دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

# کوردستانی پشت قەفقاس

## دۆسیەی تاوانەکانی رژێمی سۆڤیێت بەرامبەر بە کوردەکانی ئەم وڵاتە



پێداچوونەوە و ئامادەکردن

سدیق ساڵح



بنکەی ژین

دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

# کوردستانی پشت قەفقاس

## ( دۆسیەی تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤیێت
## بەرامبەر بە کوردی ئەو وڵاتە )

پێداچوونەوە و ئامادەکردن
سدیق ساڵح



بنکەی ژین

سلێمانی ٢٠٠٦

٩٤٧,٥

ﻫ ٩٣٢ هەورامی، ئەفراسیاو

کوردستانی پشت قەفقاس (دۆسیەی تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤێتی بەرامبەر بە کوردی ئەو وڵاتە)/ نووسینی ئەفراسیاو هەورامی.-سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.

ل: نەخشە، بەڵگەنامە، (١٦،٥ × ٢٣ سم).

١- کوردستانی پشت قەفقاس-مێژوو ئ-ناونیشان

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پێرستو پۆلێنی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٣٨

کتێب: کوردستانی پشت قەفقاس (دۆسیەی تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤێتی بەرامبەر بە کوردی ئەو وڵاتە)

نووسەر: دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

پێداچوونەوەو ئامادەکردن: سدیق ساڵح

تایپ: بەختیار ئەوڕەحمان

مۆنتاج: ڕێنوار

بەرگسازی: قادر میرخان

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٠٠٠

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

ژمارەی سپاردن: ٦٤٢ی ساڵی ٢٠٠٥

لە بڵاوکراوەکانی

**بنکەی ژین**

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستانی عێراق- سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی، کۆڵانی ٣٩، ژمارەی خانوو ١٠،

(بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتاییی ئەردەڵان)، سنووقی پۆست: ١٤

تەلەفۆن: ٣١٢٣١٠٥ مۆبایل: ئاسیا ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یا ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤

E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

# پێڕست

# پێشەکی

مەبەستم لە نووسینی ئەم کتێبە، زیاتر چۆنیەتی دامەزراندنی کوردستانی سوور (١٩٢٣-١٩٣٠)و هەڵوەشانەوەی ئەم قەوارە کوردییە لە بەشێکی نیشتمانەکەیداو سەرەنجام دەربەدەرکردنیان لە سەردەمی ستالین (لە ساڵی١٩٣٧ و ١٩٤٤ و...) بوو. لەپاڵ ئەو دۆخە کارەساتبارەدا کە پاش تێکچوون یا ڕووخانی یەکێتی‌ی سۆڤێت کوردەکانی ئەم وڵاتەی زیاتر تووشی نەهامەتی و دەربەدەری و توانەوەو ڕاوەدوونان کرد. بەختەوەرانە لەم بارەیەوە هەندێ بەڵگەو سەرچاوەی نوێم لە ئەرشیڤەکانی ئەم وڵاتە دۆزییەوە، ئەگەرچی زۆر شتی دیکە ماوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ. بۆیە پرسیاری زۆرم بۆ هاتەپێش و دەبوایە هەر بەرەو دواتر بگەڕێمەوە، واتە پێش گرتنەدەسەڵاتی بەلشەویکەکان لە ڕووسیاو لەویشەوە بۆ کاتی دەست بەسەرداگرتنی پشت قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا و چۆنیەتی ژیان و بەسەرهاتی کوردی ئەم بەشەی کوردستان و، لەویشەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە هێشتا قەفقاس وەك میرایەتییەکی خان و سەردارنشین لە چوارچێوەی پادشایەتی ئێرانداو بەشێکیشی جاروبار لەژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا بووەو سەربەخۆ یا نیوە سەربەخۆ بوون، پێویست بوو لەم بارەیشەوە بەڵگەو زانیاری پێویست کۆبکرێتەوە، بەتایبەتی سەرچاوەی ئێرانی یا تورکی عوسمانی. بەڵام لەبەر دەست ڕانەگەیشتنم بەو سەرچاوانە لەلایەکەوەو بەرفراوانبوونی بابەتەکە لەلایەکی دیکەوە، بڕیارم دا ئەم بەشەی وەك بەرگی یەکەم بڵاوبکەمەوە، بەو هیوایەی کە بەشی دووهەمیشی ئامادەبکرێ. دیارە ئەم بابەتە کە مێژووی بەشێك لە گەل و وڵاتەکەمانە، پێویستی بە دەیان لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە هەیە.

بەپێی ئەو بەڵگەو سەرچاوانە کە لەم بەرگەدا ناویان هاتووە، هیچ گومان لەوە ناکرێ کە بەشێك لە خاك و نەتەوەی کورد هەر لەکۆنەوە کەوتوەتە ناو هەرێمی پان‌و بەرینی قەفقاس و، ئەگەر ئەو بۆچوونەی هەندێ مێژوونووسیش لەبەرچاوبگرین کە کورد لە قەفقاسەوە بەرەو نیشتمانەکەی شۆڕبوەتەوە، دەبێ ئەم بەشەی نیشتمانەکەی بە یەکەم جێنشینی کوردان دابنرێ. جگە لەوە ئەم هەرێمە کە ئەودەمە لەگەڵ بەشەکانی دیکەی کوردستاندا سنوورێکی لەنێواندا نەبوە، نەك هەر کوردی تێدا ژیاوە، بەڵکوو خاوەنی دەسەڵات و قەوارەیش بووەو، سەرچاوەکانی چەند سەدەی ڕابوردوو کە باسی هەبوونی کورد لەم هەرێمەدا دەکەن و، لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕووسیاو سۆڤێت زیاتر بە ناوی کوردی ڕووسیا یا سۆڤێت یا قەفقاسەوە ناویان نراوە (وەك چۆن سەرچاوەکانی دیکە زیاتر بە وشەی کوردی تورکیا یا ئێران یا عیراق یا سوریا ناوی دەبەن ). مێژووی جێگیربوونی کورد لە هەرێمی قەفقاسدا، لە هی زۆر گەلی دیکەی ئەم هەرێمە کە ئەمڕۆ دەوڵەت و قەوارەیان هەیە یا نیانە، کۆنترە.

کوردی ئەم بەشەی کوردستان لەبەر هەڵکەوتی جوگرافیایی کە کەوتوەتە سەر سنوور (پەراوێز)ی وڵاتەکان و، هەمیشە وەك قەڵغان، یا بڵێین یەکەمجار کەوتوونەتە بەر هێرشی داگیرکەران و، پاشانیش بەهۆی شەڕو دەستدرێژی و پەلاماری ئیمپڕاتۆریەکانی عوسمانی و ڕووسەوە، زۆرجار بووەتە گۆڕەپانی بەیەکدادانیان و تووشی کوشتار و ڕاونان و کاولکردن و زیانی گیانی بووەتەوە، بەتایبەت لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ ئێران و تورکیای عوسمانیدا لە سەدەی نۆزدەهەمدا. بۆ وێنەی زیندووی بەوردی بڕوانە کتێبی (ئاڤێرنۆڤ، کورد لە شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیادا لە سەدەی نۆزدەهەمدا، وەرگێڕانی ئە. هەورامی). کوردی ئەم بەشەی کوردستان گەلێك زیاترو، بگرە لە هەندێ باریشەوە بەراورد ناکرێ لەگەڵ کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستاندا، بەتایبەت لە سەردەمی سۆڤێتدا، تووشی جینۆسایدو کارەسات بووەو، جگە لە تواندنەوە لە نیشتمانی خۆی دەرکراوە.

لەم ساڵانەی دواییدا، بەتایبەت پاش شەڕی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان لە ١٩٨٨وە تا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کۆماری قەرەباغ لە ١٩٩١دا (کە هێشتا کەس دانی پێدانەناوە) گەلێك کتێب و وتار لەلایەن هەردوولاوە بڵاوکراونەتەوەو، هەرکامیشیان بەپێی بەرژەوەندیەکانی دەیەوێ بڵێ ناگۆرنا قەرەباغ هی ئەوە. بەڵام هیچ کامیان بەڵگەیەکی مێژوویی بەدەستەوە نییە ئەوە بیسەلمێنێ. لەکاتێکدا ئەوناوچەیە سێ نەتەوەی سەرەکیی: کوردو ئازەرو ئەرمەن و هەندێ نەتەوەی دیکەی تێدا ژیاوە. سەرژمێریەکانی پێش ١٩١٧و سەرەتای سەدەی بیستەم نیشانی دەدەن کە ئەم هەرێمە فرەنەتەوە بووە (کوردستانی سووریش دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم هەرێمە).

پاش یەکەمین جەنگی جیهانی دانیشتوانی ئەرمەنی و ئازەری ئەم هەرێمە لەزیادبوونێکی یەکجار زۆرو نائاساییدا بوون و، دیموگرافیای ناوچەکە گۆڕاو، هەردوولای ئازەری و ئەرمەنی هەوڵیان دەدە بۆ جێگیرکردنی نەتەوەکەی خۆیان، بارودۆخەکە بە قازانجی خۆیان سەقامگیر بکەن یا بقۆزنەوە. ئەرمەنیەکان ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنی کە لە تورکیاو ئێران و وڵاتانی دیکەوە هەڵهاتبوون یا پەنایان بۆ سۆڤێت بردبوو، بگرە لە ئەرمینیا خۆیشی، لەوێ جێگیر کران. ئازەریەکانیش، هەروا ئەو ئازەریانەی کە لە ئەرمەنستان دەردەکران، یا لە کۆمارەکانی دیکەی پێشووی سۆڤێتەوە دەگەڕانەوە بۆ ئازەربایجانی ئێران و، بگرە نەتەوە تورك زمانەکانی دیکەی وەك تاتارو تورك و قەرەپاپاخ و... لەوێ جێگیر دەکران. پاشتر لە سەردەمی سۆڤێتدا ڕووس و گەلانی دیکە لەوێ جێگیر کران.

لەم ناوەدا تەنیا ژمارەی کورد کەم دەکرایەوەو لەناو دەچوو و قەوارەکەی هەڵدەوەشایەوەو، سەردەمی حوکمی ستالین بەکۆمەڵ بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا دەگوازرایەوە. ئەمە مەبەستی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە. پاشماوەی کوردەکانیش لەکاتی شەڕی ئەرمەنی و ئازەریدا لەسەر ناگۆرناقەرەباغ، یا لەبەر شەڕ هەڵدەهات یان لەترسی ئەرمەنیەکان هەڵدەهات و ئاوارە دەبوو.

هەرێمی ناگۆرناقەرەباغ لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئێرانەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە باری سیاسی و بەڕێوەبردنەوە مێژوویەکی تایبەتی هەیە؛ لە سەردەمی داگیرکردنی ڕووسیایشدا هەروا بووە. واتە قەوارەیەکی تایبەت بە نەتەوەیەکی نەبوەو سەر بە پارێزگای ئەلیزاڤیتەپول بووە. ئەم پارێزگایە بۆ چەند ناوچەیەك دابەش کراوەو، ناوو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەم هەرێمە چەندین جار لەلایەن کاربەدەستانی ڕووس و سۆڤێتەوە گۆڕدراوە، کە هەرکام لەمانە بەسەرهاتێکی دووروودرێژی هەیەو ئێستا ناچینە سەریان. باسی ئەوەیش ناکەین کە بولشەویکەکان لەسەر کەلاوەکانی موساواتیەکانی ئاژماری و داشناکەکانی ئەرمەنستان، ئیمپراتۆریەتی ڕووسیاو کۆماری ئەرمەنستان و ئازەربایجانیان دروست کرد، پاش ئەوەی زۆر گەلی وەك کوردو تالیش و تاتارو بەبێ ئەوەی مافێکیان پێ ڕەوا ببینریێو، هەندێ گەلی دیکەی بچووکیش بە نەتەوەو نیشتمانەکەیانەوە خرانە سەر ئەم کۆمارەو، کەوتنە بەر شالاوی ڕەگەزپەرەستانەو تواندنەوەو تەنگ پێهەڵچنین و دەرکردن. نەك هەر ماف و قەوارەیەکیان پێ ڕەوا نەبینرا، بەڵکو مافیان لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتانەیشدا بۆ مسۆگەر نەکراو، ئازارو کارەساتی ئەم گەلانە پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریی سۆڤێتیش زیاتر بوون.

مێژوونووسان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەم دوو نەتەوە دەسەڵاتدارە یا ئەم دوو کۆمارە، لە سەردەمی سۆڤێتدا، بە شانوباڵی دەسەڵاتدارانی ڕووس و سۆڤێتیاندا هەڵدەدا، وێڕای سوپاسکردنیان وەك ڕزگارکەر ناویان دەبردن کە لەژێر دەستی چەندین سەدەی پاشایەتی ئێران و مەترسی تورکیای عوسمانی دەریان هێناون. بەڵام ئەمڕۆ هەردوولای ئەم دەوڵەتە (ڕووس و سۆڤێت) بە تاوانبار دەزانن، لەبەرئەوەی خاکی ئەمیان داوە بە ئەوی دیکە. ئەرمەنیەکان دەسەڵاتدارانی سۆڤێت تاوانبار دەکەن کە ناگۆرناقەرەباغ و هەندێ ناوچەی دیکە کە دانیشتوانی یا خاکی ئەرمەنیەکان بووە، داویانە یا خستوویانەتە سەر کۆماری ئازەربایجان، یا هەندێ ناوچەی دیکەیان داوە بە کۆماری گورجستان یان

توركیا و خیانەتیان لێ کردوون‌و، دەڵێن خاکی ئێمەیان داوە بە خەڵکی دیکە. ئازەریەکانیش هەروا گەلێك ڕەخنەو ناڕەزایی خۆیان ئاڕاستەی سۆڤێت یا ڕووسیا دەکەن. بۆ وێنە دەڵێن: بەدرێژایی حەفتا ساڵ ئازەربایجان (بەتایبەت نەوت)ی تالآن کردووە و، ئەرمەنیەکان توانییان بە چەکی سۆڤێتی ڕووسی ناگۆرناقەرەباغ لە ئازەربایجان جیابکەنەوە. بەلآم نە ئەرمەنی و نە بەتایبەت ئازەری ناڵێن: بەشێك لە کۆمارەکەیان خاکی گەلانی دیکەیەو ئەوانیش خاوەن مافی خۆیانن و بەدرێژایی مێژوو لە ناوچەکەدا ژیاون و خزمەتی هەمەلایەنەی ئەم کۆمارانەیان کردووەو دەوری بەرچاویان لە ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتن و پێگەیاندنی ئەم کۆمارانەدا هەبوەو سەدان زاناو ڕووناکبیرو هونەرمەندو نووسەرو پیاوچاکیان هەبوە کە خزمەتیان کردووە. بۆ وێنە، نووسراوەکانی دوێنیٚ و ئەمڕۆیان سەرژمێری کوردو تاڵیش و تاتار بەنیوەچڵیش بەدەستەوە نادەن، یا هەر باسیان ناکەن، چونکە ئەگەر بێتوو باسی بکەن، مانای وایە ئەو گەلانە کێشەیەکیان هەیە چارەسەر نەکراوە.

هەردوولا، بۆ خۆدەربازکردن لە کێشەی گەلانی کۆمارو دەوڵەتەکەیان، دانیشتوانی ولآتەکەیان (ئێمە لێرە تەنیا مەبەستمان ناگۆرناقەرەباغە) بەسەر موسڵمان و ناموسڵمان یا ئازەری و ئەرمەنیدا دابەش دەکەن‌و، هیچ لایەکیان باسی دروستبوونی کوردستانی سوورو سەرژمێری کوردەکان و، سەرچاوە مێژووییەکانیش سەبارەت بە کورد لەم ناوچەیەدا ناکەن. دروستبوونی قەوارەو ناسنامەیەکی کوردی یا بەڕێوەبەرێتییەکی کوردی کە سنوورەکانی دیاریکراوو زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی کورد بووەو دەسەلآتدارانی سۆڤێت دانیان پێدا ناوە، فاکتێکی مێژوویی‌یە هیچ لایەکیان ناتوانن خۆیانی لێ بدزنەوە، بەلآم بە ئەنقەست باسی ناکەن.

چاوخشاندنێك بە مێژووی ناگۆرناقەرەباغدا، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنیٚ کە ئەم هەرێمە هیچ کاتێك و لە هیچ بڕیارێکدا سەر بە خاکی ئازەربایجان یا ئەرمینیا نەبوە، چونکە زۆرینەی دانیشتوانی لە هیچ کام لەو نەتەوانە پێك نەهاتبوو (یا

لەوە گەڕێین کە-وەك پێشتر باسمان کرد-چۆن دەسەلاّتدارانی ئازەری و ئەرمەنی پاشتر پەنابەرو ئاوارەو دانیشتوانی دیکەی خۆیان ناردە ئەویّ و لەویّ جێگیریان کردن و قەوارەی دیمۆگرافیای ئەوێیان تێك دا)، چونکە ئەگەر ئەم هەرێمە هەر لەسەرەتادا، چ لە باری دانیشتوان و چ باری مێژووییەوە، سەر بە ئەرمینیا یا ئازەربایجان بوایە، دەستبەجێ و بەبێ چەندوچوون دەکەوتە سەر یەکێك لەو کۆمارانە، وەك ناوچەو هەرێمەکانی دیکە کە پێشتر پێکەوە کۆیان کردنەوەو ئەو کۆمارانەیان لێ پێکهێنان. بۆیە بەلشەویکەکان دەیانزانی ئەم هەرێمە کێشەو شەڕی لەسەر ساز دەبێ و کۆسپێکی گەورە بۆ سەقامگیرکردنی دەسەلاّتداریّتی سۆڤێت لە ناوچەکەدا دروست دەکات. لەلایەکی دیکەوە، دەیانزانی کورد جگە لە ئازەری و ئەرمەنی، سێهەم دانیشتووی ناوچەکەیە. جگە لەوەیش بەلشەویکەکان نەیاندەویست دڵی هەریەك لە ئازەری و ئەرمەنی لە خۆیان بڕەنجێنن. هەر بۆیە بڕیاریان دا ئەم هەرێمە واقیعێکی تایبەتی خۆی هەبێ و دابەشیان نەکرد، چونکە جگە لە ئازەری (لە هەندێ نووسراودا تاتار یا تورك هاتووە) و ئەرمەنی و کوردی تێدا دەژی. لەبەر ئەوە، پاشان بڕیاری دروستکردنی کوردستانی سووریان دا. ئەمە خۆی بیرهێنانەوەی ئەرمەنی و ئازەری بووە کە جگە لەوان گەلانی دیکەی تێدا دەژین. هەروەها گەلێك گوندو ناوچەو شارۆچکە دانیشتوانی تێکەڵن و، جگە لە کوردو ئازەری و ئەرمەنی، گەلانی دیکەی تێدا ژیاون و نەگونجاوە دابەش بکرێن.

لە هەمووی گرنگتر، هەوارگەو لەوەڕگا دەوڵەمەندەکانی ئەم هەرێمەن کە بژیوی نەك هەر دانیشتوانی هەرێمەکە، بەڵکو هی ناوچەکانی دەوروپشتیش بوون و، بەدرێژایی سەدان ساڵ موڵکی گشتی ئەو گەلانە بوون و نەشیاوە دابەش بکرێن، چونکە لەوانە بووە بە دابەشکردن سبەینێ ئەو لایەنەی کە دەیدرێتێ، نەهێڵێ چی دی گەلانی دیکە هاتوچۆی ئەوێ بکەن. بەکورتی، جیاکردنەوەی ناگۆرناقەرەباغ لە قەوارەیەکی جیاوازدا زۆر شت دەگەیەنێ و، دواتر بەسترایەوە بە کۆماری ئازەربایجانەوە، کە بڕیارێکی بێبناغەو ڕواڵەتی بوو، چونکە کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و کۆماری ئۆتۆنۆمی ناگۆرناقەرەباغ

هەرسێ سەر بە دامودەزگاو یاساو  چوارچێوەی یەکێتیی سۆڤێت بوون. پاش داگیرکردنی پشت قەفقاس (قەرەباغ لە ساڵی ١٨٠٥دا) لەلایەن ڕووسیاوە، قەرەباغ لەگەڵ زەنگەزور (زەنگەزور ئەودەمە سەر بە "ئیرەڤان"ی پارێزگای ئەرمینیا بووە، لە گۆڕینێکی دیکەدا پارێزگایەکی نوێیان بەناوی ئەلیزاڤیتەپولەوە دروست کردووە).

ناگورنا قەرباغ، لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی سۆڤێتدا، بوو بە ناوچە یا کانتۆنێکی ئازادو سەر بە هیچ لایەکیان (ئازەربایجان و ئەرمەنستان) نەبوو. کەچی هەردوولا بە پشت بەستن بە هەندێ بڕیاری خۆیان لە ئاستی سەرەوەو خوارەوەدا، ڕاگەیاندن و نووسینی چاپەمەنیەکانی ئەو سەردەمەیان (کە هیچ کامیشیان لەلایەن دەسەڵاتدارانی ناوەند . واتە مۆسکۆ- وە لە ئاستی پەرلەمان و دەوڵەت و پارتەکەیاندا پەسند نەکراوە) دەیانەوێ بیسەلمێنن قەرەباغ هی ئەوانە، بەڵام ئەمانە نابنە بەڵگەو دیکۆمێنت. تەنانەت بەڵگەی ئەوتۆیش هەیە کە هەردوولا بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانی خۆیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە. بۆ وێنە، کۆبوونەوە یا کۆنگرەی ئەرمەنیەکانی ناگۆرناقەرباغ لە ئابی ١٩١٩دا بڕیاری داوە، بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی نالەباری ناوچەکە (شەڕی ناوخۆو ڕاونانی ئەرمەنیەکان لەلایەن تورك و موساواتیەکانەوەو، دەست تێوەردانی ئینگلیز لە ناوچەکەو...، هەورامی) کە هەر چەشنە تێکهەڵچوونێکی تێدا دەبێتە هۆی لەناوچوونی خەڵك لە هەموولایەك‌و هەموو نەتەوەکان، ناگۆرناقەرەباغ بخرێتە ناو چوارچێوەی ئازەربایجان. بەڵام لە هەندێ شوێن‌و بەتایبەت نووسراوی ئەرمەنیەکاندا، لە درێژەی ئەم بڕیارەدا هاتووە کە بەشێوەیەکی کاتی بڕیاریان داوە بخرێتە سەر ئازەربایجان، تا بەلاداخستنی لە کۆنفراسی ئاشتیی پاریسدا. بەڵام پاش (٩) مانگ کە ئەم کێشەیە لە کۆنفرانسی پاریسدا نەخرایە بەر باس، دیسانەوە ئەرمەنیەکان ئەم بڕیارەیان هەڵوەشاندەوەو بڕیاری لکاندنی ناگۆرناقەرەباغیان دا بە ئەرمەنستانەوە.

ئازەریەکان، بەتایبەت موساواتیەکان، هەڕەشەی هێنانی سوپای تورکیان کرد لە ئەرمەنیەکان. ئەودەمەیش تورکەکان گەلێك ئاژاوەیان لە ناوچەکەدا نابوەوەو

کەوتبوونە کوشتن و ڕاونانی ئەرمەنیەکان. جگە لەوە، سوڵتانۆڤ کە بە ڕەگەز ئازەریەو پارێزگار یا حاکمی ناگۆرناقەرەباغ بووەو لەلایەن ڕژێمی موساواتیەکانەوە دانراوە، دەورێکی گلاوی لە تەنگ پێهەڵچنین و ڕاونان و چەوسانەوەی کوردو ئەرمەندا دیوە. تەنانەت هەندێ سەرچاوە ئاماژە بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنی ساڵی١٩٢٠ لە ناگۆرناقەرەباغ دەکەن. ئێمە پاشان تاوانی موساواتیەکان و بنەماڵەی سوڵتانوڤ و داشناکەکان لە زمانی بوکشپانەوە باس دەکەین.

لەو سەردەمەدا، بارودۆخی ناوچەکەو دنیا لە بەرژەوەندی ئازەریەکاندا بووە. موساواتیەکان پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ تورکیاو بەریتانیادا هەبوە؛ تورکیا هاوڕەگەزی ئازەرو دژی ئەرمەنی و، ئینگلیس لەبەر نەوت و شوێنی ستراتیژی ئازەربایجان و، مەبەستی هەردوولا جیاکردنەوەی ئازەربایجان و دەست پێڕانەگەیشتنی بەلشەویکەکان بەم کۆمارەو، کۆمەڵە فاکتەرێکی دیکەش کە دواتر لە سەردەمی سۆڤێتدا ئاماژەیان پێدەکەین، پاش سەقامگیربوونی دەسەڵاتی سۆڤێت لە ئازەربایجان، بەلشەویکەکان زیاتر بایەخیان بەو فاکتەرانەی سەرەوە دا. سەرئەنجام بەلشەویکەکان بەکردەوەو بەفەرمی یا نافەرمی ناچار بوون لایەنی ئازەری بگرن.

گەرچی مشتومڕو ناکۆکییەکی زۆر لە ئاستی سەرکردەکانی قەفقاسی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتدا لەسەر ئەم کێشەیە کەوتەوە (جگە لە پێکادان و کوشتاری ئازەری و ئەرمەنی)، کار گەیشتە نامەنووسین بۆ لینین و ستالین و... لە مۆسکۆ، نەیانتوانی کێشەکە چارەسەر بکەن و، ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی هەرێمی قەفقاس (وەك نەریمانۆڤ ئورجونیکیەزەو ماخارادزەو نازرەتیان و کیروڤ و فیگاتنیر میاسنیکۆڤیان) کە ئەرمەنی و ئازەری و جورجی و... بوون، هەرجارێك کە باسی ئەم کێشە ئاڵۆزەیان کردووە، نەگەیشتوونە ئەنجامێك. بۆیە وەزیری کاروباری ئەودەمەی سۆڤێت لە ١٧ی ئەیلوولی١٩٢٠دا بە داخوازی لینین بەم چەشنە لەسەر ئەم کێشەیە وەڵامی داوەتەوە:

((هیچ کەسێ شتێك لە ئازەربایجانیەکان ناسێنێتەوەو، قەرەباغ بۆ خۆی کێشەی لەسەرەو، ئەو هەرێمە ئێستا بەشێوەیەکی کاتی لەلایەن هێزەکانی

سۆڤێتیەوە داگیرکراوەو، ئێمە بەشێوەیەکی کاتیش نە دەیدەین بە ئەرمەنیەکان و نە بە ئازەربایجانیەکان. بەم چەشنە هیچ لایەکیان لێمان زویر نابن. هەر ڕێگەیەکی دیکە بۆ کێشەی ناگۆرناقەرەباغ هەڵبژێردرێ، ئێمە بەدرۆ دەخاتەوە. واتە چاوپۆشی لە یەکێکیان دەکەین‌و، بە زیانی ئەوی دیکەیان دەشکێتەوە. من لەم بارەیەوە لەگەڵ نوێنەرانی ئەرمەنیدا کە بۆ بەشداریکردن لە ئینترناسیۆنالی سێهەمدا هاتوون‌و، لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستاندا کە ئێستا هاتوونەتە ئێرە –واتە مۆسکۆ–و، لەگەڵ ئالیاڤ و کیروڤ و هی دیکەدا زۆر دوواوم بڕیارەکەی ئێمە تاقە ڕێگەیە. ئێمە نایدەین بە هیچ کامیان. ئەگەر بیدەین دژی ئەو سیاسەتە ئاشتیخوازەیە کە بانگەشەی بۆ دەکەین))[1]. دیارە سەرکردایەتی سۆڤێتیش کە ئەم بڕیاری داوە، جگە لە فاکتەرە مێژوویيەکان و ڕێژەی دانیشتوان، فاکتەری نەوت و دەوڵەمەندی‌و شوێنی ستراتیژی ئازەربایجانی ڕەچاو کردووە، بەتایبەت هاوسنووری لەگەڵ دەریای کاسپی (خەزەر یا مازندەران)و ئێران و تورکیادا کە دەکرێ لەوێوە پەل بهاوێژرێتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بەتایبەت ئێران. ئەو سەرکردایەتە لەودەمەدا سەرقاڵی ناردنەدەرەوەی شۆڕشی بەلشەویزمی بوو بۆ ئێران و باکووری ئێران، بە مەبەستی دەرکردنی ئینگلیز لە ئێران کە کێشەیان لەڕێگەی ئێرانەوە بۆ بەلشەویکەکان نابوەوە. گاردی سپی سەر بە ڕژێمی پێشووی ڕووسیایش لە ناوچەکەو ئێراندا هەبوو.

هەر بۆیە هەوڵیان دا، سەرەتا دەسەلاتی سۆڤێتی لە ئازەربایجان سەقامگیر بکەن. ئەوە بوو دەسەلاتی موساواتیەکان لە ئازەربایجان پێچرایەوەو، ١٩٢٠/٤/٢٣ دەسەلاتی سۆڤێتی لەوێ ڕاگەیەنرا (بەلام دەسەلاتداریتی سۆڤێت لە ئەرمینیا ١٩٢٠/١١/٢٩، واتە چەند مانگ پاش ئازەربایجان، دامەزرا). ئەمە کاریگەری زۆر بوو کە ناگۆرناقەرەباغ لە باری بەڕێوەبردنەوە سەر بە ئازەربایجان بێ. ئەمە جگە لەوەی کە خاك و دانیشتوانی ئازەربایجان لە ئەرمەنستان زیاترە،

---

[1] ئەرشیڤی کۆمنیتێرن (ر. س. خید. نی)، فۆندی ٦٤، ئوپیسی ١، دیلای ١، ل٨٥.

پاشتریش نزیکبوونەوەی بەلشەویکەکان و کەمالیەکانی هاوڕەگەزی ئازەریەکان لە کێشەی ناگۆرناقەرەباغ، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ پاشتر بەسترانی پەیمانی ستراتیژی و دۆستانە لەنێوان بەلشەویك و کەمالیەکاندا. سۆڤێت بۆ زیاتر نیشاندانی ئەو دۆستایەتیە بە کەمالیەکان، لایەنی ئازەریەکانی گرت. سەرباری ئەوە، کەمالیەکان گوشاریان لەسەر بەلشەویکەکان هەبوو کە هەرێمی ناگۆرناقەرباغ نەدرێتە ئەرمەنستان و سەر بە ئازەربایجان بێ. پێشتر باسمان کرد چۆن بەلشەویکەکان (قارس و ئەردەهان)یان پێشکەشی کەمالیەکان کرد.

لەلایەکی دیکەوە، بەلشەویکەکان لەوباوەڕدا بوون کە نابێ بیانوو بدرێتە دەستی وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ئیسلامی (موساواتیو ئینگلیزەکان) کە ئەوانە گەلانی ناموسوڵمانیان زۆر بەلاوە گرنگترە لە موسڵمان. واتە ئەو پڕوپاگەندەیەی کە موساواتیەکان و دژە سۆڤێتیەکان دەیانکرد، بەلشەویکەکان بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو چەشنە پڕوپاگەندانە، بەباشیان دەزانی جارێ نەدرێتە هیچ کامیان و دواتر بدرێتە ئازەربایجان. پاشانیش دەوری چارەنووسسازی ستالین وابوو دەنگی لەگەڵ ئەوانەدا بێ کە دەیانویست هەرێمی قەرەباغ نەدرێ بە ئەرمەنستان، چونکە هەندێ ناوچەی گورجستانیش کە ستالین خۆی خەڵکی ئەوێ بوو، دانیشتووی ئەرمەنی زۆر بوو و ئەرمەنیەکان داوایان دەکردو تائێستایش داوای دەکەن، بەڵام لە سەردەمی ستالیندا نەیانوێراوە ئەم کێشەیە بە زەقی باس بکەن. ئەوەبوو ستالین لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بیرۆی قەفقاسی پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیادا (بەلشەویك ١٩٢١/٧/٥ دەنگی دا کە ناگۆرناقەرباغ سەر بە ئازەربایجان بێ[٢]). ئازەریەکان هەندێ جار هەڕەشەیان دەکرد کە ئەگەر بێتوو ناگۆرناقەرەباغ بخرێتە سەر ئەرمەنستان، ئەوان ڕێگەکان دەبڕن و، بەتایبەت ناهێڵن سووتەمەنی بگاتە ئەرمەنستان، چونکە ئابووری ئەرمەنستان و پەیوەندی ئەم وڵاتە بەدەرەوە لەڕێگەی ئازەربایجانەوە بووە.

---

[٢] ئەرشیڤی کۆمنیتین (ر-س-خید-نی)، فۆندی ٦٤، ئوپیسی ١، دیلای ١، ل٨٥.

بڕیاری یەکجاری لە ١٩٢٣/٧/٧دا دراو ناگورناقەرەباغ خرایەوە سەر ئازەربایجان. وەنەبێ ئەم بڕیارە ڕاست و ڕەوا بووبێو، ڕێژەو ڕای دانیشتوان‌و فاکتەرە مێژوویی و جوگرافیەکانی تێدا لەبەرچاو گیرابن و، بەشێوەیەکی یاسایی و دووربینانە ئەم بڕیارە درابێ. هەر ئەوەیش بوو کە پاش ڕووخانی سۆڤێت کارەساتێکی گەورەی بۆ دانیشتوانی کوردو ئازەری و هی دیکەی لێ کەوتەوەو، ئەوانە هەموو شتێکی خۆیان لەدەست داو دەرکران و تائێستایش لە ئۆردووگاو دەربەدریدا دەژین. شتێکی شاراوە نییە کە یارمەتی هەمەلایەنەی ڕووسیا بە ئەرمەنیەکان، بەتایبەت لە بواری چەکدا، بوو بەهۆی ئەوەی کە هەرێمی ناگورناقەرەباغ لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە داگیربکرێ و، دانیشتوانی نائەرمەنی ئەوێ کە ژمارەیەکی زۆریان کورد بوون دەربکرێن. بەوە، کورد بۆ هەتاهەتایە لە نیشتمانی باوباپیری خۆی هەڵکەندرا. ئەگەر یارمەتی ڕووسیا نەبوایە، ئەرمەنیەکان ئەو توانایەیان نەبوو. بەڵام ڕووسیا بۆچی ئەوەی کرد؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەخت نییە. نزیکبوونەوەی ئازەربایجان، پاش ڕووخانی سۆڤێت لە ڕۆژئاواو تورکیاوە، بەتایبەت هاتنی کۆمپانیا نەوتیەکانیان بۆ ئەم وڵاتەو تەنگ پێهەڵچنینی کۆمپانیا نەوتیەکانی ڕووسیاو کۆمپانیاکانی دیکەیان و، بەگشتی نەهێشتنی بەرژەوەندە هەمەلایەنەکانی ڕووسیا لەم وڵاتەداو، وتوویژ و نزیکبوونەوەی ئازەربایجان لە پەیمانی ناتۆو ڕاکێشرانی بۆری نەوتی ئازەربایجان لە دەرەوەی سنوورەکانی ڕووسیاوە بۆ بازاڕەکانی دنیاو، گەلێك هۆی دیکە کە بابەتی باسەکەمان نین، لەو هۆیە دیارانەن. ڕووسیا بەم چەشنە سزای ئازەربایجانی داو، بەپێچەوانەوە پەیمانی لەشکری و ستراتیژی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەرمەنستان و ئێرانیشدا بەست، لەترسی ئەوەی کە هەندێ دەنگوباس لە ئازەربایجان سەبارەت بە یەککگرتنەوەی هەردوو ئازەربایجان هەبوو و ئازەربایجان لە ڕۆژئاوا نزیك بوەوە.

تورکیا، ئەم کۆمارە ئیسلامییە، پێوەندی نەژادی و ئاینی هاوبەشی لەگەڵ ئازەربایجاندا خستە لاوەو هەموو چەشنە یارمەتییەکی ئەرمەنستانی دا. هەوڵی

دوو دەوڵەتی هاوسێ ئازەربایجان و ئەرمەنستان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناگۆرناقەرەباغ بە ناوبژیوانی وڵاتانی دیکە، بەتایبەت وڵاتانی ئەوروپایی، بە ئەنجام نەگەیشت و، ئەرمەنیەکانی قەرەباغ سەربەخۆیی ئەم هەرێمەیان لە ١٩٩١دا، وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن ئاڵاو نیشانەو سروودی نیشتمانی و یاسای بنچینەیی و دامودەزگای دەوڵەتی خۆی ڕاگەیاند، گەرچی تائێستا جگە لە ئەرمینیا هیچ وڵاتیکی دیکە دانی پێدا نەناوە. ئەوانە ڕیفراندۆمێکی (ڕاپرسی گشتی) ڕواڵەتییان لەناو دانیشتوانی ئەرمەنیدا کرد، لەکاتێکدا زۆربەی دانیشتوانی ئەوێ، بە کوردو ئازەری و گەلانی دیکەوە، لەوێ دەرکرابوون و، بگرە تەواوی دانیشتوانی ئەرمەنی ئەوێش لەوێ نەبوون. ئەنجامەکەی کە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەرمەنی و ڕووسیدا بڵاوکرایەوە، گوایە ٩٥٪ ی دانیشتوانی ئەوێ ئەرمەنین و ١٠٨٦١٥ کەس دەنگیان داوەو ٩٩,٨٩٪ی دەنگدەران لەگەڵ سەربەخۆیی ئەم هەرێمەدان[٣]. ئەم سەرژمێرییە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ سەرژمێریەکانی هەموو نەتەوەکانی سەردەمی سۆڤێتیی ناگورناقەرەباغدا یەك ناگرێتەوە. واتە ١٠٨٦١٥ کەسی ئەرمەنی کە مافی دەنگدانیان هەبوە، لەوێ نەژیاون. جگە لەوە، ڕیفراندوم بەبێ دانیشتوانی دیکەی ئەم هەرێمە پاش دەرکردنیان، بەڕێوە چووە. ئەرمەنیەکان بۆ ئەوەی خۆیان بەرامبەر بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی تاوانبار نەکەن، ئەم هەرێمەیان وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕاگەیاند، بۆ ئەوەی کۆماری ئەرمەنستان تاوانبار نەکرێ بەوەی گوایە ئەم کۆمارە دەستی لە داگیرکردنیدا نەبوەو سبەینێ لێی بپێچرێتەوە (گەرچی ژمارەیەکیش لەگەڵ ئەوەدا بوون کە ناگۆرناقەرەباغ بلکێنرێ بە ئەرمەنستانەوە). زۆربەی چەکدارو کاربەدەستی ناگۆرناقەرەباغ خەڵکی ئەرمەنستان بوون، نەك ئەرمەنی ناگورناقەرەباغ.

ئەرمەنیەکان بەڵێنی زۆریان بە کوردەکان (ی ئەرمەنستان)دا کە پاش ئازادکردنی ناگۆرناقەرەباغ، کوردستانی سوور سەرلەنوێ دادەمەزرێننەوە، بۆ

---

[٣] لە بەیاننامەی ئەنجامی ڕیفراندومی ناگۆرناقەرەباغ، کانوونی یەکەمی ١٩٩١.

ئەوەی کوردە ئێزدیەکانیش بەشداری ئەو شەڕەماڵویرانکەرە بکەن و، ژمارەیەکی زۆریان بکوژرێ و بریندار ببێ. بەڵام یەك کورد نەیوێرا بگەڕێتەوە ئەوێ و باسی کوردستانی سوور بکات[٤]. لەلایەکی دیکەوە، دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی ناگۆرناقەرباغ لە بانگەوازو یاسای بنچینەییاندا بۆ فریودانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، گەرانتی مافی گەلانی نائەرمەنی ئەوێ و هەروەها مافی مرۆڤ و یاسا نێونەتەوەییەکان دەکەن. بەپشت بەستن بە یاسای بنچینەیی یەکێتیی سۆڤێت و یاسای نێونەتەوەیی مافی چارەی خۆنووسینی خۆیان و دەرچوون لە چوارچێوەی وڵاتێکی دیکە ڕادەگەیەنن.

---

[٤] وتارێکم لەم بارەیەوە نووسیوە.

# شوێنی نیشتەجێی کورد

**- لە ئەرمەنستان**

**ناوچەکانی ئالاران، ئارتاشات، ئارتی، ڤیدین، باسارگیچار، دیلیجان، کوتائیس، تالین، ئەچمیادزین، شائومیان، ناوچەی ئاپاران، ئەکتیمبریان و شاری ئیرەڤان.**

**(کوردە سوننیەکانی ئەرمەنستان لە ناوچەکانی باسارگیچار، ئارتاشات ژیاون)**

**کوردی پشت قەفقاس لە سەدەی ١٩ـەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم**

**١. کوردی ناوچەی ئاپاردان لە گوندو شارۆچکەکانی ئالاگیز، گونداخساز (قونداخسان) جارجاریس، کوربولاخ، پامپی کوردی، کوروبوگاز، جاموشلوی بچوك، میراك سەنگار (سەنگیار)، چوبان ماز کەخیل و هوزەکانی، محەمەدی ڕوژکی، سپیکی بیلا (بیئیلا).**

**٢. کوردی ناوچەی باسار گیچا لە گوندەکانی گەیسو (غەیسو)، کەیا باشی، کوربولاخ کەیر (کیرد) کە هۆزو خێڵەکانی باشکی، کەراڵی، شاڤلیکی.**

**٣. کوردی ناوچەی دلیجان، لە گوندەکانی گولەڤینو، سیمینوڤکا زۆربەیان لە هۆزی جەلالین.**

**٤. کوردی ناوچەی ئوکتەمبیرن لە گوندەکانی ئایگیشات، ئایکەڤان، مەرگەشات سۆڤێتەکان کە هۆزو خێڵەکانی ڕوموشی و شەرکی تێدا دەژین.**

**٥. ناوچەی تالین لە گوندو شارۆچکەکانی ئاکسکو، بایسیز، گلتو(گیلتو)، دیان زاڤیستان، کەلاش بەگ، کەلاخ تالا، کشل ئامار، کانارلاگ، کانارخاچ، کامیرگوخ، سادون چی، سایرانس، سیچانلو (ئافتونا)، سوریك تەلیك (تەلەك) کە هۆزو خێڵەکانی زوکوری، ئورتولوو، ڕەشی، ڕوژکی، سیپکی، حەسەنی لەوێن.**

٦. ناوچەی شائومپان (تا ١٩٦٦ ناوی زەنگی باسارو پێش ئەوەیش ناوی ناوچە ئارتاشات بووە) نەچیرلوی سەروخوار کە هۆزو خیلکانی بروکی.

٧. ناوچەی ئەچمیادزین لە گوندەکانی ئایارلو، کوروکیند (کیوروکیند) کە هۆزو خیلەکانی شەرکی، دیڤنا تێیاندا دەژین.

- لە ئازەربایجان

لە ناوچەکانی زەنگیلان، کەڵباجار، قوباتلی، لاچین، ئیسماعیل لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم

١. لە ناوچەی زەنگیلان.

٢. ناوچەی کەڵباجار لە گوندو شارۆچکەکانی ئاخجەکند، زەیلیك، ئورجلو، سویوخ بولاغ شورتانی سەرو شورتانی خواروو.

٣. ناوچە قوباتلی لە گوندەکانی زیلانلی، کورت ماخروزلو، میرزاك و یردی مەلای سەروو (مولوی سەروو) مەلای خوارو، سیلالی (جەلالی).

٤. ناوچەی لاچین لە گوندو شارۆچکەکانی ئاخ بولاخ، ئاخجەکند، بوزلو، زیرتی قەلاچە، کەمالی، قەرەکشیش، قەرەقشلاق، لاچین، مین کیند، میرك چیراکلی، شەیلانلی.

- لە کازاخستان

لە هەرێمی ئالمائاتا.

- لە تورکمەنستان (ئەبیوەردی)

لە عەشق ئاباد، ماری و گوئیك تەپە، کائاخکین (لە گوندەکانی باقیر"باگیر"و فیروزە، چولین، گەرماب ... هتد) هەروەها لە ناوچەکانی تورکمەن-کالین، بارمە عەلی (لە کوردەکانی خاننشینی دەرەگەز، قەلات، ڕودکان، کوچان و بجنوردن).

کوردی ناوچەکانی ماری، بارامەعەلی لە ناوچەکانی پری کوپتیداغ لە ساڵانی٣٠ ی سەدەی بیستەمەوە هاتوون. هەروەها لە تاشائوز، چوارجوو، حەسارقەلا، کورین و میخەنلی دەژین.

بەپێی نووسینی مەمەدنازاروڤ. ئاکە لە نامەی دکتۆراکەی"کوردەکانی تورکمانیا"دا کە ساڵی ١٩٦٤ نووسیویە، ژمارەی کوردی تورکمەنستان ٧-٨ هەزارە، بەڵام بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦ ژمارەی کوردی ئەم وڵاتە ٢٣٠٨ کەسە (واتە پاش نزیکەی سی ساڵ ژمارەیان نەك تەنیا زیادی نەکردووە، بەڵکو کەمیش بووەتەوە، هەورامی). نووسەر دەڵێ: ئەم جیاوازییە لەبەر ئەوەیە کە ١٩٣٠ بەشێك لە کوردەکانی تورکمەنستان کۆچباری ئێران بوون ( هۆکەیشی دیارە. ئەگەر ژیانیان باش بوایەو مافیان پارێزراو بوایە، کۆچبار نەدەبوون و، ژیان و چەوسانەوەو تەنگ پێهەڵچنینی کوردەکانی تورکمەنستان لە ژیانی کوردی ئازەربایجانو ئەرمەنستان و جۆرجیا جیاواز نەبوە، هەورامی). هەروەها نووسەر دەڵێ: ژمارەی کوردەکانی تورکمەنستان زۆر لەوە زیاترە کە لە سەرژمێری ڕەسمیەکاندا هاتووە. ژمارەیەکی زۆر لەوانە لە پاسپۆرتدا بە تورکمەن و ئێرانی (فارس) و ئازەربایجانی نووسراون(٥).

مێژووی کوردەکانی تورکمەنستان لەگەڵ کوردی خۆراساندا هاوبەشە؛ بەشێك لەوانە بەهۆی دانانی سنووری نوێی ڕووسیا و ئێرانەوە، خرانە ناو چوارچێوەی ئیمپڕاتوری ڕووسیاوەو، بەشێکی تریان بە هۆی سیاسی و ئەنجامی شکستی ڕاپەڕینەکانی کوردی خۆراسانەوە لەترسی دەسەڵاتدارانی ئێران، بەتایبەت لە کۆتایی سەدەی ١٩و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە پەروازەی ناو خاکی ڕووسیا یا یەکێتیی سۆڤێت بوون.

## - لە جۆرجیا (گورجستان)

زۆربەیان ئێستا لە شاری بتلیس (پایتەختی جۆرجیا) جێگیرن و، پێش گواستنەوەیان لە ١٩٤٤دا کوردەکانی جۆرجیا لە ناوچەکانی باشووری جۆرجیادا کە هاوسنووری تورکیان، واتە ناوچەکانی ئاخالتیسخ (میسخیتی)-(جەواخیتی)، ئادیگی، ئەسپیندزە، ئاخا کەلاك، بورچالین و لە گوندەکانی خۆیان منیادزە،

---

(٥) مەمەد نازاروڤ .ئا، کوردەکانی تورکمەنیا (ئتفتوریفرات)، ١٩٦٤، ل٧.

ڕوستاوی، تسکالیتبالا، ناکەلاکڤی، تسوند... هتد. بەپێی سەرچاوەکان، کوردە موسڵمانە سوننیەکان (جگە لە ئێزدیەکان) لە ٢٢ گوندی میسخیتیدا دەژین.

شوێنی نیشتەجێی کوردان لە قرقیزستان لە ناوچەی ئوش، تالاس، جەلال ئاباد و فرونزە شوێنی نیشتەجێ کوردان لە ئۆزبەکستان هەرێمی تاشکەنت، سەمەرقەند، فیرگانە، بوخارا، کاشکادەرین (لە حەوت هەرێم و ٤٣ ناوچە جێگیرکراون.

دیارە ئێوەو هاوڕێکانتان لە بیرۆی سیاسی‌ی حیزب، ڕێبازێکی ڕاستتان گرتوەتە بەرو ئەم ئەرکە بەتەواوی‌و بەبێ خوێنڕشتن‌و ئاشتیانەجێبەجێ دەکەن ئێوە لە ئۆکرانیا وتتان: ((مسۆگەرکرنی مافی نەتەوەکان لە شێوەی جۆراوجۆرەوە بگرە تا دروستکردنی ناوچەو هەرێم یا شوورای نەتەوەیی نوێ دێتە دی)).

# کوردستان و کورد
## له فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیەکانی ڕووسی ـ سۆڤیێتیدا

**- فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیایی، بەرگی ١٧، چاپی ڕووسی ١٨٩٦، ل٧٠-٦٩:**

کوردستان، بەناو لەژێر دەسەڵاتی تورکیای عوسمانی و پێرسیا (ئێران)دایە. نە دەرباری عوسمانی و نە ئێران ئەوەندە هێزو توانایان نەبوە کە بتوانن تەواوی ئەم وڵاتە بخەنە ژێر دەستی خۆیان و ملکەچ و فەرمانبەریی بکەن. کاتێك ئێران تەسلیمی عەرەبەکان بوو، کوردەکان ئامادەنەبوون فەرمانبەرداری خەلیفەکان بن و، هەمیشە مایەی ژانەسەرو نائارامی بوون بۆیان. مێژووی عەرەبەکان زۆرجار باسی لەشکرکێشییان بۆ سەر کوردستان و تەسلیم بوونی دانیشتوانی سەرکەشی دەکات. سەلاحەددینی کورد سەدەی دوانزەهەم بنەماڵەی حوکمداری بەناوبانگی ئەیووبیەکانی دروست کرد کە کوردستانیش دەکەوتە چوارچێوەی ئیمپراتوریەکەیەوە.

**- فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیایی، بەرگی ٣٦، چاپی ڕووسی ساڵی١٩١٤، مۆسکۆ، ل٢٢١-٢١٩:**

کوردستان واتە وڵاتی کوردان، شوێنەوارێکی شاخاوییەو دەکەوێتە ئاسیاوەو بەشێکی لە چوارچێوە ئاسیاییەکەی تورکیادایە کە ئەم ویلایەتانە دەگرێتەوە: دیاربەکر، بتلیس، مەعموورەت ئەلعەزیز (معمورة العزيز)و وان و، لە بەشەکەی ئێرانی-هەرێمەکانی ئەردەڵان و ئازەربایجان و بەشێکی چیاکانی تاور (تۆرۆس) (دیارە زاگرۆسە، هەورامی) و دەگاتە زەنجیرە چیاکانی ئەرمینیا تا کۆتایی زەنجیرە چیاکانی ڕۆژئاوای ئێران دەگرێتەوە. بەشێك لە دانیشتوانی کوردستانی ئێران (کوردە کۆچەرەکان) زستانی خۆیان لەناو خاکی تورکیا دەبەنە سەر. گرنگترین شاری کوردستانی ئێران سنە (سەنەندەج)ە کە دەکەوێتە

باکووری–ڕۆژئاوای هەمەدان. کوردەکان هەروەها بە تێکەڵی لەگەڵ گەلانی دیکەدا لە ناوچەکانی ڕووسیاو ئێران و تورکیایشدا دەژین.

کوردەکان لە ڕووسیادا لە ناوچەکانی قارس پارێزگا (گوبرنی)کانی (ئەلیزاویتەپول و ئیرەڤان)دا دەژین. هەروەها ژمارەیەك کوردیش لە ناحیەی ئاخالتسیخ و پارێزگای تفلیس دەژین. ئەوان لە تەواوی ئەم شوێنانەدا هەموو پێکەوە لەیەك شوێن ناژین، وەك دوورگەی بچووك بچووك و لە گەلانی دیکە زیاترن. بەڵام لە هیچ ناحیەیەك یا ناوچەیەکدا زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوان پێك ناهێنن. لە تورکیا ئەوانە لە ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم و خارپووت و دیاربەکرو وان و بتلیس و ئالپ و مووسڵ و، لە ئێران دەتوانین بڵێین کە نزیکەی تەواوی ڕۆژئاوای ئەم وڵاتە لە گۆلی ورمێوە بەرەو باشووری ڕۆژهەلاتی کرماشان و، بگرە زیاتریش بەرەو باشوور. لە تورکیاو ئێران لەناو دانیشتوانی کورددا ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەرمەن و ئاسووری خاچپەرست و تورك و عەرەب و فارس دەژین. ژمارەی دانیشتوانی کورد لە چوارچێوەی ڕووسیادا، بەپێی سەرژمێری ١٨٩٧، نزیکەی سەد هەزار کەسە. کوردەکانی تورکیاو ئێران سەرژمێر نەکراون. ئەو سەرژمێریانەی کە لە هەندێ شوێن کراون و ژمارەی گشتی کوردەکان بە دوو ملیۆن و نیو تا سێ ملیۆن دەخەملێنێ، زۆر نزیککراوەیە.

کوردەکان لە باری ئانترۆپۆلۆژییەوە خراپ لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە. کوردەکان بەگشتی نزیك بە فارسەکانن و قژڕەش و چاوڕەشن، بالآیان لە مامناوەندی (١٨٤،٦سم) زیاترە. چوارشانەو مێشك ئەستوور (ئیندێکسی سەریان ٧٨,٢٩). لەباری زمانەوە ئەوانە سەر بە زمانە ئێرانیەکانن، زمانەکەیان چەند زاراوەی هەیە کە تایبەتمەندییەکیان نییە، بەلآم لەیەکەوە دوورن.

لەباری دینییەوە، زۆربەی هەرەزۆری کوردەکان موسڵمانی سوننین و کەمایەتییەکیان قزڵباش و ئێزدین. زانیاریەکانی دینی قزڵباشی تێکەڵەیەکی سەرسوڕهێنەو لە ئیسلام و مەسیحییەت پێك هاتووە. کوردە قزڵباشەکان لە چەند شوێنی جیاواز لەیەکدا دەژین، لە باکوور - ڕۆژئاوا لەنێوان ئەرزنجان و خارپووت و

لەسەر سنووری تورکیا- ئێران لە چیاکانی زاگرۆس دەژین. ئێزدیەکان لەناو سنوورەکانی ڕووسیاو شوێنێکی دیکەی دەوروبەری مووسڵ و چیاکانی سنجاردا دەژین. زۆربەی کوردەکان تائێستا ژیانی کۆچەری خۆیان پاراستووەو زیاتر خەریکی ئاژەڵدارین، بەشێکی کەمیشیان کە جێگیرن و کۆچەر نین، خەریکی کشتوکاڵ و پیشەسازین. کوردەکانی تورکیاو ئێران تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆیان پاراستووەو بەشێوەی هۆزو خێڵ (عەشیرەت) سەربەخۆ دەژین و، لەلایەن شێخ و ئاغاکانیانەوە بەڕێوە دەچن و دەسەلاتی دەوڵەتانی تورکیا وئێران بەسەریانەوە زۆر لاوازە.

ئەوانە بۆ دەسەڵاتدارانی تورک، هیچ کاتێك کێشەی زۆریان پێك نەهێناوە. لەلایەکی دیکەوە، پەرش‌وبڵاوی و لەیەکدابڕانی هۆزو خێڵەکانی کورد (لەناو تورکیا زیاتر لە٣٠٠ سێ سەد هۆزو خێڵ) و هەستی لاوازی نەتەوەیی‌یان، بوونەتە کۆسپی بەردەم یەککگرتنی ڕاپەڕینی کوردەکان دژی تورکیا. جگە لەوە، دەوڵەتی تورکیا توانیی کەڵك لە دوژمنایەتی کوردو ئەرمەن وەربگرێ و کوردەکان دژی ئەرمەن هان بدات. کوردەکان لە سەردەمی عەبدولحەمیددا دەوریان لە سەرکوتکردن و جێبەجێکردنی کوشتارە خوێناویەکەی ئەرمەنەکاندا بینی.

- ئینسکلۆپیدیای مێژوویی سۆڤێت، بەرگی هەشتەم، مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل٣١١-٣١٠:

کوردەکان لەکاتی خەلیفەکانی عەرەبدا دینی ئیسلامیان وەرگرت و عەرەبەکان لە بەشێکی زۆری کوردستاندا جێگیر بوون و دەستیان بە بەعەرەبکردنی دانیشتوانی کورد کرد. ئەم پرۆسەیەش (تواندنەوە) لە سەردەمی سەلجووقیەکان (سەدەکانی١٣-١١)یشدا هەر بەردەوام بوو. لە سەرەتای سەدەی ١٩وە (بەپێی پەیمانەکانی گولستانساڵی١٨١٣ و تورکمانچای ١٨٢٨، بەشێکی کوردستان کەوتە سەر خاکی ڕووسیا).

# بەختیاریەکان
# لە فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیەکانی ڕووسیدا

**- فەرهەنگی ئینسوکلوپیدیایی، بەرگی ٣، چاپی ڕووسی١٨٩١، ل٢١٤:**

بەختیاریەکان ئەو هۆزو خێڵانەن کە ژمارەیان دەگاتە ١/٢ ملیۆن کەس و لە ڕۆژئاوای ئێران لە دۆڵەکانی ڕۆژهەڵاتی هەرێمی لوڕستان و خوزستان دەژین. بنەچەو ڕەچەڵەکی بەشێکیان لە فارس و بەشێکیشیان لە کوردەکانە، بەڵام بەڕادەی یەکەم ئیحتمالی ئەوە زۆرترە کە بەختیاریەکان زیاتر لە هۆزە لوڕەکانی خزمی کوردەکان پێك هاتبن.

بەختیاریەکان موسڵمانن و بە زاراوەکانی کوردی دەدوێن و، بە وتەی ڕیچ ئەوانە کوردی هەرە ڕەسەنن (خوێن پاکترینی کوردن). بەختیاریەکان بەهێزو بەقەڵافەت، گەنم ڕەنگ و قژڕەشن، بە نێوچاوان و بەرزی پشت مل(گەردن) لە فارسەکان جیادەکرێنەوە. بەختیاریەکان گەلێکی سەرکەش و جەنگاوەرن، زۆرجار کاروانە بازرگانیەکان تاڵان دەکەن. بەڵام میواندارییە ئازادو کراوەکەیان زۆر لەو میواندارییە دروزنانەو نهێنیەکانی فارسەکان جیاوازە. لە ڕۆژئاوای ئەسفەهانەوە زەنجیرە چیاکانی بەختیاری کە بەرزترینیان عەلی جوکە(؟)و بەرزاییەکەی ٦٣٦٧ مەترەو بە لەوەڕگە بەرزو تەنگەبەرەکانیانەوە بە باشترین لەوەڕگەکانی ئێران دەژمێردرێن.

**- فەرهەنگی ئینسوکلوپیدیای نوێ، بەرگی ٥، ل٤٦١:**

بەختیاریەکان هۆزو خێڵی کۆچەری ڕۆژئاوای ئێرانو، لە دوڵەکانی ڕۆژهەڵاتی هەرێمەکانی لوڕستان و خۆزستان دەژین. بنەچەو ڕەچەڵەکی هەندێکیان فارس و،

هەندێکیشیان کوردە. ژمارەیان دەگاتە ٣٠ سی هەزار بنەماڵە، زۆربەیان موحەمەدین (موسڵمان)، بە زاراوەی کوردی دەدوێن. ئەوانە بۆ سێ هۆزی مەزن دابەش دەکرێن، پاشان ئەوانیش دەبنە خێڵ و تایفەو بنەماڵەو بەستراونەتەوە بە دەوڵەتی ئێرانەوە. بەختیاریەکان لەلایەن سەرکردەکانیانەوە بەڕێوەدەبرێن، هاوینان کۆچ دەکەن و بە زستانانیش لە دۆڵ و گوندو هۆبە و ئەشکەوتەکان (بە بیست تا سی ماڵ) دەژین. هۆزێکی بەختیاری بەناوی جامیکی تووتنەوانن و، تەواوی تووتنی هەرێمی خوزستان مسۆگەر دەکەن. بەختیاریەکان گەلێکی جەنگاوەرن، بەڵام میواندارن. پێشان هێزی سوارەی تایبەتیان لە بەختیاریەکان پێك دەهێنا. ئێستا ئەوانە چالاکییەکی زۆریان لە بزووتنەوەی مەشرووتەدا هەیەو دژی محەمەد عەلی شا ڕاپەڕیون. هۆزەکانی هەزارەی ڕۆژئاوای ئەفغانستان کە بە ڕەچەلەك مەغۆلن، هەڵگری ناوی بەختیارین (خۆیان بە بەختیاری دەزانن).

# کورد لە سەرژمێریەکاندا

شوپیڤ. مێ دەنووسێ: ژمارەی کوردەکانی ئەرمەنستان (هەرێمی ئیرەڤان) لە سەرەتای سەدەی ١٩دا دە هەزارو حەوتسەدو هەشتاوهەشت کەس بووە[٦].

بەختاد زە. ی .ل دەنووسێ: لە ١٨٨٦دا، ژمارەی کوردەکان لە پارێزگا (هەرێم)ی ئیرەڤان ٣٦٠٥ بنەماڵە بووە، زۆربەیان کۆچەر بوون[٧]. چەتۆیڤ. خ.م، بەپشت بەستن بە سەرچاوەکانی ڕووسی، دەڵێت: ١٩٠٣ لە هەرێمی ئیرەڤان ٣٧٠٦٨ کورد ژیاون، کە ٦٤٦١ لە ناوچەی ئەچمیادزین و ١٥١٥ کەس لە سورمالین و ٣٩٦٢ کەس لە ئەلیکساندەرپول و١١٤٩٣ لە هەرێمەکانی ئیرەڤان و نەخچەوان و ٢٧,٤٪یان نیشتەجێ و ٧٢,٦٪یان کۆچەر بوون. بۆ سەرەتای سەدەی داهاتوو دەتوانین بڵێین ٣/٤ی کوردی هەرێمی ئیرەڤان ژیانیان بە کۆچەری دەگوزەرێنن[٨]. بۆ سەرەتای یەکەمین جەنگی جیهانی دانیشتوانی کوردی هەرێمی ئیرەڤان ٤٠١٥٩ (جگە لە ئازەربایجان و گورجستانی ئەمڕۆ، هەورامی) کەس دەبن کە ٦٨,٥٪یان کۆچەری بوون و لەم شوێنانەدا ژیاون:

١. ناوچەی ئەلیکساندرەپول (لە ١٢ گوند و شوێن).

٢. ناوچەی شارئورادارال گیز (لە ٣گوند و شوین).

٣. ناوچەی ئەچمیادژین (لە ٥٧ گوندو شوێن).

٤. ناوچەی نەخچەوان (لە ٥٧ گوندو شوێن).

٥. ناوچەی نوڤار بایەزید (بائێزدی نوێ) (لە ٦ گوند یا شوێن).

---

[٦] چەتویڤ. خ. م، کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی١٩٢٠-١٩٤٠، ئیرەڤان، ١٩٦٥، ل١٢.

[٧] هـ. س، ل٢٠.

[٨] هـ.س، ل٢٤.

٦. ناوچەی سورمالین (لە ٩٩ گوندو شوێن).

٧. ناوچەی ئیرەڤان (لە ٣٥ گوندو شوێن) کە سەرجەم لە ٢١٣ گوندو شوێن ژیاون[٩].

کەچی وەك لە سەرژمێریەکانی دیکەدا دەبینین، ژمارەی کوردەکان پاش سەد ساڵ لە ئەرمەنستان زیادی نەکردووەو، لە زۆربەی ئەو گوندو شوێنانەی سەرەوەدا هەر بەیەکجاری بنبڕکراون و، ناوی گوندەکانیشیان وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، لە سەرەتای یەکەمین جەنگیی جیهانیدا ٤٠١٥٩ بووە[١٠].

ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەنی، بەپێی سەرژمێریەکانی سۆڤێتی و ئەرمەنی، لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا کۆتایی ئەم سەدەیە، لانی کەم چوار ئەوەندە زیادی کردووە، کە دەبێ ژمارەی کوردیش هەر لەم وڵاتە (ئەرمەنستان)دا ئەوەندە زیادی کردبایەو، ئێستا لانی کەم ١٥٠ هەزار کورد لەم وڵاتەدا بژیایە. بە هەمان رێژە کوردی ئازەربایجان و گورجستان و تورکمەنستانیش، دەبێ شان بەشانی ئەو گەلانەش زیادیان کردبێ، گەرچی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە لێرەدا بەراوردکردنی ژمارەی کوردەکان لەگەڵ دانیشتوانی ئەوکۆمارانەدا نییە کە کوردو نیشتمانەکەییان بەسەردا دابەش کراوە. ئەمەش کارێکی گران نییە، چونکە چەندین جار لە یەکێتیی سۆڤێت سەرژمێری کراوەو، دیارە ژمارەی ئەو کۆمار و گەلانە چەند زیادیان کردووەو بۆچی ژمارەی کوردەکانیان کەم نووسیوە؟ وەڵامی ئەمە زەحمەت نییە. کورد بەدرێژایی دوو سەدە، لە سەردەمی چ ڕووسیاو چ سۆڤێتدا، لە وڵاتەکەی خۆی دەرکراوەو تونێدراوەتەوەو قەوارەی نەبوە. واتە گەلێك ناسنامەی نەبێ و حاشای لێ کرابێ، ژمارەی بە کەم نووسراوەو بە دوو

---

[٩] هـ. س، ل٢٧.

[١٠] ئەرمەنیەکان و هەندێ لە بەکرێگیراوە بەناو کوردناسەکانی کورد دەنووسن: پاش یەکەمین جەنگی جیهانی ژمارەیەکی زۆر کوردی تورکیا پەنایان بۆ ئەرمینیا بردووە. بەقسەی ئەوانە بێ، دەبێ کورد چەند ئەوەندە زیادی کردبێ، کەچی لەماوەی چەند ساڵدا نزیکەی سێ ئەوەندە کەمیان کردووە.

نەتەوەی جیاوازی کوردو ئێزدی، موسڵمان و ناموسڵمان، کۆچەریو نیشتەجێ، یەنابەرو ناپەنابەر، بە دابەشکراوی (کوردی ئەرمەنستان وئازەربایجان وجۆرجیا)و، سەرئەنجام بە کوردی ڕووسیا یا پشت قەفقاس یا کوردی سۆڤێتی نووسراوە، یا بەپێی خێڵ و هۆز، یا هەندێ جار نووسراوە کوردی سەر بە تورکیا یا ئێران، یا لە باری چینایەتی و کۆمەڵایەتی و زاراوەیی... بە جیاجیا وتارو لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئامادە کراوە؛ بەبێ ئەوەی پێشینەی مێژوویی‌یان ڕوون بکرێتەوەو، وەك کێشەیەکی سیاسی، مرۆڤایەتی، جوگرافیایی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بەتایبەت پاش ئەوەی لە سەردەمی ستالیندا بەزۆر بۆ کازاخستان و سیبریاو ئاسیای ناوەڕاست گواسترانەوە. ئیتر باسی ڕێژەی کوردی ئەو کۆمارانە کراوە. ئەمانە هەمووی بۆ یەك مەبەست بووە: کێشەیەك نەبوە بەناوی کێشەی کوردی ڕووسیا یا سۆڤێت یا ئەو کۆمارانەی کە کوردیان بەسەردا دابەش کراوە. واتە کورد وەك ژمارەیەکی کەم یا وەك کەمەنەتەوە لەو کۆمارانەدا، بەبێ هیچ شتێکی هاوبەش کێشەیەکیان نەبوەو لەیەکتر دابڕاون. دەسەڵاتدارانی ڕووس و سۆڤێت و کۆمارەکانی دیکە هەنگاوێکی ئەوتۆیان بۆ یەکخستنەوە و ناساندنی ئەم گەلە هەژارە نەناوە. ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری... یان بۆ پێك نەهێناون. هەرچەندە ئەرشیڤەکانی کۆماری ئەرمینیاو ئازەربایجان تائێستایش بۆ غەیرە ئەرمەنی و غەیرە ئازەری، بەتایبەت بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی داخراون. بەڵام هەندێك بەڵگە لەمەولا ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ پەردە لەسەر گەلێك تاوانی دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی بەدرێژایی سەدەکانی ۱۹و ۲۰ بەرامبەر بە گەلی کورد لادەدەن.

گەرچی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەیان، بەبێ بەڵگەو دیکۆمێنت لای کوردانی ژێردەستی شاراوە نین. کوشتن و ڕاونانی کوردو دەست بەسەرداگرتنی زەوی وزاری کوردو هێنانی خەڵکی ئەرمەن لە وڵاتانی دیکەو جێگیرکردنیان لە گوندو ناوچە کوردنشینەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە دەکەونە قەدپاڵ یا داوێنی چیای ئاگری (ئارارات)و، دابەشکردنی کورد لە باری ئولیەوە (زنییەوە) بە کورد

(موسوڵمان)و (ئێزدی)و دەرپەڕاندنی کوردی موسڵمان بۆ ئازەربایجان و ئێران و تورکیاو، سەرئەنجام بەئەرمەنی کردنیان و، بوارنەدانیان بە گەشەدان بە زمان و کولتووری خۆیان و گۆڕینی ناوو نەتەوەو... سیاسەتێکی ڕۆژانەو هەمیشەیی دەسەڵاتدارانی ئەرمەن بووە تا ئەمڕۆیش هەر پێڕەوی دەکەن. چەتۆیڤ، نووسەری کتێبی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی، سەرەڕای هەندێ پێداهەڵگوتن بە شان‌وباڵی دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی و ئەرمەنیدا (بەبێ ئەوەیش نەدەکرا کتێبەکەی بڵاوبێتەوە) هەندێ زانیاری و بەڵگەی گرنگمان بەدەستەوە ئەدا. دیارە هەوڵی زۆری داوە، تا ئەو جێگایەی کە بواری پێدراوە، بەڵگە لە ئەرشیڤەکانی ئەرمەنستان دەست بخات. جگە لەو بەڵگانەی کە ئاڤیریانوۋ لەم بارەوە لە کتێبەکەیدا"کورد لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ ئێران و تورکیادا" هێناونیەوەو دەری دەخەن کە هەر بە داگیرکردنی پشت قەفقاس لەلایەن ڕووسیاو دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجی تەنگیان بە کورد هەڵچنیوە. ئەرمەنی دەست پێشخەری تێکدانی پێکەوەژیانی کوردو ئەرمەن بووە، واتە هەشتا تا سەد ساڵ بەر لەوەی ئەرمەن لە تورکیا بکەوێتە بەر شاڵاوی گرتن و کوشتن و ڕاونان. بەداخەوە نووسەرە ئەرمەنیەکان زۆربەیان کورد بە بەشداری تاوانەکانی ڕژێمی تورکیا دژی ئەرمەن لە شەڕی جیهانی یەکەمەوە دەزانن، کەچی باسی تاوانی دەسەڵاتدارانی خۆیان بەرامبەر بە کوردەکانی ژێردەستیان ناکەن.

چەتۆیڤ، بەپشت بەستن بە ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەت مێژووی کۆماری ئەرمەنستان دەنووسێ"لە دیکابری١٨٧٠دا دەوڵەت، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە زەویەکانی دەشتی ئاراس زستانەهەواری دانیشتوانی کوردن، بەکرێ دەیاندەن بە ژینراڵ کاخەنوڤی سەرۆکی بەشی پۆستی ناوچەی قەفقاسو پێشنیار بە کوردەکان دەکات کۆچ بکەن بۆ زەویە بێ‌ئاوەکانی نێوان ئاراراتی بچووك و گەورە. بەڵام کاتێك کوردەکان ئامادەنابن بۆ ئەو شوێنانە کۆچ بکەن، بەبێ دەستووری سەرۆکی ناوچە (مودیری ناحیە)ی ئەچمیادزین، ٧٢ ماڵی هۆزی ڕادیکانلی کورد کاول دەکەن. جگە لەوە، مۆڵەت بەو کوردە زیان‌لێکەوتوانەیش

نادەن بۆ هاوینەهەواری ئاگمەگان (بائێزدی نویٚ) کۆچ بکەن. کوردەکان کە لەوەرگەکانی زستانەهەوارو هاوینەهەوارەکانیان بیٚبەش دەبن، دەپرسن: (چی لە بنەماڵەکانی خۆمان بکەین و لەکویٚ ئاژەڵەکانمان بلەوەڕێنین؟). پارێزگاری ئیرەڤان لە وەڵامی ئەم سکالاّیەی کورداندا، بیٚشەرمانە پێیان دەڵیٚ: ئەو، دەستووری وێرانکردنی ماڵەکانیانی داوەو، بەداخیش نییەو، ئامۆژگاری کوردەکانی هۆزی ڕادیکانلی دەکات بڕۆن بۆ ئێران یا تورکیا. بەم چەشنەو بەم ڕێژەوە دەسەلاّتدارانی دەوڵەتی لەسەر خاکەکەیان دەریان دەکەن[11]. تەنانەت کاربەدەستی دەوڵەتی ڕووسیای قەیسەری وەك ئاڤیریانۆڤ، باسی هەژاری و خراپی باری ئابووری دانیشتوانی کوردو هەژاری گشتی دانیشتوانی کوردی کردووە. لە کتێبی "پیشەسازی دەستی لە قەفقاس"دا، سەبارەت بە کورد نووسراوە: بۆ ئەوەی کوردەکان خێزانی خۆیان بەخێوبکەن تا ٨٧,٣٪ی پیاوانیان ئامادەی کارکردنن و، لەملاو لەولا بەدوای کاردا دەگەڕان و، لەلایەن خەڵکی دیکەوە بۆ شوانیو درەوکردن بەکریٚ دەگیران و، خوێیان لە کولپییەوە بۆ ئەلیك نەرەپول و ئەچمیاندین و تالیش دەهێنا. هەروەها حەمباڵی و ئاوکێشانیان لە کولپی و تفلیس دەکردو، لەلایەن خەڵکی دیکەوە بە ڕەنجبەری و نۆکەری بەکریٚ دەگیران[12].

نازانم ئەوە تا چ ڕادەیەك ڕاستە. دوو کەسی ئاشنای کوردی جورجیایش بۆیان گێڕامەوە کە سەردەمی سۆڤێتیش٩٠٪ی حەمباڵەکانی کۆماری جۆرجیا کورد بوون. لە کۆنگرەی دووهەمی شووراکانی ئەرمەنستاندا دیسەمبەری ١٩٢٣، جانویان. ك. چ نوێنەری کوردەکانی ناوچەی سی ئەلیك نەرەپول دەڵێت: (ژمارەیەکی زۆری کورد بەهۆی تێکهەڵچوون و ئاژاوەی نێوان نەتەوەکانەوە ناچار بوون خاکی ئەرمەنستان بەجیٚبهێڵنو کۆچ بکەن. بە سەقامگیربوونی دەسەلاّتی سۆڤێتی لە ئەرمەنستان، دانیشتوانی کوردیش بە کەڵك وەرگرتن لەو ئازادییە

---

[11] چەتۆیڤ سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

[12] هـ. س، ل٢٥.

بواريان بۆ ڕەخسا بگەڕێنەوە بۆ ئەم كۆمارە) (ئەمەش ڕاست نييە. سەرچاوەكانی سەرژمێری ئەرمەنستانی سۆڤێتی و يەكێتی سۆڤێت، كە پێشتر باسمان كردن، نيشانەی ناڕاستيی ئەوەن، هەورامی). چەتۆيڤ، هەر بەپشت بەستن بە كتێبی"گەلانی ئاسيای پێشەوە"ی بڵاوكراوەی ئاكاديميای زانستی يەكێتی سۆڤێت چاپی مۆسكۆ، ١٩٥٧، نووسيويە:((... تا كاتی دروستبوونی كۆماری توركيا، لە هەندێ هەرێمی ئەنادۆڵ نزيكەی ٣ مليۆن ئەرمەنی و كوردو ئاسووری لەناوبران)). سەرەڕای ئەوە، گەلانی ناوبراو لەكاتی تەنگانەدا يارمەتی يەكتريان داوە. عەبدولعەزيزی يامولكی نووسيويە: ((ئەگەر هەندێ ئەرمەن لە ئەنادۆڵ مابن، يا لە مردن ڕزگاريان بووبێ، لەبەر ئەوە بووە كە ٣/٤ی لەلايەن كوردانەوە ڕزگار كران و حەشاردران)). چەتۆيڤ ئاماژە بە سەرچاوەيەكی ئەرشيڤی كۆماری جورجيا كردووەو، وتوويە: ئەرمەنێكی زۆريش ساڵانی يەكەمين جەنگی جيهانی لەلايەن كوردانی دێرسيمەوە ڕزگاركران[١٣]. عەبدا بەكيان نووسيويە: هۆزە كۆچەرە كوردەكان تا ساڵی١٨٤٠ ماڵياتی سەرانەو سروشتييان دەدا، بەڵام لە١٨٤٢ بەدواوە لەباتی ماڵياتی سروشتی پارەيان دەدا. سەربارى ئەوەی كە هۆزە كۆچەرەكانی كورد كەڵكيان لە ڕێگەوبان و قوتابخانەو... وەرنەگرتبوو، دەبوو ئەوان ماڵياتيان بدايە كە هەميشە بەرەو زيادبوون دەچوو. ئەگەر بنەماڵە كوردەكان تا ساڵی١٨٦٠ ٧ تا ٨ ڕۆبڵ ماڵياتی سەرانەو زەوی و ئاژەڵيان دەدا، سەرەتای ١٨٦٢ ئەم ماڵياتەيان بۆ دوو ئەوەندە زيادكردووە[١٤].

٢٣ی ئۆگۆستی ١٩١٧، نوێنەری كۆميتەی تايبەتی پشت قەفقاس لە ناوچەی ئەچميادزين، برووسكەيەكی لە ئاشتاركەوە بۆ تفليس كردووەو وتوويە: ((لە گەشتە سەركوتكەرانەكەدا، تەواوی ئاژەڵی خەڵكی ئاسايی و بێتاوانی ناوچەكە، كە زۆربەيان هی كوردەكان بوونو پتر لە دەهەزار سەر دەبوون، بە تالان بران.

---

[١٣] چەتۆيڤ، سەرچاوەی ناوبراو، ل٤٠.

[١٤] عەبدال بەكيان خ، ئا، كێشەی زەوی لە ئەرمەنستانی ڕۆژهەلات (١٩١٧-١٨٠١)، ئيرەڤان، ١٩٥٩، ل٤١٦-٤١٧ (بەزمانی ئەرمەنی).

کۆمیتەی سەربازانی ئەو هێزە گەیشتووە بڕیاری دا ئاژەڵەکان بە سەربازەکان بفرۆشن. زۆربەی دانیشتوانی ئاسایی کورد بەم چەشنە نەك هەر بێبەش کراون، بەڵکوو سەرو سامانیشیان بە تالآن براوەو ژیانێکی هەژاری و ئاوارەیی دەژین و لەناو کوردەکاندا برسێتی[١٥]. بڵاوە (پاڵپشت بە ئەرشیڤی مارکسیزم ـ لینین سەر بە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی کۆماری ئەرمەنستان). کەچی گەلێك نووسەری ئەرمەن، بەپێچەوانەی بەڵگەی ئەرشیڤەکانی خۆیانەوە، هەر لە ڕێگری و دزی و تالآنی کوردان دەدوێن. لە ڕاپۆرتی شووورای کۆمیسەرەکان (شووورای وەزیران)ی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤێتیدا ١٩٢٠-١٩٢٢ هاتووە، کە: (( لە یەکەم ساڵەکانی سەقامگیربوونی دەسەڵاتی سۆڤێتیدا لە ئەرمەنستان، باری ئابووری و تفاق و کشتوکاڵ ئەوپەڕی دژوار بووە. دژواری بارودۆخەکە، بەتایبەتی پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە جگە لە دانیشتوانی ناوچەکە، سەدوچل هەزار جووتیاریش لە ناوچەی سورمالین و هەرێمی قارسەوە بەرەو ئەوێ کۆچیان کردبوون، زیاتر لە سەدهەزار کەس لە گەلانی دیکە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ڕژێمی داشناکەکاندا جێوڕێی خۆیان بەجێ هێشتووەو ئاوارە بوون))[١٦].

کاتی هێرشی سوپای تورك ١٩١٨-١٩٢٠ بۆ سەر قەفقاس‌و داگیرکردنی بەشێك لە خاکی ئەرمەنستان، کە هەوڵی لەناوبردنی دانیشتوان و داگیرکردنی خاکەکەیی دەدا، مانگی مایسی ١٩١٨ سوپای تورك تەواوی ئەو پیاوانە کە لە تەمەنی کارکردندا بوون لە ١٢ گوندی کوردنشینی ناوچەی ئەلیك نەرەپول کۆیان کردنەوەو بردیاننە تورکیا. لەوانە تەنیا تاك و تەرایان گەڕانەوە، ئەوانیش زۆری پێنەچوو لەبەر نەخۆشی مردن‌و، هەر لە گوندێکی بچووکی کوردنشینی پامب، تورکەکان هەشتا کوردی ئێزدییان لەگەڵ خۆیاندا برد.

---

[١٥] چەتۆیڤ، سەرچاوەی ناوبراو، ل٢٩.
[١٦] هـ. س، ل ٤٥.

لە کتێبی "پێشکەوتنی ئابووری ئەرمەنستان" وەرگیراوە، بەشی یەکەم نووسینی تومانیان. ئو. ی، چاپی ئێرەڤان، ١٩٥٤.

له شەڕی دەوروبەری (سەردارئاباد)دا مانگی مایسی ١٩١٨، ئەرمەن و کورد کە ژمارەیان چوار هەزار کەس و نزیکەی حەوتسەد کەسیان کورد بوون، قارەمانانە بەرەنگاری تورکەکان بوونەوە[١٧]. خاتوو ئاریستوڤا کە بۆ خۆی چارەکە سەدەیەك خەریکی لێکۆڵینەوە بووە لەسەر کوردەکانی سۆڤێت و سەردانی ناوچە کوردنشینەکانی پشت قەفقاسی کردووە، سەبارەت بە ڕێگەوبان و ئامرازی هاتوچۆو پەیوەندی کوردەکانی پشت قەفقاس نووسیویە:

((کوردەکان لە ناوچە کوێستانی و بڵندەکانی پشت قەفقاس، بەتایبەت ئازەربایجان، دەژین. تا شۆڕشی سۆشیالیستیی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ و لە ساڵانی سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی سۆڤێتدا، ڕێگەی هاتوچۆی عەرەبانەیان نەبوە. تەنیا تووڵەڕێ و کوێرەڕێگەکان هەبوون و، هەر مرۆڤ و لە هەندێکیشیاندا بە ئەسپ دەتوانرا هاتوچۆیان پێدا بکرێ و، گوندەکان و ناوچەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە. زۆربەی ئەو تووڵەڕێیانە هێندە سەخت و شاخاوی بوون، زۆرجار سوار ناچار دەبوو دابەزێ. هەتا هەرەس و لافاویش کە لە چیاکانەوە سەرەوخوار دەبوونەوە، بەتایبەت لە ناوچە شاخاویەکاندا، بۆ ماوەیەکی زۆر ڕێگەی هاتوچۆی ئەم گوندانەی دەگرت. ڕووباریش پێویست بوو پێیدا بپەڕنەوە. گوندەکانیان دەکەوتنە ناو چیاکان. بۆ وێنە، گوندەکانی ئوروجلو، ئاغجەکەند، سویوغبولاق لە ناوچەی کەڵباجاڕ، کە لە باکوورەوە زنجیرە چیای موراڤداغ و لە باشوورەوە قەرەباغ و لە ڕۆژئاواوە چیاکانی ئالاگیز دەورەیان دابوون، بە هیچ شێوەیەك هاتوچۆیان تێدا نەدەما. ناوچەی لاچینیش، بەهۆی چیاکانی قەرەباغەوە، لە ناوچەی کەڵباجاڕ دادەبڕا.

کورد تا شۆڕشی ئۆکتۆبەرو، بگرە ساڵانی بیست و سەرەتای سییەکانیش، لەم چەشنە گوندە سەختەنادا بوون و، مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك پێی نەدەکرا خۆی بگەیەنێتە کەڵباجاڕ. وەك بوکشپان وتوویە: نەك تەنیا ڕۆیشتن بۆ ئەوێ زەحمەتە، بەڵکوو بۆ کوردەکانی قەفقاس پڕمەترسیش بوو (ل١٠٤). دووهەزار بنەماڵەی

---

[١٧] هـ. س، ل٣٠.

کورد ساڵی ١٨٨٦ لە هەرێمی ئیرڤان زەوییان نییە، بەڵام دوای دوانزە ساڵ ئەم ژمارەیە دەگاتە ٥ هەزار بنەماڵە (ئاریستۆڤا، ت. ف، کوردەکانی پشت قەفقاس، ل٥١).

ئەگەر هەر بنەماڵەیەك تێکڕا ٥ کەس بووبێ، واتە ٢٥ هەزار کوردی تێدا نیشتەجێ بووە، جگە لەوانەی کە خاوەن زەوی بوون، ئەویش هەر لە هەرێمی ئیرڤان. ئەمە بەدەر لە ئازەربایجان و جۆرجیا. هەروەها زۆربەی کوردەکانی ئەوێ ئاژەڵدارییان کردووە، نەك زەویداری و کشتوکاڵ. لەبەرئەوە سەرژمێرییەکی گشتی ئەودەمە لەبەردەستدا نییە، تا بزانرێ ژمارەی گشتی کوردەکانی ئەرمینیا چەند بووە. سەرەڕای ئەوە، وەك لە گەلێك سەرچاوەدا هاتووە، ئەم سەرژمێرییە پاش تەواوبوونی شەڕەکانی ڕووسیاو تورکیایە کە سەروبەند و دوای شەڕەکان ژمارەیەکی زۆر کوردی ئەو هەرێمە بەهۆی جۆراوجۆرەوە کۆچباری تورکیا بوون. بەڵام دەبینین ژمارەی کورد لە سەدەی بیستەمدا لەو کۆمارەدا زۆرجار لەوە کەمتر نیشان دراوە، لەکاتێکدا ژمارەی زۆربەی گەلان لەماوەی سەد ساڵدا ٦ تا ١٠ قات زیادی کردووە، لەلایەکی دیکەوە، ئەوە دەگەیەنێ کە دەست بەسەر زەوی ئەو سێ هەزار ماڵەدا گیراوە کە بێگومان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بووە[١٨]. کوردەکانی ئەرمینیا لە بەهاران و هاویناندا گەرمیان و کوێستانیان کردووەو، بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان کۆچیان کردووە بۆ لەوەڕگەو هەوارگەکانی چیای ئاگری (ئارارات) و لە پایزو زستانانیش هاتوونەتەوە بۆ دۆڵەکان و دەشتەکانی لێواری ڕووباری ئاراس.

پاش داگیرکردنی هەرێمی قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە، زۆربەی هەوارگەو لەوەڕگەکان لەلایەن کاربەدەستانی ڕووسیاوە، بەتایبەت ئەفسەرو ژەنراڵەکانیان،

---

[١٨] بەپێچەوانەی زۆر بۆچوونی چەوت و سەر بە دەسەڵاتدارانی ئەرمینیا کە زۆربەیان بۆ پاکانەکردنی ئەم تاوانە گەورانە و سڕینەوەی بوونی کورد نووسیویانە: لەلایەن ئاغاو شێخ و دەرەبەگی کوردەوە داگیرکراوە، ئەی باشە دەسەڵاتدارانی ئەرمینیا لەکوێ بوون؟! لەلایەکی دیکەوە بەڵگەی زۆر بەدەستەوەیە کە ئەم ئەرزانەی کورد دراون بە ئەرمەنیەکانی هەم پێش یەکەمین جەنگیی جیهانی، واتە هی کاتی شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ تورکیاو ئێراندا لە سەدەی نۆزدەهەمداو، هەم هی پاش دووهەم جەنگی جیهانی کە لە تورکیا و ئێران وڵاتانی تر هەڵاتوون.

دەستیان بەسەردا گیراوە و، ئەگەر پێشان ئاژەڵدارانی کورد کرێی هەوارگەو کانییان دەدایە ئاغاو شێخ و دەرەبەگەکانی کورد، یا بێپارە بووە، ئەمجارە دەبوایە بیاندایە بە کاربەدەستانی ڕووسیا، ئەویش بە چەندایەتییەکی زۆرترو حەتمی و بە ڕێکوپێکی لێیان وەرگرتوون. بۆ وێنە، کوردەکانی گاگورین دەبوایە بۆ هەر ئاژەڵێکی شاخداری گەورە ۱۰ کەپیك و بۆ هەر پەزوو مەڕێك ۳ کەپیکیان لە مانگێکدا بدایە بە ژەنراڵ کاخانوڤی ڕووسی (هـ. س ل٥٥).

کەڵخۆزەکانی کورد لە کۆماری ئەرمینیای سۆڤێتی، زۆربەیان لە ناوچەکانی ئاپاران و تالینن. کەڵخۆزەکانی دیکە، کە جگە لە کورد لە نەتەوەکانی دیکە پێك هاتوون، لە دۆڵەکانی ئارارات، واتە لە ناوچەکانی ئەچمیادزین و ئوکتمبریانن. لە ئازەربایجانیش، کەڵخۆزەکانی کورد لە ناوچەکانی کەڵباجاڕو لاچینن. کەڵخۆزەکەکانی تر، کە جگە لە کورد نەتەوەکانی دیکە کاریان تێدادەکەن، لە ناوچەکانی قوباتلی و زەنگیلانن (بڕوانە: خشتەکانیان کە لەنێوان ۱۹۵۹-۱۹۵۷دا ئامادەکراون (هـ. س، ل٦٤).

ئاستی خوێندەواری نەتەوە هەرەگەورەکانی کۆماری ئەرمینیا لە ۱۹۳۹ و ۱۹۵۹دا

| تەواوی دانیشتوانی شارو گوندنشین | لە هەر هەزار کەس ئەوەندە کەس خوێندنی باڵاو ناوەندی و هەروەها خوێندنی ناتەواوی ناوەندییان هەیە | | |
|---|---|---|---|
| | ساڵی ۱۹۳۹ | ساڵی ۱۹۵۹ | |
| | تەواوی دانیشتوان | تەواوی دانیشتوان | ئیشیان هەیە |
| پیاو/ ئەرمەن | ۱۱٦ | ۳۳٤ | ٥٥۱ |
| ژن/ ئەرمەن | ٦۷ | ۳۰۸ | ٥۲۱ |
| پیاو/ ئازەری | ٦۱ | ۳۰۷ | ٥٤۰ |
| ژن/ ئازەری | ۹ | ۱۷۷ | ۳۳٦ |
| پیاو/ ڕووسی | ۱٤٥ | ۳٥۳ | ٥۲٥ |
| ژن/ ڕووسی | ۱۱٥ | ٤۷۳ | ٥٦٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| پیاو/ کورد | ٢٤ | ١٠٧ | ١٩٧ |
| ژن/ کورد | ٢ | ٢٥ | ٤٦ |
| پیاو/ ئاسوری | ٨٢ | ٢٣٨ | ٤٣٣ |
| ژن/ ئاسوری | ٣٤ | ١٦٩ | ٣٠٠ |

ئەم خشتەیە گەلێك ئەنجام بەدەستەوە دەدات، بەلای خۆیەوە بارودۆخی کوردەکانی ئەرمەنستان لە هەموو کومارەکانی دیکەی سۆڤێتی پێشوو باشتر بووە. گوایە لەوێ هەموو مافێکی هاوولاتییان هەبوە. جگە لەوە، گوایە قوتابخانەو ڕۆژنامەی کوردییان هەبوە. بەلاّم ئەم خشتەیە پێچەوانەی وتەکانە، وەك دەبینین ڕێژەی کورد لە باری خوێندەوارییەوە لە هەموو گەلانی دیکەی ئەو کۆمارە کەمترەو، ئاستی خویندەواری بەرزیان یەکجار کەمەو زۆرتر ئەوانە دەگرێتەوە کە خوێندنی ناوەندییان تەواو نەکردووە. ئیتر باسی کوردە بەزۆر ڕاگوێزراوەکانی دیکە لە کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و سیبیریا ناکرێ، کە تەنانەت دەرفەتی خوێندنی سەرەتاییشیان بۆ هەڵنەکەوتووە. خوێندنی کوردەکان بە زمانی ئەو کۆمارانەیە کە تێیدا دەژین و، بە زمانی کوردی ١٪ ناگرێتەوە. هەروەها کوردەکان نەیانتوانیوە لە پەیمانگەو زانکۆو ئاکادیمیە ناودارەکان بخوێنن، بۆ ئەوەی سبەینێ ئیش‌وکاریان لە دام‌ودەزگا دەوڵەتی و حیزبی و دیپلۆماسی و لەشکری و... بدرێتێ. کورد کە لە ڕوانگەی دەسەلاّتدارانی کریملینەوە، گومانلێکراوو... بووەو دوورخراوەتەوەو قەوارەو ناسنامەی لێ سەندراوەتەوەو لە ولاّتەکەی خۆی دەرکراوە، ئەگەر ئاستی خوێندەواریی بەو چەشنە بووبێ کە لەم خشتەیەدا هاتووە، چۆن لە کۆمەڵگەی خۆی یا سۆڤیتیدا پێش دەکەوێ و چ دەورێکی دەبێ. لەکاتێکدا پرژوبلاّو و دابەشکراوو سەدان و هەزاران کیلۆمەتر لەیەك دوور و بێ‌پەیمانگەو بێ‌چاپەمەنی و بێ‌ڕێکخراو بووە!

سەرژمێری گشتیی یەکێتیی سۆڤیت، بەرگی ٥، ل١٠٧-١٠٧:
ژمارەی کوردی سۆڤێت بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ی ئەم ولاّتە

| شوێنی نیشتەجێی کوردان لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤێت | ژمارەیان | | زمانی زگماکی | | زمانی دووەمیان کە بەئازادی قسەی پێدەکەن (ڕووسی) |
|---|---|---|---|---|---|
| | هەمووی | نێرینە بەپێی % | سەر بە نەتەوەی خۆی بەپێی % | زمانی ڕووسی بەپێی % | |
| کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ئەرمینیا | ٥٦١٢٧ | ٥٠,٨ | ٧٩,٧ | ٠,٦ | ٦,٥ |
| ك.س.س جۆرجیا (گورجستان) | ٣٣٣٣١ | ٤٨,٥ | ٧٤,٧ | ١٢,٣ | ٢٦,٢ |
| ك.س.س. ئازەربایجان | ١٢٢٢٦ | ٥٠,٣ | ٦٥,٢ | ٠,٣ | ٦,٧ |
| ك.س.س کازاخستان | ٢٥٤٢٥ | ٥١,٠ | ٩٥,٣ | ٢,٨ | ٦٢,٥ |
| ك.س.س قرقیزستان | ١٤٢٦٢ | ٥٠,٦ | ٩٧,٣ | ١,٠ | ٥٩,٦ |
| ك.س.س تورکمەنستان | ٤٣٨٧ | ٥١,١ | ٣٩,٣ | ١٤,٦ | ٤٩٥ |
| ك.س.س ڕووسیا | ٤٧٢٤ | ٥٨,٩ | ٨٠,٥ | ١٢,٦ | ٦٢,٦ |
| ك.س.س ئۆزبەکستان | ١٨٣٩ | ٥٢,٦ | ٨٤,٨ | ٥,٤ | ٥٣,٥ |
| ك.س.س ئەستوانیا | ١٣ | ٧٨,٩ | ٦١,٥ | ٣٠,٨ | ٦١,٥ |
| ك.س.س ئۆکرانیا | ٢٣٨ | ٦٣,٤ | ٥٦,٥ | ٣٢,٤ | ٤٧,٥ |
| ك. س.س لیتوانی | ٣ | ١٠٠ | ٦٦,٧ | – | ٣٣,٣ |
| ك.س.س لاتیڤیا | ١١ | ٧٢,٧ | ٢٧,٣ | ٥٤,٥ | ٢٧,٣ |
| ك.س.س تاجیکستان | ٥٨ | ٥٨,٩ | ٧٤,١ | ٢٠,٤ | ٦١,١ |
| ك.س.س بیلەڕووسیا | ٦٦ | ٦٢,١ | ٣٦,٤ | ٣٣,٣ | ٥٤,٥ |
| ك.س.س مۆڵداڤیا | ٩ | ٥٥,٦ | ٤٤,٤ | ١١,١ | ٦٦,٧ |
| **کۆ** | **١٥٢,٧١٧** | | | | |

*** کوردی شارنیشین ٦٠٢٧٦ و کوردی گوندنشین ٩٢,٤٤١.**

** بەپێی سەرژمێریەکان لە ٣٣٣٣١ کوردی کۆماری جۆرجیا ٣٠٢٩٩ کەسیان لە شاری بتلیس دەژین (نیشانەیە بە گواستنەوەی کورد لە گوندو شوێنەکانی خۆیان، واتە لەسەر سنوورەوە بۆ ناوەند).

*** لە شاری باکۆ بەپێی هەر ئەم سەرژمێرییە ٢٦٨ کورد دەژین (لە شاری باکۆ دەبێ باسی لەسەدا چەندی دانیشتوانی ئەم شارە بکرێ کە کوردن).

**** کورد لە کازاخستان چەند ئەوەندەی ئەم سەرژمێرییە دەبن.

کوردەکانی پشت قەفقاس کە هێشتا نەکەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ڕووسیا، بە بەڵینێکی زۆری کاربەدەستانی ڕووسیا، سەرئەنجام کەوتنە چوارچێوەی ئەم ئیمپراتوریە. بەڵام بەپێچەوانەی بەڵێنەکانی ڕووسیاوە کە گوایە بارودۆخیان لە کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان باشتر دەبێ و خاوەن مافێکی یەکسان لەگەڵ گەلان و نەتەوەکانی دیکەی ئەم ئیمپراتۆریە دەبن و دەسەڵات و نیوچە سەربەخۆییەکەیان دەپارێزرێ، بەو دەردەی بردن کە ئەنجامەکەمان بینی، بەتایبەت وەك لە کتێبی "کورد لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ ئێران و تورکیادا" هاتووە. بەسەر دەسەڵاتداریێتی ئازەری و ئەرمەنیو جۆرجیدا دابەش وکران و تووشی ڕاونان و دەرکردن بوون. پاش یەکەمین جەنگی جیهانی کە موساواتیەکانی ئازەربایجان و داشناکەکانی ئەرمەنستان و مینشەویکەکانی جۆرجیا سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند، بەهەمان شێوەی ئیمپڕاتۆریی ڕووسیا بەڵێنی زۆریان بە کوردەکان داو، تەنانەت بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان دەستەی چەکداریشیان لێ پێك هێنان. بەڵام بەرەبەرە ئەوانیش کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیانیان بەوپەڕی ڕەگەزپەرەستییەوە تووشی هەموو چەشنە چەوسانەوەو دەرکردن و تواندنەوەیەك کرد. داشناکەکان کوردیان دژی تورکیا بەکار هێناو، بگرە لە شەڕی ساڵی ١٩٨٨ی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجاندا لەسەر ناگۆرناقەرەباغ، لە دوو بەرەی جیاوازو دژ بەیەکدا کەڵکیان لێ وەرگرتن یا ناچاریان کردن شەڕ بکەن و، زۆربەیشیان بەهۆی بەڵینی (وەك دروستکردنەوەی کوردستانی سوورو گەڕاندنەوەی کوردەکان بۆ جێ‌وڕێی خۆیان) تێکەڵ بەو

شەڕە کران و زیانێکی گیانی زۆریان لێ کەوت. پاشانیش کە بەلشەویکەکان لە قەفقاس دەسەڵاتیان گرتەدەست، کوردەکان لەبەر بەڵێن و بانگەوازی فریودەرانەیان هاوکاریی زۆریان کردن، تا دەسەڵاتی سۆڤێتی سەقامگیر بوو، تەنانەت هێزی چەکداریشیان لێ پێك هێنان. چەتۆیڤ بەپشت بەستن بە هەندێ بەڵگەی ئەرشیڤی نووسیویە: ((فێبرایەری ١٩٢١ هێزێکی سوارە بە سەرکردایەتی شامیلی تەیمۆرۆڤ کە کورد بوو، بەشدارییەکی چالاکانەی شەڕی دژ بە داشناکەکانی کرد.

هەروەها لە شەڕو خەباتی دەسەڵاتدارانی سۆڤێتیدادژی باندە داشناکیەکان، ئاپریلی١٩٢١، هێزێکی تایبەتیان لە کوردەکانی مینکەندی سەر بە ناوچەی حەواشیر پێك هێنا. ئەم هێزە سەر بە وەزارەتی دەریایی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤێتی بوو))[١٩]. بەشداری و دەوری کوردەکانی پشت قەفقاس لە سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی سۆڤێتیدا لە ناوچەکەدا زۆر چالاکانە بووەو، گەلێك شەهیدیان داوەو شان بەشانی سوپای سوورو گەلانی دیکەی ناوچەکە دڵسۆزی خۆیان نیشان داوەو، پێشوازییان لە دەسەڵاتی نوێی سۆڤێتی کردووە، بەو هیوایەی کە ئەم دەسەڵاتە نوێیە ئاسەواری سیاسەتی ڕەگەزپەرەستانەو تواندنەوەی دەسەڵاتدارانی سەردەمی ڕووسیای قەیسەری و دەسەڵاتدارانی خۆجێیی ناوچەکە بەرامبەر بە گەلی کورد نەهێڵێ و، بەپێی بانگەوازەکانی دەوڵەتی نوێی سۆڤیتی سەبارەت بە یەکسانی و مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان، گەلی کوردیش بە مافی خۆی بگات. گەلێك بەڵگەو سەرچاوە لەسەر بەشداری کوردەکانی هەرێمی قەفقاس لە سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی سۆڤێتیدا لە ناوچەکەدا هەیە.

چەتۆیڤ نووسیویە: ١٩٢١/٣/٢٨ کاتێك سوپای سوور ملەی سپیتاکی گرت و بەدوای هێزەکانی داشناکدا بەرەو گوندی کوردنشینی پامب پێشڕەویی کرد، دانیشتوانی کوردو ئەرمەنی بەهانای سوپای سوورەوە چوون. سەرەڕای بەفرو

---

[١٩] چەتویڤ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.

سەرماو ڕەهێڵەیەکی زۆر ڕێگەیان بۆ سوپای سوور لە بەفر پاك کردەوە (پاشان نووسەر کۆمەڵە ناوێکی نووسیوە کە پێشڕەوو چاوساغی سوپای سوور بوون)[٢٠]. هەروەها گەلێك بەڵگەو سەرچاوە لەسەر بەشداری کوردەکان لە جێبەجێکردنی پلانەکانی ئابووریی ناوچەدا، بەتایبەت لە کەڵخۆزو سۆڤخۆزەکاندا و لە دووهەمین جەنگی جیهانیدا هەیە.

یەکەمین ئەلفوبێی کوردی لە ١٩٢٢دا بە پیتی ئەرمەنی بوو، بۆ کوردەکانی ئەرمەنستان و جۆرجیای سۆڤێتی دانرا (نەك کوردی ئازەربایجان). بەڵام لەبەرئەوەی پیتی ئەرمەنی وەڵامدەرەوەی فۆنۆتیکی تایبەتی زمانی کوردی نەبوو و زۆر پیت و دەنگ یا فۆنۆتیکی کوردی لەناو پیتەکانی ئەرمەنی و زمانەکەیاندا نەبوو، کوردەکانی دەرەوەی ئەرمینیا (ئازەربایجان، جۆرجیاو کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان) نەیانتوانی کەڵکی لێ وەربگرن (پیت و زمانی ئەرمەنییان نەدەزانی)، بۆیە بڕیاری گۆڕینیان دا لە ١٩٣٥ دا، ئەویش پاش داواکردنێکی زۆری چەند ساڵەی دانیشتوان، بەتایبەت ڕووناکبیرو پسپۆرانی زمانی کوردی هاتەدی. واتە لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا کە هێشتا زۆربەی هەرەزۆری خوێندەوارانی کوردی ئەرمەنستان شارەزای ئەو پیتانە نەبوون (تەنیا لەبەر نەبوونی مامۆستاو کادیرو پسپۆڕ)، هەندێ کتێبی قوتابخانە یا چۆنیەتی فێربوونی زمانی کوردی (بەپیتی ئەرمەنی) لەلایەن دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئەرمەنستانەوە بڵاوکرایەوە، کوردەکان پێشوازییان لێ نەکرد. دواتر پاش سێ ساڵ، واتە لە ١٩٢٨دا، دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی ڕەزامەندی خۆیان بۆ دانانی ئەلفوبێی نوێی کوردی بەپیتی لاتینی نیشان دا. پاش ساڵێك، واتە لە ١٩٢٩دا، دەست بە دانانی ئەم ئەلفوبێیە کرا. ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە" لە ٢٥ی مارتی١٩٣٠دا چاپ کرا و لە ١٩٣٨دا وەستێنرا، یا بە واتایەکی دیکە لەلایەن دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی و ئەرمەنییەوە داخرا. هۆکەیشی ئەوە بووە گوایە دەیانەوێ ئەلفوبێی کوردی کە بەپیتی لاتینییە، بیگۆڕن بە ئەلفوبێی ڕووسی، تا کوردەکانی یەکێتیی سۆڤێت ئاسانتر بتوانن

---

[٢٠] چەتویڤ، هـ. س، ل٣٦-٣٧.

شارەزای ئەدەبیات و کولتووری دەوڵەمەندی گەلی مەزنی ڕووس و گەلانی دیکەی یەکێتیی سۆڤێت بن و، لە بەرژەوەندی گەلی کورددایە. هەندێ بەناو نووسەرو کوردناسی کوردی سۆڤێت، مۆری پەسندکردن و پاکانەیان بەم کردەوە دژە یاساو دژە کوردییەدا ناوەو، نەیانوێراوە لەم بارەوە بچووکترین ڕەخنە بگرن. ئەم کردەوەیەی دەسەلاٚتدارانی سۆڤێت ئەڵقەیەك یا بەردەوامی ئەو شالاٚوەیە دژ بە کورد، کە پاش هەڵوەشاندنەوەی کوردستانی سوورو بەزۆر ڕاگواستنی کوردەکانی لە ١٩٣٧داو داخستنی قوتابخانە کوردیەکانی لێ کەوتەوە. مەبەستیان سڕینەوەی ناسنامەی کوردی ئەم ولاٚتە بووە، ئەم دەربڕین‌و پاکانەکردنە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە. لەبەرئەوە ئەگەر بەپێی مەنتیقی ئەوان بێ، دەبوایە یەکەمجار ئەلفوبێ نوێیەکە (بەپیتی ڕووسی) ئامادەکرایە تا خەڵك فێربوایەو کتێب و قوتابخانە و کادری بۆ ئامادەکرابە، پاشان ڕاستەوخۆ ڕۆژنامەکەیش بەبێ داخستن و ڕاگرتن هەر بەو پیتانە (ڕووسی) لە بلاٚوکردنەوەیدا بەردەوام بوایە. لەلایەکی دیکەوە، پیتی ڕووسیش وەك پیتی ئەرمەنی وەلاٚمدەرەوەی زمان و فۆنۆتیك و دەنگەکانی کوردی نەبوە، ئەویش وەك پاشتر دەرئەکەوێ بەکەڵك نەهاتووە و ناچار بوون دیسانەوە بیگۆڕن. لە هەمووی گرینگتر، بەپێی سەرچاوە ڕەسمیەکانی ئەو سەردەمە، زۆربەی دانیشتوانی کورد نەك تەنیا بە کوردی، بەڵکوو بە زمانەکانی دیکەیش (چ ڕووسی چ ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجی و...) نەخوێندەوا ڕبوون. لە ئازەربایجان چەندجارێك ئەلفوبێی کوردی گۆڕدراوە بە لاتینی و تورکی و کریلی و ڕووسی. لە ماوەیەکی کورتدا چوارجار ئەلفوبێ (ئەویش جیاجیا، ئەرمینیا بەجیاو ئازەربایجان بەجیاو، هەرکام بەشێوەیەك و بەپیتی جۆراوجۆر کە هی یەکدی ناتوانن بیخوێننەوە) بۆ کورد دانراوە. دیارە خوێنەری ئەم بابەتە وەك نووسەرەکەی پرسیاریشی بۆ دێتە پێش. کاتێك کوردستانی سوور هەڵوەشاوەتەوەو قوتابخانەو ڕۆژنامەکان داخراون، ئەو ئەلفوبێ نوێیە لەکوێ بگۆترێتەوەو بۆ کێ دانراوە؟

ئەگەر کورنۆلۆژیای دانانی ئەم ئەلفوبێ کوردییانە بنووسین، لەگەڵ کورنولۆژیای ئەو کارەساتانەی کە دەسەلاٚتدارانی سۆڤێت بەسەر کوردەکانی ژێر

دەسەلاْتیاندا هێناون و بەراوردیان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە کوردی سۆڤێت نەك تەنیا ئەلفوبێیەکی یەکگرتووی نەبوە، بەڵکوو نەوەیەکیش بە هیچ کام لەو ئەلفوبێیانە پەروەردەو فێری کوردی نەبوە. هەر دووسێ ساڵ جارێك ئەلفوبێی کوردی بە پیتی جۆراوجۆر گوڕاوەو، ماوەیەکی درێژ هەر بە هیچ کام لەو پیتانە نە قوتابخانەو نە ڕۆژنامە نەبوە. پاشان ڕاگواستنی بەزۆرو بەکۆمەڵی کوردی ئەرمەنستان و جۆرجیا دەستی پێ کردووە، تا مردنی ستالین لە ١٩٥٣دا، بگرە پاش چەند ساڵێکیش دوای مەرگی ئەو دیکتاتۆرە، دەوڵەتی سۆڤێتی هیچ بەرنامەیەکی بۆ گێڕانەوەی مافە زەوتکراوەکانی ئەم گەلە کلۆڵە نەبوە.

دەسەلاْتدارانی سۆڤێت لە دانانی ئەلفوبێی کوردیشدا، تەنانەت پسپۆڕی کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان و پسپۆڕی زمانەوانی کوردی ناو پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستانیان بانگ نەکرد. لە ئەرمەنستان، تا سەقامگیربوونی دەسەلاْتی سۆڤێتی٩٠٪ی دانیشتوانی ئەم وڵاتە نەخویندەوار بوون و، ژمارەی نەخوێندەوار لەناو کەمەنەتەوەکانی دانیشتوانی ئەم کۆمارەدا هێشتا زیاتربوو[٢١].

لەکاتی دەسەلاْت گرتنە دەستی داشناکەکاندا، ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەنی لەگەڵ پەنابەرو ڕاکردووەکاندا، یەك میلیۆن و دووسەدو حەفتاویەك هەزارو دوو کەس بووە. بەلاْم تا کۆتایی١٩٢٠، واتە کاتی ڕووخانی دەسەلاْتی داشناکەکان، تەنیا حەوتسەدو بیست‌ودوو هەزار کەسیان ماون. ئەوانی دیکە بە برسێتی و نەخۆشی و شەڕی نێوان گەلەکانی ناوچەکەو ئاژاوەگێڕی داشناکەکان لەناو چوون[٢٢].

چەتۆیڤ، بەپشت بەستن بە بەڵگەکانی ئارشیڤی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤێتی، لە جێگەیەکی دیکەدا نووسیویە: ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەنستان ساڵی ١٩٢٨ (٩٢٢٨٠٥) کەس بووبێ، بۆچی ساڵی ١٩٣٣ ژمارەی

---

[٢١] چەتۆیڤ، هـ. س، ل١٠٦.

[٢٢] چەتۆیڤ هـ. س، ل٣١. بە پشت بەستن بە کتێبی دروستکردنەوەی باری ئابووری ئەرمەنستانی سۆڤێتی١٩١٨-١٩٢١، ئاکادیمیای زانستی ئەرمەنستان-ئیرەڤان، ١٩٥٨، ل٥.

دەگاتە(١١٢٤٤١٧) کەس؟ لە هەمان کاتدا، ژمارەی دانیشتوانی کوردی ئەرمەنستان نێوانی ١٩٢٨-١٩٢٣ لە ١٦٣٣٠ کەسەوە گەیشتوەتە ٢٢٦٨٨ [٢٣].

مینۆرسکی باسی بەشداری چالاکانەی کوردەکانی لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ تورکیا و ئێراندا کردووەو گوتوویە: لە شەڕی ١٨٢٨-١٨٢٩دا پولکە (هەنگە) سوارەکانی کورد کە ژمارەیان چوارسەد سوار دەبوو. هەروەها لە شەڕی کریم (قریم) ١٨٥٣-١٨٥٦دا، دوو پولکی کوردی (پولکی قارس و پولکی ئیرەڤان) بەشدارییان کردو، کاتی شەڕی ١٨٧٨-١٨٧٧، هەزارو سێسەد کەس (١٣ سەدی یا ١٣ سوتنی)ی کورد شان بەشانی سوپای ڕووسیا دژی سوپای تورك بەشدارییان کرد [٢٤].

گەلێك بەناو نووسەرو کوردناسی سۆڤێتی، بەتایبەت کوردەکانیان، لە نووسینەکانیاندا وا دەردەخەن کە گوایە تەنیا کوردی سۆڤێت خاوەن مافەو لە هەموو چەوسانەوەیەك ڕزگاریان بووەو، یەکەم ئەلفوبێی کوردی و خوێندن بە زمانی کوردی و... لە سۆڤێت دەستی پێکردووە! چۆنیەتی ئەو ئەلفوبێ کوردییە و خوێندن و بەسەرهاتی کوردەکانمان لەم لێکۆڵینەوەیەدا باس کردو، پێویست بەدووپات کردنەوە ناکات. بەڵام دەبێ ئەوەیش بگوترێ کە ئەلفوبێی کوردی یا خوێندن و دەرکردنی ڕۆژنامە یەکەمجار لە پارچەکانی دیکەی کوردستان و لە دەرەوەی کوردستان دەستی پێ کردووە؛ یا لە زۆر جێگە باس لەوە دەکەن کە گوایە پاش داگیرکردنی پشت قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بەشێکی گەلی کورد (نەك کوردستان) کەوتە ناو چوارچێوەی ڕووسیاو لە زوڵم‌وزۆری چەوسێنەرانی تورك و فارس ڕزگاریان بوو و، بواری پەیوەندی و دەست پێڕاگەیشتنیان بە دنیای دەرەوەو دنیای پێشکەوتوو بۆ ڕەخساو، بەم چەشنە بە داگیرکردنی قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە کۆسپی چەند سەد ساڵەو بارگرانی کورد نەماو، تەنانەت ڕووسیا بە تاقە ڕزگارکەری کوردو... دانراوە. بەڵام هەروەك

---

[٢٣] هـ. س. ل٩٠.

[٢٤] مینورسکی ف. ڤ، کوردەکان یاداشت و بیرەوەریەکان، سان پیترزبورگ، ١٩١٥، ص٤٢.

باسمان کرد، خەمبارترین و تراژیدیاترین بەسەرهاتی کورد لەچاو بەشەکانی دیکەی کوردستاندا، بەر کوردستانی بن دەستی ڕووسیا کەوتووە، کە لە نیشمانی خۆیان دەرکراون و، سەرئەنجام ناسنامەی کوردیان سڕیوەتەوە. ئەو نووسەرانە باسی هەنگاوە پێشکەوتوەکانی ڕووسیا یا سۆڤێت بۆ کورد دەکەن وەك:

١. نیشتەجێکردنی کوردە کۆچەرەکان.

٢. نەهێشتنی دەسەڵاتی ئاغاو دەرەبەگ و شێخی کوردو دابەشکردنی زەوی‌وزارەکانیان.

هەر دوو هەنگاوی ناوبراو گەورەترین کارەسات و برسێتی و هەژاریی بۆ کورد بەدواوە بوو. ژیانی زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردی پشت قەفقاس ئاژەڵداری و کۆچەری بوو؛ بەهۆی بەزۆر جێگیرکردنەوە مەڕومالاتەکەیان لەدەست داو زۆربەشیان پشت قەفقاسیان بەرەو کوردستانی ئێران و تورکیا بەجێ‌هێشت و، سەقامگیرکردن یا بەزۆر نیشتەجێکردنیان بەبێ ئیش‌وکار بووە هۆی بڵاوبوونەوەیان بۆ شارەکانی دیکەی ڕووسیا یا سۆڤێت، تا پاروە نانێك بۆ ماڵ ومنداڵیان پەیدابکەن.

لەلایەکی دیکەوە، سەندنەوەی زەوی‌وزار یا لەوەڕگە لە ئاغاو شێخ و دەرەبەگی کوردو دابەشکردنیان بەسەر ئەرمەنی و ئازەری هاوردە، یەکێك لە گەورەترین تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤێتە دەرحەق بەم گەلە کلۆڵە (وەك بەعسی سووریا لە کوردستانی سووریا زەوی کوردەکانی بەسەر عەرەبی هاوردەدا دابەش کردو، ئەم کردەوەیەی بەعسی فاشی بەناوی ئیسلاحاتی ئەرازییەوە بەتایبەت لەلایەن پارتی کۆمۆنیستی ئەم وڵاتەو وڵاتانی دیکەوە بە هەنگاوی پێشکەوتوانە لەقەڵەم دراو، ئەنجامەکەی بە عەرەبکردنی کوردستان بوو). ئاغاو شێخ و دەرەبەگی کوردی پشت قەفقاس، سەرەڕای چەوساندنەوەی کوردەکانی ژێردەستیان کە کەس ناتوانێ پاکانەیان بۆ بکات، بەڵام هەر هیچ نەبێ نانێکی مەمرەومەژییان بە کوردەکانی ژێر دەستیان داوە. کەچی دەسەڵاتدارانی سۆڤێت و ئەرمەنی و ئازەری، لەباتی ئەوەی زەویەکانیان بەسەر کوردەکاندا دابەش بکەن، بەسەر گەلانی غەیرە کورددا

دابەشیان کردوون، یا کردوویانەتە ماڵی حکوومەت و ماڵی گشتی کەڵخۆزو سەڤخۆزی لێ دروست کراوە، کە زۆربەی فەرمانبەرو کرێکارەکانیان کورد نین. سەرئەنجام پاش بەکۆمەڵ گواستنەوەی کوردان لە ١٩٣٧ و١٩٤٤دا، ئەم کوردانەش بۆ هەمیشە ماڵئاوایییان لە نیشتمانی باوباپیرانیان کردووە و بەیەکجاری بوونەتە موڵکی ئەرمەنی و ئازەری. گومانم لەوەدا نییە کە تاوانی لەئەژمارنەهاتووی وێنەی دەسەڵاتدارانی ڕووس و سۆڤێت لە ئاستی گەلی کورددا، لە جیهاندا دەگمەنەو، لەداهاتوویشدا لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر دەکرێ.

کاتێك سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بووم، چاوم بە هەندێ لەو کتێب و بڵاوکراوانە کەوت کە کورد بڵاوی کردوونەتەوە. زۆر نوسینی کوردەکان بە دەسکەوتی مەزن و پڕبایەخ لەقەڵەمی داون و بەشانازییەوە باسی کردوون، گوایە تیراژیان ئەوەندە زۆر بووە، لەوانە" ژیان و بەسەرهاتی لینین و کارل مارکس و فریدریخ ئینگلس و، مانیفیستی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێت و، مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبرو، کەڵخۆز و قازانجەکانی و کۆمەڵە بەرهەمی شیعرو وەرگێڕدراوو...".

ئەم بەرهەمانە ڕۆژانە لە دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤێتیو ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و ڕادیۆوە لەسەریان نووسراوە. وای لێ هاتووە خەڵك لە دیتنیان بێزار بووە. ئەو شتانە بەبێ ڕاسپاردەی دامودەزگای حیزبی و دەوڵەتی سۆڤێتی، بە واتایەکی دیکە بە فەرمان، وەردەگێڕدراونە سەر زمانی کوردی. زۆربەی کوردی سۆڤێتی نەخویندەوار و، لە تاراوگەی کازاخستانو سیبریاو ئاسیای ناوەڕاست بوون. تا کاتی لەچاپدانی ئەو بەرهەمانە چوارجار ئەلفوبێی ڕێزمانی کوردی گۆڕدراوە. ئینجا خوێنەری کورد چۆن توانیویە بیخوێنێتەوە یا بەدەستی بگات؟! جگە لەوە، هیچ پەیوەندییەکی کولتووری نێوان کوردی ئەرمەنستان و ئازەربایجان یا کوردە دوورخراوەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا نەماوە، لە سەرووی هەموویشیانەوە ئەو بەرهەمانە کە فەرموودەکانی لینین و مارکس و ستالینیان تێدا چاپ کراوە، کە بەکردەوە هەمووی هەر قسەی سەر

کاغەزن. کورد چۆن باوەڕ بەو شتانە بکات و، شۆڕشی ئۆکتۆبر کە کارەساتی بەسەر کورددا هێناوە، چۆن ئارەزووی خوێندنەوەی کتێبی شۆڕشی ئۆکتۆبری هەبێ، ئەویش لە تاراوگەو دوور لە نیشتمانی خۆی کە بەدەستی میراتگیرانی شۆڕشی ئۆکتۆبر دوورخراونەتەوە؟! چۆن باوەڕ بە چارەسەری کێشەی نەتەوەکان بکات، کاتێك لە نیشتمانەکەی خۆی ڕاونراوە، یا باوەڕ بە تێزەکانی ڕێبەری مەزنی پرۆلیتاریاو زەحمەتکێشانی جیهان هاوڕێ ستالین بکات کە کێشەکانی نەتەوەیی چارەسەرکراوە، لەکاتێکدا هاوڕێ ستالین بە پێچەوانەی فەرموودەکانی خۆی جوولاوەتەوەو ڕەفتاری کردووە. یا نووسراوەکانی ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە" کە وەرگێڕاوی بڕیارەکانی کۆنگرەو سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤێتی تێدایە، چ خزمەتێکی بە فەرهەنگ و کولتوورو مێژوو و زمانی کوردی کردووە؟! هەر ئەو حیزبەو ئەو دەوڵەتەو ئەو ڕژێمە یەك لەدوای‌یەکانە نین، ئەو هەموو کارەساتەیان بەسەردا هێناوە.

هەروەك ئاماژەمان پێکرد، بەتایبەت بەپێی بەڵگەنامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان بەرپرسانی ڕووس و سەرکردەو خاوەن دەوری کوردو، بەپێی ئەو نامانەی کە فەرماندەکانی سوپای ڕووس لەکاتی داگیرکردنی هەرێمی پشت قەفقاسدا بۆ کوردەکانیان نووسیوەو لە کتێبەکەی ئاڤیریانۆڤ و گەلێك شوێنی دیکەدا بلاوکراونەتەوە، دەسەلاتدارانی ڕووس گەلێك بەڵێنیان بە کوردەکان داوە، کە ماف و دەسەلاتیان لە ناوچەکەدا دەپارێزرێ. تەنیا پاش ئەم بەڵێنانە کوردەکان ئامادە بوون بکەونە ناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا. لەڕاستیدا تا ماوەیەکی درێژ ئەم دەسەلات و دەورەی کورد هەر ماوەو، لەباوکەوە بۆ کوڕەکانیان ماوەتەوەو پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە کاربەدەستانی مەدەنی و سەربازی ڕووسیاوە هەبوە، بەبێ ئەوەی کاربەدەستانی ئەرمەنی و ئازەری بتوانن دەست لە کاروبایان وەردەن و دەوڵەتی ڕووسیای تزاری (قەیسەری)ش بایەخێکی زۆری بەم پەیوەندی و بەڕێوەبەرێتییە کوردییە داوە. پەیوەندی نێوان کوردو دەوڵەتی ڕووس، بەشێوەیەکی ڕەسمی و دان پێدانراو بووە، بەڵگەو

دیکۆمێنتەکانی ماون. بەڵام پاشان ئەم پەیوەندییە بەهۆی ئاژاوەنانەوەی دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی و ئازەری تێك چووەو، حاکمی قەفقاس کە کابرایەکی بەتەمەن و نەخۆش بووە، ئەرمەنیەکان بۆ بردنەپێشی سیاسەتی خۆیان کیژۆڵەیەکی ئەرمەنییان لێ مارە کردووە. سەرئەنجام وای لێ هاتووە حاکمی قەفقاس بەهۆی ئەو ژنە ئەرمەنیەوە (کە دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی لەپشتیەوە بوون)، بەتایبەت کاتێك حاکمی قەفقاس نەخۆش کەوتووە، بەکردەوە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ڕووس لە هەرێمی پشت قەفقاسدا کەوتووەتە دەستی ئەم ژنە ئەرمەنییە. ئیتر کەوتوونە پیلانگێڕان دژی کوردەکانی ئەو هەرێمەو، دەستیان لە کاروباریان وەرداوەو تەنگیان پێهەڵچنیون و دەستیان بە کوشتن‌و ڕاونان و دەرکردنیان کردووەو، گەلێك شەڕی خوێناویش لەنێوان کوردو ئەرمەندا ڕووی داوە. لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدارانی مەدەنی و سەربازی ڕووس لە هەرێمی قەفقاس پشتی ئەرمەنیەکانیان گرتووە، کوردی بێدەرەتان و بێپشتیوان لە هەڵاتن بۆ کوردستانی بندەستی ئێران و تورکیا زیاتر هیچ ڕێیەکیان لەبەردەمدا نەبوەو، بەشێکیان کە ماونەتەوە تەسلیمی قەزاو قەدەری دەسەڵاتدارانی ڕووس و ناوچەکە (ئەرمەنی و ئازەری) بوون‌و چارەنووسیان بەو ڕۆژە گەیشت.

لێرەدا ئاماژە بە هەندێ بەڵگە دەکەین کە دەسەڵاتدارانی ڕووسیا کاروبارو بەڕێوەبەرێتی کوردەکانی هەرێمی پشت قەفقاسیان هەر لە دەستی خودی کورداندا هێشتوەتەوە. گرنگ ئەوەیە بڕیارو فەرمانەکانی دەسەڵاتدارانی ڕووسیا لەم بارەوە لە ئاستی بەرزی پایتەختی ئەو سەردەمەی ڕووسیادا، واتە سان پیترسبۆرگ (لینینگراد)، دەرکراون. لە گەلاڵەی مەدەنی بەڕێوەبردنی خانەنشینەکانی ئیرەڤان و نەخچەوان و، هەروەها ناوچەی ئوردوئابادا کە ١٨٢٧/١٢/١٥ لە پیترسبۆرگەوە بۆ شازادە پاسکەڤیچ حاکمی قەفقاس نێردراوە، هاتووە: " کاروباری کۆچەرەکان با هەر لە دەستی سەرۆك هۆزو خێڵەکانیاندا بێ "[٢٥].

---

[٢٥] بەڵگەکانی کۆمیسیۆنی ئارخیۆگرافیای قەفقاز، بەرگی٧، ل٤٣٥.

هەروەها لە دەستووری ١٨٤٧/١٢/٢٨دا، کاروبارو بەڕێوەبەرێتی تەواوی هۆزو خێڵە کوردەکانی ئازەربایجان (جگە لە کوردە ئێزدیەکان) خراوەتە ئەستۆی سەرۆکی هۆزی ڕازیکی (ڕادیکی) جەعفەر ئاغا کە ناسناوی عێل بەگی بووە[٢٦] و، کاروباری کوردە ئێزدیەکانیش کە لە ئەستۆی حەسەن ئاغا بووە، تا ساڵی ١٨٦٩ بەڕەسمی بەردەوام بووە[٢٧]. وەك دەبینین بەڕێوەبەرێتی کاروباری هەرێمی قەفقاس هێشتا بەپێی خاننشین و ناوچەکان بووە و، هێشتا ئەرمەنی و ئازەری و گەلانی دیکە بەڕێوەبەرێتی یا قەوارەیەکی یەکگرتوویان نییەو، تەنیا پاش شۆڕشی ئۆکتۆبر ١٩١٧ ناوچە ئەرمەنی و ئازەرنشینەکان لە چوارچێوەی بەڕێوەبەرێتییەکدا کۆکراونەتەوەو، پاشان دوو کۆماری جیاوازیان لێ دروست کردوون و، هەر بەشێکی کوردستانیش خراوەتە چوارچێوەی ئەم دوو کۆمارە دەستکردەو، تالیشستانیش خراوەتە چوارچێوەی ئازەربایجان، ئەویش بەو مەرجەی کە مافی گەلانی دیکەی وەك کوردو تالیش و نەتەوەکانی دیکە لە چوارچێوەی ئەو دوو کۆمارەدا ڕێزی لێ بگیرێ.

کاربەدەستانی باڵای دەوڵەتی ڕووسیا، بەپێچەوانەی کاربەدەستانی خۆجێیی بەتایبەت ئەرمەنی و ئازەرییەوە، هەوڵی زۆریان داوە بەڕێوەبەرێتی کوردەکان جیا و سەربەخۆ بێ و، جگە لەو دەستوورو بڕیارانەی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێ کرا، هەندێ گەلاڵەی دیکە سەبارەت بە کوردەکانی هەرێمی پشت قەفقاس پێشنیارو ئاراستە کراون. بەڵام بەداخەوە هیچ کامیان نەیانهێشتووە تاسەر جێبەجێ بکرێن و، یەك لەدوایەك خراونەتە پشت گوێ یا ڕەت کراونەتەوە. بۆ وێنە، پالکۆڤنیك لوریس میلیکوڤ گەلاڵەیەکی بەناوی"پەیڕەو (پرۆگرام)ێك بۆ بەڕێوەبەرێتی کوردەکان"ـەوە ئاراستە کردووە. گەلاڵەیەکی دیکە لە ١٨٤٥دا لەلایەن ژەنراڵ مایور سوسلوڤەوە بۆ بەڕێوەبەرێتی ئەو کوردانەی کە لەتورکیاوە هاتوونەتە ناوچەی ئیرەڤان، پێشکەش کراوە. هەروەها گەلاڵەی نازاروڤ پارێزەری ئیرەڤان لە ١٨٥٧ و

---

[٢٦] سەقامگیربوونی دەسەڵاتی ڕووس لە قەفقاز، بەرگی ١٢، تفیلیس، ١٩٠١، ل٣٥٧-٣٦١.

[٢٧] ڕشتون. ڤ، ڕیفۆرمی جووتیاری لە ئەرمەنستان لە ١٨٧٠، ئیرەڤان، ١٩٤٧، ل١٠٩.

گەلاڵەی حاکمی قەفقاس لە١٨٦٩ و ... ئاراستە کراوە. بەڵام هیچ کامیان نەیانهێشتووە سەربگرێ، وەك چۆن کوردستانی سووریان هەڵوەشاندەوە.

کوردەکانی پشت قەفقاس کە زۆربەیان بە ئاژەڵداریەوەو ژمارەیەکیشان بەکشتوکاڵەوە یا بەهەردووکیانەوە خەریکن، هەر هۆزو خێڵێکیان هاوینەهەوارو زستانەهەوارو لەوەڕگای تایبەتی و دیاریکراویان هەیەو، ساڵنامە یا ڕۆژژمێری قەفقاس دیاری دەکات، بۆ وێنە لە هەرێمەکانی ئێرەڤان و ئەلیزاڤێتەپول و تیفلیس و کۆتائیسی گرنگترین و دەوڵەمەندترین هاوینەهەواری کوردەکانی تۆمارکردووە، وەك ئایری جان، ئاغ مەغان(ئاخ مەخان ـ تاق مەخان) بۆ ئالاگێزو میس خان سیناك، چینیگیل و ئاگری (ئارارات)[٢٨].

دوای سەقامگیرکردنی دەسەلاتی سۆڤێتی لە ئەرمەنستان، بەپێی دابەشکردنی پارێزگاو شارو ناوچەو هەرێمی نوێ، کوردەکان زیاتر لەیەکتر دادەبڕێن و، سەرنجام بە جێگیرکردنی ئەو ئەرمەنییە پەنابەرو ئاوارەو هاوردانەوە نەك تەنیا لە تورکیاو ئێران و ئازەربایجانی سۆڤێتەوە، بەڵکوو لە وڵاتانی دیکەوەو، لە زۆر گوندی کوردنشین ڕێژەی دانیشتوانی بە قازانجی ئەرمەنیەکان گۆڕدراو کوردەکان دەبوونە کەمینە. بەپێی دابەشکردنی نوێی بەڕێوەبەرێتی ناوچەو هەرێمەکان، وەك نووسەرانی ئەرمەن دەڵێن، لە هیچ کامیان دانیشتوانی کورد زۆرینەی پێك نەهێنا. هەروەها نووسەرانی ئەرمەنی و هەندێ بەناو نووسەرو کوردە کوڵۆڵەکانی ئەرمینیایش، هەوڵی ئەوەیان داوە وا نیشان بدەن کە ژمارەیەکی زۆری کوردی ئەم کۆمارە لە کوردە هەڵهاتوو و پەنابەرەکانی تورکیاو ئێرانن و، ئاماژە بە هەندێ داخوازی سەرۆك هۆزو خێڵی کوردی تورکیاو ئێران کراوە، کە داوایان کردووە ببنە هاووڵاتی ڕووسیا. بەڵام ئەم کوردانە بە درێژایی مێژوو، بگرە پێش و پاش ئەوەیش کە ڕووسیا قەفقاس داگیر بکات و سنوورێك دانرێ، بەبێ هیچ کەندو کۆسپێك هەر لەو هەرێمەدا هۆبەو هەواریان هەڵداوە. پاش ئەوەی ڕووسیا (دواتر سۆڤێت) چەند پەیمانێکی لەگەڵ ئێران و تورکیادا

---

[٢٨] سەرچاوەی ناوبراو، تیفلیس، ١٨٩٩، بەشی سێهەم، ل٤٢.

مۆركردو سنوورەكانیان دیاری كراو بەربەست خرایە بەر هاتوچۆ بۆ كوردەكانی ئەمبەرو ئەوبەری سنوورەكان، هەندیٚ لەو هۆزو سەرۆك خێڵە كوردانە بۆ بژێوی ئاژەڵەكانیان وەك ڕابردوو ناچار بوون مۆڵەت لە دەسەڵاتدارانی ڕووسیا وەربگرنو، تەنانەت بۆ بژێوی ژیانی خۆیان داوای مانەوەو هاووڵاتی بوونی خۆیان لە ڕووسیا كرد. گەرچی هەندیٚ نووسەر نووسیویانە ئەمانە پەنابەر بوونو، ئەمەیش ناوی ئەو ناوچانەیە كە كوردەكانی لە ئەرمەنستانی سۆڤێتدا تێدا دەژین: ناوچەكانی ئاپران، ئالین، ئوكتیمبریان، ئەچمیادزین، ئارتاشات، ڤیدنسكی، ئاشناراك، كالینین، ئاختین، كوتائیس، باسار گیچەر.

# کورد یا کوردستانی پشت قەفقاس
# لە سەرچاوە ڕووسیـــەکاندا

چورسین لەژێر سەردێری کوردەکانی ئازەربایجاندا، کە ساڵی١٩٢٥ بڵاوبووەتەوە، دەڵێ: بەڵگەو نیشانەی وا هەیە کە کوردی پشت قەفقاس لەنێوان سەدەکانی ٨-١٤دا لێرە ژیابن[٢٩].

مینۆرسکی کوردناسیش باسی دەسەڵاتدارێتی بنەماڵەی بەناوبانگی کورد، واتە شەدادیەکان لەم ناوچەیە (پشت قەفقاس) دەکات کە لەنێوان سەدەکانی ١٠-١٢دا لە هەرێمێکی پان و بەریندا، لە ڕووباری"کوری"یەوە تا ڕووباری"ئاراس"، لەژێر دەسەڵاتیاندا بووەو، بارگەو ناوەندەکانی ئەم بنەماڵە کوردییە گەنجەو دوین (دڤین) بووە[٣٠]. نیکتینی بەناوبانگیش لەسەر ئەم بنەماڵە دەسەڵاتدارەی کورد

---

[٢٩] چورسین .گ. ف، "کوردەکانی ئازەربایجان" (یاداشتەکانی ئەتنۆگرافی)، لە (زانیاری یا ڕاگەیاندنەکانی پەیمانگەی مێژوویی- فیلو ژیای قەفقاز)، بەرگی ٣، تیفلیس، ١٩٢٥.

[٣٠] minorsky، V. Studies in Caucasien History، London. ١٩٥٣ ،

هەروەها بڕوانە کتێبی: ئاریستۆڤا .ف، کوردەکانی پشت قەفقاز، ل٢٢.

لـە فەرهـەنگی ئینـسکلۆپیدیای سـۆڤێتی، مۆسـکۆ، ١٩٨٠، ل٣٦٨. لەسـەر شـاری دونیـە (ڕڤینـە) دەنووسـێ: ((کـە شـارێکی کـۆنی ئەرمینیایـەو دەکەوێتـە ٣٥ کیلۆمـەتری ئیریڤـان و سـاڵی ٦٤٠ ناوەنـدی ئیمـارەتی عـەرەبی ئـەرمینیا بـووەو لـە سـاڵی ١٢٧٦وە لەلایـەن تاتـارو مەغۆلەکانەوە تێك دراوە و شوێنەواری کاول بووی بارەگاو ماڵی ماوە)).

دیارە ئەو نووسەرە ئەرمەنی بووەو هیچ ئاماژەیـەك بـە بـوونی کوردو ئـەوی پێوەنـدی بـەم شارەوە یا دەسەڵاتی کورد یا دانیشتوانی ئەم شارە ناکات، لەکاتێکدا لـە کتێبەکـەیدا ئامـاژە بـە هـیچ سەرچـاوەیەك ناکـات. وەك زۆر نووسـەری دیکـەی ئەرمـەنی کـە دەسـتێکی بـاڵاو

له قەفقاس، دەڵێت: ئەم بنەماڵەیە ساڵی٩٥١ لەلایەن مەحموودی شەدادییەوە له هۆزی ڕاوەندی دامەزراوە[٣١].

خاتو ئارسیتوڤا. ت. ف، بەپشت بەستن بە سەرچاوەکانی دیکە، سەبارەت بە کوردەکانی پشت قەفقاس دەنووسێ: پێویستە ئەوەیش بگوترێ کە ئەدەبیاتێکی زۆر هەیە، باسی بوونی کوردەکان له قەفقاس لەنێوان سەدەی ١٣-١٤داو، بگرە کۆنتریش دەکات[٣٢]. جگە لەوە، مێژووی خانەکانی میرنشینەکانی قەرەباغ و شەگین و گەنجە و ...، پێش ئەوەی لەلایەن ئێران و تورکیاو پاشتریش ڕووسیاوە دەستیان بەسەردا بگیرێ، نیشانی دەدەن کە کورد له چوارچێوەی ئەو میرنشینانەدا ژیاون و دەسەلاتیان هەبوە، یا بەشداری دەسەلات بوون. هەورەها ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیای عوسمانیدا له سەدەی ١٩هەمدا یا مێژووی داگیرکردنی قەفقاس لەلایەن ئیمپراتۆریی ڕووسیا توێژینەوەیان کردووە، باسی کوردەکانی ئەم هەرێمەیشیان کردووە، بەتایبەت ئاڤیریانۆڤ، بەوردی له دەوری کورد و دەسەلاتی کوردو سەرژمێری کوردو جێ‌وڕێیان و ... دوواوە. پەیماننامەکانی دوای شەش شەڕی ڕووسیا لەگەڵ ئێران وتورکیای عوسمانیدا، سەدەی نوزدەهەم، وەك پەیماننامەی گولستان و تورکمان چای و ئادریانەپول، سان ستیفانۆڤ و قارس و ...، فاکتەرێکی ترە کە باسی هۆزو خێڵ و بنەماڵەو گوندو ناوچە کوردنشینەکانی سنووره دەستکردەکانی ئیمپراتوریەکانیان کردووە. هاناو داخوازی

---

سەرەکییان لە نووسینەوەی فەرهەنگ و ئینسایکلۆپیدیای ڕووسیا (سۆڤێت)دا هەبوە، ئەوەندەی پێیان کرابێ هەوڵیان داوە ناوی کورد بسڕنەوەو، گەر هەر نەبێ کورد بەدناو بکەن. تەنانەت کاتێ باسی ئەرمینیای گەورە ، یا شارەکانی کوردستانی باکوور دەکەن، هەمووی بە ئەرمەنستان دادەنێن؛ بەتایبەت کە باسی کوردی سۆڤێت لەپشت قەفقاس دەکەن، پشت بە سەرچاوە کۆنە ڕووسی و بیانیەکان نابەستن کە کورد لەو هەرێمەدا ژیاون و، دەنووسن ئەوانە له تورکیاو ئێرانەوە هەڵهاتوون.

[٣١] نیکتین. ڤ. پ، کوردەکان.

[٣٢] ئاریستوڤا. ت. ف، کوردەکانی پشت قەفقاز، ل٣٦.

فەرماندەکانی ڕووسیا لە قەفقاس بۆ حاکم و سەردار و میرەکانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا، نەك تەنیا قەفقاس، بەڵکوو بەشەکانی تری کوردستان، بەتایبەت سەرۆك هۆزەکانی کورد کە لە گەلێك کتێبی ڕووسیدا ناویان هاتووە، یارمەتی ڕووسیا بدەن، یا بکەونە چوارچێوەی ئیمپڕاتۆریی ڕووسیاوە، فاکتەری ترن حاشایان لێ ناکرێ. ئەمەیش بەرپەرچدانەوی هەندێ نووسەرە کە دەڵێن: ئەو کوردانە هێزی لەشکری و سنووڕپارێزی تورکیای عوسمانی یا ئێرانی شاهانشاهی بوون، یا کوردی پشت قەفقاس لەبەر هۆی سیاسیو ئابووری، زۆربەیان لە سەرەتای سەدەی بیستەم و پاش یەکەم شەڕی جیهانی لە ئێران و تورکیاوە هەڵهاتوون... کوردناسەکانی ڕووس و سۆڤێتی باسی بەشداری هۆزو خێڵەکانی کوردی پشت قەفقاس لە ڕاپەڕینەکانی کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستاندا دەکەن.

ڕۆژنامەکانی ڕووسیاو دەسەڵاتدارێتی بەلشەویکەکانیش لەسەرەتادا سەرچاوەی دیکەن کە لە بوونی دانیشتوانی کوردو گوندو ناوچەی کوردنشین دەدوێن و، بگرە سەردێری هەندێ هەواڵ و ڕاگەیاندنیشیان بە ناوی (لە کوردستانەوە) دەست پێدەکەن.

بۆکشپان نووسەری کتێبی "کوردەکانی ئازەربایجان" بەشە کوردنشینەکەی ئازەربایجانی سۆڤێت بە کوردستان ناودەبات و، بەپێی بەڵگەو سەرژمێریەکانی ڕووسیاو سۆڤێتی، بوونی بەشێکی کوردستانمان لە چوارچێوەی ڕووسیادا پێ نیشان دەدات. هەروەها نووسەر ئاماژە بە کۆچ‌ورەوی کوردەکانی ڕووسیا (پشت قەفقاس) دەکات، بەهۆی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی دەسەڵاتدارانی قەفقاس (ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجی)ی ڕووسیاو سۆڤێتەوە بۆ ئێران و تورکیا. نووسەرەکانی دیکەی وەك ئاڤیریانۆڤ و نیکیتین و، خاتوو ئاریستوڤ و خالفین و نووسەرانی دیکە ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەم ڕاستیانە دەکەن، سەدەی ١٩هەم و سەرەتای دەسەڵاتدارێتی بەلشەویکەکان لە قۆناغی جۆربەجۆردا گەلێك کوردی پشت قەفقاس بەرەو کوردستانی ژێردەستی ئێران و تورکیا، تەنانەت عیراق و

سووریای ئەمڕۆش، ناچار کراون کۆچ بکەن. گەلێك بنەماڵەو هۆز هەن بەسەرهاتی خۆیان دەگێڕنەوە، یا لە باووباپیرانیانەوە بیستوویانە دەڵێن لە قەفقاسەوە هاتوون. ئەمەش فاکتەرێکی گرنگە، باسی ئەوە دەکات که کوردی پشت قەفقاس، بەرێگەی تەنگ پێهەڵچنین و دەرکردن یا تواندنەوە، بەرەو کەمی ڕۆیشتوون و بەراورد ناکرێن لەگەڵ ئەو کوردانەدا کە پاشان لەدەست ڕژێمەکانی تورکیاو ئێران هەڵهاتن بۆ قەفقاس. ئەگەر بەپێی نووسینی هەندێ نوێنەری ڕەگەزپەرست و شۆڤێنی و دژی کورد بێ، کە دەڵێن کوردی ئازەربایجان یا ئەرمەنستان هەڵهاتووی ئێران یا تورکیان، یا بۆ کارکردن و لەوەڕگەو... هاتوون، دەبێ ژمارەی کوردی پشت قەفاس هەر لەزیادبوون و، چەند قاتی سەرژمێریەکانی دوو سەدەی ڕابردوو بوونایەو، سەرژمێریەکانیش پێچەوانەی بۆچوونەکانیانن.

کوردە دەربەدەرکانی پشت قەفقاس، بۆ خۆیان دەگێڕنەوە کە زۆر جار کوردی موسڵمانی ئەرمەنستان یا کوردی ئازەربایجان یا جۆرجیا (گورجستان)، لەم کۆمارەوە بۆ ئەو کۆمارو بەبیانووی جۆراوجۆر دەرکراون (و دواجاریش ستالین هەر لە قەفقاسەوە بەزۆرو بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا ڕایگواستوون). کەچی نووسەرانی شۆڤێنی و دژی کورد کەڵکیان لەم کارەیش وەرگرتووەو، کە لەسەر کوردی ئەرمینیا دەنووسن، دەڵێن ئەمانە لە ئازەربایجانەوە هەڵهاتوون، یا لەسەر کوردی ئازەربایجان دەنووسن: گوایە ئەمانە لە ئەرمینیاوە هاتوون. نووسەرانی ڕووس و سۆڤیتیش کە لێکۆڵینەوەی مەیدانییان لەسەر کوردی پشت قەفقاس کردووە، ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەم کێشەیە دەکەن. تاوانی جینۆسایدو سڕینەوەی قەوارەو ناسنامەی کوردی پشت قەفقاس هێندە گەورەیە، هەموولایەك (موسکۆ. ئێرەڤان . باکۆ . تیفلیس) بەرژەوەندیان تێدا هەبوەو، هەوڵیان داوە بەو نووسین و سیاسەتانەیان ئەم تاوانە گەورەیە بسڕنەوە، بەڵام بۆیان نەچوەتە سەر. بۆ وێنە، گەلێك گوندی کوردنشینی ئەرمەنستان کە دانیشتوانی سەرجەم لە سەدەی نۆزدە یا لە سەرەتای سەدەی

بیستەم کۆچباری ئێران یا تورکیا بوون، یا ناچارکراون بگوازنەوە بۆ ئازەربایجان، دراونە کوردی ئێزدی یا ئەو کوردانەی کە لە تورکیاوە هەڵهاتوون بۆ قەفقاس، تەنانەت ئەرمەنە هەڵهاتوەکانی تورکیاو ئێرانیشیان تێدا نیشتەجێ کردووە و، ناوی گوندەکانیان گۆڕیوە و، دواتر مێژووی گوندو دانیشتوانی ئەو گوندانەیان بەو شێوەیە کە خۆیان ئارەزوویانە نووسیوەتەوە. بۆ وێنە، دەنووسن گوندە کوردنشینەکانی ئەرمەنستان زۆربەیان لەلایەن ئەو کوردانەی کە لە تورکیاوە هەڵهاتوون بنیات نراون و ئاوەدان کراونەتەوە. هەر ئەو گوندانەی کە لە داوێنی چیای ئاگری یا ڕۆخەکانی ڕووباری ئاراس بوون. گوندێکی غەیرە کورد لەنێوان ئەو گوندانەو گوندەکانی کوردستانی تورکیاو ئێراندا نەبوە، یا لە یەك هۆزوخێڵ و بنەماڵەی کورد بوون.

بۆ نموونە، گوندی ئاکۆ لە ناوچەی تالین، گوایە لەلایەن کوردە موسڵمانەکانەوە بنیات نراوەو، دانیشتوانی لەنێوان ١٩١٧-١٩١٨دا بەرەو تورکیا هەڵاتوون. نووسیویانە: پاش ئەوە ئێزدی هاتوونە جێگەکەیان، وەك بڵێی لێرە ئێزدی کورد نین و نەتەوەیەکی جیاوازن و، گوایە ئەو گوندانە خاکی کوردان نەبوون.

هەندێ لە سەرچاوەکانی سۆڤێتی، بۆ زیاتر بەدناوکردنی کوردی پشت قەفقاس، باسی ڕێگری و دزی و تاڵانی کوردەکان دژ بە گەلانی ناوچەکەو بەتایبەت ئەرمەنەکان دەکەن، پاش ئەوەی قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە داگیر کراوە و، دەسەڵاتی ئەوێ دراوەتە دەستی کاربەدەستانی خۆجێیی؛ یا نووسیویانە: کورد خاکی ئەرمەنیەکان داگیر دەکەن، یا لەبەر هۆی دینی پێکدادان و شەڕو کێشە لەنێوانیاندا سەری هەڵداوە، کەچی بەڵگەکانی ئارشیڤ و گێڕانەوەی کوردەکان بەپێچەوانەوە لەم بارەوە دەدوێن.

پاش ئەوەی قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە داگیرکرا، بەتایبەت پاش هاتنە سەرکاری بەلشەویکەکان و داخستنی سنوورەکان، کە ڕێگەی هاتوچۆی کوێستان و گەرمیانی هۆزە کوردەکانی سەر سنووری دەستکردی ئەم سێ

دەوڵەتە داگیرکەرەی کوردستان (تورکیاو ئێران و ڕووسیا) بەسترا، ئەم کوردانە سەدان ساڵ بووە پێشتر کەس ڕێگەی پێ نەگرتوون و ئازاد بوون، ئیتر دەبوو لەو دەوڵەتانە مۆڵەتی ڕەسمی وەربگرن و باج و سەرانەیان پێ بدەن، تا بواریان پێ بدەن پەزو ئاژەڵیان لە شوێنی جاران بلەوەڕێنن. داگیرکەرانی کوردستان ئەم کارانەیان کردوەتە بەڵگە، گوایە فلان سەرۆك هۆز یا دەرەبەگ و ئاغا داوای هاتنی خۆی و هۆزەکەیی بۆ ناو خاکی ڕووسیا کردووە، کەچی بەتەواوبوونی کاتی هۆبەکەیان گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی جارانی خۆیان. ئەم چەشنە تەنگەتاوکردنە بۆ یەکێك کە زانیارییەکی قووڵی لەسەر کێشەکە نەبێ، ناشێ باوەڕی پێ بکرێ، لەکاتێکدا ڕاپۆرت یا نووسراوێك سەبارەت بە گەڕانەوەیان، یا لەسەر کۆچی هەمیشەیی کوردەکانی خۆیان کە لەبەر هۆی سیاسی ئاودیوی بەشێکی دیکەی کوردستان بوون، بەدەستەوە نادەن. کورد ئەگەر لەمبەرو ئەوبەری سنوورە دەستکرەکانی ولاتەکەیدا بژی، یا پەنابەر و کۆچەری بێ، داگیرکەرانی ولاتەکەی لەبەر هۆی سیاسی یا ئابووری بە بێگانەیان دادەنێن و، لەسەر خاکی باووباپیرانی دەبێتە میوان و، داگیرکەرانی ولاتەکەیش منەتباری دەکەن و باج و سەرانەی لێ وەردەگرن.

ئەم دیاردەیە زیارتر لە کوردستانی داگیرکراوی باکوورو ڕۆژهەلات و باشووری کوردستان بەرچاو دەکەوێ، بەتایبەت بۆ هۆزو خێڵە کۆچەرو ئاژەڵدارەکانی کورد کە ژیانیان بە گەرمیان و کوێستانی ئەمدیوو ئەودیوی سنوورەکانەوە بەستراوەتەوەو، زۆرجاریش بووەتە کارەساتێکی دڵتەزێن بۆیان و، خراونەتە مامەڵە بۆ پێکهاتنی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانو لەمبەرو لەوبەری سنوورەکانەوە بۆ قووڵایی ولاتەکەیان دوور خراوەنەتەوەو ناوچەکانیان پێ چۆڵ کردوون. بە وتەی خۆیان، لەبەر هۆی ئاسایش دەستیان بەم تاوانە کردووە. کارەساتی دانیشتوانی سەر سنوورە دەستکردەکان و چۆڵبوونیان نیشانەی ئەو ڕاستییەن. ئەگەر دەوڵەتێکی داگیرکەریان بواری بە گەرمیان و کوێستانی کوردەکان نەدابێ، ئەوا ئاژەڵەکەیان لەناو چووەو بە دەستکورتی و هەژاری ماونەتەوە.

شەڕەماڵوێرانکەرەکانی ڕووسیاو تورکیای عوسمانی و ئێرانی پاشایەتی، لە سەدەی نۆزدەهەمداو، بگرە لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانیشەوە، زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر خاکی کوردان ڕوویان داوە. کورد زیانێکی یەکجار زۆری گیانی و ماڵی لێ کەوتووەو، چەند جارێك سنوورەکانی نێوان ئەم سێ دەوڵەتە داگیرکەرە بەهۆی ئەم شەڕانەوە هەر لەسەر خاکی کوردستان گۆڕدراون و، هەردەمێك دەسەڵاتی یەکێکیان بەسەر هەندێ ناوچەو هەرێمی کوردستانەوە بووەو، بەو چەشنەی کە خۆیان ویستوویانە لەگەڵ دانیشتوانەکەیدا جووڵاونەتەوە؛ دانیشتوانەکەیان یا دەرکردووە یا ناچاریان کردوون بۆ شوێنی دیکە بگوازنەوە، بۆ تێکدانی دیموگرافیاو ڕەوشی ئەتنیکی و قەوارەی ناوچەو هەندێ لەو هەرێم و ناوچانە، بۆ وێنە قارس و ئەردەهان و خۆی و ماکۆو سەڵماس و....

ئێمە لێرەدا ئاماژە بە قارس دەکەین، کە لە شەڕە ناوبراوەکاندا بووە گۆڕەپانی دەستدرێژی و هێرش و کوشتارو تاڵان و ئاوارەبوونی دانیشتوانەکەی. باسی مێژووی کۆنی ئەم هەرێمە ناکەین. قارس بەرلەوەی ساڵی١٨٧٧ لەلایەن ڕووسیاوە داگیربکرێ، لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا بووەو، بەپێی پەیمانی سان ستیفانۆ لە ١٨٧٨ دا بەڕەسمی خراوەتە سەر خاکی ڕووسیاو، مانگی مایسی ١٩١٨ پاش ٥٩ ساڵ ئەم شارە لەلایەن هێزی تورکیاوە داگیرکرایەوە. پاش شکستی تورکیا لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، داشناکەکانی ئەرمەنستانداگیریان کردو، سەرئەنجام بەپێی پەیمانی قارس لە ١٩٢١دا درایەوە بە تورکیا.

جێی داخ و کەسەرە، کاتێك ئەم شارو ناوچەو هەرێمانەی دیکە لەژێر دەسەڵاتدارێتی ڕووسیاو داشناکەکاندا بوون، زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی کە کورد بوون، تووشی ڕاونان و دەرکردن و کوشتن بوون، بە چەشنێك کوردەکان بوونە کەمینەی دانیشتوان، یا وەك گەلانی هاوردەی دیکە یەکسان بوون. لەم بارەوە هەندێ فاکت و سەرژمێری هەیە کە نووسەرانی سۆڤێتی نەیانتوانیوە بەرامبەریان بێدەنگ بن یا خۆیانی لێ گێل بکەن. بۆ وێنە، خاتوو ئاریستوڤا نووسیویە: ((بە وتەی باکرادزە، د. ز، ساڵانی حەفتای سەدەی نۆزدەهەم زۆربەی

دانیشتوانی قارس کورد بوون، جگە لە کورد، گەلانی قەفقاسیشی تێدا ژیاون، لەوانە جۆرجیو موسڵمان و ئەرمەنی)).

کاتێك لەژێر دەسەڵاتی تورکیادا بووە، بایەخ بە موسڵمانەکانی ئەویٚ دراوە و تورك و تورکمەن و ئاجار بۆ ئەو ناوچەیە هێنراون. لە ئێران و ناوچەی بورچالینەوە قەرەپەپاخ و جوولەکەیش بۆ ئەویٚ هێنراون و نیشتەجیٚ کراون. کاباردینی و ئەسەتین و کوردیش کە لە قەفقاسەوە هێنراون بۆ ئەویٚ، لەم شارە جێگیر کراون. بەڵام پاش ئەوەی هەرێمی قەفقاس، لەوانە قارس، لەلایەن ڕووسیاوە داگیر کرا، موسڵمانەکانی قارس بە کوردو تورك و گەلانی دیکەوە ئەوێیان بەجیٚهێشت. ژمارەی ئەو هەڵاتوانە، بە وتەی سادو ڤسکی ك، ساڵی ١٨٨٠ گەیشتە ٦٥٤٤٧ کەس. لەبەر ئەو جۆرە کۆچکردن (دەرکردن)انە بڕیار درا ئەو زەویوزارە چوڵەی هەرێمەکە پڕبکرێتەوە. ئەوە بوو لەپشت قەفقاسەوە، ڕووس و یۆنانی و گەلانی دیکەیش نێردرانە ئەویٚ. بەپیٚی ئەو خشتەیە کە خاتوو ئارسینوڤا داویە، جگە لە ڕووس و یۆنانی، ئەرمەن و قەرەپاپاخی لیٚ جگێر کران، بە چەشنێك کە هیچ گەلێك زۆرینەی دانیشتوانی ئەوێیان پێك نەهێنا. ساروڤسکی، ك، ژمارەی دانیشتوانی قارسی لە ١٨٨٣دا، بەم چەشنەی خوارەوە باس کردووە: ئەرمەنی ٢١،٥٪، تورك ٢٧٪، تورکمەن ٥٪، کورد ١٥٪، قەرەپاپاخ ١٥٪، (ئەسەنین و چیچنی، کاباردین و لیزگین و گەلانی دیکەی قەفقاس ٠٣٪)، ڕووس ٥،٥٪، یۆنانی ١٠،٥٪، جۆرجیو موسڵمان و ئاسووری و قارس و قەرەج ٠١٢٪)[٣٣]. خاتوو ئاریستوڤا دەڵێت: ئەو بیروباوەڕو بۆچوونەی کە دەڵیٚ هۆزە کۆچەرەکانی کورد زۆربەیان لە داوێنی چیاکانی ئارارات (ئاگری) ژیاون، هەڵەیە. لەبەر ئەوە، بەپیٚی ڕاگەیاندنی توێژەری ئەڵمانی ڤاگنەر. م لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩دا، لە بەشی ئەرمەنستانی ڕووسیادا هۆزە کۆچەرەکانی کورد نەك تەنیا لە داوێنی ئاراراتدا ژیاون، بەڵکوو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی هەوارگەو کوێستانەکانی گوٚلی گوکچادا ژیاون[٣٤].

---

[٣٣] ئاریستوڤا، ت.ف، بابەتەکانی کولتووری کوردی ڕووسیا لە سەدەی نوزدەهەمەم و نیوەی سەدەی بیستەمدا، مۆسکۆ،١٩٩٠، ل٥٦.

[٣٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

پاشان نووسەر دەڵێت: بوونی هۆزو خێڵە کوردەکان کە خەریکی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بوون، تا ئێستایش ئەو گێڕانەوەو ئەفسانانە لەبیرماون کە پشتاوپشت لەسەر جێ‌وڕێ و گوندکانی خۆیان وتراون‌و، سەرچاوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێش سەدەی نۆزدەهەم[(٣٥)].

هەروەها نووسەر دەڵێت: بەپێی پەیمانەکانی تورکمانچای ١٨٣٨ لەنێوان ڕووسیاو ئێراندا و، هەروەها دوای پەیمانی ئادریانەپول لەنێوان ڕووسیاو تورکیای عوسمانیدا لە ١٨٣٩، بەشێك لەو خاکانەی کە دانیشتوانی کوردو ئەرمەن بوو و لەسەر خاکی تورکیا (ئەرزڕۆم و قارس و...)بوو، کەوتە بەر خاکی ڕووسیا... هۆزو خێڵەکانی کوردی ئەوناوە کە سەر بە مەزهەبی سوننەو شیعەو ئێزدی بوون، سوننیەکان کە بریتی بوون لە جەلالی و بروکی و ڕادیکانلی میلان‌و سیپکی‌و گالتوری (قوتوری) و... شیعەکانی قەلخانی و قەرەچولی و... و ئێزدیەکانی حەسەنی و... ساڵی١٩٣٥ باریان کرد بۆ تورکیا[(٣٦)]. بەپێی هەندێ سەرچاوەی زارەکی، هۆزو خێڵەکانی ڕوزافی و سیپکی و ڕاموشی و بروکی، نیوەیان موسڵمانی سوننی و نیوەیان ئێزدین.

دوای یەکگرتنی جۆرجیا (گورجستان) لەگەڵ ڕووسیادا لە١٨٠١ داو، خان‌نشینەکانی گەنجەو قەرەباغ و شەکین (کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن)ی ڕووسیایش بوونە خاوەن کوردی خۆیان[(٣٧)].

---

(٣٥) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٣٦) هەمان سەرچاوە، ل٦٥.

(٣٧) ئاڤیریانوڤ، پ.ی، کورد لە شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ ئێران وتورکیادا، ل٢٤. خوێنەری بەڕێز دەتوانێ تەماشای ئەم کتێبە بە کوردی بکات کە لەلایەن نووسەری ئەم بابەتەوە وەرگێردراوە و سەرچاوەی زۆری لەسەر ئەم بابەتە تێدایەو هەوڵم داوە کەمتر لەم نووسینەدا کەڵکی لێ وەربگرم.

# سروشتی
# کوردستانی پشت قەفقاس

بوکشپان لەم بارەوە دەڵێ: ((هەرێم یا ناوچەی پێشووی کوردستان (بەتایبەت ناوچەکانی لاچین و کەڵباجار)، پڕە لە کانزای سروشتی و بەنرخی وەك خەڵووزی بەرد، خوێی نیترە(بارووت)، بەردەپێ، ئازبیست. خاکی ئینفوزورنا پڕیەتی لە ئاسن و مس و... و خاوەن کەرەستەیەکی دەوڵەمەندی"خەڵووزی سپی"یە، بەتایبەت لە ڕووباری تەرترو ڕووبارە بەخوڕەکانی دیکەو کانی ئاوی کانزایی و گەڕاوو پزیشکی، (بەتایبەت کانییەکانی ئیستیسوو کە لە دەوروبەرەکانیاندا سەیرانگەی پشوودان دروست کراوەو هیچی لە ئاوی کارلسبادی بەناوبانگی ئەمریکا کەمتر نییە. بەڵام کەڵك وەرگرتن لەوانە بۆ تەواوی دانیشتوانی کۆماری ئازەربایجان و هەموو یەکێتی سۆڤێت، پێویستی بە ڕێگە (جادە) و هۆی گواستنەوە هەیە کە دەبێ جێبەجێ بکرێن[٣٨].

لەو سەردەمەدا کە ئیش‌وکارو بژێوی زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوان لەسەر ئاژەڵداری بووە، ئەویش لەسایەی دەوڵەمەندی و لەوەڕگە سروشتیەکانی کوردستاندا بەتایبەت چیاکانی، بووە. بوکشپان دەڵێت: هەوارگەکانی (لول بیر)ی لاچین و، ئەوانەی کەڵباجار، نەك تەنیا هەوارگەی دانیشتوانی کوردی ناوچەکەن، بەڵکوو کۆچەرو ئاژەڵدارەکانی دیکەی ئازەربایجان ڕوو دەکەنە بۆ ئەم هەوارگە دەوڵەمەندو بێوێنەیە. وەك نووسەر دەڵێت: باشترین لەوەڕگەو هەوارگەکانی ئازەربایجان لەم ناوچەیەدایەو، کۆچەرەکانی موغان‌و میل و قەرەباغ و، هەروەها

---

[٣٨] بوکشپان، هـ. س، ل٤٧.

کۆچەرەکانی ئەفشار کە سەدان کیلومەتر ڕێگە دەبڕن و دێنە ئەم هەوارگانەو، تەنانەت ئاژەڵدارەکانی دەوروبەری ڕووباری کوریش دێنە ئێرە. کوێستانە ساردو پڕ لە گیاو لەوەڕگەنی ڕووبارە بێئەژمارەکانی کە سەرچاوەکانیان لە چیاکانی ئەم ناوچەیەوە هەڵدەقوڵێن، کۆچەرەکانی ئازەربایجان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن (٣٩) .

پاشان نووسەر بەوردی کاروانە ڕێی کۆچەرەکان بەدرێژایی ساڵ لە تابلۆیەکدا دەکێشێ و، تێیدا کاتی مانەوەیان لە ڕێگەو، کات بەسەربردنیان لە هەوارگەکان کە بۆ چەند هەوارگە کۆچ دەکەن لەگەڵ ناوی هەوارگەکاندا دیاری دەکات (٤٠) .

---

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل١٣.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ل١٧.

# داشناکەکانی ئەرمەنستان و موساواتیەکانی ئازەربایجان

داشناکەکان دوای شۆڕشی ئۆکتۆبر لە ۱۹۱۷ەوە تا مانگی۱۱ی ۱۹۲۰ لە ئەرمەنستان دەسەڵاتیان گرتە دەست، بە پێچەوانەی درۆو دەلەسەی زۆر نووسەری سۆڤێتی و کوردەوە، نەك تەنیا هیچیان بۆ کوردی چوارچێوەی وڵاتەکەی خۆیان نەکردووەو بەرامبەریان بێلایەن نەبوون، بەڵکوو دژی کورد جوڵاوونەتەوە، پاش ڕووخانی سۆڤێتیش کە هاتنەوە سەر دەسەڵات، درێژەیان بەو سیاسەتە دا، بەڵام بەشێوەیکی دیکەو ناڕاستەوخۆو نادیار (ئێمە لەبەر درێژی بابەتەکە لێرەدا خۆدەپارێزین و، ئاماژە بە چەند قسەی بوکشپان خۆی وەك شاهیدی ڕووداوەکان و ئەو کوردانە کە دیونی دەکەین) ((باندەکانی داشناك بە سەرکردایەتی ژەنراڵ "درو" لەگەڵ موساواتیەکانی ئازەربایجاندا کوردەکانیان ناچارکردبوو ڕابکەن بۆ تورکیاو ئێران))[41]. کوردەکانی ئازەربایجان، تا گرتنە دەسەڵاتی بەلشەویکەکان کەمایەتییەکی نەتەوەیی چەوساوە بوون. دەوڵەتی موساواتیەکان وەك ڕووسیای تزاری لەو ڕوانگەیەوە تەماشای کوردەکانیان کردووە کە دەکرێ دژی هاوسێکانیان کەڵکیان لێ وەربگرن. سیاسەتی موساواتیەکان بەرامبەر بە کوردان لە گەلێك لاوە لە هی ڕووسیای تزاری زیاتر توند بووە))[42].

موساواتیەکان لەڕێگەی نۆکەرەکانیانەوە، وەك فیۆداڵە گەورەکان و فەرمانداری قەرەباغ خەسرەو بەگی سوڵتانۆڤ، بڕیاریان دابوو سیاسەتی نەتەوەیی خۆیان بەڕێوەببەن و دەستەی چەکداری پێك بێنن.

---

[41] هەمان سەرچاوە، ل٦٧.

[42] هەمان سەرچاوە، ل٦٨.

ستیکلوڤ. ئا، له لێکۆڵینەوەکەیدا سەبارەت بە هێزی سوپایی موساواتیەکان، نووسیوه: بۆ پاراستنی سنوورەکانی خۆیان له هێرش و مەترسی ئەرمەنیەکان بۆ سەر قەرەباغ، داشناکەکانی ئەرمەنی گەلاّلەکەیان بە سەرکردایەتی وەزیری شەڕی دەوڵەتەکەیان نارد بۆ دەرەوەی قەرەباغ. ماوەی خزمەتکردنیان دوو ساڵ و جلوبەرگی لەشکرییان پێدراوەو چەك و مەشق و بارهێنانیان بۆ دابین کراوه، بەلاّم لەکاتی مەشق و بارهێناندا دەورەکەیان تەواو نەکردووەو بەلشەویکەکان ناوچەکەیان گرتووه [٤٣].

جگه له به"قەزاقکردنی کوردەکان" (وەك حەمیدیەکانی سەردەمی عەبدولحەمید، هەورامی) ماڵیاتێکی یەکجار زۆریان لەسەر کوردەکان دانابوو، لەلایەن چەکداری بەگەکانی قوتورلینەوه هێرش بۆ گوندە کوردو تورکنشینەکانیش دەکرا، بەلاّم زیاتر دەکرایه سەر گوندە بێدیفاعە کوردنشینەکان و تالاّنیان دەکردن و خەڵکیان بەسوغرە ڕاپێچی کارکردن دەکرد، ئاژەڵیان بەتالاّن دەبردو، بگرە دەغڵ‌ودانی خەڵکیان تالاّن دەکرد. ئەمە کردەوەیەکی ئاسایی و باوی موساواتیەکان بوو. بۆیان گێڕامەوە له یەکێك لەو هێرشانەی چەتە بەگەکانی تورکدا کە موساواتیەکان چاوپۆشییان لێ کردوون بۆ چاو ترساندنی خەڵك، زۆرجار تەقەیان له گوندنشینەکان کردووەو، پاش ئەوە داوای حەقی ئەو گوللانەیان لێ کردوون کە تەقاندوویانن. ئەگەر پارەکەیان نەدابایە یا دەبوە بیانوویەك کە ئەو چەتانە سامانی هەموویان بەرن، بەربەرەکانیش دژی ئەوانە دەبوە هۆی کوشتنیان. ئەو بەگانە، لەباتی هەر کەسێکی کوژراویان، تەواوی بنەماڵەیەکیان لەناو بردووەو، ئەو کوردانەش کە تۆڵەیان سەندوەتەوه، دەبوو ڕابکەن و، بگوێزنەوەو تەواوی سامانی خۆیان بەجێ‌بهێڵن.

چەوسانەوەی کوردەکان پەرەی سەندووەو، گاڵتەو سووکایەتی بە زمانی کوردی کراوه. کورد دەبوە مایەی گاڵتەو بابەتی قسەی پێکەنین و، زۆرجاریش

---

[٤٣] هەمان سەرچاوە ، ل٦٩-٧٠.

ئەمە دەبوە هۆی ئەوەی کە گوندە کوردنشینەکان واز لە زمانی کوردی بێنن. ئەو زمانەی کە بەگ و موساواتیەکان کردبوویان بە کەرەسەی گاڵتەو پێکەنین و نوکتە (بۆ وێنە کەر. وەر یا کەرە. وەرە)، من بۆ خۆم بەرەوڕووی هەندێ لەو ڕووداوە خەمبارانە بوومەوە، کاتێك کە کوردەکان سوێندیان دەخوارد واز لە زمانی زگماکی خۆیان بێنن (بۆ وێنە، لە گوندی کەمالی لە ناوچەی لاچین). ئەم ڕووداوانە بەپێی چەوسانەوەی زیاتری فیۆدال و موڵکدارەکان زۆرتر پەرەیان دەسەندو، زیاتر کوردەکانی تووشی تواندنەوەو، کۆمەڵگەکەیانی دوچاری داخستن و دابڕان دەکرد. زمانی تورکی کە زمانی ڕەسمی و زمانی دەوڵەتی و دەسەلاتداری نەتەوەیی سەردەست بوو، زمانێکی ئاشکراو (ئاواڵە) بوو، کەچی زمانی کوردی وەك زمانێکی (داخراو) لەناو ماڵی خۆو لەناو کۆمەڵی بچووك بچووکدا قسەی پێ دەکرا.

جگە لەوە، پرۆسەی تواندنەوەی کوردەکان، بەهۆی بارودۆخ و پێشهاتی دیکەوە، دەکراو، لەم بارەیشەوە گەورەترین هۆکار کە لەم پرۆسەیەدا دەوری دەبینی، ئەوەبوو کە کوردەکان وەك کەمەنەتەوەی پشت قەفقاس و دابڕاو لەیەك، بەتایبەت دابڕانی کوردەکانی هەرێمی نەخچەوان و ئیرەڤان کە لە گەمارۆی دانیشتوانێکی زۆر"زۆرینە"ی بەربلاوی تورکدا بوون، شوێنەواری خۆی بەجێهێشتووە [٤٤].

دەتوانین بڵێین لە هەموو گوندەکاندا، ئێمە ژنهێنانی کوردەکانمان لەگەڵ ئافرەتی تورکدا بینی (بنەماڵەی هاوبەش). لە هەندێ شوێندا، بۆ وێنە لە گوندی زیرتی، ژنە تورکەکان فێری زمانی کوردی بوون، بەلام زۆربەیان هەر بە زمانی تورکی قسە دەکەن. لە وتووێژەکانماندا لەگەڵ کوردەکاندا کە ژیانی هاوبەش یا هاوسەرییان لەگەڵ تورکەکاندا هەیە یا لە گوندە تورکنشینەکاندا دەژین، ئەوەیان دەست نیشان دەکرد کە ژنهێنانیان لە تورکەکان، هەندێ جار دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بۆ خۆیان بەرەبەرە زمانی کوردییان لەبیر بچێتەوەو منداڵەکانیشیان هەموو کاتێك ناتوانن فێری زمانی کوردی بن. تێکەڵییان لەگەڵ

---

[٤٤] هەمان سەرچاوە، ل٧١ و٧٢.

تورکە کۆچەرەکاندا لە هاوین و زستانە هەوارەکاندا کە زۆربەی هەرە زۆریان بە تورکی دەدوێن و، هەروەها کاروباری بازرگانی و دەوڵەتی کە لەدەستی تورکەکاندایە، لەگەڵ خزمەتکردنیان لە سوپای ئازەربایجاندا، ئەمانەو زۆر شتی دیکە، پرۆسەی تواندنەوەی کوردەکانی زیاتر بەرەوپێش بردووەو بوونەتە هۆی سەرەکی تواندنەوەیان. بەلاّم ئەم تواندنەوەیە یەکجار قووڵ نەبوو و هەموو شوێنێکی نەگرتەوەو، دروستبوونی ناوچەی کوردستانی ئازەربایجان بەری بەم پرۆسەیە گرتو، زۆربەی دانیشتوانی کوردستان کە پێشتر خۆیان بە تورك لەقەڵەم دەدا، ئیتر خۆیان بە کورد دادەنا [٤٥].

بوکشپان ئاماژە بە وتەی یەکێك لە بیرمەندەکانی موساوات بەناوی وەلییڤ م.گ ـەوە (کە ناسناوی بەهارلیە)و جلوبەرگی دەگۆڕێ و لە چاپەمەنیەکانی سۆڤیێتیدا بیروڕاو نووسراوەکانی خۆی بلاّودەکاتەوەو بۆچوونی موساواتیانە دژی شۆڕشی خۆی ناشارێتەوەو لەسەر مردنی زمانی کوردی دەدوێ و دەڵێ: ((زمانی تورکی لە ئێستادا زیاترو پتر دەسکەوتی هەیەو تەنگی بە زمانەکانی دیکە هەڵچنیوە، ئەو زمانانەی کە کۆنەو داڕزاون و سەردەمیان بەسەرچووەو باویان نەماوە، وەك زمانی تاتی و تالیشی و لیزگینی و کوردی و ... هتد)) [٤٦].

نووسەر دەڵێت، بەپێی نووسراوو بۆچوونەکانی موساواتیەکان، بەتایبەت لە گۆڤارەکەیانەوە (ئۆدلو-یورت، ژمارە٢٢٠، ساڵی ١٩٣٠) کە لە ئەستانبووڵ دەرئەچوو، بوون یا ئازادکردنی زمانێکی دیکەو (مەبەستی زمانی کوردییە) لە کۆماری ئازەربایجاندا، دەبێتە هۆی دابەشبوونی گەل و نیشتمانی ئازەربایجان. بلاّوکردنەوەی ئەو چەشنە بۆچوونە دژە شۆڕشیانە تائێستا لەقاو نەدراوەو، بەداخەوە داموودەزگاکانی سۆڤیێتیش بواری بلاّوکردنەوەی ئەو چەشنە بۆچوونانە دەدەن. تا ساڵی ١٩٣٠ هەندێ لە بەرپرسانی داموودەزگاکانی پەروەردەو فێرکردنی ئازەربایجان، ئەم سیاسەتە شۆڤینستیانەیان بەرامبەر بە کەمەنەتەوەکانی

---

[٤٥] هـ. س، ل٧٣ و٧٤.

[٤٦] هـ. س، ل٧٥.

ئازەربایجان بەڕێوەبردووە. ئەمە پێچەوانەی سیاسەتی لینینییە، سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی و چارەسەرکردنی (داشناکەکانیش کاتێ خۆی بۆ گەیشتن بە مەبەستە ناپاکەکانیان باسی خزمایەتی کوردو ئەرمەن دەکەن، کۆمیتەی ناوەندی پارتی داشناك سوتون شوباتی ۱۹۳۱ لەم بارەیەوە نووسیویە، کوردەکان هاوسێی ئێمەن و لەگەڵ ئێمەی ئەرمەنیدا لەسەر یەك خاك دەژین و خزمی خوێنی ئێمەن و...) [٤٧].

موساواتیەکان چەکێکی ڕوحییان دا بە هەندێ لە ڕێبەران و بەرپرسارانی فەرمانبەری وەزارەتی پەروەوەردەو ڕاگەیاندنی ئازەربایجانی سۆڤێتی بۆ دژایەتیکردن‌و بەڕێوەنەبردنی سیاسەتی نەتەوەیی لینینی‌و چارەسەرنەکردنی کێشەی کەمەنەتەوەکان و کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی خۆیان و، گەشەپێدانی کولتووریان، کە کورد و نەتەوەکانی دیکەی ئازەربایجانی گرتەوە. ئەم سیاسەتە بەتایبەت لە کۆبوونەوەی هاوبەشی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان و وەزارەتی پەروەوەردەو بارهێنانی ئازەربایجان مانگی حوزەیرانی ۱۹۳۱ سەبارەت بە کێشەی کەمەنەتەوەکان، ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەیە لەقاودرا. لەم کۆبوونەوەیەدا کە بە دەستپێشخەری و پێشنیاری پارتی کۆمۆنیستی کۆماری ئازەربایجان ڕێك خرا، ئەوە دەست نیشانکرا کە هەر لە ساڵی ۱۹۲٤وە هەندێ لە کاربەدەستانی کوردستانی گەرچی لەڕاستیدا بەشێوەیەکی ترسنۆکانەو لیبراڵانە کێشەی کردنەوەی قوتابخانەی کوردییان بە زمانی زگماکی کوردی خستە بەردەمی وەزارەتی پەروەردەو بارهێنانی ئازەربایجان، یەکێك لە بەشدارانی ئەم کۆبوونەوەیە هاوڕێ ئیلیاسوڤ بوو کە بەرپرسی بەشی بەڕێوەبەرێتی پەروەوەردەو بارهێنانی پێشووی کوردستان بوو، باسی مێژووی پەسندکردنی ئەلفوبێی کوردی کرد کە ئەودەمە لەسەر ئەلفوبێی تورکی بوو و، وتی:

((کاتی خۆی لە ئازەربایجان لەم بارەیەوە چەند هەنگاوێك هەڵگیراو، یەکەم کتێبی ئەلفوبێی لە ساڵی۱۹۲٤ ئامادەکراو نێردرابوە وەزارەتی پەروەردەو

---

[٤٧] هـ. س، ل٧٦.

بارهێنانی ئازەربایجان، بەڵام بەداخەوە ئەلفوبێیەکە (وەك کتێبی ئەلفوبێ) هیچ هەستێکی ئەوانی نەبزواندو هەر لەوێشدا مرد و، ئەم کێشەیەش ڕاگیرا)) [٤٨].

بەڵام هەر ئەو هاوڕێ ئیلیاسوڤ "ئەلیاسوڤ"ـە لەم وتارەیدا جەختی لەسەر ئەو دەسکەوتە مەزنانە کردووە کە لە بواری کولتوورییەوە لە کوردستان بەدی هاتوونو، وتی: تەنیا لە یەکێك لەو سێ ناوچانەی کوردستانی پێشوو، واتە ناوچەی لاچین، ئێستا ئێمە زیاتر لە سەد قوتابخانەی سەرەتایی و شەش قوتابخانەی ناوندیو حەوت ساڵە یەك پەیمانگەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و دوانزە کتێبخانەو سی کلووب و... هەیەو، زیاتر لە چوارسەدو پەنجا کوردی لاو لە قوتابخانە ناوەندیەکانی ئازەربایجان دەخوێنن و دکتۆرو ئەندازیاری کوردیمان هەیە، ئاکادیمیای پیشەسازی پەیمانگەی پیشەسازیی نەوتیان تەواو کردووەو... [٤٩] و، بۆ سی ساڵی داهاتوو لە جێبەجێکردنی پلانی پێنج ساڵەدا پێمان وایەو گومانیشیمان نییە کە دەتوانین نەخوێندەواری نەهێڵین و، ئەگەر نەتوانین لەسەداسەد، لانی کەم لەسەدا هەشتای نەخوێندەواری لە دانیشتوانی کوردی ئازەربایجان لەناوبەرین، دەتوانین لە ساڵی١٩٣١دا خوێندنی سەرەتایی گشتی مسۆگەر بکەین، بە پلانی وەزارەتی پەروەردەو بارهێنان. ئێمە جگە لە چاککردنەوەی قوتابخانە کۆنەکان، دەستمان کردووە بە دروستکردنی ١٤ قوتابخانەی نوێ لە سی ناوچەی کوردستان، وەك لە کەڵباجارو قوباتلی و لاچین.

سەرەڕای ڕەخنەی پارتی بەلشەویکی سۆڤێتی لە هەڵەکان و، هەندێ لە کاربەدەستانی وەزارەتی پەروەردە کە سیاسەتێکی بۆگەنو چەپەڵیان لەم بارەیەوە پێڕەو کردووە (تا ساڵی١٩٣٠)، بەڵام تائێستا هەنگاوی پێویستیان بۆ گەشەپێدانی زمانی کوردی و، قوتابخانەو ئەلفوبێ و نووسین بە زمانی کوردی و کولتوورو برایەتی و ئینتەرناسیونالیزم و... بۆ کوردەکان هەڵنەگرتووەو،

---

[٤٨] هـ .س، ل٧٧ (لە کۆپیی ڕاپۆرتی کۆبونەوەی سێهەمی توژینەوەی کێشەی کەمەنەتەوەیەکانی کۆماری ئازەربایجان لە١٧ی ئەیونی ١٩٣١).

[٤٩] هـ. س، ل٧٧.

دەتوانین بڵێین لە تەواوی کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوە حیزبی و کەمسەمۆڵیەکان و، کۆبوونەوەکانی خەڵکی ئاسایی و هەژارو کەڵخۆزچیەکان و زەحمەتکێشانی کوردو تورکدا، کە ئێمە لەکاتی گەشتەکانماندا لەگەڵیاندا کردوومانە، بەشداران ڕەخنەو گلەیی توندی خۆیان بەرامبەر بە سیاسەتی وەزارەتی پەروەردەو بارهێنانی ئازەربایجان تا ساڵی ١٩٣٠ ڕوون کردەوەو، ئەم وەزارەتە نەك تەنیا سالأنێکی دورودرێژ لەم بارە بێدەنگ بووە، بەڵکوو کاتی خۆی کۆسپ و تەگەرەیان بۆ کردنەوەی قوتابخانەو بووژاندنەوەی کولتوور بە زمانی زگماکیش بۆ کوردەکان ناوەتەوە (٥٠).

بوکشپان سەبارەت بە بنەماڵەی سوڵتانۆڤ و بەگەکانی قوتورلین کە خزمی یەکن و بە ڕەسەن تورکن، دەڵێت: کە موساواتیەکانی ئازەربایجان، پاش حوکم گرتنەدەست، ڕوویان دایە دەسەلأتدارێتی چەوسێنەرانەی ئەم بنەماڵەیە، شەرعییەتو قانوونیان بەسەر ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئازەربایجاندا سەپاندو، یەکێك لەو بەگانەیان بەناوی خوسرەو بەگی سوڵتانوڤەوە، کرد بە فەرمانداری قەرەباغ و، تا سەقامگیربوونی دەسەلأتی سۆڤێتی ئازەربایجان لە ناوچەی کەڵباجاری ئەمڕۆ، هەشتا هەزار هیکتار لەوەڕگەو زەوی چاندن و ٤٥ هەزار هیکتار لێڕەوار (جەنگەڵ)ی ناوچەکەیان بەدەستەوەبوو.

جووتیارانی ناوچەکانی لاچین و قوباتلی، لەباری ئابوورییەوە بەوانەوە بەسترابوون و، زوڵم و زۆرێکی بێوێنەو نەبیستراویان لەو خەڵکە کردووە (لە ماڵیات و باج وەرگرتنەوە، تا مافی سوورانە، واتە شەوی یەکەمی بووك). ئەم جووتیارانە تائێستا ناتوانن بە ئارامی ناوی ئەو چەوسێنەرە دڕندەیە بهێنن و، دەیان وێنەی دەستدرێژی و لێدان و کوشتن و تالأنکردنیان بۆ باس کردووین.

بۆکشپان کە لە گەشتەکەی خۆیدا گەلێك ڕەخنەی خۆیو دانیشتوان و، ڕەخنەو بەڵێنی بەرپرسانی دەوڵەتی ئازەربایجانی، بەتایبەت لەو کۆنفرانسەی کە بە پێشنیارو دەست پێشخەری پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان سەبارەت بە

(٥٠) هـ. س، ل٧٨.

کێشەی کوردو چارەسەرکردنی تۆمار کردووە و، گەلێك بەڵێن و گەلاڵە لەم بارەوە دراون و دەرچوون، نەك تەنیا هیچ ئاڵوگۆڕیك لە ژیانی کوردەکاندا نەکراو، دەوڵەت هیچ هەنگاوێکی نەنا، زۆری پێنەچوو لەوێ بەزۆر گواستیاننەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا.

هەرچۆنێك بێ، لەم بەرهەمەدا بەڵگە زۆرە لەسەر سیاسەتی کوردی سەردەمی ڕووسیاو دەسەلاّتداریّتی موساواتیەکانی ئازەربایجان و داشناکەکانی ئازەربایجان و دەسەلاّتدارانی سۆڤێتی، کە یەك لەیەکتر نامرۆڤانەتر بوون، ئەوی سەردەمی سۆڤێتی باڵی بەسەر هەموویاندا کێشاوە.

# کوردستانی پشت قەفقاس
# لە بەڵگەنامەو سەرچاوەکانی سۆڤیێتیدا

کاتێك سەرقاڵی کۆکردنەوەی بابەت و لێکۆڵینەوە بووم لەسەر ئەم کێشەیە، جگە لە سەردانی ئەرشیڤەکان و خوێندنەوەی چەند سەرچاوەی وەك کتێب و لێکۆڵینەوە، هەوڵی زۆرم دا لە مۆسکۆ چاوم بە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی پشت قەفقاس بکەوێ، بەتایبەت ڕۆژنامەکانی "قیزل کوردستان- کوردستانی سوور" و " کوردستانی سۆڤیێتی یا سۆڤیێتسکی کوردستان" کە لەو سەردەمەدا بڵاوبوونەتەوەو لە ئەدەبیات و سەرچاوەکاندا ناویان هاتووە. بەڵام بەداخەوە بۆم نەدۆزرانەوە، زۆر گەڕام و توانای سەفەرکردنم بۆ کۆمارەکانی دیکەی سۆڤیێتی پێشوو نەبوو بۆ دۆزینەوەیان. بۆیە ناچاربووم چاو لە چاپەمەنیەکانی دیکەی ئەو سەردەمە بکەم، دەبینم لە چەند ڕۆژنامەدا کە دواتر باسیان دەکەین، بەتایبەت ڕۆژنامەی"زاریا وەستوك" سەردێڕی بابەت و هەواڵەکانی لەژێر ناوی"لە کوردستانەوە" یا "ناوچەی کوردستان" نووسیوە، یا کە لە ڕووداوەکان دەدوێن نوسیوویانە فلان گوندی سەر بە فلان شاری کوردستان یا ناوچەی کوردستانە (ئەمە جگە لەو بڕیارانەی کە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی و حیزبی سۆڤیێتی، بەتایبەت لە ئازەربایجان لەسەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستانی ئازەربایجان داویانەو بڵاوبوونەتەوە). بابەتی ئەم ڕۆژنامانە، بەڵگەیەکی دیکەی زیندووی حاشاهەڵنەگرو مێژوویی و یاسایی‌یە لەسەر کورد و کێشە ڕەواکەی و نیشتمانەکەی و دانی پێدانراوە. دان پێدانانەکە بەپێی بەڵگەی مێژوویی، زۆربەی هەرەزۆری هەم دانیشتوانەکەی کە کورد بوون و هەم خاکەکەی کە لە بەشەکانی دیکەی کوردستان دانەپچڕاوەو درێژەی خاکی کوردستانی باکوورو ڕۆژهەڵات و... گرتوەتەوە.

یەکەم نووسەری سۆڤێت، لە ئازەربایجانی سۆڤێتی، کە غەیرە کوردو گوایە بەرپرسیارەك جوولەکە بووە، بە ئاشکرا وشەی کوردستان و کوردستانی ئازەربایجان " یا کوردستانسکی ئویزد"، واتە ناحیە یا ناوچەی کوردستانی بە کارهێناوەو بەڵگەیشی لەم بارەوە هێناوەتەوە. بوکشپان لەژێر سەردێڕی"تریتۆری (خاك) و سنوورەکای کوردستانی ئازەربایجان"دا، بەپشت بەستن بە بڕیارە حیزبی و دەوڵەتیەکانی ئازەربایجانی سۆڤێتی، دەڵێ: ناوچەی کوردستان وەك یەکەیەکی بەڕێوەبەرێتی سەربەخۆ لە ١٩٢٣دا دامەزراو، پاش هەڵوەشانەوەی لە ١٩٢٩داو سەرلەنوێ بەشکردنی بەڕیوەبەرێتی ناوچەکانی بەسەر ئازەربایجان، کرا بە"کوردستانسکی ئوکروگ"[٥١] (بە کوردیەکەی هەر ناوچەی کوردستانە) کە لە باکوورەوە بۆ باشوور ئەم ناوچانەی دەگرتەوە: کەڵباجار، لاچین، قوباتلی و بەشێك لە ناوچەی جەوانشیری ئەمڕۆ.

سنوورەکانی باکووری ناوچەی کوردستانی پێشوو بە هێڵی سەراورد (خط الرأس) زنجیرە چیاکانی موراۋ داغی ئەم ناوچەیە لە ناوچەی گەنجە جیادەکاتەوە (واتە لە باکوورەوە زنجیرە چیاکانی موراۋ داغ کوردستان لە ناوچەی گەنجە جیا دەکاتەوە، هەورامی) و بە هێڵی سەراورد زنجیرە چیاکانی کانگوور–ئالانگیز[٥٢] کوردستان لەگەڵ ناوچەی نور . بائێزدی سەر بە ئەرمینیا هاوسنوورەو، لە باشووری ڕۆژئاوایشەوە کوردستان هاوسنووری ناوچەکانی شارئورا–دەریلاگیز (دارالگین)و زەنگەزوری کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤێتە.

سنوورەکانی کوردستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە بە ڕووباری ئاکیردا دەڕوات، تا سنوورەکانی ناوچەی پێشووی جەبرەئیل کە لە گوندی (ئەفەندیلەر)ەوە دەست پێدەکات، تا لەو شوێنەی کە لقی لای چەپی ئەم ڕووبارەوە، واتە میل خیلوۋ، دەڕژێتە ئەم ڕووبارەو، سەرئەنجام کوردستان لەگەڵ ناگورناقەرەباغ هاوسنوورەو،

---

[٥١] لە جێی خۆیەتی ئەگەر لەبری ناوچە هەرێم بەکاربێنین، چونکە کوردستانی ئازەربایجان چەند ناوچە دەگرێتەوە.

[٥٢] ئالان گیرزیان کردووە بە ئالاگیز تا ناسنامەی کوردی پێوە نەبێ، کە تا ئەمڕۆیش هەموو دانیشتوانی کوردن.

له باشوری ڕۆژهەڵاتەوە، واتە لەو شوێنە کە ڕووباری میل خیلوۆ دەڕژێتە ڕووباری ئاکیرەوە هەتا زنجیرە چیاکانی موراقداغ[٥٣] .

نووسەر کە باسی سنوورەکانی کوردستان دەکات، پاش هەڵوەشانەوەی یەکەم لە ١٩٢٩داو دابڕینی زۆر ناوچەو گوندو چیای کوردستان، واتە پاش بچووك و تەسککردنەوەی، ئەو ناوچانەی هاوسنووری کوردستانن، نووسەر وا لێیان دەدوێ کە بەشێکی دیکەی کوردستان بوون. هەر بەپێی سەرچاوە ڕووسی و سۆڤێتیەکان دانیشتوانیان کورد بووە و، هەندێکیشیان بەتایبەت ئەوانەی ئەمڕۆ دوێنێ خرانە سەر کۆماری ئەرمینیا، تائێستایش دانیشتوانیان کوردن. ئەمە بۆ خۆی فاکتەرێکی مێژوویی و حاشاڵێنەکراوە کە خاکی کوردستان لەنێوان ئەو دوو کۆمارەدا لەلایەن دەسەڵاتدارانی سۆڤێتیەوە دابەش کراوە. جگە لەو بەڵگانەی کە باسمان کردن، بەتایبەت هی سەدەی نۆزدەو سەدەکانی دیکە، بەرپەرچدانەوەی ئەو نووسەرە ڕەگەزپەرستانەیە کە بەبێ بەڵگەو سەرچاوە هەوڵ دەدەن بڵێن کوردی ئەرمەنستان زۆربەیان هەڵهاتووی تورکیا و ئێرانن و....

نووسەر ڕەخنە لەوانەیش دەگرێ کە شتی بێسەروبەریان لەسەر کوردەکانی ئازەربایجان یا سۆڤێت نووسیوەو، خۆیان لە بەکارهێنانی وشەی کوردستان و گەلی کورد وەك نەتەوەو، هەروەها ئەو ناوچەیەی کە پێی دەوترێ کوردستان و زۆربەی دانیشتوانی ئەوێ پێك دێنن بواردووەو، بەئەنقەست بایەخی کێشەی کوردی سۆڤێت کەم دەکەنەوەو بە چاوێکی سوك تەماشایان دەکەن.

هەروەها نووسەر ڕەخنەیش لە کاربەدەستانی سۆڤێتی (ئازەربایجانی) دەگرێ کە بۆ لێکۆڵینەوەکەی بابەت و بەڵگەی ئەرشیفی و سەرچاوەیان نەخستوەتە بەردەستی، یا بەئەنقەست نەیانداوە یا هەڵیان نەگرتووە یا لەناویان بردووەو ئاشکرایان نەکردووە[٥٤] . نووسەر هەروەها دەڵێ: گەرچی کێشەی کوردستانی ئازەربایجان زۆرجار بابەتی کۆبوونەوەی کاربەدەستانی حیزبی و دەوڵەتی

---

[٥٣] بوکشپان ئا، کوردەکانی ئازەربایجان، باکۆ، ١٩٣٢، ل١٠و ١١.

[٥٤] بوکشپان. ئا، هـ.س، ل٥٠.

ئازەربایجان بووەو کۆمیسیۆنی تایبەتی بۆ دیاری کراوە، کە سنوورو چۆنیەتی بەڕێوەبەرێتی ناگۆرناقەرەباغ و کوردستان دیاری بکات، ئەم کۆمیسیۆنە هیچ گومان و کۆسپێکی لە دروستکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ ناگورناقەرەباغ نەبوەو بڕیاری داوە و دروستیان کردووە. بەڵام لەسەر کوردستان یا بۆ کوردستان یا بەپێچەوانەوە، کێشەی کوردستان چەند مانگ باس و توێژینەوەی لەسەر کراوە. سەبارەت بە ناوچەی کوباتلی (قوبادلی یا قوباتلی) کە پاشان بوو بە ٥\١١ (پێنج یەکیٚ کوردستان) چەند بڕیار دراوەو گۆڕاوە[٥٥]. ماوەی مانگی ١١ و ١٢ی ساڵی ١٩٢٢ سێ بڕیار لەلایەن سەرکردایەتی ئازەربایجانەوە (١٩٢٢/١٠/٢١ و ١٩٢٢/١١/٢٠ و ١٩٢٢/١٢/٣٠) لەسەر ناوچەی قوبادلی دراوە؛ یەکەمیان بڕیاری هەڵوەشاندنەوەو دوانەکەی دوایی بڕیاری کاتی بووە لەسەر هێشتنەوەی کێشەکەو باسکردنی (واتە کێشەکە هەیە، بەڵام هیچ بڕیارێکی تەواو لەسەری نەدراوەو جاریٚ ڕاگیراوەو، هەر کاتێك بیانەویٚ دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ باسکردنی ئەم کێشەیەو بڕیاری لەسەر بدەن، هەورامی). لە ١/١٣ / ١٩٢٣دا کێشەکە لەلایەن سەرکردایەتی کۆمیتەی ئازەربایجانەوە باس کرایەوەو، بە نیازی دروستکردن یا ڕێکخستنی بەڕێوەبەرێتی کوردستان، ناوچەی قوبادلی بە شێوەیەکی کاتی سەربەخۆ بوو[٥٦] و، تا هاوینی ١٩٢٣ کێشەی جیاکردنەوە (دیاریکردنی سنوورو چارەنووس)ی کوردستان لە کۆبوونەوەی مانگی حەوتی ١٩٢٣دا لەلایەن ئەو کۆمیسیۆنە تایبەتەوە کە باسمان کرد تاووتویٚ کرا.

ئێمە دوو پرۆتۆکۆلی ئەم کۆمیسیۆنەمان هەیە کە هی ئەرشیڤی حیزبیی پەیمانگەی مێژووناسی "ستیپان شائومیان" ناوە کە سەر بە کۆمیتەی ناوەندی

---

[٥٥] هەمان سەرچاوە، ل٥٠.

[٥٦] بڕوانە بەندی یەکەمی پرۆتۆکۆلی سەرکردایەتی کۆمیتەی (تسیك) ئازەربایجان. ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی ئازەربایجانی سەر بە کۆمیتەی (تسیکی) ئازەربایجان، دیلای ژمارە حەوت، بەڕێوەبەرێتی چارەسەرکردنی زەوی بە کۆمیساریا (وەزارەتخانە)ی زەویوزار لە ١٩٢٣، ل ٢٥. بوکشپان، هەمان سەرچاوە، ل٥١.

پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان (بەلشەویك)ـە. کێشەی کوردستان، لە یەکەم کۆبوونەوەی کۆمیسیۆنەکەدا، لە ئاستی چۆنیەتی و شێوازی بەڕێوەبردندا دیاری کرا. ئێمە کۆپی نووسینی تاووتوێکردنەکەمان لەسەر ئەم کێشەیە بەدەستەوە نییە. بەڵام تێکستی بڕیارەکە هیچ گومانی تێدا نییە، لەسەر ئەوەی کە ئەندامانی کۆمیسیۆنەکە سەبارەت بە کێشەی کوردستان بیروڕای جیاوازو مەبدەئییان هەبوە، بۆیە بواری چارەسەرکردنی یەکجاری و خێرایان نەبوە(٥٧).

ئەم بۆچوونە لە پرۆتۆکۆلی کۆبوونەوەی کۆمیسیۆندا بەم چەشنەی خوارەوە ڕەنگی داوەتەوە:

خاڵی . ٤ دوو پێشنیار کراوە:

١. کوردستان بکرێ بە بەڕێوەبەرێتییەکی یەکگرتوو و، مافی ناوچەی (ئویزدی) هەبێ و، ڕاستەوخۆ بەناوەندەوە ببەسترێ‌و جەوانشیرو شووشەو قوبادلی لە چوارچێوەی کوردستاندا بن. (هۆکانی): دووری کوردستان لە ناوەندەوە، واتە لە باکوورەوە، دابڕان و دووری کوردستان لە قەرەباغەوە کە دەکەوێتە نزمایی و قووڵاییەوەو دانیشتوانیشی کەم نییە، واتە نزیکەی شەست هەزار کەسە. تا ئێستایش ناوەند بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادات و، پێویستیەکانی جێبەجێ ناکات، لەبەر ئەوەی هەندێ ناوچەی قەرەباغی پێوە بەستراوە.

---

(٥٧) دیارە یەکدەنگ نەبوون، یا زۆربەیان دژی چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان بوون و، جیاوازییان هەبوە لەسەر سنووری کوردستان‌و، ئەوەی کە ناوچەی کوردستان ڕاستەوخۆ سەر بە باکۆ یا ناگورناقەرەباغ یا ناوچەکانی دیکەوە ببەسترێتەوەو، دەسەڵاتی ناوچەی کوردستان تا چ ئاستێك بێ و، ناوەکەی چی بێ: ناوچەی کوردستان یا هەرێمی کوردستان یا ئۆتۆنۆمی کوردستان و.... بێگومان باسی ئەوە کراوە کە جگە لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان و نەخچەوان، ناوچە کوردنشینەکانی ئەرمینیاش بخرێتە سەری یا نەخرێ. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی ئازەربایجان ئازەری و ئەرمەنی و گورجی بوون و، هەموویان بەرژەوەندییان لە چارەسەرێکی بناغەیی کێشەی کورددا نەبوە. لەلایەکی دیکەوە، دیار نییە نوێنەرانی کورد لە کۆبوونەوەکان و کۆمیسیۆنەکەدا بەشدار بووبن، یا پرس و داخوازی دانیشتوانی کوردیان لەبەرچاو گرتبێ‌و، هەروەهایش دەورو هەڵوێستی مۆسکۆ چی بووە؟

**٢. کوردستان، وەك ناوچەیەکی سەر بە قەرەباغ بهێڵرێتەوە.**

**لەم بارەوە دەنگەکان دابەش دەکەین (بۆچوونی جیاواز دەبێ، هەورامی)و کێشەکە بە کراوەیی دەمێنێتەوە. من پێم وایە ئەنجامی دەنگدانەکەیش کتوپڕ نابێ. لایەنگرانی جیاکردنەوەی کوردستان، ناتوانن بەپێی بۆچوونەکانی خۆیان قەناعەت بەوانی دیکە بکەن و سەربکەون. هەروەك لە بڕیارنامەکەدا دەبینین، بۆچوونەکانی ئەوان هەر لەسەر خاك یا تریتۆریای کوردستان بووە و، لەم بارەیەشەوە دەنگدانی "دژ" و "لەگەڵ"یش هەبوە.**

**دابڕان و پەیوەندییەکی یەکجار دژواری نێوان ئەو ناوچانەی کە دەبوایە بکەونە چوارچێوەی کورستانەوە، وایان دەکرد ئەم ناوچانە لە باری بەڕێوەبەرێتییەوە سەربەخۆییان بپارێزرێن. ئەم بارودۆخە ڕاستەوخۆ دژی ئەو پێشنیارە بوو، کە داوای یەکگرتنەوەی ئەو ناوچە سەخت و دوورو ناوبراوانەی دەکرد کە چیاکان بە شێوەیەکی سروشتی لە یەکی جیاکردوونەتەوە.**

**لە بواری خاکیشەوە، ئەو یەکگرتنە پێشنیارکراوە ناوەڕۆکێکی دەستکردی دەبوو و، وەڵامدەرەوەی ڕاستەقینەی پرنسیپی کاری کۆمیسیۆنەکەو پێشنیاری لایەنگرانی جیاکردنەوەی کوردستان بوو، سەرئەنجام هەروەك لە یەکەم پێشنیاردا دیارەو هاتووە، هەوڵ دراوە پەیوەندی نزیکترو ڕاستەوخۆتر لەگەڵ ناوەندی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستیو کۆماری ئازەربایجاندا، واتە باکۆی پرۆلیتەری، ببەسترێ.**

**ئێمە دەمانەوێ جارێ باسی بارودۆخی جوگرافیایی و سروشتی ناوچەکە بکەین، لەبەرئەوە هەروەك ئاماژەمان پێکرد هی دیکە بۆ جیاکردنەوەی کوردستان نەبوو. لانی کەم هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لە یەکەم پێشنیاردا نییە.**

**لە کۆبوونەوەی دواتری ئەم کۆمیسیۆنەدا کە ١٩٢٣/٧/٧ گیراوە، بە بۆچوونی ئێمە، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بڕیاری لەسەر دراوە. ئەوەتا لە کۆپیەی نووسراوی دووهەمدا هاتووە:**

| گوێ گیرا | بڕیاردرا |
|---|---|
| ٢–سەبارەت بە کوردستان. | ٢. ئۆتۆنۆمی کوردستان پێك بێ کە ناوەندو سنوورەکانی لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمی ناگورنا قەرەباغدا بێ. |

درێژەی مێژووی ئەم کێشەیەمان بۆ ڕوون نەبوەوەو نەمانتوانی ڕوونی بکەینەوە. بەڵام دیارە بڕیاری ناوبراو بەهۆی ئەوەوە کە لەلایەن ڕێکخراوە پایەبەرزەکانەوە پەسند نەکراوە، دەستبەجێ جێبەجێ نەبوە. بەڵام هەرچۆنێك بێ، دەتوانین بڵێین کوردستان لەم کەین و بەینەدا، وەك ناوچەیەکی یەکگرتوو لە بواری بەڕێوەبەرێتی و سەربەخۆییەوە، لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەدا کە لە گەڵاڵەی یەکەمدا هاتوون و باسمان کردن، جیا کرایەوە.

ئەوەبوو ئابی ١٩٢٣ هاوڕێی خوالێخۆشبوو حوسەی گاجییێڤ "حوسەین حاجییێڤ"، بە سەرۆکی کۆمیتەی بەڕێوەبەرێتی (حکوومەتی خۆجێیی) دیاری کرا. لە ئەرشیڤدا نووسراوی ئەو وتووێژانەی حوسە گاجییێڤ کە ڕاستەوخۆ بە تەلەفۆن سەبارەت بە هەندێ کێشەی پەیوەندییدار بەو هەنگاوانەی یەکەم کردوونی سەبارەت بە ڕێکخستنی ناوچەی کوردستان بوون، لەگەڵ سەرۆکی شووڕای وەزیرانی کۆماری ئازەربایجان دوواوە و، بە زمانێکی ساکار ناوی کوردستانیان لێ ناوە [٥٨].

بوکشپان وتەیەکی بەنرخ و ژیرانەی هەیەو دەڵێ:

دروستکردن و جیاکردنەوەی کوردستان لە ناوچەیەکی تایبەتدا بەناوی کوردستانی ئازەربایجانەوە، لە ١٩٢٣دا ناونرا. بێگومان بوو بە کەش‌وهەوایەکی لەبار کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە (وەك پێشتر باسمان کرد، زۆربەیان لە تورك پێك هاتبوون و بە تورك خۆیان لەقەڵەم دەدا) ئیتر خۆیان بە کورد داناو کوردبوونی خۆیان لەو خاکە (کوردستان)دا کە تێیدا دەژین سەلماند [٥٩].

هەڵەی ڕێکخراوو دامودەزگاکانی خۆجێیی لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی نەتەوەیی و، هەڵسەنگاندنی بایەخی ئەم کێشەیەدا، لەبری ئەوەی کە لە قۆناغی یەکەمدا کێشە سەرەکیەکە، واتە کێشەیی نەتەوەیی (سیاسەتی نەتەوەیی)، چارەسەر بکەن، هەنگاوی "خێرخوازانە"ی دیکەیان هەڵناوەو، ئەمەیش ئەم کێشەیەی زیاتر دژوار کردووە، بەبێ ئەوەش کێشەیەکی بۆ خۆی ئاڵۆز بووە.

---

[٥٨] بوکشپان. ئا، هـ س، ل ٥٢، ٥٣.

[٥٩] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

ئاسەواری ئەم سیاسەتەیان هەتا ئەم دواییەش لەناو نەبرا. لەم بارەیەوە شتێکی زۆر سەیرتان بۆ باس دەگێڕمەوە. کاتی گەشتەکەمان بۆ ناوچەکانی لاچین، فەرمان درا بە ڕێکخراوو دامودەزگاکان، ئەو کەسانەی کە بە زمانی کوردی قسە دەکەن مانوفاکتۆریان بدرێتێ. گومان لەوەدا نییە کە ژمارەی ئەوانەی خۆیان بە کوردزمان لەقەڵەم دا، لەم کاتەدا یەکجار زۆر بوو و، دەستبەجێ ژمارەی دانیشتوانی کورد یەکجار زۆر بوو، هاوسەنگی پێکهاتەی دانیشتوانی نێوان کوردو تورکی بە یەکجاری گۆڕی. ئەگەر لە ڕابردوودا زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە بە تورک (ئازەربایجان) زمان لەقەڵەم درابێ، پاش بەرقەراربوونی هەرێمی کوردستان، بە پێچەوانەوە دەرچوو و سەرژمێری ١٩٢٦ ئەم ڕاستییەی سەلماند. جگە لەوە، کوردەکان بە شێوەیەکی هەرەوەزی و پێکەوە لە ناوچەکەدا دەژین و بەسەر گوندە تورکنشینەکاندا بڵاونەبوونەتەوەو زمانی کوردییان لەبیر نەچووەتەوە و بە زمانی زگماکی کوردی خۆیان قسە دەکەن[٦٠].

---

[٦٠] هەمان سەرچاوە.

# کوردی پشت قەفقاس
# لە سەرژمێریەکانی ڕووسی و سۆڤێتیدا

ئێمە بەوردی سەبارەت بە سەرژمێریەکانی سەردەمی سۆڤێت دووایین و، وەك بوکشپان دەڵێت: تەنانەت هیچ بایەخێك نەدراوە بە سەرژمێری و دیاریکردنی ژماری کوردەکان (واتە وەك شتەکانی دیکە). دیارە ئەم وتنەی نووسەر زۆرشت دەگرێتەوە. جگە لەوەی کە جیاوازیەکی زۆر لە سەرژمێریەکاندا هەیەو، بگرە هەندێ سەرژمێری کورد لەچاو سەرژمێری پێشوودا کەمتر دەرچووەو، تەنانەت لە هەندێ سەرژمێریدا ناوی کوردی هەر نەهاتووە، یا لەچاو ڕێژەی یا زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی گەلانی دیکەی سۆڤێتدا کەم کراوەتەوە، یا بەپێی ڕێژەی زیادبوونی دانیشتوانی گەلانی دیکەی ناوچەکە نەبوە. کارەسات و چەوسانەوە هەمەلایەنە لێرەو لەوێ کە بەسەر کوردی پشت قەفقاسدا هاتوون. کاتێك دەسەڵاتدارانی قەفقاس لە سەردەمی ڕووسیای قەیسەریدا کەوتنە ڕاونان و دەربەدەرکردنی کورد، دواتر دەسەڵاتدارانی ڕەگەزپەرستی هاوسێی کورد لە ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجی هاتنە سەر دەسەڵاتی موساواتیەکانی ئازەربایجان و داشناکەکانی ئەرمەنستان و مەنشەویکەکانی جۆرجیاو، پاشانیش درێژەیان بە هەمان سیاسەت دا، کە دەسەڵاتدارانی قەفقاس لە سەردەمی سۆڤێتیدا پێڕەیان دەکردو، هەموویان هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەو تواندنەوەی کوردیان دا. سەرئەنجام سەردەمی ستالین بەتۆپزی گوێزرانەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا. کاتێك کورد بۆ دوو نەتەوەی جیاواز (کوردو ئێزدی) دابەش کرا، لە ترسی دەسەڵاتداران و دەستکاری‌نەکردنی ئیش‌وکارو سامان و

ماڵیان، ناوو نەتەوە یا زمانی زگماکی خۆیان لەسەر نەتەوەی دەسەڵاتداری ئەو کۆمارە نووسی کە تێیدا دەژیان. کاتێك کورد قەوارەیەکی نەبووبێ و...، دەبێ لەو بارودۆخەدا سەرژمێری ڕاستەقینەی کورد چۆن کرابێ.

دەسەڵاتدارانی ڕووسیا، دەبوایە وەك ئازەری و ئەرمەنی بەڕێوەبەرێتی یا ناوچە یا هەرێمێکی جیاوازیان بەپێی ژمارەی ئەو سەردەمەی کوردی قەفقاس و نیشتمانەکەیان، بۆ پێك هێنابایە. سەردەمی سۆڤێتیش هەروا. کاتێك قارس و ئەردەهان بوونە بەشێکی ڕووسیا، پێویست بوو کورد بەپێی ڕێژەی دانیشتوان و پان و بەرینی خاکەکەی، یا بۆ ڕاکێشانی کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان بۆ لای سۆڤێت و... ئەگەر کۆمارێکی جیاوازیان بۆ پێك نەهێنرابایە، کۆمارێکی ئۆتۆنۆمییان بۆ بەرقەرار کرابایە. بەپێچەوانەوە، کوردو نیشتمانی جۆراوجۆری سەدان ساڵەی باووباپیرانیان، بەسەر کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیا و جۆرجیادا دابەش کران و، وەك خەڵات و دیاری پێیان دران. بگرە لە چوارچێوەی یەکێك لەو کۆمارانەیش نەهێڵرانەوە، چونکە ئەگەر کورد بمایەتەوە، قورساییەکی دەبوو. دەبوایە وەك گەلانی دیکە قەوارەیان هەبوایەو، بەپێی دروشم و بانگەوازە درۆزنانەکەیان کە گەلانی سۆڤێت مافی چارەنووسینیان بەدەست خۆیانەو...، وەك گەلانی دیکە هەمان مافی یەکسانیان هەبوایە. کوردیش وەك گەلانی دیکە داوای ئەو مافانەی دەکرد، بەڵام سەرکوتکردن و ڕاونان و تواندنەوەی یەك لەدوای‌یەك و بڵاوەپێکردنیان، بواری بەم گەلە چەوساوەیە نەدا داوای مافی خۆی بکات و ڕاپەڕێ. ڕژێمەکانی ڕووسیاو سۆڤێت (لەگەڵ ڕژێمە خۆجێییەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستاندا) هەمیشە سەرژمێری ڕاستەقینەی کوردەکانی پشت قەفقاسیان ئاشکرا نەکردووە، تا ئابڕووی خۆیان نەچێ و، کەس پرسیار نەکات بۆچی ئەم گەلە بەو ژمارە زۆرەوە هیچ مافێك و قەوارەو بەڕێوەبەرێتی جیاوازی نییە، لەکاتێکدا زۆر گەل کە ژمارەیان لە کورد زۆر کەمتر بووە، قەوارەیان بۆ پێك هێناون! سەرچاوە مێژووییەکان، مێژووی جێگیربوونی گەلی کوردی لە هەرێمی قەفقاسدا لە هی زۆر گەلی دیکە کۆنتر داناوە. کورد، بە پێچەوانەی زۆر گەلی

هەرێمی قەفقاسەوە کە خاوەنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی خۆیان بوون، لەبەر دەسەڵاتدارانی ڕووسی و سۆڤیێتی ئەو مافانەی نەبوەو، هەڵهاتووە بۆ ژێر دەسەڵاتی تورك و ئێران.

بوکشپان دەڵێت: سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ڕووسیا لە قەفقاس، زانیارییەکی ئەوتۆی کەم یا زۆری لەڕاستییەوە نزیك، لەسەر سەرژمێری کوردەکان لەبەردەستدا نییە. لەبەرئەوە دەوری کوردەکانی ئازەربایجانی ئەمڕۆ (و هەرێمی ئەلیزاویتەپولی پێشوو) لە ناوچە سەر سنوورەکاندا، بووە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتی ڕووسیا تەنیا وەك هێزێکی لەشکری کەڵك لە کوردەکان وەربگرێ دژی دراوسێکانی و، کوردەکانی ئەلیزویتەپولی لەوانی دیکە، واتە بەناو دانیشتوانی موسڵمان، جیا نەکردوەتەوە[٦١].

ئاڤیریانوڤیش لە کتێبی"کورد لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ ئێران و تورکیادا" لەم بارەوە نووسیویە: ((کوردەکانی هەرێمی ئەلیزاڤیتەپۆل بە یەکجاری لە کوردەکانی دیکەی ڕووسیا (کوردە ڕووسەکان) دابڕاون، لەبەرئەوە دەکرێ بڵێین ئەوان بەهۆی چیا سەختەکانەوە، ناوچە بێ ڕێگەکانی نیشتەجێی کە پانتاییەکەی ١٣٠-١٥٠ فەرسەخە، لە کوردەکانی هەرێمی ئیرەڤان جیاکراوەتەوە. بۆیە لەبەر ئەم دوورکەوتنەوە یا دابڕانەیان لەیەکتر، بێگومان بایەخی سیاسی ئەوانی لە ئۆپیراسیۆنەکانی لەشکری ئێمەدا دژی تورکیاو هەروەها ئێرانیش نەهێشتووە. ئەگەر بێتوو شەڕمان لەگەڵ ئەم وڵاتەیشدا ببێ، دەکرێ بڵێین هیچ دەورێك نابینن، لەبەرئەوەی ئەوانە کەوتوونەتە ناوچەی قووڵ و کوێرو دووری بەشی هەرێمی ئەلیزاویتەپول))[٦٢].

بوکشپان لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەوە لەم بارەیەوە دەڵێ: ((پێویست بە وتن ناکات کە ئەم بارودۆخەی کوردەکان لەم بارەیەوە دەورێکی چارەنووسسازی بینی و، تەنانەت کوردەکانی ئازەربایجانیش سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیان بەرچاو بوو، هیچ

---

[٦١] بوکشپان، هـ.س، ل٥٨.

[٦٢] ئاڤیریانوڤ، ل٣٢٥.

بایەخێکیان پێ نەدرا. بۆیە لەم بارەیەوە مرۆڤ سەری لەو سەرژمێریانەی کوردەکانی ئازەربایجان سوڕ دەمێنێ کە هەندێ نووسەرو سەرچاوە داویانەو، نازانێ کامیان ڕاستە یا لە ڕاستییەوە نزیکە. بوکشپان ئاماژە بە هەندێکیان دەکات:

ئاڤیریانوڤ ژمارەی کوردەکانی هەرێمی ئەلیزاڤیتەپول لە کۆتایی سەدەی ١٩دا، بە ٣٥-٤٠ هەزار کەس داناوە. پاڵکۆڤنیك کارتسوێش بە ٣٤١٦١ کەسی داناوە. بەپێی هەر ئەو سەرچاوەیەی کە دیرر، ئا. م ئاماژەی پێ دەکات، واتە (ساڵنامەی قەفقاس)، سەرژمێرییەکی تەواوی دیکەمان لەسەر ئەو کوردانەی کە بە زمانی زگماکی خۆیان دەدوێن بەدەستەوە دەدات. هەڵبژاردە یا وێنەیەکی ئەو خشتانەتان دەخەینە بەرچاو کە کۆمیتەی ناوەندیی سەرژمێرەکان لە ١٩٥٠دا دەری کردووە، کە بەپێی سەرژمێری ١٨٩٧ ئامادەکراوەو بەناوی "دابەشبوونی دانیشتوانی قەفقاس بەپێی زمان لە سەرژمێری ١٨٩٧دا"وە (بڕوانە تابلۆو خشتەکانی ژمارە ١و ٢و ٣)[٦٣].

سەرژمێری ١٨٩٧ کە بنەمایەکی ڕاستی نییە، ئەو کوردانە دەگرێتەوە کە بەزمانی زگماکی خۆیان دەدوێن. ئەی ئەوانی دیکە کە یا زمانی کوردی نازانن و یا لەبەر ترس و گەلێك هۆی دیکە خۆیان سەر بە زمانەکانی دیکە یا نەتەوەکانی دیکە نووسیوە؟! ئەی ئەو کوردانەی کە بە وتەی خۆیان هەندێکیان لە ناوچە شاخاوی و دەست پێڕانەگەیشتوو و بێڕێگەدا دەژین و، فەرمانبەرانی کۆمیتەی سەرژمێریکەریان پێنەگەیشتووە؟! ئەم سەرژمێریانە هەموو ناوچەو گوندی کوردنشینی پشت قەفقاسیان نەگرتوەتەوە.جگە لەوەی کە فەرمانبەرانی کۆمیتەی سەرژمێری ناوچە، لەو نەتەوە دەسەڵاتدارانە بوون کە بەدرێژایی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی خۆیان نە بەکردەوەو نە بە دەم و نووسین دژایەتی کوردیان نەشاردوەتەوەو ژمارەی کوردیان هەمیشە کەم نووسیوە.

لە سەرژمێری ١٩١٧دا بە پێی دین، سەرژمێری کورد کراوە، واتە محەمەدی (موسڵمان) و ئێزدی، نەك نەتەوە. بوکشپان ڕەخنەی توندی خۆی ئاڕاستە دەکات و

---

[٦٣] بوکشپان، هـ.س، ل٥٩.

دەڵێ: بۆ تائێستایش ئەم جیاوازی و دابەشکردنە هەر بەردەوامەو، بووە بە بنەمای سەرژمێرەکانی سۆڤێتی[٦٤]. بە ڕەحمەت بێ بوکشپان نەما تا دواتر درێژە بە بەرهەمەکەی خۆی بدات و بە چاوی خۆی ببینێ ئەمڕۆ چۆن کوردی ئێزدییان بە نەتەوەیەکی جیاواز داناوە، زۆر دڵگران دەبوو ئەگەر لە سەردەمی ئەودا ئەو کارە کرابایە، کوردی موسڵمان (محەمەدی)و کوردی ئێزدی بە جیا بنووسرێن، وەك ئەمڕۆ کراونەتە دوو نەتەوەی جیاوازو، بووە بە سیاسەتی ڕەسمی کۆماری ئەرمینیا.

خوێنەرانی بەڕێز دەبێ ئەوەیان لەپێش چاو بێ کە مێژووی سەرژمێریەکانی دنیا، بەتایبەت سەرژمێریەکانی سەردەم، پرسیاری زۆر بەپێی پێشکەوتن و دواکەوتنی وڵات و ڕژێمەکان، لە ئانکێتی پڕکردنەوەی فۆرمی سەرژمێریەکاندا کراوەو دەکرێ. من نامەوێ لێرەدا بەوردی لەو بارەیەوە بدوێم. من دژی ئەوە نیم لەگەڵ پرسیاری نەتەوەبووندا، پرسیاری ئولی و زمان و ئیش‌وکارو ئاستی خوێندن و داهات و... لە دانیشتوان بکرێ، تەنانەت دژی ئەوەیش نیم مرۆڤ ئازاد بێ و خۆی بە نەتەوەیەکی دیکە بنووسێ. بەڵام لەم سەرژمێریانەی دەسەڵاتدارانی ڕووس و سۆڤێتی و ڕژێمە خۆجێییەکانیاندا لە هەرێمی قەفقاس بە ئەنقەست و بە مەبەست ساختە کراوەو، گەلێك پیلان لەپشتیەوە هەبوە بۆ تواندنەوەی گەلان و بێ قەوارەکردنیان. ڕژێمە دواکەوتوو و ڕەگەزپەرستەکانی داگیرکەری کوردستان، تائێستایش هەر درێژە بەو ڕێبازە گڵاوەی پێشینانی خۆیان دەدەن.

بەپێی سەرژمێری ١٨٩٧، ژمارەی کوردی پشت قەفقاس ٩٩٨٣٢ کەس بووە:

١. کوردی قەفقاس بەپێی سەرژمێری ١٨٩٧:

| ناوچە | پیاو | ژن | سەرجەمی نێرو مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| هەرێمی باکۆ | ٦ | ٢ | ٨ | |
| داغستان | ١١ | ١١ | ٢٢ | |
| هەرێمی ئەلیزافیتەپول | ١٦٦٣ | ١٣٧٩ | ٣٠٤٢ | |
| ناوچەی قارس | ٢٢٦٣٢ | ٢٠٣٣٦ | ٤٢٩٦٨ | |

(٦٤) بوکشپان، هـ.س، ل٦٠.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| هەرێمی کوتائیسی | ٩٣٥ | ٨٨٩ | ١٨٢٤ | |
| ناوچەی تیرسکی | ١٣ | ٦ | ١٩ | |
| هەرێمی تیفلیس | ١٤٠٠ | ١١٣٨ | ٢٥٣٨ | |
| شاری چورنەمو | ٢٢ | – | ٢٢ | |
| هەرێمی ئیرەڤان | ٢٦٢٣٩ | ٢٣١٥٠ | ٤٩٣٨٩ | ٩٩,٨٣٢ |

## ٢. سەرژمێری کوردی پشت قەفقاس تا ١٩١٦/١/١:

| ناوچە | محەمەدی (موسلمان) | ئێزدی | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| هەرێمی باکۆ | ٥٠١ | ١٩١ | |
| هەرێمی ئەلیزاوێتەپول | ٣,٨٠٢ | – | |
| ناوچەی باتوم | ٥٥٢ | – | |
| ناوچەی قارس | ٤٩,٧٥٢ | ١٧,٦٩٨ | |
| هەرێمی تیفلیس | ٥,٩٣٢ | ٤,٦٩٧ | |
| هەرێمی ئیرەڤان | ٣٦,٥٠٨ | ١٢,٦٢٤ | |
| کۆی گشتی | ٩٧,٠٤٧ | ٣٥,٢١٠ | ١٣٢,٢٥٧ |

| | سەربە ناوی شووڕای گوند | ناوی گوند | ژمارەی دانیشتوان | بە زمانی کوردی دەدوێن | ناوی تایفەو بنەماڵە (خێڵ) بە سەرەکیەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ناوچەی لاچین | عەبداللەر | زیرتی (زرتی) | ٢٢٩ | ٢٣٩ | فاتو- ئەڵلاوێردی شاهسوارلی- تارولی (شاە وێردیلەر)، مامەلی شەرەفلی، کراڤلی، شەرەفلی لیزگی، میری، کوچەری سەفی قولی، ئاغەلی ئوغلی (ئیسماعیللەر، ئەسەدلەر، خودیلەر) ئیسخانلەر، مەمەدلەر شەفیقلەر، چیچکلەر |
| | مین کەند | مین کەند | ١٢٥٥(لەوانە ٥٩ یان تورکن) | ٧٦١ | |
| | بوزلو | بوزلو | ٣٥٠ | ٣٥٠ | |
| | | کەمالی | ٤٠٥ | ٤٠٩ | |
| | | قەلاجە | ٦٩ | ٦٩ | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | چراغ لی | ١٩١ | ١٩١ | |
| | ئاغجەکەند | ئاغجەکەند | ٢٣١ | ٢٣١ | |
| | قەرەکشیش | قەرەکشیش | ٤٧٥ | ٤٧٥ | |
| | | شیلانلی | ٢٩٠ | ٢٩٠ | |
| | | کاتوس بنیا | ٣٠ | ٣٠ | |
| | | چای بنیا | ٢٠ | ٢٠ | |
| ناوچەی کاغیزمان | چیراخ | شورتان | ٣١٥ | ٣١٥ | نەقیلی، گوتی (گوتیدی) حوسەین قوڵلەر، قولوق کور نیژیکلی، عەلی ڕەزالی، میرگلی، کەچیرلی، قەرەخانلەر، حوسەینلەر، مایلەر، میشادیلەر، ئەلیاسلەر، شوکورلەر. |
| | | سویوغ بولاخ | ١٨٩ | ١٨٩ | |
| | زارس | زایلیك | ٥٨١ | ٥٨١ | |
| | ئاغجەکەند | ئاغجەکەند | ٤٤٠ | ٤٤٠ | |
| | | ئوروجلو | ٢٩٤ | ٢٩٤ | |
| | | خەلانلی | ٢٥٦ | ٢٥٦ | |

(ئەمە بەپێی زمان). کەچی پاش بیست ساڵ، واتە بەپێی سەرژمێری ١٩١٧، ژمارەیان بەپێی دین و مەزهەب (موسڵمان و ئێزدی) ١٣٢٢٥٧ کەس، واتە ٣٢٤٢٥ (سیودوو هەزار و چوارسەد و بیستوپێنج کەس) زیادی کردووە. ئەگەر بەپێی ئەم ڕێژەیە ژمارەی کورد زیادی کردبێ، یا بەپێی زیادبوونی سەرژمێری گەلانی قەفقاسو سۆڤێتی پێشوو بەگشتی زیادی کردبێ، دەبێ چەند بن؟! دەبێ ئەوە لەبەرچاو بێ کە کوردی قارس ژمارەیان یەکجار زۆرەو، قارس بەپێی پەیمانی ١٩٢١ دراوە بە تورکیا.

بوکشپان دەڵێت: سەرەڕای ئەوەی ئەم سەرژمێریانە کە بە شێوەی جۆراوجۆر (بەپێی زمانی زگماك لە ١٨٩٧دا، یا دین لە ١٩١٧دا)و لەسەر بنەمایەکی یەکگرتوو نەدراون، مرۆڤ سەری لێ دەشێوێو ناتوانێ ئەنجامێك بەدەستەوە بدات. بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەم ژمارە زۆرەی کورد، بەرچاوەو کاریگەریی لەسەر دیاریکردنی قەوارە یا ناسنامە یا جیاکردنەوەی کوردستان بە بەڕێوەبەرێتییەکی

یەکگرتوو هەبوە، چونکە زۆربەی هەرە زۆر یا زۆربەی دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان، بەپێی سەرژمێریەکان کورد بوون و، لایەنگرانی گەلاڵەی جیاکردنەوەی کوردستان نەیانتوانی کەڵك لەم تاکە ڕاستییە کە لەدەستیاندا بووە وەربگرن و، بەجێی بگەیەنن (یا بیسەپێنن بەسەر گەلاڵەو بۆچوونەکانی دیکەدا، هەورامی). بەلام بوکشپان دەڵێت: ((بەلام وەك لە خوارەوە دەبینین، ئەم بۆچوونەی ئەوان بناغەیەکی پتەوی نەبوو)):

((ئەو بۆچوونە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێ، کە گوایە دانیشتوانی ناوچەی کوردستانی پێشوو زۆربەی هەرەزۆری کوردەو، بە چەشنێك تۆمارکراوە کە تائێستایش هەر لەسەر ئەو بیروباوەڕەن و بەسەر بۆچوونەکانی دیکەدا زاڵە. جێی سەرسوڕمانە کە بەپێی ئەو سەرژمێرییە نزیککراوەیەی کۆمیتەی پلاندانانی کۆماری ئازەربایجان کە لەکاتی گەشتەکەمدا دەستم کەوت، ژمارەی کوردەکانی ناوچەی لاچین ٩٩,٢٪ و هی ناوچەی کەڵباجار ٩٩,٥٪ و، هی تورکەکان لە هەردوو ناوچەکەدا ١٨٠(!) کەسە، واتە ١٠٨ کەس لە ناوچەی لاچین و ٧٢ کەس لە کەڵباجار.

بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦، کە هاوڕێ ئەلیاسوۆ ژمارەی کوردەکانی ئەوێی بەپێی زمانی زگماك ئامادە کردووە، ژمارەی کوردی پێنج (ناوچە)ی بەم شێوەیە بووە:

| ناوچە | ژمارەی گشتی | ژمارەی ئەوانەی کە بە زمانی زگماك دەدوێن |
|---|---|---|
| ناوچەی قەرەقشلاق | ٦٠٣٣ | ١٧٥٨ |
| ناوچەی کەڵباجار | ١١٩٩٣ | ١٤٣٨ |
| ناوچەی کوردخاجین | ٨١٧٣ | ٦٩١ |
| ناوچەی مورادخانلی | ٦١٥٩ | ٤٢٩ |
| ناوچەی قوتورلین | ٥٨٨٥ | ٩٥٥ |

ژماری کوردەکانی ناوچەی قوباتلین بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦، لە باری ژمارەو لە زمانی زگماکەوە، دووسەد کەسە. ژمارەی گشتی کوردستانی ئازەربایجان، بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦، بە ٣٧,١٨٢ کەس دیاری کراوە کە ٧٢,٢٪ی ناوچە

کوردنشینەکانی ئازەربایجان پێك دێنێ، بەڵام لەوانە تێکڕا ۳۱۲۳ کەسیان بەکوردی دەدوێن[٦٥].

نووسەر ڕەخنە لەو سەرژمێرییانە دەگرێ کە ۹۹,۲٪ی دانیشتوانی ناوچەی لاچین و۹۹,٥۹٪ی دانیشتوانی کەڵباجاڕ کە کوردن،بەپێی سەرژمێری ۱۹۲٦ گوتراوە ۷۲,۲٪ی دانیشتوانی کوردستانی ئازەربایجان کوردن. هەرچۆنێك بێ، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردستانی ئازەربایجان کوردن. ئەو بۆچوونانەی دیکەی نووسەر کە پێشتر ئاماژەمان پێکردوون، ژمارەی کورد سەرباری ڕاونان و تواندنەوەو گوێزانەوەو چەوسانەوەی هەمەلایەنە، زۆر زیاترە لەوەی کە سەرژمێرییە ڕەسمیەکانی سۆڤێتی داویانە. بەڵام لەبەر ئەوەی سەرژمێریەکان هی سەرەتای دامەزراندنی کوردستانی ئازەربایجانن، زۆر لەسەری ناڕۆن، چونکە نووسەر بۆ خۆی لە جێگەیەکی دیکەدا دەڵێت: کوردستانی ئازەربایجان پێش ئەوەی ناسنامەو قەوارەی هەبێ، زۆربەی هەرە زۆری کورد خۆیان بە تورك دادەنا، بەڵام پاش ئەوەی ترسیان نەما بەپێچەوانەوە زۆربەی هەرە زۆریان خۆیان بە کورد دانا. لەلایەکی دیکەوە قوتابخانە بۆ فێربوونی زمانی کوردی کرایەوەو گەشە بە کولتوورو هونەری کوردی درا. بەپێی ئەو ئامارانەی کە نووسەر لەسەر ئەو پێنج ناوچەیە داونی، ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی ئازەربایجان بەپێی سەرژمێری (۱۹۲٦) ۳۸,٤٤۳ کەسە، نەك ۳۷,۱۸۲، جگە لە کوردی ئەرمینیاو جورجیا. هەر بەپێی ئەم سەرژمێرییە تەنیا ۳۱۲۳ کەسیان بە زمانی کوردی دەدوێن، واتە لە ۱۲ کەس یەك کەسیان. ئەمە بۆ خۆی هەمووشتێك دەگەیەنێ و، چەوساندنەوەو تواندنەوەو ترس و...بێگومان لە سەرژمێریەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، واتە بە کەم نووسراون).

نووسەر لە خشتەی ژمارە ۳دا کە بۆ خۆی دایناوەو، لە ئەنجامی گەشتەکەیدا پاش تێپەڕبوونی ٥ ساڵ بەسەر سەرژمێری یەکەمی سۆڤێتدا، واتە ۱۹۲٦، بەو ئەنجامە دەگات کە کوردەکان چیدی خۆیان بە نەتەوەی دیکە دانانێن و زمانی کوردی بە زمانی سەرەکی یا زگماکی خۆیان دادەنێن.

---

[٦٥] هەمان سەرچاوە، ل٦١.

((گەورەترین گوندی ناوچەی لاچین کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەم ناوچەیە، واتە گوندی مینکەند، بەشێکی دانیشتوانی تورکن، لەو تورکە هەڵهاتوانەن کە ساڵی ۱۹۱۹ لە ئەرمەنستانەوە کاتی دەسەڵاتدارایێتی و دژایەتی موساوات و داشناکەکان هاتوونەتە ئێرە [٦٦].

گوندی کاری کاخ کە گوندێکی کوردییە، لە۲۸۰ کەسی دانیشتوانی، ئێمە تەنیا ٥ کەسمان لەناویاندا بینی زمانی کوردییان لەبیر مابێ و، ئەویش بەزەحمەت لەبیریان ماوە(دوو پیاوی تەمەن بەساڵاچوو و سێ پیرەژن) و، هەموو دانیشتوانی تورکن و بە تورکی قسە دەکەن. لە گوندی میریکیش کە ژمارەی دانیشتوانی ۳۷٤ کەسە و لە۷ تایفە یا بنەماڵەی کورد پێك هاتوون، هەموو بە زمانی کوردی قسەدەکەن. جگە لە هەندێ بە ساڵاچوو کە زمانی کوردییان لەبیرماوە، ئەویش بەخراپی لەبیریان ماوە.

۱. تایفەی ئاپورلو ۷ کەس.

۲. دەمولەر ۲ کەس.

۳. کالی لەر ۳ کەس.

٤. ڕوتوکلو ۳ کەس.

٥. قەرەخالەر ٥ کەس.

٦. ئەحمەدلی۱ کەس.

۷. ئیمایلی۱۰ کەس.

سەرجەم ۳۱ کەس، واتە ۲۰ پیرەژن و ۱۱ پیرەمێرد.

گوندی تاتارلەری سەر بە شووورای گوندی کیشات کە ژمارەی دانیشتوانی ۲۲٥ کەسەو سەر بە تایفەکانی شانالی جەعفەرلین، تەنیا ٤۰ کەس زمانی کوردییان لەبیر ماوەو، ئەوانەی کە تەمەنیان لە ٤۰ ساڵ زیاترە، بە زمانی کوردی دەدوێن [٦٧].

---

[٦٦]. سەرچاوەی پێشوو، ل٦۳

[٦٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

# ڕوونکردنەوە

لە کۆمەڵە وتارو لێکۆڵینەوەیەکدا کە هەندێکیان پێشتر بڵاوکراونەتەوە، هەوڵم داوە بەپێی بەڵگەو سەرچاوەی نوێ بۆ توژینەوەی مێژووی کوردەکانی سۆڤێت هەنگاوێك هەڵبگرم و بەرپەرچی ئەو بۆچوون و نووسینانە بدەمەوە کە تا ڕووخان و، بگرە پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریی سۆڤێتی، گەلێك درۆو دەلەسەیان سەبارەت بە کوردەکانی سۆڤێت دەردخواردی خوێنەرانی کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان داوەو، گوایە کوردی سۆڤێت وەك گەلانی دیکە خاوەنی ماف یەکسان و... و، کوردی ئەوێ کوردی دنیایەکی دیکەیەو بەختەوەر و پێشکەوتوون و، ئەوەی بۆ کورد کراوە لە هیچ وڵاتێکی دیکەی دنیادا نەکراوەو، گەلێك درۆی شاخدارو هەڵبەستراوی لەو چەشنە.

جێی داخ و کەسەرە، نووسەرانی ئەو بابەتانە (چ کوردو چ سۆڤێتی) خۆیان شاهیدی ئەو تراژدیدیانە بوون، یا لانی کەم ئاگاداریان بوون یا بۆیان گێڕاوەتەوە. کەچی بە وتارێکیش لە سەردەمی پیریسترۆیکای گۆرباچۆڤدا ئەم تاوانە گەورەیان لەقاو نەدا، بەتایبەت کوردناس و ڕۆژهەلاتناسەکانی سۆڤێت کە توێژینەوەیەکی بابەتیانەو زانستیایانەیان تەرخانی کێشەی کوردەکانی سۆڤێت نەکرد، لەکاتێکدا بەناو چەند ناوەندێکی کوردناسییان هەبوو و، دەرگای ئەرشیڤەکانی سۆڤێتیش کرابوونەوەو ئازادی دەربڕین و نووسینیش هەبوو، ترسی کوردەکانیش تاڕادەیەك شکابوو تا چۆنیەتی بەسەرهاتی خۆیان بۆ ناوەندو بەشە کوردناسەکانی سۆڤێت باس بکەن (چ لە ئاستی پەیمانگەو زانکۆکان و چ ئاستی کۆمارو شارەکاندا). پێویستە بگوترێ بەشێك یا ناوەندێکی سەربەخۆی تایبەت بە کوردناسی کە دامودەزگاو شوێن و... هەبێ، ساڵانە بودجەی جیای بۆ تەرخان بکرێ و، قوتابی وەربگرێ و کادیر بۆ داهاتوو پەروەردەبکات و، گۆڤارێکی وەرزانە یا ساڵانەی هەبێ و، کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینار لەسەر کێشەی کوردو بەشەکانی کوردستان ڕێك بخات، یا پەیوەندی و

هاوکاریی لەگەڵ ناوەندە کوردناسیەکانی دەرەوەدا هەبێ و بانگی یەکتر بکەن، نەبوەو تائێستایش نییە. تائێستا ئەم بەش یا ناوەندە کوردیانە کۆڕێکیشیان بۆ کێشەی کوردەکانی سۆڤێت نەبەستووە.

گوتمان بەش یا ناوەندێکی کوردناسی لە سۆڤێت نەبوو، ئەوەیش کە هەبوە بە ڕواڵەت بووەو یا لە ژوورێکدا (بەبێ تابلۆ) و، ناویان کامنیدرا( ) یا بە لابراتوریا ( ) یا گرووپی کوردناس بووەو، لە بەشی ڕۆژهەڵاتناسی پەیمانگە یا زانکۆکاندا یا بەشی ئێراننناسی یا زمانە ئێرانیەکاندا بووە. وەك ئاشکرایە زلهێزو وڵاتە کۆلۆنیالیستەکانی ڕۆژئاوا بە ئیمپراتۆریەکانیانەوە گەلێك ناوەندو مەڵبەندو بەشی لێکۆڵینەوەیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە وڵاتانی خۆیاندا لە سەر وڵاتان و گەلانی جیهان بنیات ناوەو، جگە لە لێکولێنەوە ئابووری و عەسکەری و سیاسیەکان، لێکۆڵینەوەی مێژوویی و زماننناسی و کولتووریش دەکەن‌و، خزمەتێکی گەورە بوون بۆ ناساندنی ئەو گەلانەو کادیری زۆریان بۆ پەروەردە کردوون کە دەورێکی باڵایان لە پەیوەندیەکانی هەردوولادا گێڕاوە.

جگە لەو ناوەندو مەڵبەندانە، لە ڕێگەی باڵیۆزخانەو کونسوڵخانەو دەزگا سیخوڕی‌و ناوەندە کولتووریەکانیانەوە لێکولێنەوەی هەمەلایەنە لەسەر گەلان و وڵاتانی جیهان دەکەن‌و. لەکاتی پێویستدا دەتوانن کەڵکیان لێ وەربگرن بۆ بەرژەوەندی خۆیان. کوردناسی سۆڤێتیش هەر ئەو مەبەستەی هەبوە. نزیکی جوگرافی کوردستان لە سۆڤێت‌و ئەندامێتی تورکیا لە ناتۆو دۆستایەتی ئێران لەگەڵ ڕۆژئاوادا، کارێکیان کرد بەرژەوندی ئەم وڵاتە لەوەدا بێ کە نەك تەنیا ئاگای لە بارودۆخی کوردستان بێ، بەڵکوو تا بۆی بکرێ بزووتنەوەکەی بەرەو لای خۆی ڕاکێشێ و، لەباری سیاسیشەوە بیخاتە ناو بازنەی سیاسەتی دژی ڕۆژئاوای خۆی و بە نووسینی کتێب و چاپەمەنی لەسەر کێشەی کوردو پەرەوەردەکردنی کادیر کەش‌وهەوایەکی لەباری بۆ خۆی لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دروست کرد. لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری و هێزە سیاسیەکانی دژی ئەو ڕژێمە داگیرکەرانەی کە لەلایەن ڕۆژئاواوە پشتیوانی

دەکران و بەرامبەر بە کێشەی کورد بێدەنگ بوون، لایەنگریی سۆڤێت و بیرو بۆچوونی چەپ برەوی زۆر بوو. لەڕاستیدا، سۆڤێت توانی زۆربەی هێزەکانی کوردو بیروڕای گشتیی کورد بەرەولای خۆ ڕاکێشێ، پرۆگرامی هێزە سیاسیەکانی کورد شاهیدی ئەم ڕاستییەن.

بەرهەمی زۆربەی کوردناسەکانی سۆڤێت پێش ئەوەی زانستیانەو مێژوویی و بابەتیانە بێ، ئایدۆلۆژیانەو بەمەبەست بووەو، بەگشتی سۆڤێت توانی بزووتنەوەی کورد لە پەیوەندی گرتنی بە ڕۆژئاواوە دابڕێ و دووری بخاتەوە. لێرەدا مەبەستم نییە بڵێم ئەوەی کە لە بارەی کوردناسییەوە لە سۆڤێت کراوە، بێکەڵك بووە یا شتێکی ئەوتۆ نەکراوە. نا، گەلێك مرۆڤی ڕووناکبیرو بەتواناو پسپۆر لەناو کوردەکانی سۆڤێتدا هەبوەو هەیەو ویستویانە گەلێك شت بکەن. بەڵام بواریان نەدراوە و پشتیوان و هاوکارییان نەبوە، یا بەشی ئێرانناسی یا زمانە ئێرانیەکان کردوویەو لەلایەن دەوڵەت نەکراوەو هان نەدراوە. کوردەکانی سۆڤێت لەپێناوی خزمەتی نەتەوەکەیاندا ویستویانە گەلێك هەنگاو هەڵبگرن، بەڵام بەربەست کراون و، بگرە هەندێك ڕووناکبیر بە تاوانی جۆراوجۆر زیندانی یا دوورخراونەتەوەو لە ئیش‌وکار دەکراون. گوێزانەوەی زۆرەملێی کوردەکانی سۆڤێت بۆ کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو و، دابڕانیان بە سەدان هەزار کیلۆمەتر لەیەکتر، نموونەیەکی ئەو بارودۆخەیە. ناوەند یا مەڵبەندێکی کوردی نەبوە کە بتوانێ پەیوەندییان لەگەڵدا بکاو چاپەمەنی و کتێبی قوتابخانەو... یان بگەیەنێتە دەست و، ڕێنوێنی و سەرپەرشتییان بکات، یا کادیری وتنەوەی زمانی کوردی و مامۆستاو... ئامادەبکات. ئیتر باسی ئەوەیش ناکرێ کە کوردەکان لەو کۆمارانەدا بە زمانی قرقیزی و کازاخی و ئۆزبەکی و ئەرمەنی و ئازەری و ڕووسی و جورجیایی و تورکمانی و.. خوێندوویانە. پاش هەڵوەشانەوەی سۆڤێتیش، کوردەکانی سۆڤێت نەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ شوێنی باووباپیرانیان و هەوڵی داواکردنی مافە زەوتکراوەکانی خۆیان بدەن و، قەوارە یا ناوەندێك بۆ خۆیان پێکەوە بنێن. نەك هەر نەیانهێشت بگەڕێنەوە، بەڵکە باری ئابووری و سیاسی ڕژێمە

ناسیونالیستەکانی ئەو کۆمارانە دەرفەتیان پێنەدان بگەڕێنەوە. ئەو کتێب و چاپەمەنیانە کە پێشتر لە بواری زمان و چیرۆکدا بە زمانی کوردی نوسرابوون، لەبەر نەزانینی زمانی کوردی لێی بێبەهرە بوون و پێیان نەگەیشتووە. گەلێك پرسیارم لەم بارەوە لە کوردەکانی سۆڤێت کردووە، تەنانەت یەکێکیان دەیگوت ئێمە تائێستا کتێبێکمان لەسەر مێژوو و ئەدەبی خۆمان بە هیچ زمانێك نەدیتووە.

# ژمارەی کوردی سۆڤێت
# لە سەرژمێریەکاندا

بەپێی سەرچاوە ڕووسی و تورکیەکان، لە ئەنجامی شەڕەکانی ڕووسیا- تورکیاو ڕووسیا- ئێران لە سەدەی نۆزدەهەمدا، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی قەفقاس (بەتایبەت لە نیوەی سەدەی ١٩دا) ئاوارەی تورکیاو ئێران و وڵاتانی دیکە بوون،و، کوردیش بەشی تێدا هەبوو. جگە لەوە، ژمارەیەکی زۆری گەلانی ئەم ناوچەیە بەهۆی ئەو شەڕانەوە تووشیماڵویرانی و کوشتار بوون،و، پاشان یەکەمین جەنگی جیهانی،و، شۆڕشی ئۆکتوبرو جێگربوونی دەسەڵاتی سۆڤێتی (ڕووبەڕبوونەوەی دەوڵەتانی ئازەربایجان"موساواتیەکان" و ئەرمینیا"داشناکەکان" و جۆرجیا"مینشەویکەکان" دژی دەسەڵاتداریەتی سۆڤێت، کە بە شەڕی ناوخۆ ناسراوەو، چەند ساڵێك درێژەی کێشاوە. ئەمانەو گەلێك هۆی دیکەی وەك برسێتی و وشکەساڵی و زیان گەیاندنی قەرەبوونەکراو بە ئابووری هەرێمەکە (لەژێر ناوی خەباتدا دژی کوڵاك و دەرەبەگ و دەوڵەمەندو...)، کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر دانیشتوانی هەرێمەکە داناو، لەبری زیادبوونی ژمارەیان، بەرەو کەمی چوون.

سەرچاوە کۆنەکان، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە هاتنی هۆزە تورك زمانەکان بۆ هەرێمی قەفقاس،و ناوەڕاست، تەنگی هەڵچنی بە دانیشتوانی ئەو هەرێمە، لەوانە گەلانی ئێرانی زمان (کوردو ئەسەتین و تاتەکان...) بەتایبەت لەنێوان سەدەکانی (١٠-١٤).

یەکەم سەرژمێری ڕووسیای قەیسەری (ئیمپراتۆری ڕووسیا) ساڵی ١٨٩٧ بەڕێوەچوو. بەپێی ئەم سەرژمێرییە، ١٤٦ نەتەوەو گەل لەم وڵاتە بەدی کرا. بەڵام

پاش شۆڕشی ئۆکتۆبر له ۱۹۱۷دا، یەکەم سەرژمێریی گشتی (۱۹۲٦) لەم ولاتەدا کراو، پتر له ۳٤ نەتەوەو گەل و زمان و زاراوە تۆمار کرا. زۆر له گەلانی تورك زمان له سەرژمێریەکاندا به تاتار نووسران. بۆ وێنه، له سەرژمێریدا ئازەریەکان به کازاق و قرقیز به قرقیز یا تورك نووسران. گەرچی کوردەکانی ڕووسیا له سەرژمێری ۱۸۹۷دا بەجیا نوسراون و ژمارەیان ۹٥,۹ هەزار (واته نزیك به سەدهەزار) کەسە، پاش سەد ساڵ هەر ئەوەندە نووسراون‌و هەر دەڵێی کوردەکان زاووزێیان نەکردووە، کەچی زۆر گەل هەیە لەودەمەوە تا ئەمڕۆ ژمارەیان ٦ تا ۱۰ ئەوەندە زیادی کردووە. فارس و یۆنانی و ئەرمەنی به زمانی ئەم بنەماڵەیە دانراون و، تاجیکی و ئەفغانی و کوردی و تالیش‌و تاتی و ئەسەتینی لەسەر زاراوەی بنەماڵەی زمانه هیندوئورووپاییەکان نووسراون. هەر بەپێی سەرژمێری ۱۸۹۷، گەر ژمارەی گەلێك لەو سەردەمەدا له ژمارەی کوردەکان کەمتر بووبێ، ئۆتۆنومی و قەوارەی خۆیان پێ دراوە. بۆ وێنه، ئەگەر بەپێی سەرژمێری ۱۸۹۷ بێ، ژمارەی کورد ۹۹,۹ هەزار و هی ئازەربایجان ۷۳,۱ هەزار کەس‌و چەرکەسەکان ٤٦,۳ هەزارو کاباردینەکان ۹۸,٦و ئینگوشیەکان ٤۷,٤ هەزارو کومیەکان ۸۳,٦ هەزار و قەرە چایڤیەکان ۳۷,۳ هەزار کەس بووە. ئەمڕۆ ژمارەی هەندێکیان دە بەرابەر زیاترەو تا ئەمڕۆیش قەوارەی خۆیان هەیە( بڕوانه: نەتەوەکانی یەکێتیی سۆڤێت، نووسینی کەزلوڤ. ڤ.ی، موسکۆ، ۱۹۷٥، ل۳٦و ۳٥).

لەلایەکی دیکەوە، هەندێ لەو گەلانەی سەرەوەو گەلانی دیکه که ئەمڕۆ بوونەته خاوەن قەوارەی نەتەوەیی خۆیان، پاش دروستبوونی"کوردستانی سوور" له ۱۹۳۳دا ئەم قەوارەیەیان پێ ڕەوا بینرا. کەچی کوردە کلۆلەکە، نەك تەنیا قەوارەکەی لێ سەندرایەوە (له۱۹۳۰دا)، بەڵکوو پەرەگەندە کراو له ولاتەکەی خۆی وەدەرنراو، بەسەر گەلێك کۆمارو شاری سۆڤێتی پێشوودا دوور لەیەکتر دابەش کرا. بەلشەویکەکان، که تووشی هەموو چەوسانەوەیەك ببوون و، تەنانەت به هاوولاتی پلەدوو له قەڵەم دەدران، ڕووسیای تزارییان به زیندانی گەلان ناودەبرد. هاوولاتی پلەیەك سلاڤیانەکان بوون که دەسەلاتیان لەدەستدا بوو و، له

نیوەی دانیشتوانی ئەم ئیمپراتۆرییە کەمتر بوون، کەچی هاتنە سەر حوکم. سەرەڕای بەڵێنی زۆر بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەکان، تاوانی ئەوتۆیان کرد کە وێنەی لە ڕژێمەکانی سەردەمدا نەبوو. من لێرەدا گەلی کوردی بن دەستی سۆڤێتم مەبەستە. کاتی دانانی سنوور بۆ کۆمارو ئۆتۆنۆمییەکانی سۆڤێت، گەلێك هەڵەو تاوانی مێژوویی کراو زوڵم‌وزۆرێکی لەڕادەبەدەر لە هەندێك گەل و نەتەوەی بچووك و گەورە کرا و، مافی هەندێ گەلیش لەبەرچاونەگیرا. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە هەندێك لەو گەلانە، بەتایبەت کورد، لە قەوارە خۆی بێبەش کراو، بەهۆی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەوە تووشی تواندنەوە بوو. دابەشکردنی سنوورە دەستکردەکان پاش تێکچوونی سۆڤێت، گەلێك شەڕی خوێناویی لەنێوان گەلان و کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوودا نایەوەو، ئەو کێشەیە تائێستا بەبێ چارەسەر ماوەتەوە. ئەو ناوچانانەی کە کێشەیان لە سەرە، دەبێ مافی زیاتر بۆ ئەو گەلە ڕەچاو بکرێ کە لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتوورییەوە دواکەوتوون‌و، یارمەتی هەمەلایەنەیان بدرێ. ئەمە کوردەکانی نەگرتەوە. بۆ وێنە، ناگۆرناقەرەباغ کە کوردستانی سوور دەکەوتە چوارچێوەی ئەم کۆمارە ئۆتۆنۆمییەو سەر بە ئازەربایجان بوو، کێشەی تێدا لەسەر ئەم هەرێمە هەبوو، چونکە جگە لە سێ نەتەوەی سەرەکی ئەرمەن و ئازەری و کورد، گەلانی دیکە لەوێ دەژیان؛ ئەو ناوچەیە بەناحەق خرایە ناو چوارچێوەی ئازەربایجان‌و، ئێستایش بەشەڕ لەلایەن ئەرمەنستانەوە داگیرکراوەو کورد بوو بە قوربانی ئەم دابەشکردنە ناسروشتییەو، هەر کوردەکەیش بێ‌پشتیوان و بێ‌پەناو بێ‌قەوارەو ماف مایەوە. ئەرمەنیەکان کۆماری خۆیانیان هەبوو، ئازەریەکانیش هەروا لەکاتی لێقەوماندا پەنایان دەبردە بەر کۆمارەکەی خۆیان، یا پشتیوانی و یارمەتییان دەدرا. کوردەکە بەیەکجاری لەوێ هەڵکەندراو، کێشەکە ئێستا بووەتە کێشەی نێوان ئازەربایجان و ئەرمینیاو، لایەنی سێهەم واتە کورد وەلانراوەو، هیچ کامیان باسی ناکەن و، دەزانن ئەو بەشەی کوردستان سەردەمانێك بە کوردستانی سوور ناسرابوو و، دانی پێدانرابوو. سەرەڕای هەموو سیاسەتی چەوسانەوەو تەنگ پێ‌هەڵچنین بەدرێژایی سەدەی ١٩و ٢٠، سەدی حەفتاوپێنجی دانیشتوانی کورد بوون، بەپێی

سەرچاوەی پێشوو، ژمارەی کوردەکانی سۆڤێت لە سەرژمێری ١٩٧٠دا هەشتاونۆ هەزارە، کە ٣٧ هەزاریان لە کۆماری ئەرمینیاو ٣١ هەزار لە کۆماری جۆرجیا دەژین. واتە لەو ٨٩ هەزار کەسە، ٥٨ هەزاریان (٧٠٪) لەم دوو کۆمارەدا دەژین. کەچی بەپێی سەرژمێریەکانی پێش دووەمین جەنگیی جیهانی، زۆربەی هەرە زۆری کوردەکانی سۆڤێت لە ئازەربایجان دەژیان. پاش شەڕ (کاتی شەڕ) زۆربەی هەرە زۆری کوردەکانی سۆڤێت بە فەرمانی ستالین لە ئازەربایجانەوە دوورخرانەوە بۆ کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و ئۆزبەکستان و قرقیزستان و سیبریا (ئیدی باسی کوردی تورکمەنستان ناکەم)و، جێگەیەکی زۆر زۆر کەمیان لەم سەرژمێریەدا هەیەو، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ژمارەی ڕاستی کوردەکاندا جووت نایێتەوە.

کوردەکانی سۆڤێت بەهۆی پەرواوزەبوون و دەرکردنەوە لە نیشتمانەکەیان، لە کۆمارو شارەکانی سۆڤێتی پێشوودا لەناو نەتەوەو دین و کولتووره جیاجیاکاندا دەژیان و، نووسینیان بە زمانی ئەو نەتەوانە بوو و قوتابخانەی کوردیو دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان بە کوردی، وەك ڕۆژنامەو گۆڤارو چاپەمەنی دیکەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن، نەبوو و تووشی تواندنەوە بوون. هەرچەند ئەنجامی سەرژمێریەکانی سۆڤێت، بەتایبەت ئەوانەی سەردەمی دەسەلاّتداریێتی ستالین کراون، لەلایەن زانایانی سیاسی و پسپۆڕی سەرژمێری و کێشەی نەتەوایەتییەوە لە سەردەمی سۆڤێت و پاش ڕووخانیدا، ڕەخنەیەکی زۆریان لێ گیراوەو، بگرە بەدرۆیش خراونەتەوە. لەم بارەیەوە، ئەو بەڵگە نهێنی و شاراوانەی کە دەیان ساڵ ڕووناکییان نەدیتبوو، هەندێکیان ئاشکرا کراون. ئەو بەڵگانەی کە پەیوەندییان بە سەرژمێریەکانەوە هەبوو، لەگەڵ ئەو فەرمانە نهێنیانەدا کە ڕێبەران و کاربەدەستانی سۆڤێتی داویانە، نیشانی دەدەن نەك تەنیا دەستکاری زۆریان تێدا کراوە، بەڵکوو ئاوەژوویش کراون.

بە تەماشاکردنی ئەنجامی ئەو سەرژمێریانە، زۆر زانیاری هەیە ئەو پرسیارو شتە گرنگانەی کە لە زانستی ستاتستیکا"سەرژمێری"دا هەیە، لە ڕیزی سەرژمێری کوردەکاندا نەنووسراون، یا خەتیان بەسەردا کێشراوەو جێگەکەیان بەتاڵە. لێرەدا شتێکی زیادو بێجێ نییە چەند پرسیارو لێکۆڵینەوەی خۆم ئاماژە

پێ بکەم، وەك پرسیارم لە چەند کوردی بە ساڵاچووی دانیشتووی کازاخستان، کە سەردەمی ستالین لە ئۆردووگا زۆرەملێکاندا ژیابوون. گوتیان ئێمە لەکاتی سەرژمێری ١٩٥٩دا هیچ پرسیارێکمان لێ نەکراوەو بەڵگەی سەرژمێرییان نەدیتووەو، ئەگەریش کرابێ، لەسەر لیستی دوورخراوەکانی کوردی ئەوێ کراوە کە لەژێر دەستی دەزگا داپڵۆسێنەکانی پۆلیس و ئاسایشدا بوون. لیستەکان پڕکراونەتەوە، تا بگەنە ئەوەی وەڵامی پرسیاری لیستی سەرژمێریەکان بدەنەوە: شوێنی لەدایکبوون، لەکەیەوە لێرەن، چۆن هاتوونەتە ئێرە، یا چۆن گەیشتوونەتە ئێرە؟، ئیش‌وکارتان چییە؟ چەند وەردەگرن، ئاستی خوێندەواریتان، چەند کەستان لەڕێ مردوون و....

زۆرجاریش لە سەرژمێریەکاندا، هەندێ کوردی ئازەربایجان و ئەرمەنستان لە ترسی گوشارو ئەزموونی تاڵی ڕابردوو و بۆ خۆلادان لە زۆر کێشەو تەنگ پێهەڵچنین، خۆیان بە نەتەوەی دیکە نووسیوە، یا لە ئەرمینیا خۆیان بە ئێزدی ناونووس کردووە. ئەم تراژیدیانە هەر بەردەوامە.

ڕژێمی سۆڤێتی کە ئەو هەموو هەراوهوریایەی لە دنیادا سازکردبوو و، پارتە براکانی لە جیهاندا ئەوەیان گەورەتر کردبوو کە کێشەی نەخوێندەواریی چارەسەر کردووە، لەکاتێکدا سەردەمی سۆڤێت و بەتایبەت ئێستایش ژمارەیەکی زۆریان نازانن ناوی خۆیشیان بنووسن. ئەمە وەك ئەوە بوو کە دەیانگوت کێشەی نەتەوەیی چارەسەر کراوەو هەموو گەلانی سۆڤێتی مافی یەکسانیان هەیە. ژمارەی گەل و نەتەوەکانی سۆڤێت بەپێی سەرژمێریەکان بەرەو کەم بوون چوون. وەڵامی ئەو پرسیارو ڕەخنانە بۆ هەندێ گەل و نەتەوە لە لیستی سەرژمێریەکاندا نەهاتووە و، ژمارەی هەندێ گەلیش بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن زیادی کردووە. پاکانە بۆ ئەم سیاسەتە نالەبارە کراوە، کەچی ئەم نالەبارییەیش بەپێچەوانەوە لەسەر کورد ڕەنگی داوەتەوە. بۆ وێنە، گوتوویانە: هەندێ گەل کە زمان و ڕەسەن و کەلەپووریان نزیکە، یا لە باری جوگرافیاوە نزیکی یەکتر یا تێکەڵ بە یەك بژین و بە یەك نەتەوە بژمێردرێن یا قەوارەیەکیان بۆ پێك هێنراوە. کەچی کوردەکەیان کردوەتە دوو

بەش، موسڵمان و ئێزدیو بە دوو نەتەوەی جیاواز دانراون. هەندێ گەلیان پێکەوە لکاندو قەوارەیەکیان بۆ پێك هێنان، لەبەر ئەوەی ناسروشتی و زانستیانەو ئارەزوومەندانە نەبوو، بە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریی سۆڤێتی ئەوانیش هەڵوەشانەوە. بۆ وێنە، چیچنی–ئەنگووشییەکان یا کاباردین و بالکارییەکان، قەرەچایف و چیرکیسەکان.

ئەم بەشە کە تایبەت بەو سەرژمێرانەیەو لە سەردەم و پاش ڕووخانی سۆڤێت چاپ و بڵاوکراوەتەوە، ئێمە تەنها سەرژمێری کوردەکانمان مەبەست بووە.

بابەتەکە زۆر گرنگ و پێویستەو، لێکۆڵینەوە پێویستی بە کات و دڵسوزی و توانای ماددی و بایەخدان هەیە. ڕۆیشتن بۆ لای کوردی قەزاخستانو ئوزبەکیستانو تورکمەنیستان و قرقیزستان و ئازەربایجان و ئەرمەنستان و ڕووسیاو ئۆکرائیناو گورجستان و شارو گوندەکانیان هەروا ئاسان نییە. نووسەر پتر لە ١٠ ساڵە چەند جارێك ئەم پێشنیارەی خستوەتە بەرچاوی هێزە سیاسیەکانی کورد. گرنگ بوو من پێشنیار بکەم تا خۆیان دەست بەکار بن، بەڵام مخابن. لە سەرژمێری١٩٣٧دا، واتە دووهەمین سەرژمێری دانیشتوانی سۆڤێت پاش هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور لە١٩٣٠ داو، یەکەم قۆناغی فەرمی (ڕەسمی) بەزۆر ڕاگوێزانی کوردەکانی سۆڤێت هەر لە ساڵی١٩٣٧ـەوە بەڕێوەچوو. بەپێی ئەم سەرژمێرییە، ٤٣٣٩٩ کورد لە یەکێتیی سۆڤێت دەژین [٦٨].

لەکاتێکدا بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦، ژمارەی کوردەکان لە تەواوی یەکێتیی سۆڤێت کە بەجیاو بە شێوەیەکی ڕەسمی نووسراوە، ٥٢٣٨١ کەس[٦٩] بووە. بەڵام هەر بەپێی ئەم سەرژمێرییە کە ژمارەی کوردەکانی تێدا بەجیا نووسراوە (لە کۆماری ئازەربایجان ٤١٢٨٣، واتە ١,٨٪ی تەواوی دانیشتوانی ئەم کۆمارە، لە کۆماری ئەرمەنستان ١٥٢٦٣ کەس، واتە١,٧٪ی تەواوی دانیشتوان و، کۆماری لە جۆرجیا (گورجستان)١٠٣٩٧، واتە٩,٧٪ی تەواوی دانیشتوانیان. هەمووی

---

[٦٨] بڕوانە: سەرژمێری گشتی یەکێتیی سۆڤێت لە ١٩٣٧دا.

[٦٩] جوگرافیای پشت قەفقاسی، تفلیس، ١٩٣٠، ل٢٤١، ٢٩٩، ٣٠٠.

پێکەوە ٦٦,٩٤٢ کوردی تێدا ژیاوە، نەك ٥٢,٣٨١ کەس). ئەمە جگە لەوەی کە ژمارەی کوردەکانی کۆماری تورکمانستان و گەلێك شوێنی دیکەیان نەنووسیوە.

سەرەڕای ئەوەی کە دەسەڵاتدارانی خۆجێیی کۆمارەکانی پشت قەفقاس (ئازەربایجان- ئەرمەنستان و گورجستان) هەوڵی سڕینەوەی کوردو قەوارەکەیان داوە بە دەربەدەرکردن و تواندنەوەیان، دەبینین ژمارەی کورد لە سەرژمێری ١٩٢٦دا نزیکەی ١٤ هەزار کەسی لە سەرژمێری ١٩٣٧ زیاترە، کەچی دەبێ بەپێچەوانەوە بووبێ.

لە کتێبی جوگرافیای پشت قەفقاسدا سەبارەت بە کوردەکان هاتووە، کوردەکانی ئەم هەرێمە هەر لەکۆنەوە لێرە جێگیر بوون. ئەرمەنستانی ئێستا تەنانەت لە سەدەی ٩ی پێش زاین و، لە ئازەربایجان لە کۆتایی سەدەی شازدەوە تێیدا جێگیر بوون (ل٣٠٠). کوردەکان باڵابەرزو، قژو چاو ڕەشن، کەپوویان ڕێکوپێك و کەمێ دیمەن درێژن. کوردەکانی ئەرمەنستان پێکەوەو نزیك بەیەکتر لە گوندە کوردنشینەکان دەژین، بەشێکیان جێگیرو بەشێکیان نیوەکۆچەرو ئاژەڵدارن، بەڵام کوردی ئازەربایجان زۆربەیان خەریکی کشتوکاڵ و جێگیرن.

لە کوردستانی ئازەربایجاندا، بەشێکی کوردەکان لە ئەشکەوتە سروشتی و ناسروشتیەکاندا دەژین (ئەوانیش پێکەوە دەژین). کوردەکان تەنیا لە مینکەند، لە خانووبەرەی بە بەرد دروستکراودا دەژین. لە ئاجارستان، کوردەکان زستان لە گوندو هاوین لە چیاکان دەژین[٧٠]. خانووبەرەیان پەنجەرەیان پێوە نییەو، تەنیا سەربانی کونێکی تێدایە بۆ دەرچوونی دووکەڵ و ڕووناکی. ژنانی کورد چارشێو لەسەر ناکەن و، لەچاو ژنانی گەلانی دیکەدا ئازادترن و، لە وتووێژە گشتیەکان و جەژن و شادیدا لەگەڵ پیاواندا بەشداری دەکەن. ئاستی خوێندەوارییان سفرەو، تا ئەم ماوەیەی دواییش نووسراویان نەبوو، لە نووسراوی عەرەبی یا ئەلفوبێی ئەرمەنی کەڵك وەردەگرن[٧١].

---

[٧٠] هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

[٧١] هـ. س، ل٣٠٤.

ستالین لە سەرژمێری ١٩٣٧ ناڕازی بووە. بەپێی ئەم سەرژمێرییە ژمارەی دانیشتوانی یەکێتی‌ی سۆڤێت ١٦٢ ملیۆن کەس بووە، بەڵام پێشبینی زۆرتری کردووە. بۆیە فەرمانی داوە پاش دووساڵی دیکە، واتە لە ١٩٣٩، سەرژمێرییەکی دیکە بکرێتەوە، گوایە ڕێژەی سەرژمێری ١٩٣٧ لەچاو وڵاتانی سەرمایەداریدا کەمتر بووە. بەڵام ئەو کوشت و کوشتارەی کە خۆی لە گەلان و ڕووناکبیران‌و ئۆپۆزیسیونی کرد، هەروەها برسێتی ساڵی ١٩٣٢-١٩٣٣ و کاری هەرەوەزی سیاسی بێڕەحمانەی پاش شۆڕشی ئۆکتۆبر کە ملیۆنەها کوژراوی بەدواوە بوو، بە سەرژمێرییەکەوە دیاربوون. تەنانەت وەك مرۆڤی زیانبەخش و بەمەبەست، بە تاوانی دوژمنی گەل و جاسووسی وڵاتانی بێگانەو ترۆتسکیزم و لایەنگیری بوخاری مامەڵەی لەگەڵدا کردوون. ستالین لە کۆنگرەی حەڤدەی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا کۆتایی ١٩٣٣، گوتبووی ژمارەی دانیشتوانی یەکێتی‌ی سۆڤێت ١٦٨ ملیۆن کەسە (چوار ساڵ بەر لە سەرژمێری ١٩٣٧، دەبوایە لە ١٦٨ ملیۆن زیاتر بوایە)[٧٢]. واتە لە سەرژمێری ١٩٣٧دا ژمارەی تەواوی دانیشتوانی یەکێتی‌ی سۆڤێتی بە ١٦٢ ملیۆن کەس ڕاگەیاندووە. ئەوە بەدرۆخستنەوەی وتەی ستالینی ڕابەرو، سەرئەنجام ئابڕووچوونی سیستەمی سۆسیالیستییە کە ڕێژەی زیادبوونی دانیشتوانی لەچاو وڵاتانی کاپیتالیستی لەخوارەوە بووە. بۆیە ستالین فەرمانی داوە سەرۆکی بەڕێوەبەرێتی کۆمیتەی هەڵبژاردنی گشتی کراڤال، ی.ئا و، سەرۆکی بیرۆی سەرژمێری ١٩٣٧ کیڤیتکین، ئو.ئا گوللەباران بکرێن.

ستالین، مۆلەتوڤی کردە بەرپرسی سەرژمێری ١٩٣٩ و، تەنانەت دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤێتیش هەڕەشەیان لە خەڵك کرد کە هەر کەس خۆی ناونووس نەکات دادگایی دەکرێ. بەڵام سەرژمێری ١٩٣٩یش وەڵامدەرەوەی ویست و خواستی ستالین نەبوو و ژمارەی دانیشتوانی سۆڤێت

---

[٧٢] بەڵام بەپێی پێشبینی پلاندانانی دەوڵەتی سۆڤێت، دەبوایە ژمارەی دانیشتوانی یەکێتی‌ی سۆڤێت لە سەرژمێری ١٩٣٧دا ١٨٠٧ ملیۆن بوایە.

١٦٧,٣ دەرچوو و ڕانەگەیەندرا. ئەوە بوو ستالین فەرمانی دا لیستە زیادەکان و، ئەوانەی کە پڕنەکراونەتەوە، بدڕێنە زیندانیەکان تا پڕیان بکەنەوە (پێشتر زیندانیەکان سەرژمێری نەدەکران). لەو سەردەمەدا، بەپێی سەرچاوەکان، نزیکەی دوو ملیۆن کەس لە زیندان و ئۆردووگا زۆرەملێکاندا بوون. پاش پڕکردنەوەی ئەم لیستانە، ژمارەی تەواوی دانیشتوانی سۆڤێت لەلایەن ستالینەوە لە کۆنگرەی ١٨دا، بە ١٧٠,٢٨ملیۆن و، لە ڕۆژنامەی "پراڤدا"دا بە ١٧٠,٥ ملیۆن ڕاگەیەنرا (ئاشکرایە ژمارەی زیندانی و دەرکراوو دوورخراوو بێکارو نەخوێندەوار بلاو ناکرێتەوە). بەڵام پاش مردنی، ناوی هەموو ئەوانە بە لیست و بەڵگەو دۆکیومێنتەوە بلاوکرایەوەو، تائێستایش لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بەردەوامە. لە لیستی سەرژمێریەکاندا، گەلێك پرسیاری سەرژمێری نەنووسراوە یا پڕنەکراوەتەوە، وەك شوێنی لەدایکبوون، چەند ساڵ لەوێ ژیاوی، ئێستا لەکوێ دەژی و، چەند ساڵەو لەکەیەوە لە شوێنی تازەی دەژیو، سەبارەت بە داهات و ئیش و ئاستی خوێندەواری، تا تاوانی ڕژێمی ستالین (بەتایبەت بەرامبەر بە کورد بۆچی گوێزراونەتەوە...) ئاشکرا نەبێ. خاڵێکی دیکە کە جێی بایەخ و سەرنجدانە، لە سەرژمێری ١٩٢٦دا چەند گەل یا نەتەوەیان پێکەوە بە یەك نەتەوە یا گەل نووسیوە. بۆ وێنە، چەند گەل (کورامەکان، کیپچاکەکان و فیرگانەکان و تورکەکانی سەمەرقەند) بە ئۆزبەك نووسراون و لەسەر ئۆزبەك حسابیان کردوون؛ یا هەندێ گەلی نزیك بە تاتارەکان، وەك میشارەکانو تیپتاریەکانو ناگای باکیەکان بەجیا لە سەرژمێریەکاندا نووسراون. کەچی لە سەرژمێری ١٩٣٩دا، ئەمانە هەموویان بە تاتاری کریم نووسراون. یا لە سەرژمێری ١٩٣٧دا، ژمارەیەکی زۆر لە تورکەکانی سۆڤێت (تورکی میسخیتی، باتووم و سوخوم) و قەرەپاپاخەکان کە لە سەرژمێری ١٩٢٦دا بەجیا نووسرابوون، بە ئازەری نووسراون؛ یا ئاجارەکان و میگریلیو شڤانی و خیمشینەکان لە سەرژمێری ١٩٣٩دا بە جۆرجی (گورجی) نووسرابوون[٧٣]. ئەم

---

[٧٣] سەرژمێری ساڵی ١٩٣٩ی دانیشتوانی یەکێتی سۆڤێت، چاپی ١٩٩٢، ل٢٤٤-٢٦٣.

بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژی دەوێ. بەڵام مەبەستم تەنها یەك خاڵ بوو، ئەویش ئەوەیە کە هەندێ لە گەلان گوایە لە باری زمانەوە نزیك بەیەکتر بوون، بەیەك نەتەوەیان داناون، کەچی کوردیان کردوەتە دوو بەش کوردو ئێزدی (کوردی موسڵمان و ناموسڵمان)، واتە بە دوو نەتەوەی جیاواز لە سەرژمێریەکاندا ناونووس کراون.

لە (سەرژمێری سەرانسەری دانیشتوانی یەکێتیی سۆڤێتدا ساڵی ١٩٧٠، چاپی مۆسکۆ، ل١٩٣-١٩٩) باسی بنبڕکردنی کێشەی نابەرامبەری ئابووری و کولتووری گەلانی یەکێتیی سۆڤێت کراوەو، بە شانازییەوە خۆیان بە مرۆڤ و هاوولاتی یەکێتیی سۆڤێت ناو بردووە. ئەم وڵاتە لە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتیدا بووەتە نموونە بۆ جیهان. لە وڵاتەکەی ئێمەدا پرۆسەی نزیکبوونەوەی گەلان پەرەدەستێنێ و بەرەبەرە بەرەو یەکگرتنی تەواو دەچێ. پرۆسەی تواندنەوەی ئیتنیکی (تێکەڵبوونی گەلان یا تواندنەوەیان لەناو یەکدیدا). هەندێ گەل پێکەوە لەسەر خواستی خۆیان و دوور لە ناچارکردن، واتە هەندێ گەل یا نەتەوە زمان و کولتوور و ژیانی ئەوی دیکەی وەرگرتووە و، ئەنجامەکەی بووەتە هۆی زیادبوونی نەتەوەیەك و کەمبوونەوەی نەتەوەی دیکە. بەڵام ئەو پرۆسانەی کە بریژنیڤی سەرۆکی سۆڤێت و حیزبەکەی بە بۆنەی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی یەکێتیی سۆڤێتەوە ڕایانگەیاند، کوردی ئێزدی و نائێزدی (موسڵمان)ی نەگرتەوە، لەکاتێکدا هیچ نەبێ بە یەك زمان قسە دەکەن کە کوردییە، ئیدی باسی شتی دیکە ناکەم. ئەم پرۆسانە بۆ کورد پێچەوانە بوون.

لەناو جووەکانی یەکێتیی سۆڤێتدا، جگە لە ئەشکەنازەکان کە لە سەرژمێری ١٩٢٦دا بە جووی ڕەسەن نووسراون، هەندێ گرووپی تایبەتی دیکەی جوو وەك جووەکانی ئاسیای ناوەڕاست و بوخاراو جووەکانی جۆرجیاو جووەکانی کریم (کریمچاکەکان) و جووەکانی کوردستان (لالوی یا لاهلویی)، ئەوانیش بەجیا لە سەرژمێری ١٩٢٦دا نووسرابوون‌و، وەك نەتەوەی جیاواز لەقەڵەم درابوون، لەکاتێکدا ئەوانە بە زمانی جۆراوجۆر قسەیان کردووە. بەڵام لە سەرژمێری

١٩٣٩دا هەموو پێکەوە سەر بە نەتەوەی جوو نووسراون. ئەمەیش ئەنجامی خەباتی خودی جووەکان بووە کە بواریان نەداوە بەجیابیاننووسن. هەروەها چەند گرووپی دینی تاتار بەجیا نووسراون. بۆ وێنە، تاتاری ناموسڵمان یا ئەوانەی کە بە زاراوەی دیکە قسە دەکەن یا لە باری جوگرافیاییەوە لە شوێنێکی دیکە دەژین، بەجیاو وەك نەتەوەی سەربەخۆ نووسراونن. پاش خەباتێکی زۆر، دەسەڵاتدارانی سۆڤێت ناچار کران زۆربەی ئەوانە بە تاتار بنووسن، بەڵام کوردی سۆڤێت هەر بەجیاو وەك دوو نەتەوەی جیاواز، واتە کوردو ئێزدی، نووسران.

ساڵی ١٩٥٩یش سەرژمێرییەکی دیکەی گشتی لە یەکێتیی سۆڤێتی کراوە، واتە پاش بەزۆر ڕاگوستنەوەی کورد لە ١٩٣٧ و ١٩٤٤دا بۆ کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و سیبریا. لەم سەرژمێریەدا ژمارەی کوردی ئازەربایجان ٥٨٨٧ کەسە (کەچی لە سەرژمێری ١٩٢٦دا هەر لەم کۆمارە ٤١٢٨٣ کەس کورد بووە)، ژمارەی کوردی ناگورناقەرەباغ ١٧٩٠، لە کۆماری گورجستان ١٦٢١٢، لە قرقیزیا ٤٧٨٣، لە ئەرمینیا ٢٥٦٢٧ کەس بووە. لەکاتێکدا ژمارەی کوردی کازاخستان و تورکمانستان و ئۆزبەکستانی تێدا نییەو، زۆربەی هەرە زۆری کوردەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان بەزۆر بۆ کازاخستان و ئۆزبەکستان گواستراونەوە. بەپێی سەرژمێری ٩٧٠، ژمارەی کورد لە یەکێتیی سۆڤێت بە ٨٩ هەزار کەس نووسراوەو، بەپێی سەرژمێری ١٩٧٩یش ژمارەی کوردی سۆڤێت ١١٦ هەزار کەسە.

# بەڵگەنامەی نوێ
# لەبارەی کوردەکانی سۆڤێتەوە

**- دەوری تورکیا لە سیاسەتی کوردیی سۆڤێتدا**

بەپێی بەڵگە مێژووییە کۆن و نوێیەکانی ڕووسی-سۆڤێتی، بەشێکی کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەمی زایندا، لە ئەنجامی شەڕە دڕندانەکانی ڕووسیاو تورکیای عوسمانی و ئێراندا، کەوتە سەر خاکی ئیمپڕاتۆریی ڕووسیا. بە واتایەکی دیکە، بە هۆی سەرکەوتنی ڕووسیاوە لە شەڕەکانی تورکیاو ئێراندا، ئەم بەشەی کوردستانیش خرایە سەر ئیمپڕاتۆریی ڕووسیا. واتە تا کۆتایی یەکەمین جەنگی جیهانی کوردستان لەنێوان تورکیاو ئێران و سۆڤێتدا (ڕووسیای پێشوو) دابەش کرابوو. پاش یەکەمین جەنگیی جیهانی، وەك ئاشکرایە، بەشەکەی ژێر دەسەڵاتی تورکیای عوسمانی، بوو بە سێ بەشەوە: دوو بەشی خرایە سەر دەوڵەتە دەستکردەکانی عیراق و سووریاو، بەشێکی دیکەی هەر لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورکیادا مایەوە. بەشەکەی ڕووسیایش، پاش هاتنە سەر دەسەڵاتی بەلشەویکەکان، بەتایبەت قارس و ئەردەهان خرایە یا درایە تورکیای هاوپەیمانیان. ئەم دابەشکردن و ئاڵوگۆڕو فرۆشتنانەی خاکی کوردستان، هەر لەکۆنەوە تا سەردەمی دەسەڵاتدارێتی بەلشەویکەکان نائارەزوومەندانەو بێپرسکردن و ئاگاداری گەلی کورد بووەو، گەلی کوردی تووشی کارەسات کردووە. جگە لە وێرانبوونی کوردستان و کوشتاری دانیشتوانەکەی‌و تاڵانکردن و دوورخستنەوەو بەعەرەبکردن و فارسکردن و تورککردن (لە کوردستانی سۆڤێتیش بە ئەرمەنیکردن و ئازەریکردن)، لە چەند قۆناغیشدا لە هەموو بەشەکانیدا گەلێك جار تووشی جینۆساید بووەو، سنووری کوردستان تەسك کراوەتەوەو بەرەبەرە حاشا لە

بوونی کوردو کوردستان کراوەو، سەرئەنجام لە بەشێکی ئەم وڵاتەدا -وەك کوردستانی سۆڤێت- کوردەکان لە چەند قۆناغدا لە وڵاتی باووباپیریان ڕاگوێزراون‌و قەڵاچۆ کراون (ئەو کارەی کە ڕژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستان لەتواناياندا نەبوو بیکەن). گەلێکی بێوڵات و ولاتێکی بێگەل، کوردستانی سۆڤێت و کوردی سۆڤێت چاوەڕێیان دەکرد. ئەگەر بە تاقە تاوان (لە ئاست‌و ناوەڕۆکدا) دابنرێ، خۆ بە یەکێك لە تاوانە دەگمەنەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێ. دەگمەنیەکەی لەوەدایە لە قووڵایی تراژیدیاکەیدا بەشێکی کوردستانی سۆڤێت وەك قارس و ئەردەهان، بە هاتنە سەر حوکمی بەلشەویکەکان، پێشکەش و مامەڵەی پێ کراو، درایە تورکیا. ئەوەیش کە مایەوە بەسەر دوو کۆماری ئازەربایجان و ئەرمینیادا دابەش کراو، هەر لەناو ئەم دوو کۆمارانەیشدا هەر ناوچەو شارێکی درایە یا خرایە سەر بەڕێوەبەرێتی هەرێم و شارەکانی ئەم دوو کۆمارە. واتە دوو بەشی کوردستانی ئازەربایجان و ئەرمەنستانی سۆڤێت، بێبەش کرا لەوەی وەك بەشێکی یەککرتوو کە سەر بە شار یا هەرێم و ناوچەیەك بن و، پێکەوە بن و لەیەك نزیك بن. واتە بەرەبەرە ئەو پەیوەندیە هەمەلایەنانەی کە پێشتر لەنێوان کوردەکانی سۆڤێتدا هەبوو، پچڕا.

بەڕێوەبردنی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی دەسەڵاتدارانی ئازەربایجانی و ئەرمەنستانی سۆڤێت (وەك نووسینی کوردەکانی ئازەربایجان بە ئازەری و ئەرمەنستان بە ئەرمەنی و، داسەپاندنی ناوو فامیلی ئازەری و ئەرمەنی‌و بێبەشکردنیان لە خوێندن و زمانی زگماك‌و موسڵمان و ناموسڵمان بوونیان لەسەر ژمێریەکاندا و...)، پیسترین و تاوانبارترین کردەوەی بەلشەویکەکان بوو. جگە لە هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور لە (١٩٣٠-١٩٣٢)داو دوورخستنەوەی قۆناغ بە قۆناغی کوردەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان، بەتایبەت لە سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانیدا بۆ کۆمارەکانی دیکەی سۆڤێتی پێشوو، بۆ سیبریاو قەزاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و قرقیزستان و ئۆزبەکستان و شارو گوندی دیکە (کە سەدان و هەزاران کیلومەتر لە نیشتمانی باووباپیرانیان

دووركەوتنەوەو، لە هەمووی خراپتر لەیەك دووركەوتنەوە)، چونكە لەگەڵ یەك و پێكەوە نیشتەجێ نەكران و، هەموو پەیوەندیەكانی نێوانیان پچڕێنرا. سەفەركردنیان نەك تەنیا بۆ لای یەكدی و بۆ شارو كۆمارەكانی دیكە لێ قەدەغە كردن، بگرە لە سەردەمی ستالیندا ناسنامەی هاووڵاتییان لێ سەندرایەوە. سەرنجام تاوانی هەرە گەورەی بەلشەویكەكان بەرامبەر بە گەلی كورد ئەوە بوو، پاش دووهەمین جەنگی جیهانی و مردنی ستالین تا ڕووخانی ئیمپراتۆرەكەیان بوارو مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێ نەدراو، بۆ هەمیشە لەوێ مانەوەو پاش ڕووخانی سۆڤێت و دروستبوونی دەوڵەتانی نوێ تووشی گەلێك كارەساتی دڵتەزێنتر بوون.

بۆیە دەڵێم ئەگەر تاوانێكی بێوێنە نەبێ، دەگمەنە. پێم وایە ئەوە گەورەترین تاوانی ڕژێمی بەلشەویكەكان بووە دژی كورد. من لێرەدا نامەوێ بچمە ناو قووڵایی باسەكەو بەڵگە مێژوییەكانەوە، بەڵكو ئاماژەم بەم چەند بەڵگەنامە داوەو كورتەیەكیم نووسیوە. دروستكردنی كوردستانی سوور لەلایەن بەلشەویكەكانەوە هەنگاوێكی ڕەواو سروشتی و مافێكی سەرەتایی گەلی كورد لەم بەشەی كوردستان بوو، چونكە:

١. زۆربەی دانیشتوانی هەرێمەكە كورد بوو.

٢. دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی نەیاندەتوانی گەلی كورد لەو پرۆسەو بانگەوازەی كە بەلشەویكەكان ڕایانگەیاندبوو، وەك ئازادی و یەكسانی گەلانی یەكێتیی سۆڤێت و مافی چارەنووس و... لابدەن. لەكاتێكدا گەلێك قەوارەو ئۆتۆنۆمییان بۆ گەلانی دیكە دروست كردبوو.

٣. بەپێچەوانەی خواستی دەسەڵاتدارانی ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە كە كوردستانیان دابەش كردبوو و، ئامادە نەبوون بەڕەسمی مافی كورد بسەلمێنن و لانی كەم ئۆتۆنۆمی كولتووری یا ئیداری پێ ڕەوا ببینن، مۆسكۆ بڕیاری پێكهێنانی كوردستانی سووری دا بۆ ڕاكێشانی كوردی پارچەكانی دیكە، بەتایبەت لە كوردستانی عیراق و دابڕینیان لە ئیمپریالیزمی ئینگلیز و هاندانیان لەدژی ئینگلیز (لەم بارەیشەوە بەڵگەو دیكومێنت هەیە).

٤. شەڕو کێشەی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان، پێش و پاش ١٩١٧، (تەنانەت پاش سەقامگیربوونی دەسەڵاتی سۆڤێتی لە هەردوو کۆمارەکەدا) لەسەر ناگورناقەرەباغ کە بە دروستبوونی کوردستانی سوور ئەم دوو کۆمارەی جیاکردەوە، یا کێشەکەی کزتر کرد (کێشەی نێوان ئازەری و ئەرمەن بەدرێژایی دەسەڵاتداریتی سۆڤیێتی هەر بەردەوام بوو، ئەوە بوو پاش ڕووخانی سۆڤێت تەقییەوە)، هۆیەکی دیکەی پێویستی دروستکردنی کۆماری کوردستانی سوور بوو. سەیر ئەوەیە هەردوو لایەنی ئازەری و ئەرمەنی لەکاتی شەڕەکانیاندا دانیان بە بوونی کوردستاندا دەناو کوردەکانیان بانگ دەکرد تا هاوکارییان بکەن دژی لایەنی بەرانبەرو بەڵێنی زۆریان پێ دەدان.

٥. فاکتەری سەرەکی لە دروستبوونی کوردستانی سووردا، داواکاری دانیشتوانی ئەم بەشەی کوردستان بوو، کە ئەوانیش وەك گەلانی دراوسێ خاوەن قەوارەی خۆیان بن.

٦. بەڵێنی دەسەڵاتدارانی ڕووسیا لە سەردەمی داگیرکردنی قەفقاسدا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە سەرۆکەکانی کوردی ئەوێ کە بە چاوێکی جیا لە دەسەڵاتدارانی تورك و فارس تەماشایان دەکەن و مافی خۆبەڕێوەبردنیان لە چوارچێوەی ڕووسیای تزاریدا بۆمسۆگەر دەکەن‌و، دەسەڵات و پلەوپایەی سەرۆك هۆزەکانی کورد وەك خۆی دەمێنێتەوەو بۆ ئەم مەبەستەیش پلەوپایەی هەندێکیان بەرزدەکرێتەوە (لەم بارەیشەوە گەلێك بەڵگەنامەو نامەی کاربەدەستانی ڕووسیا بۆ سەرۆك هۆزەکانی کورد هەیە کە بڵاو دەکرێنەوە)، ئەمانەو گەلێك هۆکاری دیکە پێشینەیەکی مێژوویی بوون دەسەڵاتدارانی سۆڤێت نەیاندەتوانی لەپێش چاویان نەگرن.

٧. سەرئەنجام نەهێشتنی قەوارەی کوردی (کوردستانی سوور)و قەڵاچۆکردنی ئەم بەشەی کوردستان، وێڕای دەوری ناپاکی کاربەدەستانی تورکیاو ئازەری‌و ئەرمەنی، دەسەڵاتدارانی سۆڤێت لەو بەرپرسییە ڕزگار ناکات، چونکە بڕیاری سەرەکی لە مۆسکۆ دراوەو، ئەو هەموو تاوانەیش بەبێ پەسندکردن یا بێ‌دەنگی

سەرانی سۆڤێت ڕوویان نەداوە. جگە لەوە کوردەکانی سۆڤێت هەر لە سەرەتای دروستبوونی سۆڤێتەوە تا هەڵوەشاندنەوەی ئەم دەوڵەتە، داوای گەڕانەوەی مافە ڕەواکانی خۆیان کردووەو، لەو هەموو تاوانە ئاگادارکراونەتەوە (لەم بارەیەشەوە بەڵگە زۆرە. بۆ وێنە، نامەکانیان بۆ خرۆشچۆڤ و بریژنیف و گۆرباچۆڤ).

گومان لەوەدا نییە کە بەپێی ئەم بەڵگەنامەو دۆکیومێنتانە، تورکیا دەوری سەرەکی لە نەهێشتنی قەوارەو ناسنامەی کوردی سۆڤێتدا گێڕاوە. دواتر ڕەگەزپەرستەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان ئەو حەساسیەتەی کە تورك بەرامبەر کێشەی کورد نواندوویە، ئەمانیش زیاتریان کردووەو، هەموو وزەی خۆیان بۆ بەرگرتنی کورد لە گەیشتن بە مافەڕەواکانی بە خەرج داوە. ئەم ڕژێمە داگیرکەرەی کوردستان هەوڵی زۆری داوەو دەدات، نەك تەنیا کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان مافێکیان نەدرێتێ، بەڵکوو بە ئامانجی خۆیان نەگەن تا بە کوردەکانی لای خۆیشی دەگات. بۆیە بووەتە سەرچۆپیکێشی داگیرکەرانی دیکەی کوردستان، تا پێکەوە نەهێڵن ئەم گەلە چەوساوەیە ئاهێك بە بەریدا بێتەوەو، لە ئانکاراو دیمەشق و تاران کۆبنەوەو دژی کوردستانی باشوور پیلان بگێڕن. جێی داخە کە یەکێتیی سۆڤێت لەباتی ئەوەی هەڵوێستێکی مرۆڤانەو ئاشکراو پتەوی هەبێ و، نەهێڵێ تورکەکان دەست لە کاروباری نێوخۆی سۆڤێت وەربدەن، هەنگاو بە هەنگاو پاشەکشەی بەرامبەر کرد، تا وای لێ هات تەنانەت دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی ناچار کرد پێشی چالاکی کولتووری و زمانەوانی کوردەکانی سۆڤێت بگرن. پاکانە بۆ ئەم هەڵوێستەی سۆڤێت ناکرێ.

پاشەکشەی سۆڤێت بەرامبەر بە داخوازەکانی تورکیا کە کوردەکانی سۆڤێت هیچیان نەدرێتێ و، سەرئەنجام سنووردارکردنی چالاکیی کوردەکانی سۆڤێت و، پاشانیش پەشیمان بوونەوەی لەو بڕیارو بەڵێنانەی کە پێیان دان، واتە بەستنی کۆنفرانسی کوردناسی لە شارو شوێنەکانی دیکە یاساغ کرا. بەلشەویکەکان بە بیانووی ئەوەی کە پەیوەندیە ناجێگیرەکانیان لەگەڵ تورکیادا تێك نەچێ، بەکردەوە مەرجەکانی دەوڵەتی تورکیای پەسند کرد. سۆڤێت لەباتی ئەوەی

سنووریّك بۆ تورکەکان دابنیٚ دەست لە کاروباری ناوخۆی سۆڤیّت وەرنەدەن. ئەودەمە تورکیا پیّویستی بە یارمەتی و پشتیوانی سۆڤیّت هەبوو، هەر یارمەتی بەلشەویکەکان بوون کە کەمالیەکانی بە دەسەلاّت گەیاند. ئەمە بۆ کورد بووە مایەی کارەسات. تورکەکان هیچ ڕەخنەیان نەبوەو دژی دروستکردنی قەوارەو ناسنامەی گەلانی دیکەی غەیرەکورد نەبوون. بۆ ویّنە، دژی ئەرمینیا نەبوون، کە دوژمنایەتی لەنیّوانیاندا هەبوە، یا دژی دروستکردنی قەوارەی ئازەری نەبوون، چونکە هاوڕەگەزی خۆیان بوون.

کوردستانی سوور لە ۱۹۳۰دا هەلّوەشیّندرایەوەو، سالّی ۱۹۳۵ نەیانهیّشت کۆنفرانسی کوردناسی لە باکۆ بگیریٚ و، پاشان هەموو دامودەزگاو پەیمانگەو قوتابخانەکانی کوردی لە سۆڤیّت داخران. تورکیا دەوری سەرەکی لەم تاوانانەدا هەبوە، کەچی لە سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانیدا، ڕژیّمی بەلشەویکی سۆڤیّتی بە سەرۆکایەتی ستالینی ڕیّبەری کریّکارانی جیهان و ئازادکەری گەلانی چەوساوە، فەرمانی دا کوردەکانی سۆڤیّت لە کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە بۆ سیبریا و ئاسیای ناوەڕاست بگوازریّنەوە، بە بیانووی ئەوەی کە ئەم کوردانە هاوهەستی دەولّەتی تورکیای هاوپەیمانی ئەلّمانیای نازین و، بە نزیکبوونەوەی سوپای ئەلّمان و تورکیا ئەوانە یارمەتییان دەدەن دژی سۆڤیّت. لەکاتیّکدا نەك تەنیا کوردی سۆڤیّت، بەلّکوو کوردی بەشەکانی دیکە دژی هاوپەیمانانی ئەلّمانی نازی– واتە تورکیاو ئیّران– بوون.

وا بزانم ناوەڕۆکی کۆنفرانسەکەو وتارەکان و کیّشەی تورکەکان لەگەلّ سۆڤیّتیەکاندا، پیّویستییان بەشیکردنەوە نییە. لە ناوەڕۆکی ڕۆژنامەی "ڕیّیا تازە"دا دیارە، نەك تەنیا باسی کیّشەی کوردو میّژوو و زمان و کەلەپووری کوردی نەکردووە، بەلّکوو بووەتە ڕۆژنامەیەکی زمانی حالّی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان و سۆڤیّت و، وەرگیّرانی وتاری چاپەمەنیەکانی سۆڤیّتی بلاّوکردوەتەوەو، خویّنەری نەبوە نە بە ڕووسی و نە بە کوردی، لەبەر نەخویّندەواری کوردی ئەرمینیا. جگە لەوە، بۆ کوردی ئازەربایجانیش

نەنێردراوە. پاشان لەبەر گۆڕینی ئەلفوبێی کوردی (تائێستا پێنج جار گۆڕاوە)و، نەبوونی قوتابخانە بە کوردی و، پاشتر گواستنەوەی کوردەکانی ئەوێ، بە فەرمانی مۆسکۆ ڕۆژنامەکە داخراوە. سەرەڕای ئەوە، ژمارەیەك لە نووسەرو کوردناسی کورد بە تاوانی پەیوەندیگرتن بە کوردی دەرەوە، یا ناردنی ڕۆژنامەو چاپەمەنی کوردییەوە بۆ یەکدوو کەس، یا لێدوان و ئاماژەکردن بە کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان، یا هەڵوێستی ڕووناکبیرانەو نیشتمانپەروەرانە، دەستگیر کراون و دوور خراونەتەوەو زیندانی کراون. ئەمەیش بابەتێکی تایبەتەو پێویستی بە وتارێکی دووروودرێژ هەیە.

ساڵانی ڕووداوەکانی پاش کۆنفرانسی کوردناسی ساڵی ١٩٣٥، نیشانی دەدەن کە نەك تەنیا بڕیارەکانی کۆنفرانسەکە جێبەجێ نەکران، بەڵکوو تا ڕووخانی یەکێتیی سۆڤێت کۆنفرانسێکی دیکەی کوردناسی نەبەسترایەوەو، پەیمانگەو ناوەندێکی کوردی دانەمەزرێنرا، بگرە پاش ئەوەی کە تورکیا لە ١٩٥١دا بووە ئەندامی ناتۆو ئێرانی شاهەنشایش بووە پێگەو دۆستی ڕۆژئاوا، کۆنفرانسێك لەسەر کورد نەگیرا.

کاربەدەستانی سۆڤێت زۆرجار جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە نابێ کوردی سۆڤێت ئاڵوگۆڕی چاپەمەنیی (تەنانەت لە بواری زمانناسیدا) لەگەڵ کوردی دەرەوەدا هەبێ، یا پەیوەندیی بەیەکەوە هەبێ و، کوردی دەرەوە بۆ ئاڵوگۆڕی ئەزموون و زانیاری سەردانی سۆڤێت بکەن؛ لەوانە، بەشداری لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا بکەن، یا کوردی سۆڤێت بۆ هەمان مەبەست بانگی دەرەوە بکرێن، یا کەڵك لە چاپەمەنی یەکتر وەربگرن. ئەو تاوانە گەورەیەو، ئەو کردەوە یا سیاسەتە نامرۆڤانەیەی سۆڤێت بە هیچ شێوەیەك پاکانەی بۆ ناکرێ. ئەمە لەبری ئەوەی کوردستانی سۆڤێت یا کوردی سۆڤێت ببنە وێنەو پەناگەو پاڵپشتی کوردی پارچەکانی دیکەو، هۆی ڕاکێشان و دۆستایەتیکردنیان لەگەڵ سۆڤێت!

کاربەدەستانی تورك نەك تەنیا باوەڕیان بەو بەڵێن و سوێندانەی کاربەدەستانی سۆڤێت نەکرد کە کۆنفرانسی کوردناسی تەنیا سەبارەت بە بواری

زماننا‌سی و کولتوورییه، بەڵکوو داوایشیان کرد هیچ چالاکییەك بۆ دانانی ئەلفوبێی کوردیدا نەکرێ. وەك ئاشکرایە زۆربەی زۆری کوردەکانی سۆڤێت، ئەودەمە لە چوارچێوەی کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیادا دەژیان، ئەو دوو کۆمارەیش زۆر سیخوڕو کۆنسوڵی تورکی لێ بووە. بەپێی بۆچوونەکانی کاربەدەستانی سۆڤێت (لەژێر گوشاری تورکەکاندا)، باشتر وابووە کاروباری کوردو کوردناسی بگوازرێتەوە بۆ تیفلیس، چونکە ئازەربایجان و ئەرمینیا هاوسنوور یا لە تورکیاوە نزیکترن، تا چیتر لەگەڵ تورکدا تووشی کێشە نەبن. واتە ئەگەر چالاکی بکرێ، لەناو کوردەکاندا نەکرێ. پاشان لە تیفلیس شتێکی ئەوتۆ نەکرا، لە سان پیتربۆرگ و مۆسکۆ هەندێ شت بەناوی کوردناسییەوە کرا (ئەویش ئامادەکردنی هەندێ پسپۆڕو کوردناس بوو بۆ پێویستیەکانی خۆیان، تا ئاگاداری کێشەی کورد بن‌و بتوانن لەکاتی پێویستدا کەڵك لە کێشەی کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان وەربگرن بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتەکەیان).

لای بەلشەویکەکان، هەروەك لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە، ئەوەی لە دەرەوەی سۆڤێت سەبارەت بە کوردناسی کراوە، بە دەستی یا بۆ بەرژەوەندی ئیمپریالیزم کراوە، تەنانەت گەر لە بواری زمانناسی یا دانانی ئەلفوبێی کوردیشدا بووبێ، بگرە ئەگەر لەلایەن کوردەکانی دەرەوەیشەوە کرابێ. بۆیە نەیانهێشت کوردی سۆڤێت نە بانگەوازی کەس بکات و نە بچێتە دەرەوە. هەروەها ڕێیان نەدا ئاڵوگۆڕی چاپەمەنیی هەبێ. بۆچوونی بەلشەویکەکان هەر لەسەر کوردناسی و کوردو کۆبوونەوەی کوردان نێگەتیڤانە نەبوە، بەڵکوو بزووتنەوەکانی کوردیشی لە تورکیا یا بە کۆنەپەرستانەو سەر بە ئیمپریالیزم، یا بە ئاژاوەو هاندانی داشناکەکان و... تاوانبار کردووە،. ئەوەیش هەر بۆ ڕازیکردن و دڵخۆشبوونی تورکەکان بووە. گەرچی بۆچوونی کاربەدەستانی سۆڤێت لەسەر پیلان و ئاژاوەگێڕیی سیخوڕەکانی دیپلۆماسی تورکیا بەگشتی و، کێشەی کورد بەتایبەتی، سەرلەبەر وەك یەك نییە، بەڵام لە ئەنجامدا ئەو بیرو بۆچوونانە سەرکەوتن‌و جێبەجێ کران کە لە بەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستاندا بوون. بە

وتەی خۆیان، هەرچۆنێك بێ نەیانویست لەسەر کۆنفرانس یا کۆبوونەوەیەکی کوردناسی تووشی سەرئێشە بن و، گیروگرفت بۆ خۆیان سازبکەن.

بە لێکۆڵینەوەی دەوری کورد لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ تورکیاو ئێراندا، بۆم ڕوون بووەتەوە کە ڕووسیا پاش داگیرکردنی قەفقاس، بەشێکی کوردستانیشی داگیر کرد. هەر ئەو تورکیاو ئێرانەی وا باسی هاووڵاتیانی کوردو برایانی موسڵمانی خۆیان دەکرد کە کەوتوونەتە ژێردەستی داگیرکەری ڕووس و خوازیاری گەڕانەوەن بۆ باوەشی دایکی نیشتمان. ئێستایش مافی ئەلفوبێی کوردی یا هەر مافێکی دیکە بۆ ئەو هاووڵاتیو برا موسڵمانانە لە وڵاتێکی دیکە بەڕەوا نابینن. گیرانی کۆنفرانسێکی کوردناسی بۆ دانانی ڕێزمانی کوردی، یا دەرچوونی ڕۆژنامەیەك بە زمانی کوردی، بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەروەری و یەکپارچەیی خاکی تورکیا دادەنێن. ترسنۆکی و بێشەرمی هەندێ کاربەدەستی سۆڤێت بە ڕادەیەکە تەنانەت فەرمانیان داوە وتارو بابەت و هەواڵ نە لە چاپەمەنیەکانی سۆڤێتداو نە بەدەمیش لەسەر کوردو ئەو کۆنفرانسەی کە بۆ دانانی ئەلفوبێ گیراوە بڵاونەکەنەوەو، سێ ڕۆژنامەدا کە وێنەکەیان لەگەڵ بەڵگەکاندا هاتووە، گوتراوە سەربەخۆ بڵاویان کردوەتەوەو، دەبێ سزا بدرێن و، فەرمانیشیان پێدەدەن لەمەولا شتێك لەوبارەوە بڵاونەکەنەوە.

هەندێ لە کاربەدەستانی ئەرمەنی پێشنیاریان کردووە، لەبەر ئەوەی زۆربەی کوردەکانی سۆڤێت لە ئازەربایجانی سۆڤێت دەژین، دەبێ لەوێ کۆنفرانس و کۆڕو کۆمەڵی کوردی ببەسترێن. ژمارەیەکی زۆری کوردەکانی ئەرمینیا زمان و کەلەپووری ئەرمەنییان وەرگرتووەو بە زمانی کوردی نادوێن و بە ئەرمەن کراون، بە چەشنێك کە لە ئەرمەنەکان جیاناکرێنەوەو خۆیان بە کورد نازانن. پێشنیاریان کردووە ئەگەر لە باکۆ نەبەسترێ، لە تفلیس ببەسترێ، وەك بڵێی ئەوانیش دەیانەوێ کوردو کێشەکەی لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە (هەروەك بەدرێژایی مێژوو بە بیانووی جۆراوجۆر سەرەتا کوردی موسڵمانی ئەوێیان دەرکردو، کوردە ئێزدیەکانیان وا لێ کرد ناچار بن خۆیان بە نەتەوەیەکی جیاواز لەقەڵەم بدەن.

بەڵام بەوەیشەوە وازیان نەهێناو، لە سەردەمی ستالیندا ژمارەیەکی زۆریان دوورخرانەوە. باسی ئەوە ناکرێ پاش دەستگرتنی ئەرمەنی بەسەر ناگورناقەرەباغدا کە کوردستانی سووریش بەشێکی، چییان بەسەر کورددا هێنا.

پاش تێکچونی سۆڤیێتیش، لە دوو سەرژمێری ئەرمینیادا کوردی ئێزدی بە نەتەوەی ئێزدی دانراوەو کوردیش بەجیا. جێی داخە هەندێ کاربەدەستی سۆڤیێتی پێشنیاریان کردووە: بۆ ئەوەی تورکەکان چیتر لەسەر چالاکی کوردناسی ڕەخنەیان لێ نەگرن، نابێ بەرپرس‌و فەرمانبەرانی دەوڵەتی لەو چەشنە کۆبوونەوەو کۆنفرانسانەدا بەشداری‌و قسە بکەن‌و، ئەو جۆرە کۆنفرانسانە دوور لە سنوورەکانی تورکیاو لە ناوچە ناوەندیەکانی ڕووسیا بەڕێوە ببرێن. واتە بۆ گەلێك لە گەلانی وڵاتەکەی خۆیان‌و هاووڵاتی خۆیان‌و لەژێر ئاڵای سۆسیالیزم‌و... نابێ بەرپرس یا فەرمانبەرێکی دەوڵەتی ڕێنوێنی‌و پشتیوانییان بکات‌و بەڵێنی یارمەتی‌و هاوکارییەکیان بداتێ‌و بە ئاشکرا لەسەریان بدوێ‌و بنووسێ. کۆنفرانس‌و کۆبوونەوەیەکیش کە لەسەر کورد دەکرێ، دەبێ لە کۆماری ڕووسیا کە هەزاران کیلۆمەتر لە شوێنی نیشتەجێی کوردانەوە دوورە، بگیرێ‌و کەس ئاگای لێ نەبێ، بۆ ئەوەی تورك ڕەخنەیان لێ نەگرێ‌و پێی نەزانێ. بەکورتی، ئەو سیاسەتەی کە سەرانی سۆڤیێت بەرامبەر بە هاووڵاتیانی کوردی خۆیان هەر لە سەرەتاوە گرتوویانەتە بەر، بەرامبەر بە هیچ گەلێکی دیکە بەو چەشنە نامرۆڤانەو گلاو نەبوە.

زۆربەی ئەو ڕاپۆرتنووسانەی کە لە بەڵگەکاندا ناویان هاتووە، ئاگاداری بارودۆخی هەموو پارچەکانی کوردستان بوون و، بەو زوڵم‌و زۆرەیان زانیوە کە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە لێیان دەکرێ؛ هەستیان بەوە کردووە کە سۆڤیێت خۆی بە پشتیوانی گەلانی چەوساوە دادەنێ‌و، گەلی کوردیش یەکێکی ئەو گەلانەیە کە هاوسێیەتی و، پێویستە کە لە کوردەکانی خۆیەوە دەست پێ بکات، کەچی بە پێچەوانەوە پیسترین‌و ڕەشترین مێژوویان بەرامبەر بە کوردەکانی خۆیان تۆمار کردووە.

- کۆنفرانسی سەرتاسەری کوردناسی

* زاریا وەستوك، ١٩٣٤/٧/١٤، ژمارە ١٦٢

ئێرەڤان (لەڕێگەی تیلگرافەوە) ١٩٣٤/٧/٩ لە ماڵی فەرهەنگ (معارف) یەکەم کۆنفرانسی سەرتاسەری کوردناسی (لە ئاستی یەکێتیی سۆڤێتدا) لەسەر داخوازی پەیمانگەی مێژووی کولتوورەکانی ئەرمینیاو کۆمیتەی ئەلفوبێی نوێی سەر بە دەوڵەتی ئەرمینیا دەستی پێکرد. لەم کۆنفرانسەدا، نزیکەی (٣٠) سی نوێنەری زەحمەتکێشانی کوردی ئەرمینیاو ئازەربایجان و جورجیاو هەرێمی نەخچەوان و ئاجارستان و کوردناسی شارە ناوەندیەکانی یەکێتیی سۆڤێت بەشدارییان تێدا کرد. کۆنفرانسەکە بۆ تاووتوێکردنی کێشەکانی دروستکردنی زمانی ئەدەبیی کوردی و ڕێنووس‌و گراماتیك و... زمانی کوردی پێك هاتووە. سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی (بەلشەویکی) ئەرمینیا هاوڕێ ئاکۆپۆڤ و، نوێنەری دەوڵەتی ئەرمینیا هاوڕێ مارتیکیان و، سەرۆکی بەشی پروپاگەندەی مارکسیزم–لینینیزمی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی (بەلشەویکی) ئەرمینیا هاوڕێ ئاریسیان و، سکرتێری دەوڵەتی ئەرمینیا هاوڕێ دەشتویان و... بەشدارییان تێدا کرد. کۆنفرانسەکە لەلایەن هاوڕێ مارتیکیانەوە کرایەوەو، دەستی بەکارکردو، هاوڕێ ئاریسیان لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمینیاوە سڵاوو بەخێرهاتنی بەشدارانی کرد، هاوڕێ کارینیان لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی ئەرمینیاوەو، هاوڕێ شامیلۆڤ لەلایەن کۆمیتەی سەرتاسەری ئەلفوبێ نوێیەکانەوە وتاری بەخێرهاتن و سڵاو گەیاندنیان خوێندەوە. وتاری "شۆڕشی ئۆکتۆبرو پێکهێنانی کولتووری نەتەوەیی زەحمەتکێشانی کورد" لەلایەن هاوڕێ ئاریسیانەوە خوێندرایەوە.

کۆنفرانس تیلگرامێکی پیرۆزبایی و سوپاسی بۆ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت (بەلشەویك) هاوڕێ ستالین و، هەروەها بەرپرسی ڕێکخراوی حیزبی لە هەرێمی پشت قەفقاسی پارتی کۆمۆنیستی

(بەلشەویکی) هاوڕێ بەدیی و هاوڕێ خانجانیان نارد. لە یەکەم کۆبوونەوەی کۆنفرانسەکەدا، وتاری هاوڕێ حاجی جوندی سەرۆکی بەشی کوردی لە پەیمانگەی مێژووی کولتوورەکان لە ئەرمینیاو، چالاکی ئەم بەشە بۆ کۆکردنەوەی بابەتی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری و لەچاپدانی کتێبی قوتابخانە بۆ قوتابیان‌و ڕۆژنامەی کوردی "ڕێیا تازە"و بەشی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەی کوردی خوێندرایەوە.

* زاریا وەستوك، ١٩٣٤/٧/١٤، ژمارە ١٦٢

درێژەی ڕاپۆرت لەسەر کۆنفرانسی کوردناسی

ئێرەڤان (ئاژانسی تیلگرافی پشت قەفقاس) دووهەم ڕۆژی کۆبوونەوەی کۆنفرانسەکە، تایبەت بوو بە پەسندکردنی بنیاتنانی زمانێکی لیتراتۆری (ئەدەبی)ی کوردی. لەم بارەوە کوردناسە گەنجەکان و قوتابیە کوردەکانی خوێندنی باڵای قوتابخانەکانی ئەرمینیا وتاریان خوێندەوەو، ڕەخنەیان لە پرۆفیسۆر خاچاتۆریان گرت کە هەڵەی زۆری لە ڕێزمانی کوردی (گراماتیك)دا کردووە. سەبارەت بە پرنسیپەکانی زمانی ئەدەبیی کوردی یاریدەر سیوان و هەروەها پرۆفیسۆر خاچاتۆریان و... قسەیان کرد. لە ڕۆژی سێهەمی کۆنفرانسەکەدا زۆر شت تاووتوێ کرا، کە بە هەموویەوە نزیکەی (٣٠) سی کەس سەرنج و تێبینی خۆیان خوێندەوە. لە کۆبوونەوەی ئیدارەی کۆنفرانسەکەدا، لەلایەن کۆمیتەی حیزبی قەفقاسەوە، هاوڕێ بیدی (بەدی)و، جێگری سەرۆکی شوورای وەزیرانی ئەرمینیا هاوڕێ ئەرزینکیان و، جێگری سەرۆکی بەشی کۆڕی زانیاری (ئاکادیمیای زانستی) پشت قەفقاس هاوڕێ پرئوموۆ و، سەرنووسەری ڕۆژنامەی "زاریا وەستوك" ئامادە بوون.

هاوڕێ ڕیان ئیرزینکیان و پرئوموۆ بەخێرهاتنی بەشدارانی کۆنفرانسەکەیان کرد. لە کۆبوونەوەی بەیانی کۆنفرانسەکەدا لە ١٩٣٤/٧/١٢دا، بڕیارلەسەر بەشەکانی کاری کۆنفرانسەکە، واتە پێکهێنانی بەشەکانی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی‌و زاراوەسازی (تیرمینالۆگیا)و ڕێنووس‌و گراماتیك دراو ڕێك

خران. کۆنفرانسەکە بە یەکدەنگی بڕیاری دا زمانی کوردەکانی ئەرمینیا بکرێتە بناغەیەك بۆ بۆ زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی. هەروەها بڕیاری پێکەوەنانی ناوەندێکی کوردناسی بۆ کارکردن لەسەر هەموو کێشەکان‌و پێکهێنانی کولتووری زەحمەتکێشانی کورد درا.

* کۆتایی کۆنفرانسی سەرتاسەری (یەکێتی‌ی سۆڤێت) کوردناسی

زاریا وەستوك، ١٩٣٤/٧/١٦، ژمارە ١٦٤

ئیرەڤان (لەڕێگەی تیلگرافەوە) یەکەم کۆنفرانسی سەرتاسەری سۆڤێت لەبارەی کوردناسییەوە کە شەش ڕۆژی خایاند، کۆتایی بە کاری خۆی هێنا. جگە لە کاروباری ئاسایی و کۆبوونەوەکان، بڕیاری دروستکردنی هەندێ بەش، واتە ڕێکخستنی کۆمیسیۆنەکانی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی و ڕێنووس‌و زاراوەسازی زمانی کوردی درا. لە دواین کۆبوونەوەی کۆنفرانسەکەدا کە ١٩٣٤/٧/١٤ گیرا، گوێ لە پێکهێنانی کۆمیسیۆنەکان گیراو پەسند کرا. کۆنفرانس بڕیاری دا لەمەولا، بۆ گەشەپێدان بە زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، هاوولاتیانی کوردی سۆڤێتی زبانی کوردەکانی ئەرمینیا وەك بناغەیەك بۆ ئەم زمانە بەکاربهێنن، لەبەرئەوەی ئەوانە ئیدی ئەدەبی خۆیان هەیە. بڕیاردرا کەڵك لە زاراوە زیندووەکانی کوردەکانی ئازەربایجان و جۆرجیاو تورکمەنستان بگیرێ.

هەروەها کۆنفرانس بڕیاری دا: ناوەندێکی کوردناسی سەرتاسەری (لە ئاستی سۆڤێتدا) پێك بێ، ئەرکی کارکردن و لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی زمانی ئەدەبی و زانستی بخرێتە ئەستۆی. شوێنی ئەم ناوەندە، دەبێ لەلایەن کۆمیتەی سەرانسەری ئەلفوبێ نوێیەکانی سۆڤێتەوە دیاری بکرێ. دووهەم کۆنفرانسی کوردناسی، بڕیاردرا ساڵی ١٩٣٥ لە ئازەربایجان ببەسترێ. هەروەها بڕیاردرا بەشێکی کوردناسی لە زانکۆی ئەرمینیا ڕێك بخرێ. کۆنفرانس لەلایەن سکرتێری تسیك (ئەنجومەنی جێبەجێکردن)ی ئەرمینیاوە هاوڕێ دەشتویان داخرا. ئەو، لە وتارەکەی خۆیدا، گرنگی زۆری سیاسی و ئەدەبی کاری یەکەم کۆنفرانسی کوردناسی لە ئاستی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا دەستنیشان کرد.

* وەرگێڕاوی ڕۆژنامەی ئایاستان خوروردایین (ئەرمەنستانی سۆڤێتی)

وتاری بەخێرهاتنی سەرۆکی ناوەندی کۆمیتەی جێبەجێکەری ئەرمەنستانی سۆڤێتی (شووڕای وەزیران) هاوڕێ مارتیکیان لە کۆنفرانسی کوردناسیدا ١٩٣٤/٧/١١

گەلی کورد بەدرێژایی سەدان ساڵ لەژێر باری چەوسانەوەی شێخ و ئاغاو بەگ و کاربەدەستانی ڕووسیای تزاری (قەیسەری)دا بووەو گیان و توانایی دروستکەرانەی ئەم گەلە لە تاریکی و دواکەوتندا خنکێندراوەو، کۆمەڵانی زەحمەتکێشی کورد تەنیا لە سەردەمی دەسەڵاتی سۆڤێتیدا لەگەڵ گەلانی دیکەی یەکێتیی سۆڤێتدا بواری ڕزگاربوونیان لە هەموو چەوسانەوەیەك پێ دراوە، تا بتوانن ژیانێکی باش بۆ خۆیان پێك بێنن. تەنیا لەسایەی ئەم دەسەڵاتەوەیە کە دەستیان داوەتە چاپکردنی کتێبی خۆو ئەدەبیاتی خۆو کولتووری نەتەوەیی خۆ کە ناوەڕۆك و شێوازێکی پرۆلیتاریانەیان هەیەو توانیویانە پێکی بێنن. ئەوەتا ئەمڕۆ لەم کۆنفرانسەدا نوێنەرانی زەحمەتکێشانی کورد هاوڕێیانی کورد خەریکی تاووتوێکردن و لێکۆڵینەوەی گەشەدان بە کێشە کولتووریەکانن و، بۆ بووژاندنەوەی کولتووری خۆیان ڕێگە بۆ داهاتوو دەکەنەوە. مێژوو دیاردەیەکی ئەوتۆی بە خۆوە نەبینیوەو، تەنیا لەسایەی سەری دەسەڵاتی پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕو سەرکردایەتیەکەیەوە، واتە پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت و، بەڕێوەبردنی سیاسەتی نەتەوەیی لینین و ستالین ئەم بوارەیان بۆ ڕەخساوە. ئێستا مێژووی گەلی کورد لەم کۆمەڵگە سۆسیالیستیەدا شان بەشانی گەلانی دیکەی یەکێتیی سۆڤێت شوێنی خۆی دەگرێ. گەلی کورد بە زمان و ئەدەبیاتی خۆی کولتوورێکی سۆسیالیستی لەگەڵ سامان و ژیانێکی سۆسیالیستیدا ڕێك دەخات.

گەلی کورد قوتابخانەی خۆیو ڕۆژنامەو گراماتیکی زمانی خۆی پێك دێنێ و، بەو زمانەی خۆی لێکۆڵینەوەو زانیاری خۆی لەسەر سۆسیالیزم و کێشەکانی دیکەی دروستبوونی سۆسیالیزم ئەنجام دەدات. بەکورتی، گەلی کورد هاتە ڕیزی جیهانی پێشکەوتوانەو ڕووناکبیرانەی کولتووری سۆسیالیستی و، دەگات بە بەشی سامانی لەبن نەهاتووی کولتووری خۆی. هاوڕێیان وشەو ڕستەیەك نییە وەسفی کاری

بەکۆمەڵی زەحمەتکێشانی کوردی پێ بکەم کە لە هەموو بوارە کولتوورییەکاندا خۆی دەنوێنێ. کرێکارانی کورد، کەلخۆزیەکان و ڕووناکبیرانی کورد فێری ئەو ئەرك و کارە دەبن کە زمان و ئەدەبیات و کولتووری کوردی لەژێر سەرکردایەتی پارتەکەماندا بەڕێبەرایەتی سەرکردەی مەزن و ژیرو زانا هاوڕێ ستالین ڕێگەی بۆ کردووینەتەوە.

لەو باوەڕەدام کۆنفرانسەکە دەتوانێ بەبێ هیچ کۆسپێك ئەو کێشەو پرسیارانەی کە لەبەردەمدان، چارەسەر بکات‌و، هێزێکی زۆری بۆ پێشخستنی کولتوورو ژیانی زەحمەتکێشانی کورد دەبێ.

وتاری حاجی جوندی: هاوڕێ جوندی بە وردی لەسەر ئەم چالاکییە واتە بەستنی کۆنفرانسەکە، کە ماوەی ساڵێك خەریکی بوون و، توانیویانە فۆلکلۆرێکی زۆری کوردی‌و وشەو ڕێزمان و سەرچاوە کۆبکەنەوە، دوا وتار چییە کە لەکۆتاییدا گوتی: تەواوی ئەو دەسکەوتانەی کە ئێمە ئێستا هەمانە، لەسایەی سیاسەتی نەتەوەیی لینینییە کە گەلی زەحمەتکێشی کوردیش بۆ پەرەپێدانی کولتووری سۆڤێتی بەشداریی تێدا دەکات.

وتاری هاوڕێ گەنج شییان سەرنووسەری ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە": ڕۆژنامەکەمان بۆ زەحمەتکێشانی کوردو ژنانی کۆیلە دەستێکی نزیکەو، بەگشتی بۆ هەموو چین و توێژی کوردییە. وتاری هاوڕێ جەلیل جەلیلۆڤ: بەپێی ڕاپۆرتی ناوبراو لە ١٩٣٩دا دوو کتێب بە تیراژی پێنج هەزار دانە دەرچوون، لە ١٩٣٠دا پێنج کتێب بە دەهەزار دانە، لە ١٩٣١دا هەشت کتێب و تیراژیان پانزە هەزارو، لە ١٩٣٣دا هەژدە کتێب کە تیراژیان سی‌وپێنج هەزارو، لە ١٩٣٢دا بیست‌ودوو کتێب کە تیراژەکەیان چل‌وپێنج هەزارو، لە ١٩٣٤دا بیست‌وپێنج کتێب کە نەوەد هەزار تیراژیان بووە.

* ڕۆژنامەی "خوروردادین"، ژمارە ١٦٣

کۆنفرانسی کوردناسی چ بڕیارێکی دا

١٩٣٤/٨/١٤ دواین کۆبوونەوەی سەرتاسەری یەکێتی‌ی سۆڤێت لەسەر کوردناسی بوو، کە ٤ مەبەستی خوارەوەی لەبەردەمدا بوو:

١. ڕێکخستنی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی.

٢. ڕێکوپێك نووسینی زمانی کوردی و ئەلفوبێ بۆ ئەم زمانە.

٣. ڕێزمان.

٤. چۆنیەتی زاراوەسازی و ڕێنووس بەڕێکوپێکی.

هەندێ پێشنیار لەم بارەوە کراو، بڕیاری یەکجاری بۆ کارکردن لەسەر کێشەکان خرایە بەردەم پەیمانگەی مێژووی کولتوورەکانی ئەرمەنستان. بەپێی بڕیاری کۆنفرانسەکە، بناغەی زمانی کورد دەبێ زمانی کوردی کوردەکانی ئەرمەنستان بێ، واتە زاراوەی کرمانجی. هەروەها کۆنفرانس هەندێ کێشەی ڕێکخستن و دروستکردنی ناوەندێکی سەرتاسەری کوردناسی لە ئاستی سۆڤێتدا خستە بەردەمی کۆمیتەی ئەلفوبێی نوێی کوردی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی (تسیك) یەکێتی‌ی سۆڤێت.

بڕیارە دووهەمین کۆنفرانسی کوردناسی لە ١٩٣٥دا لە ئازەربایجان بگیرێ و، بڕیارە بەشی کوردناسی لە پەیمانگەی دەوڵەتی (لە ئیرەڤان) بکرێتەوە. هاوڕێ داوەتیان سەبارەت بەوەی کە ژنانی کورد لە کۆنفرانسەکەدا بەشدارییان نەکردووە، ناڕەزایی خۆی دەربڕی و، داوای کرد لە کۆنفرانسی داهاتوودا نەك تەنیا ژنانی کورد بەشداری بن، بەڵکوو دەبێ وتاریش بخوێننەوە. پاشان هاوڕێ شامیلۆڤ بەناوی کۆنفرانسەکەوە سوپاسی پەیمانگەی مێژووی کولتوورەکانی ئەرمەنستانی کرد کە یارمەتی بەڕێوەبردنی کۆنفرانسەکەی دا. پاشان هاوڕێ دەشتویان کۆتایی کاری کۆنفرانسەکەی ڕاگەیاند کە بە چەپڵەلێدان کۆتایی پێهات.

* ڕۆژنامەی "کۆمۆنیست"، ١٩٣٤/٧/١٤، ژمارە ٤

"کۆنفرانسی کوردناسی کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا"

یەکەم کۆنفرانسی سەرتاسەری یەکێتی‌ی سۆڤێت لەسەر کوردناسی کۆتایی پێهات. کۆنفرانسەکە شەش ڕۆژی خایاندو، ٩ کۆبوونەوەو شەش بەشی هەبوە، کە لێکۆڵینەوەی تێدا لەسەر ئەدەبیاتی زمانێکی یەکگرتووی کوردی، ڕێزمان، ڕێنووس‌و زاراوەسازی (وشەڕۆنان) کراوە. لە کۆبوونەوەی دوایی کۆنفرانسەکەدا لە ١٤ی ١٩٣٤/٧دا، بڕیارنامەیەك سەبارەت بە زمان، و ڕێزمان و ڕێنووس‌و زاراوەسازی و کێشەی ڕێکخستن خوێندرایەوەو پەسندکرا. کۆنفرانسەکە، بڕیاری

دا زمانی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی بۆ بناغەی زمانێکی ئەدەبی کوردی کە ئیتر ئەدەبیاتی خۆیان پێك هێناوە، وەك بناغەیەك کەڵکی لێ وەربگیرێ. هاوکاتیش دەبێ زاراوەکانی کوردی ئازەربایجان و جۆرجیاو تورکمانیا بۆ ئەم مەبەستە لەبەرچاو بگیرێن. کۆنفرانس بە پێویستی دەزانێ ناوەندێکی کوردناسی لە ئاستی سەرتاسەری یەکێتیی سۆڤێتدا پێك بێنێ. ئەم ناوەندە کوردناسییە، دەبێ کاروباری خۆی لەسەر کارکردن بۆ ئەدەبیاتێکی زانستیانەو کێشەکانی زمانناسیی کوردی کۆبکاتەوە. شوێنی ئەو ناوەندە کوردناسییە، لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی سەرتاسەری سۆڤێتەوە لەسەر ئەلفوبێ نوێیەکان دیاری بکرێ.

دووهەم کۆنفرانسی کوردناسی، بڕیار وایە ساڵی ١٩٣٥ لە ئازەربایجان بگیرێ. هەروەها بڕیاریش لەسەر ئەوە دراوە کە پێویستە بەشێکی کوردناسی لە زانکۆی ئیرەڤان بکرێتەوە. لە کۆتایی کۆنفرانسەکەدا، سکرتێری کۆمیتەی جێبەجێکەر (سەرۆکی وەزیران)ی ئەرمەنستانی سۆڤێتی هاوڕێ گ.دەشتویان قسەی کردو، پاش ئاماژەکردن بە ئەنجامی کۆنفرانسەکە، بەم قسانە کۆتایی بەکاری کۆنفرانسەکە هێنا: کۆنفرانسەکە گرنگییەکی یەکجار زۆری لەبواری سیاسی و کولتووریدا هەیە. بەرهەمی وتارو بەڵگەکانی ئەم کۆنفراسە لەلایەن پەیمانگەی مێژووی کولتوورەکانی ئەرمینیاوە چاپ دەکرێن.

* ڕۆژنامەی "کۆمۆنیست"، ١٩٣٤/٧/١٤، ژمارە ٢

"لە کۆنفرانسی کوردناسییەوە"

ئەمڕۆ یەکەم کۆنفرانسی سەرتاسەری کوردناسی سۆڤێت، کە چەند ڕۆژ لە ئیرەڤان بەڕێوەچوو، کۆتایی پێهات. کۆنفرانس کاری لەسەر دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی کرد. ڕۆژی دووهەمی کۆنفرانسەکە، باسێکی درێژو زیندووی لەسەر دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی کوردی تاووتوێ کرد. لە تاووتوێکردنەکەدا، ئەم کوردناسە گەنجانە وتاریان خوێندەوە: قوتابی قوتابخانەی بەرز شامیلۆڤ، قوتابی زانکۆ-زمانناس هاوڕێ کوردۆیڤ و هەندێ قوتابی کوردی خوێندنی بەرزی قوتابخانەکانی ئەرمەنی قسەیان کرد. لەسەر

پرنسیپەکانی دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی کوردی، یاریدەری مامۆستای زانکۆ سیواك و پرۆفیسۆر خاچاتۆریان و، لە تاووتوێکردنەکاندا پرۆفیسۆر چوپان زادە لە ئازەربایجانەوە بەشدارییان کرد. لە ڕۆژی سێهەمدا تاووتوێکردنی کێشەکان بەردەوام بوو، زیاتر لە (٣٠) سی کەس بەشدارییان تێدا کرد. هەروەها لەم کۆنفرانسەدا سەرۆکی بەشی پروپاگەندەی مارکسیزم-لینینیزمی هەرێمی پشت قەفقاس هاوڕێ بیدیاو جێگری سەرۆك وەزیرانی ئەرمینیا هاوڕێ ئیرزینکیان و، جێگری ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە" هاوڕێ گریگوریانو بەخێرهاتنی بەشدارانی کۆنفرانسەکەیان کردو سڵاویان لێ کردن. هەروەها زانای لاوی کورد هاوڕێ ئەمیر عەودالێش لەسەر ئەلفوبێ و ڕێنووس قسەی کرد.

- بەڵگەنامەکان:

* نهێنی

پەیوەندی نێوان یەکێتیی سۆڤێت و تورکیا لە ساڵی ١٩٣٤دا

(پەیوەندی سیاسی) ١٩٣٥/٥/٢٨

کۆنفرانسی کوردناسی لە ئیرەڤان، بووە مایەی ئەوپەڕی بێزاری دەسەڵاتدارانی تورکیا. گەرچی ئەم کۆنفرانسە هیچ مەبەستێکی سیاسی نەبوو، بەڵکو تەنیا بۆ دروستکردنی ئەلفوبێی زمانی کوردی و نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو دانیشتوانی کوردی یەکێتیی سۆڤێتیدا بەسترا. تورکەکان ئەم کۆنفرانسەیان بە مەترسییەکی گەورە بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی ناونەتەوەیی (سڕینەوەی ناسنامەی کورد)ی کوردەکانی تورکیا تەماشا کرد. تورکەکان، تەنانەت گومان و دوودڵی خۆیان لەوە دەربڕی کە ئایا هەنگاوێکی سیاسی لەژێر پەردەی ئەم چالاکییە زمانناسییەدا بۆ یەکگرتنی کوردەکانی وڵاتانی دەوروبەرو لەوانە کوردانی دانیشتووی تورکیای بەدواوە نابێ؟ بۆیە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت بڕیاری دا کاروباری پەروەردەکردنی کوردەکانی سۆڤێت بە زمانی خۆیان بێ، لە چوارچێوەیەکی تەنگ و سنوورداردا بەڕێوەبچێ، تا بەم چەشنە هەم

سیاسەتی نەتەوەیی یەکێتیی سۆڤێت خەوشدار نەکرێ و، هەم سەرباری ئەمە خۆ لابدات لە تێکهەڵچوون لەگەڵ تورکەکاندا. بەتایبەت جەخت لەسەر ئەوە کرا کە خۆ بپارێزرێ لە پەیوەندی کردن بە زمانناسەکانی بیانییەوە کە لەبواری گەشەپێدان بە کولتوورو زمانی گەلی کورددا کاردەکەن و، پەیوەندییان پێوە نەکرێ.

سەبارەت بە ئارمی یەکێتیی سۆڤێت کە وێنەی چیاکانی ئاراراتی پێوە دیارەو، ئەم چیایانە لەناو خاکی تورکیادان، دەوڵەتی تورکیا هەندێ لۆمەی کردین و ڕەخنەمان لێ گیرا. بەڵام دوای ڕوونکردنەوەیەکی زارەکی هاوڕێ قەرەخان لەگەڵ وەزیری ناوخۆی تورکیادا، چیتر وەزیری ناوخۆ پێی لەسەر تێبینیەکانی خۆی دانەگرت[1].

بالۆیزی یەکێتیی سۆڤێت لە تورکیا لیف میخائیلۆڤیچ قەرەخان

وێنەی بۆ هاوڕێیان

١. لیتڤینۆڤ.

٢. کریستینسکی.

بالیۆزی یەکێتیی سۆڤێت لەتورکیا

لیف میخائیلۆڤیچ قەرەخان

* بۆ کۆمسیاری کاتی (بەوەکالەت) لە کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت (وەزیری کاروباری دەرەوە) هاوڕێ کریستینسکی ن.ن

سەبارەت بە کۆنفرانسی کوردی

بەر لەوەی واسیف سەبارەت بە کۆنفرانسی کوردەکان بدوێ کە مانگی حەوتی ساڵی پێشوو لە ئێرەڤان گیرا، شوکر کاتی چاوپێکەوتنی لەگەڵ هاوڕێ قەرەخاندا پەیامی ڕەجەب پەیکەری سکرتێری گشتی پارتی گەلی تورکیای سەبارەت بە چۆنیەتی ئەم کۆنفرانسە پێ ڕاگەیاندو، داوای لە هاوڕێ قەرەخان کردبوو کە مەبەست و ئەرکی ئەم کۆنفرانسەی بۆ ڕوون بکاتەوە. وەڵامی زارەکی هاوڕێ لیتڤینۆڤ لەم بارەوە، لێرە درا بە واسیف، منیش هاوکات ئەم پەیامەم گەیاندە

ڕوشتی ئاراس. پەیامەکان، جێی ڕەزامەندی تەواوی تورکەکان نەبوو. ئێستا تورکەکان چیتر باسی ئەوەمان لەگەڵدا ناکەن کە ئایا ئەو کۆنفرانسە لەژێر پەردەی کێشەی زمانەوانیدا مەبەستی سیاسیی بەدواوە نەبوە؟ هەروەها چیتر باسی ئەوەیش نەکرا کە هەموو جموجۆڵ و چالاکییەکی ناو کوردەکان ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی هۆشیاری نەتەوایەتی کوردەکان و بتوانێ لە داهاتوودا مەترسییەك بۆ تورکیا دروست بکات. دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە ئاماژە بە بۆچوون و تێگەیشتنی ئەوان بکەین:

چۆن کورد لە تورکیادا هەیە، ئاوایش کۆمەڵێکی زۆری کورد لە عیراق و سووریاو ئێران دەژین، بەتایبەت لە سێ وڵاتی یەکەمدا کەوتوونەتە بەر شاڵاوی پرۆسەی تواندنەوەی ئەو ڕژێمانە. ئەگەر بەرامبەر بە سیاسەتی تواندنەوەی کوردەکان و، لەناوبردنی ئەو جیاوازییە ئیتنیکیەی کوردەکان لەگەڵ نەتەوەی دەسەڵاتدار (تورك)دا کە دوو نەوەی کورد کەوتوونەتە بەر شاڵاوی ئەم سیاسەتە، تورکەکان بەردەوام پاکتاوی ڕەگەزی گەلی کورد دەکەن. بەڵام پرۆسەیەکی پێچەوانە لەناو خاکی یەکێتیی سۆڤێتدا دەچێتە پێش، کە لەوانەیە هێزێکی بەرهەڵستکار لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەدا دژی تواندنەوەی کوردەکانی دەرەوەی سۆڤێت پێك بێ و، ئەم ناوەندە بچووکەی کوردەکانی سۆڤێت ببێتە هاندەرو پاڵنەری کوردەکانی دەرەوەی سۆڤێت لە خەباتیاندا بۆ هۆشیاری دیاریکردنی مافی چارەنووسی گەلەکەیان. پەرۆشی تورکەکان ئا لێرەدایە کە مەترسی بۆ سەر بارودۆخی ناوخۆی کۆماری تورکیا هەبێ، بۆیە لەم بارەیەوە نیگەرانن و بە نابەدڵییەوە دەڕواننە پرۆسەکە.

دەبێ ئەوەیش بگوترێ کە هەندێ نیشانەو بەڵگە بەدەستەوەن، باسی گەیشتنی هەندێ چاپەمەنی کوردی دەکەن، سەبارەت بە چالاکی کوردەکان، بۆ ناو خاکی تورکیاو بڵاوکردنەوەیان لەناو دانیشتوانی کوردی ئەوێ. لەم بارەیەشەوە وەزیری ناوخۆی تورکیا شوکر کەیا بە ڕاشکاوی پێی ڕاگەیاندم کە زۆر ئاگاداری بارودۆخەکەیە. لەلایەکی دیکەوە، تورکەکان لەوەیش نیگەرانن کە

ئەم جۆرە کۆنفرانسانە لە شوێنێك بەڕێوەدەچێ کە دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا، واتە شاری ئێرەڤان. جگە لەوە، بڕیارە کۆنفرانسی داهاتوو لە باکۆ بەڕێوەبچێ، کە تورکەکانی زیاتر نیگەران کردووە لە سەربەخۆیی کوردەکان. گەرچی ئاراس و شوکر کەیا چالاکی ناو کوردەکان بە کاربەدەستانی ئەرمەنستانییەوە گرێ نادەن. بەڵام من پێم وایە ئەوە ڕاست نییە، ئەگەر بگوترێ بۆچوونێکی وایان نییە، چونکە سەرۆکی بەڕێوەبەریتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە وتووێژێکی دووقۆڵیماندا ئاماژەی بەوەی کرد کە بزووتنەوەیەکی سیاسی کوردو ئەرمەن دژی تورکیاو تورك بەڕێوە دەچێ. دەتوانین وا لە ئاماژەکردنی ناوبراو لەم بارەوە تێبگەین کە بواردان بە بووژاندنەوەی کولتووری کوردی لەلایەن ئەرمەنستانی سۆڤێتەوە، پەیوەندی و هەڵوێستی نالەباری تورکەکانی توندتر کردووە، سەبارەت بەو پێشهاتانەی کە لەناو خاکی یەکێتیی سۆڤێتدا ڕوودەدەن. بەم چەشنە ئەگەر ئەو هەموو درۆو دەلەسانەی کە بە شێوەی ڕەسمی و ناڕەسمی لە ڕاپۆرتی دامودەزگا سیخوڕیەکانی تورکیادا هاتوون، سەبارەت بە چالاکیی سیاسی لەژێر پەردەی بووژاندنەوەی کولتووری ناو کوردەکاندا وەلابنێن، هەر ئەوەندە بەسە تورکەکان هەڵوێستی نیگەرانی و ناڕەزایی خۆیان بە بوونی چالاکی و بووژاندنەوەی کولتووری لەناو کورددا دەربڕن. لە دیدارەکانمدا لەگەڵ ئاراس و شوکر کەیا، جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەم چالاکییە کولتووریانە، بگرە ئەو ڕاستییەیش کە دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئێمە گەشە بەو چالاکیانە دەدەن، نابێ بە شێوەیەکی دیکەی جیاواز وەربگیرێن و، ئەمە جێبەجێکردنی سیاسەتی نەتەوەیی دەوڵەتەکەمانەو، بووەتە هۆی بەرزکردنەوەو گەشەپێدانی کولتووری گەلێك نەتەوەو گەلانی دانیشتووی وڵاتەکەمان، کە تا سەقامگیربوونی دەوڵەتی سۆڤێت مافیان پێشێل کرابوو. کەواتە نابێ ببێتە هۆی نیگەرانی و ناڕەزایی دەوڵەتی تورکیا. ئاراس کە نەیدەتوانی لەم ڕاستیانە تێبگات، لە وەڵامدا گوتی: ئەو دژی ئەوە نابێ ئەگەر دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت دەورێکی کەمو کز ببینێ، لەو پرۆسەیەدا کە بۆ

بووژانەوەی کولتووری ناو کوردەکان دەیکات. بەڵام پێی وایە، لەبەر بەرژەوەندی پەیوەندیەکانی یەکێتی‌ی سۆڤێت و تورکیا، پێویست بە هاندان و پەرەپێدانی ئەم پرۆسەیە ناکات، تەنانەت گەر کردەوەیەکی بەدواوە نەبێ. جگە لەوە، ناوبراو گوتی: من (ئاراس) هەنگاوێکی ئەوتۆیشم دژی چالاکی کولتووری لەناو تورکستانیەکانی دانیشتووی تورکیادا بەجێ‌گەیاندووە. (واتە تورکیایش نەیهێشتووە ئەوانەی کە لە سۆڤێتەوە ڕایان کردووەتە تورکیا، چالاکی بنوێنن، هەورامی). من بۆ خۆم زۆر کەم شارەزای بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردو، ئەو هەنگاوو چالاکییانەم کە لەڕاستیدا لەناو کوردەکاندا دەکرێن. بۆیە ناتوانم هیچ پێشنیارێکی کۆنکرێت لەم بارەوە بکەم. مەبەستی من لەم نامەیە ئەوەیە کە سەرنجتان بۆ ئەوە ڕابکێشم کەوا پێویستە نیگەرانی و نارەزایەتی و ڕەخنەگرتنی تورکەکان نەهێڵین ، ئەویش لەڕێی بەدرۆخستنەوەی ئەو درۆودەلەسانەوە کە سیخوڕەکانی تورکیا کردوویانە. ئەو ڕاستییەیش، واتە بەڕێوەبردنی چالاکیی کولتووری لەناو کوردەکانی سۆڤێتدا، لانی کەم دەتوانێ مەترسیی تورکەکان کەم بکاتەوە، سەبارەت بەوەی کە هەندێ کەس لەژێر پەردەی چالاکیی کولتووریدا زەمینەی چالاکیی سیاسی دژی تورکیا خۆش ناکەن. لەوانەیشە ئەم هەنگاوانەی ئێمە وا نیشان بدرێ کە ئەم کۆنفرانسانە تەنیا ناوەڕۆکێکی تەکنیکییان هەیەو، بەرپرسانی دەوڵەتیشمان بە وتارەوە بەشداری لەم کۆنفرانسانەدا نەکەن و، دەکرێ ئەم کۆنفرانسانە دوور لە سنوورەکانی تورکیا لە شارێکی دیکەی با بڵێین ناوچە ناوەندیەکانی یەکێتی‌ی سۆڤێت یا باکووری قەفقاس بەڕێوەبچن، نەك لە هەرێمی پشت قەفقاس. دەبێ ئەم هەموو کێشانە تاووتوێ بکرێن.

گرنگ ئەوەیە، ئەم کێشەیە نابێ بخرێتە ئەرشیڤەوەو بخرێتە پشتگوێ. پێمان وا نەبێ هەموو شتێك ئاساییە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ئەو ڕوونکردنەوەو تێ‌گەیاندنە پێویستانە بە واسیف ڕاگەیەندران[٧٤].

هاوڕێتان

زال گیند گ.

---

[٧٤] هەمان سەرچاوە، ل١٣٧.

* بۆ نوێنەری بەرپرسی وەزارەتی کاروباری یەکێتیی سۆڤێت
لە کۆماری فیدراتیڤی پشت قەفقاسی ڕووسیای سۆڤێتی
هاوڕێ ئاستاخوف، ١٩٣٥/٩/٥، ژمارە ٢٠٩٣
بەڕێز گیئورگی ئەلیکساندروڤیچ

وەرگێڕاوی یادداشتێکی هاوڕێ نیکیتنتان بۆ دەنێرم کە سەبارەت بە سەردانی عیسمەت پاشا بۆ ئەرمینیا لە چاپەمەنیەکانی تورکیادا نووسراوە (بڕوانە پەیوەستی یەکەم). سەرنجتان بۆ ئەو جێگەیە ڕادەکێشم کە هێڵم بەژێریدا کێشاوە: ئەمانە هەر درۆی ئاشکراو ڕووتن کە کۆنسوڵی تورکیا لە ئەرمینیا کاتی سەردانەکەی عیسمەت بۆ ئیرەڤان ڕێکی خستووە. چۆنیەتی شێوازو وشەکانیان لە ڕاپۆرتەکانیاندا دەناسمەوەو شارەزایانم. ئاشکرایە ئەو ڕاپۆرتەی کە سەبارەت بە کوردەکان نووسراوە، لەلایەن کۆنسوڵخانەی تورکیاوە نووسراوە.

مێژووی ئەم کێشەیە بەم شێوەیە: مانگی ٧ی ساڵی ڕابردوو کاتی سەفەرەکەم بۆ ئەرکێکی ڕاسپێردراو، سەردانی دەرەوەی ئیرەڤانم کرد. کۆنفرانسێکی کوردناسی لەوێ بەرێوەدەبرا، سەرۆکی بەشی ئەکادیمیای هەرێمی قەفقاس هاوڕێ پیرئوموڤ کە تێیدا سەرخۆش بوو، قسەی دەکرد: (کەنیاکی لای ئێمە زۆر بەهێزە). وتارێکی زۆر ناسەرکەوتوانەو بێناوەڕۆکی خوێندەوە. بۆ وێنە، ڕستەی بەم چەشنەی دەگوت: ((داشناکەکان لە پاپۆڕێکی نوقومکراودا ڕایان کرد، لەکاتێکدا کوردە کۆڵنەدەرو ئازاکان خوێنیان بەسەر لوتکە سەرختەکانی چیای ئاراراتدا دەڕژاندو سەربەخۆیی خۆیان پاراست)). کۆنسوڵەکانی تورکیا کە دەستکیزو سیخوڕی خۆیان لەناو پەیمانگەی تەکنیکی کوردیدا هەیەو، ئێستا کۆنسوڵەکانی تورکیایان لەم بارەوە ئاگادارکردوەتەوە. کۆنسوڵەکان ڕاپۆرتیان بۆ سەفارەتی خۆیان و، ئەوانیش یادداشتێکی پرۆتێستیان بۆ ئێمە نووسیوە. دوای ئەمەیش دامودەزگا بەرپرس و دەسەڵاتدارەکان فەرمانیان داوە کە دەبێ چوارچێوەو سنوورێك بۆ کاروباری کوردەکان دابنرێ. بەڵام بەداخەوە ئەم بڕیارانەی کە لەلایەن کاربەدەستانی پایەبەرزەوە دەدرێن، زۆرجار ڕەچاو ناکرێن (بڕوانە پەیوەستی ژمارە ٣٩٢).

بارودۆخی کێشەکە بەم شێوەیە: OKPL (دیارە دەزگایەکی بەرزی دەوڵەتی یا ئاسایشی سۆڤیێتە، هەورامی). لێرەدا گلەییەکی کرد، کە دەبێ پەیمانگەی پەیوەندی (پید تیخنیکوم) کوردی بەپێی ئەم گلەییە بگۆڕدرێ و هەڵبوەشێنرێتەوەو، بەهاری ئەمساڵ بگۆڕدرێ بە قوتابخانەی حیزبی. بڕیار دراوە بەشێکی پەروەردە لەم پەیمانگەیەدا بکرێتەوە کە لە ماوەی دووساڵدا مامۆستای کوردی ئامادە بکات. بەم چەشنە لە ئیرەڤان، لەبری دوو ڕێکخراو یا دەزگای کوردی، ئێمە دەتوانین سێمان هەبێ (واتە قوتابخانەی حیزبی سۆڤیێتی و ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە").

تورکەکان کە لە قوتابخانە کوردیەکاندا سیخوڕی خۆیان هەیە، ئاشکرایە هەموو دەنگوباسەکان بە کۆنسوڵەکان دەگەیەننەوە. کۆنسوڵەکانیش دەستبەجێ ڕاپۆرت سەبارەت بە چالاکتربوونی ئێمە لەناو کوردەکاندا دژی تورك دەدەن بە باڵوێزی خۆیان. جگە لەوە، دەکرێ بڵێین هەردوو کۆنسوڵخانەکانی تورکیا ڕۆژانە ڕاپۆرتی خۆیان سەبارەت بە پەرەپێدانی چالاکیەکانی ئێمەو هاندانی ئەرمەنیەکان دژی تورکیا ئاڕاستەی باڵوێزەکەیان دەکەن. گوایا ئەرمینیا گۆپاڵێکە یەکێتیی سۆڤیێت دژی تورکیا ئامادەی دەکات و، هەموو دانیشتوانی ئەم وڵاتە بە هەڵوێستێکی دژی تورکی پەروەردە دەکرێن و، لەباری لەشکرییەوە ئامادەو چەکداریان دەکات. لەشکری ئەرمەنیش بەشێکی جیاوازی هێزی کوردی تێدایەو، بە شێوەیەکی تایبەت ئامادەدەکرێن بۆ هێرشکردن بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیاو، کێشەی کورد کێشەی ئامادەکردنی سوارەی جەنگاوەری کوردو ئاژیتاسیون (پڕوپاگەندەکەر)ی کورد بە بیروڕای کۆمۆنیستی دژی تورکیان.

من لەگەڵ ئەو گەلاڵەیەی OKPLدا نەبووم و، تەنانەت پێم وابوو وا باشترە ئەم پرسیارە لە کۆبوونەوەیەکی داخراویشدا باس نەکرێ. بۆیە من داوام لە هاوڕێ ئاکۆپۆف کرد واز لەم پرسیارە بێنین و، ئەوە بوو هەڵگیراو لابرا.

لەم بارەوە بە پێویستی دەزانم ئەم هەنگاوانە هەڵبگیردرێ:

١. مەرجە لە هەردوو قوتابخانەی کوردیدا پاکسازی بکرێ، واتە ئەو کەسە گومان لێکراوانەو، ئەوانەی کە لەم بارەیەوە پەیوەندییەکی ناپەسندیان هەیە (پەیوەندی بە تورکەکانەوە یا گومانلێکراو)، دەربکرێن.

٢. لەم بارەوە دەبێ ئەم دوو قوتابخانەیە بۆ تیفلیس بگوازرێنەوە. لەم بارەیەشەوە من وتووێژم لەگەڵ هاوڕێیان خانجانیان و ئاکۆپۆف‌و، دام‌ودەزگا بەرپرسەکاندا کردووە. بەڵام پێیان وایە ئەگەر ئەم پێشنیارە لەلایەن ئێرەڤانەوە بکرێ، جوان نییە (لەوانەیە وا لێك بدرێتەوە کە گوشار دەخرێتە سەر کەمەنەتەوەکان). بۆیە لە هەمووی پێویستتر ئەوەیە، ئەم کێشەیە لەلایەن ئێوەوە ڕووبەڕووی دام‌ودەزگاو کاربەدەستانی پشت قەفقاس بکرێ[٧٥].

لەگەڵ سڵاوێکی هاوڕێیانەمدا

نەیمارك

* بۆ سەرۆکی کاتی بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت

ژمارە ١٧٣٩، ڕێکەوتی ١٩٣٥/٧/٢٥

نهێنی

مێژووی هاتنی دەستەی کوردناسی بۆ ئێرە، بەم چەشنەیە: ١٩٣٥/٦/١١ دەستەیەکی هەشت کەس (شەش قوتابی و دوو کەسی سەرکردەیان)ی کوردناس دێنە تفیلیس. ئەوانە دەچنە پەیمانگەی قەفقاسناسی، نەك هەر فەرمان‌و ڕێنوێنی پێویستیان پێ نەدابوون کە چۆن هەڵس‌وکەوت بکەن، بەڵکوو هاوڕێ سکوبیلۆڤیشیان لە هاتنیان ئاگادار نەکردبووەوە، گەرچی پەیمانگەی قەفقاسناسی لەو بینایەدایەو نوێنەرایەتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەیش هەر لەوێ بوو، بەبێ ڕەچاوکردنی دەستووری دام‌ودەزگاکانی بەرپرسی پەیمانگەی قەفقاسناسی‌و بێ ڕاوێژکاری و پەسندکردن، هاوڕێ سکوبیلۆڤ سەبارەت بە هاتنی کوردناسەکان بابەتێکی لە ڕۆژنامەکانی تفیلیسدا بڵاوکردبووەوە (تەماشای پەیوەستی ژمارە ١ بکە).

کوردناسەکانی ئێرەڤان لە ١٩٣٥/٦/١٩دا دێنە ئێریڤان‌و، لێرە دەکەونە هەراوهوریاو خۆنواندن‌و، ئەوانە بەبێ ڕەزامەندی من ئاگادارییەکیان سەبارەت بە هاتنی کوردناسەکان لە ڕۆژنامەدا بڵاوکردوەتەوە (تەماشای پەیوەستی ژمارە ٢ بکە). کۆنسوڵی تورکیا ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی لەم بارەوە بۆ مۆسکۆ ناردووە، ناوەڕۆکەکەی جارێ بۆ من ڕوون نییە.

---

(٧٥) هەمان سەرچاوە ل٤٤.

ئێستا قوتابیەکانی پەیمانگە لە ناوچەکان خەریکی پراکتیکن: کوردۆیڤ و سالیخۆۋ (کە هەردوو لە بەشدارانی کۆنفرانسی ساڵی ڕابردوو بوون)، لە ناوچەی ئاپران و، ئاڤیلیانی و جانویڤ (ئەوانیش بەشدارانی کۆنفرانسی ساڵی ڕابردوون) لە ناوچەی تالنین‌و، میرزایڤ و یوگوف بە هەوارگەکانی داوێنی ئالاگیزدا دەگەڕێن. بەڵام سەبارەت بە سەرپەرشتانیان، واتە هاوڕێ شامیلۆۋ و هاوڕێ جەعفەرۆۋ کە لە بەشدارانی کۆنفرانسی ساڵی پێشوون، ئەوانە لە ئێرەڤان سەرقاڵی ئیشکردنن. بەڵام تا ئەوکاتەی ئەوانە کەوتوونەتە گەشتوگوزارو سەردانی تەواوی ئەو ناوچانەی کە کوردیان تێدا دەژین، جارێ پێویستە ئەم هەنگاوانە هەڵبگیرێن:

١. سەبارەت بە نووسینگەی ڕۆژنامەکان، دەبێ پێیان بگوترێ و گەرانتی ئەوەش وەربگیرێ لەمەولا، بەبێ ڕازیبوون و پەسندکردنی ئێمە، هیچ شتێك سەبارەت بە کاروباری کوردەکان لە ڕۆژنامەکانیاندا بڵاونەکەنەوە.

٢. سەبارەت بە کوردناسەکان، دەبێ فەرمانیان پێ بدرێ کە کۆتایی بە خۆدەرخستن و پڕوپاگەندەی خۆیان لەبارەی چالاکیەکانیانەوە بهێنن. دووهەم هەنگاو کە پێم وایە بەگوێرەی پێویست نییە، ئەوەیە کە دەبێ هەنگاوێکی وا لە مۆسکۆ هەڵبگیردرێ کە بەرگری لە هاتن و دەرکەوتنی کوردناسەکان بۆ ناو خاکی یەکێتیی سۆڤێت بکرێ و، دەبێ مۆڵەتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت مسۆگەر بکرێ. بۆ ئاگاداری، کوردەکانی ئازەربایجان ڕاست دوو ئەوەندەی کوردەکانی دانیشتووی ئەرمەنستانن و، لەوێ پێکەوە دەژین و، ژیان و کەلەپووری خۆیان پاراستووە. لەکاتێکدا زۆربەی کوردەکانی ئێرە (ئەرمینیا) ئەوەندە بە ئەرمەنی‌کراون‌کە خۆیان بە کورد نازانن. ئەوانە وەك گرووپی بچووك بچووك لەناو زۆرینەی دانیشتوانی ئەرمەنیدا دەژین. لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا، کۆبوونەوەی کوردناسی و کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی لە ئەرمەنستانی سۆڤێتی و، هاتنی بە هەراوهۆریای کوردەکان هەر بۆ ئەرمینیا، ئازەربایجان ناتوانێ وەك شتێکی بێ‌مەبەست و پێشتر دانراو حیسابی بۆ نەکات (٧٦).

فەرمانبەری دیپلوماسی

نەیمارك

---

(٧٦) هەمان سەرچاوە، ل٤٦، ٤٤.

* بەشی یەکەمی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت
ژمارە ٨٣٧١، ڕێکەوتی ١٩٣٥/٦/٢٩

سەبارەت بە بەشی یەکەمی نامەی فەرمانبەری دیپلۆماسیی سەر بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت لە ئیرەڤان هاوڕێ نەیمارك، ژمارە ٣٩ی ڕێکەوتی ١٩٣٥/٦/٢٩، لەسەر کێشەی کورد. من قسەم لەگەڵ هاوڕێ باقیرۆفدا کرد، پێی وایە ئەو چالاکیانەی لەناو کوردی ناوچەکانی ئالاگیزو کەڵباجاری ئازەربایجان بەڕێوە چوون، ناتوانین ببنە بنەمایەك بۆ سکالاو پرۆتێستی تورکەکان [٧٧].

فەرمانبەری دیپلۆماسی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت

ئیلینسکی

* بۆ فەرمانبەری دیپلۆماسی وەزارتی کاروباری دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت لە باکۆ
هاوڕێ ئیلینسکی، ١٩٣٥/٦/٢٩، ژمارە ٨٣٧١

ئەمساڵ، ١٥ی مانگی شەش لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەمان فەرمان بە خۆتان دراو، کۆپیی نامەی هاوڕێ "نەیمارك"یشتان لە ١٩٣٥/٦/٢٩دا پێ‌نیشان درا. داوامان کردبوو بزانین ئێوە چ هەنگاوێکتان لەسەر ئەو شتانەی کە لە نامەکەدا هاتووە، هەڵگرتووە. بۆ وێنە، لەسەر کوردەکان و فرۆشتنیماڵەکەی کۆنسوڵی تورکیا لە ئیرەڤان ئیلماز (ماڵەکەی ئیلماز لە باکۆیەو دەیەوێ بیفرۆشێ) [٧٨].

یاریدەدەری سەرۆکی بەشی و.ك.د. سۆڤێت

میلیر

* بۆ سەرۆکایەتی کاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت
هاوڕێ کریستینسکی ن.ن
زۆر بەڕێز نیکولای نیکولایۆڤیچ

---

[٧٧] هەمان سەرچاوە، ل٥٠.

[٧٨] هەمان سەرچاوە، ل٥٣.

ئەمە زیاد دەکەم بۆ نامەی پێشووم، واتە نامەی ژمارە ٨٤ی نهێنی ڕێکەوتی ١٩٣٥/٣/٢٧و ڕادەگەیەنم:

بڕیاری دەوڵەتی لەسەر کێشەی کورد بەم چەشنەی خوارەوە جێبەجێ کراوە:

١. ئەو کۆنفرانسەی کە بڕیارە مانگی ٧ی ١٩٣٥ لە باکۆ بەڕێوەبچێ، هەڵوەشێندراوەتەوە.

٢. تەواوی کاروباری بەڕێوەبەرێتی لەلایەن ئەنیستیووت (پەیمانگە)ی قەفقاسناسی لە تیفلیس (کە ڕاستەوخۆ سەر بە بەڕێوەبەرێتی ئاکادیمیای زانیاری یەکێتیی سۆڤێتە) بەڕێوە دەچێ و، بەشی کوردیی تێدا ڕێك خراوەو، بەرپرسی هاوڕێ کاروینەو، تێکەڵی بەشی گەلانی بێخاوەن کراوەو، کەم نووسراوە (ئەوانەی هێشتا ئەلفوبێو نووسراویان بە زمانی خۆیان نییە)، گەرچی دوو بەشی دیکە هەیە، واتە بەشی ئەتنۆگرافی و مێژوویی، کراونو بڕیار دراوە کاروباریان تەنیا لە بواری زانستیدا بەڕێوەبچێ.

٣. هەموو ئاڵوگۆڕێکی کوردناسی لەگەڵ دەرەوەدا، دەبێ بەتوندی بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی بەشی پڕوپاگەندەی کولتووری پەیمانگەی قەفقاسناسییەوە.

٤. سەرنووسەری ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە" لەکار لابراوەو، ڕۆژنامەکەیش خراوەتە چوارچێوەی خزمەتگوزاری و بڕیارە دەوڵەتیەکانەوە.

٥. پشتگیری و بەرگری لە ناردنی ڕۆژنامەو چاپەمەنی کوردی بۆ دەرەوەی وڵات کراوەو، لەم بارەوە فەرمان بەدامودەزگاکانی بەرپرس دراوە کە نەهێڵن ڕۆژنامەو چاپەمەنی کوردی ببرێنە دەرەوە.

٦-پەیمانگەی پەروەردەی کوردی ئیرەڤان (ئیرەڤانسکی کوردسکی پیدتیخنیکوم) هەڵوەشێندراوەتەوەو، گۆڕاوە بە قوتابخانەی حیزبی سۆڤێتی بە بەشی پەروەردەوە (ئەم کێشەتان لە نامەی ژمارە ٧٧٨٠ی ڕێکەوتی ١٩٣٥/٣/١١دا بۆ نێرراوە). بەپێی بڕیاری دەوڵەتی، تاووتوێکردن و هێشتنەوەی پەیمانگەی پەروەردەی تەکنیکی کوردی لابراوەو ڕەت کراوەتەوە[٧٩].

---

(٧٩) هەمان سەرچاوە، ل٥٣.

لەگەڵ سڵاوی هاوڕێیانەمدا

نوێنەری بەرپرسی وەزارەتی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت

م.سکوبیلۆڤ

* بۆ سەرۆکی کاتی بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت

هاوڕێ تسوکێرمان

ژمارە ۱۳۱۲، ڕێکەوتی ۱۹۳۹/٦/۹

بەپێی ئەو زانیاریانەی کە هەمە، ماوەیەك لەمەوبەر ئارال و ئیلماز ڕاپۆرتێکی نهێنییان سەبارەت بە کێشەی کورد نووسیوە. دەتوانین بڵێین ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیەیە:

(لەم ڕۆژانەدا دەرچووانی خولی بەناو پەیمانگەی تەکنیکی کوردی لە ئیرەڤان، گوایە ژمارەی ئەو دەرچوانە پەنجا کەسە (بەڵام لەڕاستیدا هەژدە کەسن، نەیمارك) زۆر زیاترن لە پێویستیەکانی قوتابخانەی گوندە کوردنشینەکانی ئەرمینیا (بەڵام لەڕاستیدا بەش ناکەن، نەیمارك).

هێشتا، لە ئیرەڤان ڕۆژنامەی کوردی "ڕێیا تازە" دەردەچێ. کە بوونی ئەم ڕۆژنامەیە لەسەر سنووری تورکیا خۆی لەخۆیدا مایەی مەترسی و دوژمنایەتییە ( دوژمنکارانەیە یا هەڕەشەیە بۆ سەر تورکیا، هەورامی). زۆربەی چالاکیی کوردی لەو شوێنانەیە کە دەکەونە چوارچێوەی ئازەربایجانی سۆڤێتی، واتە ئەو ناوچانەی کە وەك ئۆتۆنۆمییەکی یەکگرتووی کوردستان دێنە بەرچاوو، قەرەباغ بە ئەرمینیاوە گرێ دەدەن. لەوێ، ڕۆژنامەی تورکی بەناوی "قیزل کوردستان" و دوو ڕۆژنامەی دیکەی کوردی دەردەچێ. ناوەڕۆکی ئەم ڕۆژنامانە، سەرەڕای ئەوەی کە یەکێتیی سۆڤێت بەڵێنی دۆستایەتی لەگەڵ تورکیادا هەیەو، بڕوای بەو بەڵێنە هەیە، بەرامبەر بە تورکیا نەفرەت ئەنگێزو دوژمنانەن).

بە تەماشاکردنی ناوەڕۆکی کورتی ئەم ڕاپۆرتە، دەبینین سەرنجی تورکەکان بە شێوەیەکی سەرەکی هەر لەسەر کوردستانی ئازەربایجانە (واتە ناوچەکانی لاچین و

کەڵباجاری ئازەربایجان). لەڕاستیدا بیرۆکەی ڕێکخستنی ناچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان لەم ناوچانەدا هەبوو، بەڵام پاشان ئەم بیرۆکەیە پشت گوێ خرا. وا دیارە هەندێ ئاسەواری ڕێڕەو و لایەنی ئەم بیرۆکەیە لەوێ ماون. بەپێی ناوی ڕۆژنامەی "قیزل کوردستان" بێ، ئەم بیرۆکەیە وازی لێ نەهێنراوە. پێویست بوو هاوڕێ ئیلینسکی سەرنجی لەم شتە بدات.

سەبارەت بە کێشەی دامودەزگا کوردیەکان (واتە ڕۆژنامەو پەیمانگەی پەروەردەی تەکنیکی پیدتیخنیکوم) لە ئیرەڤان، لە دیدارێکدا لەگەڵ هاوڕێ خانجانیاندا، ناوبراو پێی گوتم: ئەگەر ئەوانەیان لێرە لە ئەرمەنستانی سۆڤێتی هەڵگرتبایەو بگوێزرانایەتەوە بۆ تیفلیس، کە شوێنێکی لەبارو جێی خۆیانەو ڕازی دەبوون، جێی سوپاس دەبوو. بەڵام ئەو بۆ خۆی ئەم کێشەیە ناهێنێتە گۆڕێ، باسی بکات. ئەو زۆر پێی خۆشە ئەگەر ئەم کێشەیە لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێتەوە لە مۆسکۆ یا تیفلیس، بڕیاری لەسەر بدرێ یا ڕێنوێنی بکرێ.

منیش لەلایەن خۆمەوە پێم وایە زۆر باشترو پێویستە فەرمان بە نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت بدرێ لە تیفلیس، تا کێشەی گواستنەوەی ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە"و پەیمانگەی پەروەردەی تەکنیکی کورد لە ئیرەڤانەوە بۆ تیفلیس بخاتە بەردەمی کۆمیتەی حیزبی ناوچەکە. ئەمڕۆ شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشم زانی کە پەیوەندیی بە نووسەرانی ئەو ڕاپۆرتەوە هەیە. سەرکۆنسوڵی تورکیا، واتە ئیلماز، کە پێشتر وەك سکرتێری کۆنسوڵخانەی تورکیا لە باکۆ ئیشی کردووە، لەوێ ماڵێکی باشی هەبوە لە گەڕەکی پایەبەرزانی دەوڵەتی. کاتێك ئیلماز دێتە ئێرە، هەر ئەو ماڵەی بۆ دەهێڵنەوە. بەڵام نازانم بۆچی؟ ماوەیەك لەمەوبەر زانیم ناوبراو دەیەوێ بە پارەیەکی باش بیفرۆشێ و، بۆ مۆسکۆی نووسیوە دەیەوێ بڕوات بۆ باکۆ، بۆ ئەوەی ئاگاداری هەندێ کاروباری ئێمە و کوردەکان بێ و زانیاری وەربگرێ. ئەوە بوو بە فڕۆکە چووە باکۆو خانوەکەی ئەوێی بە پانزە هەزار ڕۆبل فرۆشت و، بە گەڕانەوەیشی لەگەڵ ئارالدا ڕاپۆرتێکی نووسی کە ناوەڕۆکەکەیم لێرەدا بۆ نووسیون [٨٠].

فەرمانبەری دیپلۆماسی لە ئەرمەنستانی سۆڤێتی

نەیمارك

---

(٨٠) هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

* بۆ بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت

هەروەها بۆ فەرمانبەرو نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت لە ئێرەڤان نەیمارك

ژمارە ٨١٠٥٠

ڕێکەوتی ٢٦ی مایسی ١٩٣٥

سەبارەت بە نامەکەتان کە ٣٠ی نیسانی ئەمساڵ بە ژمارە ٣٠ی زۆر نهێنی نوسرابوو، بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت ڕادەگەیەنێ، کە لەگەڵ بۆچوونەکانی خان جانیاندا هاوڕان لەبارەی ئارمی ئەرمەنستانی سۆڤێتەوە. دواتر لەبەرئەوەی ئێستا تورکەکان چیدی باسی ئەم کێشەیە ناکەن، شتێکی زۆر پێویست و ڕاست بوو کە ئێمە بۆ خۆمان زیاتر سەرنج لەم کێشەیە بدەین‌و جەختی لەسەر بکەینەوەو دەستپێشخەری گۆڕینی ئارمی دەوڵەتی بین. داواتان لێ دەکەم ئەم هەڵوێستە بگەیەننە هاوڕێ خان جانیانی سەرۆکی بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵات تسوکیرمان.

بناغە بۆ ئەم شتە (ئەوەیە: ئارارات دەکەوێتە ناو خاکی تورکیا، لە ئەرمینیا هیچ ناوبانگێکی نییە. ئەویش بەوەدا دیارە کە یەك گۆڕانیش لەسەر ئارارات نییە، لەکاتێکدا کەم گۆڕانی هەیە ئاماژە بە ئالاگیز نەکات. بوونی چیای ئارارات لە ئارمی ئەرمینیادا، پێویست بە بیرهێنانەوەی ئەو ڕابردووە تاڵ و ڕەشەی ڕابردوو نییە. گرنگ نییە ئەم ئارمە لای تورکەکان دەبێتە هۆی گومان لە نیازی تۆڵەسەندنەوەی ئێمە[٨١].

سەرۆکی بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت

هاوڕێ تسوکیرمان

کۆنسوڵەکانی تورکیا دیسانەوە دەستیان بە بیرهێنانەوەو هێنانەکایەی ئاسووریەکان کردووە، واتە چالاکی کۆمەڵەی گشتی و سەرتاسەری

---

[٨١] هەمان سەرچاوە ل٥٥.

ئاسووریەکانی یەکێتیی سۆڤێت، بەتایبەت بەشەکانی ئەم کۆمەڵەیە لە ئێرەڤان و لینینیەکان. پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە هەر ئەودەمەی کۆنفرانسی ئاسووریەکان هاوینی ساڵی ١٩٣٤ لە تیفلیس بەڕێوەچوو، ئەوانە لە ڕاپۆرت و وتارەکانی خۆیاندا هەڵوێستی سیاسییان دژی تورکیا گرتەبەر. بێگومان بەم بارەیشەوە تورکەکان ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر ئەم کۆمەڵەیە دەنووسن. پێویستە بگوترێ تەواوی ئیش‌وکاری ئەوانە ئەنجامەکەی بێبەرهەم دەبێ، لەبەرئەوە:

١. بێگومان لەناو ئەم کۆمەڵانەدا مرۆڤی سەرکێش هەن کە دەتوانن کێشەمان بۆ دروست بکەن. ئەگەر لەگەڵ تورکەکاندا بۆمان دروست نەکەن، بێگومان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بۆمانی دەکەن.

٢. کۆنسوڵی تورکیا لە لینینیەکان، واتە ئارال، مرۆڤێکی ئەوتۆیە کە توانای ئاژاوەگێڕانی هەیەو، کردەوە (بێ کردەوەو بێ بەرهەمەکان یا چالاکی)ی ئەم کۆمەڵەیە بە شێوەیەکی وا بنووسێ کە دەربکەوێ دژی تورکیا خەریکی پیلان گێڕانە. بۆیە من پێشنیار دەکەم کە زۆر پێویستە ئەم کێشەیە بخرێتە بەردەمی دامودەزگا بەرپرس‌ودەسەڵاتدارەکان و، چارەسەر بکرێ و، لانی کەم نەهێڵن ئەم کۆمەڵەیە کە دەتوانێ کێشەی زۆرمان بۆ بنێتەوەو پێویستمان پێی نییە، نەهێڵن‌و هەڵبوەشێندرێتەوە. ئەرکی ئەم کۆمەڵەیە بریتییە لە یارمەتیدانی بەرزکردنەوەی کولتوورو ئابووریی‌و باری ژیانی زەحمەتکێشانی ئاسووری. بەڵام،

١. لەبەرئەوەی ئەم کۆمەڵەیە تەنیا لەسەر کاغەز ناوو بۆنی هەیەو بێگوتارو ناوی خۆی خەڵك دەترسێنێ،

٢. لەکەیەوەو، تاکەی سیاسەتی نەتەوەیی لینینیی ئێمە لەڕێگەی ئەم جۆرە کۆمەڵەو ڕێکخراوو ناوەندە ئۆتۆنۆمیە کولتوریانەوە بەڕێوەبچێ.

پێم وایە، ئێمە بەگوێرەی پێویست ئەوەندە دامودەزگای حیزبی سۆڤێتیمان هەیە، کە زیادیشن، بۆ ئەوەی سیاسەتی نەتەوەیی لینینی بەڕێوە ببەن. بۆیە پێویستە کۆمەڵەی ناجۆرو بێناوەڕۆکی ئاسووریەکان هەرچی زووترە، لە ئاستی هەموو یەکێتیی سۆڤێتدا هەڵبوەشێندرێتەوەو لابرێ[٨٢].

فەرمانبەری دیپلۆماسی نەیمارك

---

[٨٢] هەمان سەرچاوە ل٦٠.

* بۆ بەشی یەکەمی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت
لەسەر نامەی ژمارە ٧٧١٩ی ئێوە
ڕێکەوتی ١٩٣٥/٢/٢٢

لەم بارەوە دەگەڕێینەوە بۆ کۆپیی پرۆتۆکۆڵی کۆنفرانسی کوردناسی. دەبێ بڵێم تێکستی تەواوی پرۆتۆکۆڵی کۆنفرانسەکە بە ڕێکوپێکی ڕێك خراوە (دانە ڕووسیەکەی ئەم پرۆتۆکۆڵە لەلایەن منەوە چاك کراوەو وەرگێڕاوە ئەرمەنیەکەی بەفەرمانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب، لەلایەن یەکێك لە فەرمانبەرانی سەرکردایەتی حیزبەوە واتە هاوڕێ سیریك داوەتیان نووسراوە)و، تەواوی ئەو شوێنە نالەبارانەی پرۆتۆکۆڵەکە بەوردی هێڵی بەژێردا هێنراوە.

بەپێی بڕیاری دامودەزگاکانی ئێرە، تەواوی کاروباری کۆنفرانسە کوردناسیەکە لە پەیمانگەی کەرەستەکانی کولتووری ئەرمینیا وەرگیراوەو دراوە بە بەشی کۆڕی زانیاری قەفقاسی سەر بە کۆڕی زانیاری یەکێتیی سۆڤێتو، ئەویش هەر لەو بینایەدایە کە بەڕێوەبەرێتی نوێنەرایەتی بەشی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێتی لێیە.

بە هەڵوەشاندنەوەو نەهێشتنی بەشی قەفقاسناسی سەر بە کۆڕی زانیاری یەکێتیی سۆڤێت، کاروباری کوردناسی دراوە بە پەیمانگەی قەفقاسناسی قەفقاسی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی جێبەجێکەر (شووڕای وەزیران). دواتر لەبەرئەوەی ئەم پەیمانگەیەیش هەر لەو بینایەدایە کە بەڕێوەبەرێتی بەرپرسی نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێتیشی لێیە، ئەم بەڕێوەبەرێتیەی وەزارەتی دەرەوە دەتوانێ و ئاسان دەبێ ئاگادارو کۆنترۆڵی ئیشوکاری کوردناسی بکات تا تووشی هەڵەو لادان نەبێ. لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمەدا، دەمەوێ بڵێم تەواوی کاروباری ئامادەکردنی بانگەوازی کۆنفرانسی کوردناسی بدرێتە دەستەی بەشی پشت قەفقاسی کۆڕی زانیاری یەکێتیی سۆڤێت، ئەویش شوێنەکەی هەر لەو بینایەدایە کە نوێنەرایەتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێتی تێدایە. جگە لەوە، نوێنەرایەتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە لێرە نەك تەنیا لەسەر بانگەوازی بەستنی کۆنفرانس

ئاگاداری کردووومەتەوە، بەڵکوو لەکاتی کۆنفرانسەکەدا ناردوومی بۆ لینینیەکان، واتە کاتێك کۆنفرانسەکە دەستی پێ کردبوو، واتە ئەودەمە کە ئیتر پیرئوموڤ وتارە پڕ لە درۆو دەلەسەو ئابڕووبەرانەکەی خۆی دابوو.

پیرئوموڤ، ڕۆژی بەڕێکەوتنی لە ئێرەڤانەوە، لە بەڕێوەبەرێتی نوێنەرایەتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت بووەو، هاوڕێ سکوبیلۆڤ نەك تەنیا لەم بارەوە ناوبراوی ڕێنوێنی نەکردووەو فەرمانی پێویستی پێ نەداوە، بەڵکوو پاشانیش کاتێك هاوڕێ سکوبیلوڤ بۆ لێکۆڵینەوە دەینێرێتە ئەوێ، ڕاپۆرتی درۆودەلەسە ئاڕاستەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە دەکات لە ئێرەڤان. هێشتا ئەم شتانە نەماون:

١. ڕۆژنامەی کوردی "ڕێیا تازە".

٢. تیخنیکۆمی کوردی (پەیمانگەی ئامادەکردنی مامۆستایان، هەورامی).

ڕۆژنامەکە شەش ڕۆژ جارێك دەردەچێ و، لەژێر دەستی وەزارەتی کشتوکاڵدایەو، تەنیا خەریکی بەرزکردنەوەی باری ژیان، کولتوورو بارودۆخی ئاژەڵدارو جووتیارانی کوردە لە کەڵخۆزی ناوچەکانی تالین، ئابران، کوتائیس و ئاتختین لە ئەرمینیاو، زۆرکەم هەواڵ لەسەر کەڵخۆزە کوردیەکانی ناوچەی (ڤدین)ی سەر بە کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤێتی و هەرێمی نەخچەوان بڵاودەکاتەوە.

تەنانەت لەکاتی کۆنفرانسە درۆزنەکەی کوردناسیدا، ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە" هیچ کێشەیەکی جیهانی بڵاونەکردەوەو، وەك ڕابردوو دەنگوباسی کەڵخۆزەکانی بڵاودەکردەوە. ئەم ڕۆژنامەیە بەوردی لەلایەن دامودەزگا بەرپرسەکانی ئەرمەنستانەوە کۆنترۆڵ کراوەو بەڕێوە دەبرێ. لەوەی کە ئەم ڕۆژنامەیە تا چ ڕادەیەك دوورەپەرێزە، دەتوانین بەوەدا بیسەلمێنین کە کۆنسوڵەکانی تورکیا نەیانتوانی هیچ بیانوو و ڕەخنەیەکی لێ بدۆزنەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە لەلایەن وەرگێڕەکانیانەوە بۆیان وەردەگێڕدرێن.

ئیدی تیخنیکومی کوردی هەڵوەشاوەتەوەو، کراوە بە قوتابخانەی حیزبی و بەشێکی بچووکی پەروەردەی هەیەو، ساڵانە پانزە کەس بۆ ئیش‌وکاری

پەروەردەو، ئەوەندەیش بۆ کاروباری حیزبی ئامادە دەکات؛ لەوانە ١٨ کەسیان دەبنە مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانە کوردیە کەڵخۆزەکانی ئەرمەنستان و، ٢ تا ٣ یان هەر بۆ ئەو مەبەستە دەنێردرێن بۆ هەرێمی نەخچەوان و، دوویان دەنێردرێن بۆ خوێندنی بەرزو، ئەوانی دیکەیش ئیش‌وکاری سۆڤێتی و پارتایەتییان لە ناوچە کوردنشینەکان پێ دەسپێردرێ. کوردێك بە سەرۆکی ئەم قوتابخانە حیزبییە دیاری کراوە، کە خۆڕاگرو لەباری سیاسیشەوە باش ئامادە کراوەو حیزبییەو زمانی کوردیش باش دەزانێ.

١. وتاری هاوڕێ شامیلۆڤ ١٩٣٥/٧/١١:

((ئێمە دەبێ لە تەواوی بەرهەمەکانی ئێوە، دیارە مەبەستم ئەدەبیاتی ئەرمەنییەو ئەمڕۆ هەیە، کە باشترین و لەبارترین کەرەستەیە، کەڵك وەربگرین بۆ دروستکردنی زمانی کوردی، هەم بۆ کوردەکانی ئێرەو هەم بۆ کوردەکانی دەرەوە. ئەم کارە لەڕێگەی نوێنەرانی ئەم گەلەوە دەکرێ کە هاتوونەتە ئێرەو، وەك دەبینین هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمەو زمانەکەی ئێمەشدا نییە.))

٢. وتاری پرۆفیسۆر چوپانزادە ١٩٣٥/٧/١١:

((ئاشکرایەو بێگومان ئێستا شتێکی فەنتازییە (خەیاڵییە) کە باسی کێشەی دروستکردنی زمانێکی جیهانیی کوردی بکرێ‌و، دەتوانم بڵێم تەنانەت بیرۆکەیەکی کۆنەپەرستانەیە. ئەرکی سەرشانی ئێمە دیارە، ئەویش ئەوەیە کە زمانێکی یەکگرتووی کوردی بۆ کوردەکانی پشت قەفقاسی سۆڤێتی دروست بکەین. ئێمە دەبێ زمانێکی سۆڤێتی خۆمان دروست بکەین، زمانێکی بەرزو بەرهەمی بەکۆمەڵی هەموومان بێ، بتوانێ ببێ بە نموونە بۆ کوردەکانی دەرەوەیش. جگە لەوە، بێگومان دەبێ ئێمە بنەمایەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیشی پێ زیاد بکەین. بەم چەشنە ئێمە دەتوانین کێشەی کوردی لە ئاستی جیهاندا چارەسەر بکەین.))

٣. وتاری هاوڕێ سیڤاك ١٩٣٥/٧/١٣:

((... له دەرەوه كۆمەڵه كوردێكی زۆر هەن و، ئێمه دەبێ زمانێكی ئەدەبی ئەوتۆ دروست بكەین كه له داهاتوودا لەلایەن كوردەكانی دەرەوەیشەوه پەسند بكرێ و وەربگیردرێ و پێشوازی لێ بكرێ.))

٤. وتارێكی دیكەی پرۆفیسۆر چوپانزادە:

((سەبارەت به دروستكردنی ئەلفوبێ (ڕێنووس)و وشەڕۆنان (تیرمینالۆگیا)و ... ئێمه ئەزمونێكی دەوڵەمەندمان له دەیان كۆماری سۆڤێتیدا هەیەو، پێویسته تەنیا ئەوانه وەك نموونەیەك كه ئەنجامی بەكۆمەڵی لێكۆڵەرو زانیارانی یەكێتیی سۆڤێتمانه، كۆبكرێتەوە. گواستنەوەی ئەم ئەزموونه بۆ دەرەوەیش پێویسته تا بیروڕاو كاریگەریی بۆرژوازی لەسەر كاروباری كوردناسی نەبێ.))

٥. وتاری هاوڕێ شامیلۆڤ ١٩٣٥/٧/١٣:

((پرۆفیسۆر خاچاتوریان گوتی: كابرایەكی دەرەوە، واته له پرۆفیسۆرو زانایەكی ئینگلیزی كه بۆ بەرژەوەندی ئیمپریالیزم كاردەكات، خەریكی لێكۆڵینەوەیه لەسەر زمانی كوردی، ئەویش تەنیا لەبەر مەبەستی ئیمپریالیستانەی خۆیانەو، پێشنیارمان پێ دەكات شتێكی نوێ بهێنینه ناو زمانی كوردی. وا دیاره ئەو زانا ئینگلیزه دەیەوێ ویستی خۆی بەسەرماندا بسەپێنێ و، كاریگەری لەسەرمان هەبێ.))

٦. وتاری (بەخێرهاتن)ی سەرۆكی بەشی كولتووری كۆمیتەی ناوەندی پارتی كۆمۆنیستی ئەرمەنستانی سۆڤێتی هاوڕێ ئاریسیان

((گرنگی ئەم كۆنفرانسه نەك تەنیا له چوارچێوەی كۆمارەكەی ئێمەدایه، بەڵكوو بۆ دەرەوەی یەكێتیی سۆڤێتیشه... ئێمه دەبێ كولتوورێكی واو زمانێكی ئەوتۆ بۆ زەحمەتكێشانی كوردو، ئەدەبیاتێكی وا دروست بكەین كه لەناو جەرگەی زەحمەتكێشانی كوردەوه هەڵقوڵابێ و، بتوانێ نەك تەنیا دەیان ئەدەبناس

و زانا پەروەردە بکات، بەڵکوو دەبێ ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی کولتووری کۆمەڵانی زەحمەتکێشی کوردو، هەروەها ببێتە هۆی ڕاپەڕاندنی براکانی کوردی دەرەوەی وڵاتەکەمان. لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی ئێمە، نەك تەنیا هەر بۆ ئەوە نییە کە پەرەو گەشە بە کۆمەڵانی خەڵکی یەکێتیی سۆڤێت بدەین و بۆ خۆمانی بکەین، بەڵکوو دەبێ یارمەتی برایانی زەحمەتکێشی دەرەوەمان بدەین و، دەبێ بۆ خەباتی دژی ئیمپریالیزمی و چالاکترکردنیان ڕایان بکێشین و ئاستی هۆشیاری سیاسییان بەرزبکەینەوە.))

٧. وتاری هاوڕێ پیرئوموڤ:

(لەلایەن بەشی کۆڕی زانیاری پشت قەفقاسی سەر بە کۆڕی زانیاری یەکێتیی سۆڤێتەوە سڵاوو بەخێرهاتنی بەشدارانی کرد).

((داشناکەکان پاش دەربڕینی سوپاسیان بۆ ئیمپریالیزم، بە هاندانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بۆ پاراستنی بەرژەوەندەکانی ئیمپریالیزم، ئەوانە (داشناکەکان) هەر بەردەوامن بۆ جێبەجێکردنی ویستی خاوەنەکانیان (ئیمپریالیزم)... ئەنجامی ئەم ئاژاوەیە کە تراژیدیاو کارەساتێکی گەورەی بۆ گەلی کورد بەدواوە بوو، لای هەموان ئاشکرایە.

ئێستا دوای شکاندنی ئەم پیلانەی ئیمپریالیزم، کە داشناکەکان دەورێکی بەرچاویان تێدا بینی، ئێمە ئەو دەورەیان لە وتارەکانی سەرکردەکانیاندا دەبینین، کە یەکتر لەقاو دەدەن و، داشناکەکان کە خۆیان لەم پاپۆڕە نوقمبووەی کوردەکان ڕزگارکرد، بە سەرشۆڕی و ترسنۆکانە ڕایانکردو خۆیان شاردەوە، ئەمەیش لەکاتێکدا بوو کە هەندێك لە کوردەکان قارەمانانە لە چیا سەخت و بەرزەکانی ئاراراتدا لەشەڕی نابەرامبەردا لەپێناوی سەربەخۆیی خۆیاندا شەهیدکران)).

((ئێوە بەم کۆنفرانسە شمشێرێکی تیژتان بەدەستەوەیە کە گەلی کوردی پێ چەکدار دەبێ، بۆ ئەوەی نەك تەنیا لێرە خەبات بکات و، ئاستی کولتووری خۆی بەرزبکاتەوە، بەڵکوو لەوێش لە دەرەوە بتوانێ خۆی لە دەستی ئیمپریالیزمی

خوێنڕێژ ڕزگار بکات... لەم بارەوە کۆبوونەوەکەی ئێوە، بڕیارەکانی ئێوە بایەخێکی گرنگیان بۆ دەرەوەیش هەیە)).

بە پێویستی دەزانم ئەوەش بڵێم جگە لەو وتارانەی کە لەبارەی زمانناسیەوە لەم کۆنفرانسەدا پێشکەش کراون، هەروەها وتارێکی زۆریش لەسەر گەشانەوەی فیۆدالیزم لەناو کوردەکاندا خوێندرانەوە. ئەوەی کە باس کرا، نیشانی دەدات کە کۆنفرانسی کوردی لە ئیرەڤان بەبێ گیروگرفت نەبوو و، هەروەك لە ڕاپۆرتەکەی هاوڕێ سکۆبیلۆڤدا هاتووەو ئێمە لەم بارەوە توانیمان وەڵامی تورکەکان بدەینەوە. لەبەرئەوە بە پێویستی دەزانم هاوڕێ سکۆبیلۆڤ سەبارەت بە کۆنفرانسی دووهەمی کوردی لە باکۆ ئاگادار بکەنەوەو فەرمان و ڕێنوێنی پێ بدەن. بۆ کاروباری کوردناسی داواتان لێ دەکەم کۆبوونەوەیەك بۆ لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی ئەم کێشەیە لەلای ئێوە، واتە لە ناوەند، ڕێك بخرێ بە بەشداری ئەو هاوڕێیانەی کە لە مۆسکۆن، واتە هاوڕێ قەرەخان سکۆبیلۆڤ و نەیمارك[٨٣].

* سەرۆکی بەشی یەکەی ڕۆژهەڵات تسوکیرمان
هاریکاری ئەم بەشە میلیر
جێگری کۆمسیاری کاروباری دەرەوە (وەزارەتی دەرەوە)ی یەکێتیی سۆڤێت، هاوڕێ کریستینسکی ن.ن، ژمارە ٨٣
ڕێکەوتی ٢٧ی مارسی ١٩٣٥
لەسەر نامەکەی ئێوە، واتە ژمارە ٧٧٨٠
ڕێکەوتی ٣/١١ی ئەمساڵ ١٩٣٥

بڕیاری دەوڵەتی سەبارەت بە چالاکی و، کاروبار لەناو کوردەکاندا لە بروسکەیەکدا لەلایەن کۆمیتەی هەرێمی قەفقاسەوە ڕاگەیەندراوە. بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی بیرۆی کۆمیتەی هەرێمی قەفقاس، لە ١٩٣٥/٣/١٥دا، بەرپرسانی سەرکردایەتی یەکێتیی سۆڤێت و ئەرمەنستانی سۆڤێتی پێکەوە

---

[٨٣] هەمان سەرچاوە، ل٦١-٦٣.

بڕیاریان داو، فەرمانیان پێ درا کە دەبێ کاربەدەستانی ئەرمەنستان و ڕێکخراوە هەڵسووڕاوەکانی ئەم کێشەیە فەرمانی ناوبراو جێبەجێ بکەن. سەبارەت بە نامەکەی ئێوە، من کۆمیتەی هەرێمی حیزبیم لە قەفقاس ئاگادار کردوەتەوە. کێشەی هێشتنەوەی پیدتیخنیکوم (پەیمانگەی پەروەردەیی) کە بەپێی نامەکەی ئێوە دەبێ بمێنێتەوە، لە ڕۆژانی نزیکدا ڕوون دەکرێتەوەو، کۆمیتەی هەرێمی حیزبی لە قەفقاس دەینێرێ بۆ مۆسکۆو، ئەوانیش لەم بارەوە فەرمانم دەدەنێ و، منیش ئێوە بەوردی ئاگادار دەکەمەوە[٨٤].

**نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت**

**سکۆبلیۆڤ.م**

* لە بەشی یەکەمی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت

بۆ نوێنەری ئەم وەزارەتە لە تیفلیس هاوڕێ سکوبیلۆڤ ژمارە ٧٧٨٠ \١١ی مارسی ١٩٣٥

کۆپی بۆ نوێنەر (باڵیۆز)ی یەکێتیی سۆڤێت لە تورکیا هاوڕێ قەرەخان

وەك ئاگادارن، بڕیارێکی دەوڵەتی لەم بارەی کاروبارو چالاکی ناو کوردەکانی پشت قەفقاسی کۆماری فیدراڵی قەفقاسی سۆڤێت هەیە، کورتەیەکی بە چەند خاڵ لای خوارەوە دەنووسین:

١. ئەو کۆنفرانسە کوردناسییەی وا بڕیارە مانگی حەوتی ئەمساڵ لە باکۆ ببەسترێ، بەڕێوەناچێ.

٢. ناوەندی کوردناسی دەگوازرێتەوە بۆ تفلیس، واتە بۆ بەشی کۆڕی زانیاریی پشت قەفقاسی سەر بە کۆڕی زانیاریی یەکێتیی سۆڤێت و، کاروباری ئەم مەڵبەندە کوردناسییەیش مەرجە بەتوندی لە چوارچێوەی زانیاری زمان و ئەدەبیاتدا بێ.

---

[٨٤] هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

٣. ئاڵوگۆڕو پەیوەندیی کوردناسانی سۆڤێت لەگەڵ زانایانی دەرەوەدا، بە چاودێری کۆمیتەی ناوەندی سەرتاسەری سۆڤێت بۆ دانانی ئەلفوبێی نوێ و، هەروەها لەلایەن کۆمیتەی حیزبیی پشت قەفقاسی سۆڤێتەوە دەبێ.

٤. ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە"ی ئیرەڤان، دەبێ ببێتە ڕۆژنامەیەکی ئاسایی خۆجێیی نەتەوەیی (میللی). جگە لەوە، ئەم ڕۆژنامەیە بۆی نییەو نابێ باسی کوردەکانی دەرەوە بکات.

٥. بردنەدەرەوەی ڕۆژنامەو کتێبی خوێندن و هەر چەشنە نووسراوێکی کوردی بۆ دەرەوە قەدەغەیە.

٦. پەیمانگای پەروەردەیی (پید تیخنیکوم)ی کوردی لە ئیرەڤان هەڵبوەشێنرێتەوەو، بکرێ بە قوتابخانەیەکی حیزبی بۆ ئامادەکردنی فەرمانبەرانی حیزبی و سۆڤێتی، بۆ ئەو شوێنانەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن (دەبێ بەشێکی بچووکی پەروەردە لە قوتابخانەی حیزبی سۆڤێتدا بەگوێرەی پێویست بهێڵرێتەوە.

جێبەجێکردنی سێ خاڵی یەکەم خراوەتە ئەستۆی کۆمیتەی حیزبی پشت قەفقاس و کۆمیتەی ناوەندی سەرتاسەری سۆڤێت بۆ کاروباری ئەلفوبێی نوێ و، سێ خاڵەکەی دیکەی ئەم بڕیارە بە فەرمان و ڕێنوێنی کۆمیتەی حیزبی قەفقاسی ئەرمەنستان دەبێ.

داواتان لێ دەکەم، سەبارەت بەم کێشەیە پێوەندی پێویست بە کۆمیتەی حیزبی و دەسەڵاتدارانی ئەرمینیاوە بکەن و، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت ئاگادار بکەنەوە کە ئەو هەنگاوانەی بە کردەوە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی دەوڵەت لەبەرچاو گیراون و پێڕەوی دەکرێن، بەتایبەت داوادەکەم ئەو خاڵانەی کە تایبەتن بە هەڵوەشاندنەوەو لای ئێمەو لە ئاستی دەوڵەتیدا بڕیاریان لێ دراوە، ڕەچاو بکرێن. بڕیارەکەی ئێمە بەپێی ئەو زانیاریانە بوون کە لەکاتی تاووتوێکردنی کێشەکەدا گەیشتبوون. لەوانەیە پێویستییان بە تاقیکردنەوە هەبێ بۆ دەرخستنی و ڕاستی و ناڕاستی لەجێدا. ئەگەر لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو

تاقیکردنەوەدا بۆمان دەرکەوت ئێمە بۆمان داناون و، ئەگەر پێویست بە هێشتنەوەی پەیمانگەکە بکات بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ ماوەتەوە، ئەودەم پێویستە لەگەڵ کۆمیتەی حیزبی قەفقاسدا ئاگادارمان بکەنەوە بەڵگەو بڕیارەکەتان لەم بارەوە لەسەر چ بنەمایەك دەبێ، ئەودەم ئێمەیش سەرلەنوێ ئەم خاڵانە تاووتوێ دەکەینەوە [٨٥].

جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤێت

کریستینسکی

* سەرۆکی بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت

هاوڕێ تسوکێرمان

ژمارە K ٣\١١٠ی شوباتی ١٩٣٥

بەپێی ئەو خاڵانەی کە دوێنێ بە داخوازی هاوڕێ کریستنیسکی لە شاری تفلیسەوە نێرراون، تەواوی ئەو بابەتانەی کۆنفرانسە کوردناسیەکە (بە وتارو پرۆتۆکۆل و ...ەوە) کە لای منە، بۆتانی دەنێرم، جگە لەو وتارانەی کە بە زمانی کوردی نووسراون و، لەم ڕۆژانەدا وەریان دەگێڕین و بۆتانی ڕەوانە دەکەم. بابەتەکان بە زمانی ڕووسی و ئەرمەنین. وەرگێڕاوە ئەرمەنیەکان بۆ زمانی ڕووسی لە یەکی مارسی ئەمساڵدا ئامادە دەبن، ئەودەم بۆتانی دەنێرم، بەڵام جارێ کۆپیی ئەسڵیتان بۆ دەنێرم.

ئەو بابەتانەی کە بۆتانی دەنێرم، هێشتا پوخت و ڕێکوپێك نەکراون. لەبەرئەوەی بایەخی بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتەکان زیاتردەکەن، بەدرێژایی ماوەی بەڕێوەبردنی کۆنفرانسی کوردناسی یەك جار ناوی تورکیا هاتووە، ئەویش لە وتاری بەخێرهاتنەکەی هاوڕێ ئاریسیاندا کە هەستێکی تێدا لە خەباتی قارەمانانەی گەلی کورد بۆ سەربەخۆیی خۆیان ئاڕاستەی داشناکەکان دەکات. هەر لەو وتارەدا هاوڕێ ئاریسیان داشناکەکان ڕیسواو شەرمەزار دەکات کە

[٨٥] هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

کوردەکانیان لە ساڵانی ١٩١٩ و ١٩٣٥ و ١٩٢٦دا دژی تورکیا ڕاپەڕاند. ئەگەر هەندێ وشەو ڕستەی نالەبارو سەرنەکەوتوو لەم کۆنفرانسەدا لەلایەن بەشدارانی ئاسایی کۆنفرانسەوە گوترابێ، وەلای بنێین. تەواوی گوتارو بابەتەکان تەنیا لەسەر کێشەکە و سوودبەخش بووە و، کەڵکی زۆری بۆ زمان و نووسینی کوردی هەبوە.

بەهۆی پەلەکردنەوەو منیش سەرلەنوێ بابەتەکانم نەنووسیەوەو، بگرە پوختەیشم نەکردن. پێم وایە دەکرێ سەرلەنوێ لە مۆسکۆ چاپ بکرێنەوە.

ئەگەر پێویست بە ماتریاڵی ئەو بابەتانە نییە، تکایە بیاندەن بە کۆمیتەی ئەلفوبێی نوێی تورکی سەربە ئەنجومەنی نەتەوەکانی سۆڤێت[٨٦].

**فەرمانبەری دیلۆماسی نەیمارک**

*** بۆ بالیۆزی کاتی یەکێتیی سۆڤێت لە تورکیا**

**هاوڕێ زالیکند**

**ژمارە ٧٥٨٧ ١٩٣٥\١١\٢٣**

سەبارەت بە کوردەکان، لە پۆستەی دیکەدا بەوردی و دوورودرێژی بۆتانی دەنووسم. هەر کە پرۆتۆکۆل و کۆمەڵە وتارەکانی کۆنفرانسی ئێریڤانمان پێگەیشت، چاوەڕێین بگەنە دەستمان، بە گەیشتنی بۆتانی دەنێرین. جارێ دەتوانین تەنیا ئاگادارتان بکەینەوە کە ئەو بابەتانەی لەبەر دەستماندان بەهۆی کەموکوڕی زۆری ئەو پێوەندیەکانمانەوە، زەحمەتە بتوانین سەبارەت بە ناوەرۆکی سیاسەتی دەرەوەی کۆنفرانسی ئێرەڤان ئەنجامێك بەدەستەوە بدەین. کۆپی نامەی هاوڕێ سکوبیلۆڤ کە ١٩٣٤/١٢/٣٨ بە ژمارەی زۆر زۆر نهێنی ٤٧٦، لەم بارەوە نووسیویەو، هەروەها وەرگێڕاوی ئەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامەی کوردی "ڕێیا تازە"دا بلاوکراونەتەوە، ڕەوانەیان دەکەم بۆتان. ئەوەیش لەبەرچاو بگرن کە وەرگێڕانی ئەو وتارانە لە کوردییەوە بۆ زمانی ڕووسی لە توانای ئێمەدا نییە، لەبەرئەوەی وەرگێڕ زمانە کوردیەکەی زۆر بێداروبارە.

---

(٨٦) هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

هەرچۆنێك بێ، پێمان وایە دەوڵەتی تورکیا هیچ بنەمایەکی نییە لەسەر ئەو کۆنفرانسە کوردییە تا ڕەخنە (لۆمە یا ناڕەزایی) لە ئێمە بگرێ، چونکە باسی تورکیای تێدا نەکراوەو، تەنیا کولتووری کوردەکانی ئێرەی تاووتوێ کردووە کە زۆر دواکەوتوون.

ڕاگەیاندنی ئاراس سەبارەت بەوەی کە ئێمە بەمەبەست و بەئەنقەست کەوتووینەتە چالاکیی کولتووری و نەتەوەیی لەناو کوردەکانداو، ئەو چالاکیانەی کە ئەوان (تورکەکان) بۆ خۆیان لە ناو گاردە سپیە هەڵاتوەکانی ڕووسیای قەیسەری کردوویانەو، بەوەی لای ئێمەیان بەراورد کردووە، ئاشکرایە هیچ بنەمایەکی نییەو، دەبێ بەتوندی بەرپەرچ بدرێنەوە. هیچ شتێك دژی تورکەکان لە چالاکیی کولتووری ئێمەدا لەناو کوردەکان نەکراوە. لاف و گەزافی تورکەکان بۆ ئەوەیە، لەپێناوی دانانی ڕێزمانی کوردی و پەروەردەو فێرکردنی کوردەکاندا دەستەبەری چالاکیەکانمان ببین. لەلایەکی دیکەوە، بۆ ئەوەیە ئێمە دەست لە هەموو هەنگاوێك بۆ بەرگریکردن لە هەراوهوریا لەسەر ئەم کێشەیە هەڵ بگرین، تا دڵنیا بن. لەڕاستیدا ئێمە ڕێ لە هەموو هەوڵدانێك بۆ بەرگریکردن لە پێوەندی نێوان کوردەکانی تورکیاو دەرەوە بگرین[٨٧].

سەرۆکی بەشی یەکەمی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت تسوکیرمان

هاوکاری بەش میلیر

* بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت
هاوڕێ لیتڤین م.م
ژمارە نهێنی ٧٦٤ لە ١٩٣٤/١٢/٢٨

من کۆپیی ڕاپۆرتە تایبەتەکەی ئێوەم (ژمارە ٨٨ی ١٩٣٤/١٢/٢٣) سەبارەت بەو کۆنفرانسەی کە لە ئێرەڤان گیراوە، بەدەست گەیشت. من گرنگیی کێشەکەو

---

[٨٧] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ئامادەنەبوونی فەرمانبەری دیپلۆماسیمان لە ئیرەڤان لەبەرچاودەگرم. ئێوارەی ئەو ڕۆژەیش ئیرەڤانی بەجێهێشتبوو (هاوڕێ نەیمارك بەهۆی نەخۆشییەوە پشووی وەرگرتووە، بەڕێوەبەری کاروباری شوورای وەزیرانی ئەرمینیا بە شێوەیەکی کاتی لەجێی ناوبراو کار دەکات). هەر لە برووسکەکەمدا کە لە ئیرەڤانەوە ڕۆژی ١٩٣٤/١٢/٢٥نێردراوە، بەڕێوەبردنی کۆنفرانسی زانستی لەبارەی زمان و نووسینەوە لە یەکێتیی سۆڤێت بۆ یەکێك لە کەمەنەتەوە دواکەوتووەکان کارێکی ئاساییە. پرۆتۆکۆلەکانی کۆنفرانسەکە کە ئێستا لە کۆمیتەی ئەلفوبێ نوێیەکانی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی (تسیك)دان و، هاوکات ئەو چەند ڕۆژنامانەی کە بە زمانی کوردی و ئەرمەنین‌و دوو یادداشتی ناو ڕۆژنامە ڕووسیەکانیشتان بۆ دەنێرین، هەموویان بەوردی چۆنیەتی کۆنفرانسەکە دەخەنە ڕوو. نوێنەری کۆمیتەی ناوەندی جێبەجێکەری ئەرمینیا لە وتارەکەی خۆیدا هیچ وشەیەکی سەبارەت بە سەربەخۆیی کوردەکان نەدرکاندووە (وتارەکەی لە ژمارە ١٥٨ی ڕۆژنامەی ئەرمەنیدا هاتووە). کۆنفرانسەکە داوای ڕێکخستنی مەڵبەندێکی سەرتاسەری (لە ئاستی سۆڤێتدا)ی کوردناسیی لە تفلیس کردووەو، داوایشی کردووە کۆنفرانسێکی ئەوتۆ لە ساڵی داهاتوودا، واتە ١٩٣٥، لە باکۆ ببەسترێ.

بەپێی ئەو بەڵگەو زانیاریانەی کە بە من گەیشتوون، ئەو ئەنجامەم دەستگیر بووە کە بنەمایەك بۆ ناڕەزایی ئەم و ئەو (دیارە دوو پێشنیاری سەرەوەیە) نابینم. تکایە فەرمانی پێویستمان لەم بارەوە بۆ بنێرن. بێگومان باڵیۆزی تورکیامان بە درۆودەلەسەو دوژمنانە ئاگادار کردوەتەوەو تێیان گەیاندووە. دوێنێ ئێوارە نەیمارك کە لە پشوودان گەڕابوەوە بۆ ئیرەڤان، لای من بوو، ڕایگەیاند:

١. ئەو زانیاریە درۆودەلەسەو دوژمنانەیە کۆنسولی تورکیا لە ئیرەڤان داویە بە باڵیۆزخانەی تورکیا لە مۆسکۆ.

٢. نەیمارك لە مانگی ئابدا ڕاپۆرتێکی سەبارەت بەم کێشەیە بۆ سەرۆکی بەشی یەکەمی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤێت هاوڕێ

تسوکیرمان نووسیوەو، زانیاریی ڕێکوپێك و ڕاستی لەسەر کۆنفرانسی ناوبراوی داوەتێ، بەڵام لەو بارەوە ئەو هیچی بە من نەگوت.

بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی کۆنفرانسەکە، من بەرەو ڕاستییەکی ئەوتۆ، واتە نووسینگەی ڕۆژنامە کوردیەکەمان "ڕێیا تازە" نەك تەنیا ڕۆژنامەکەی خۆیان، بەڵکو کتێبیش کە زۆربەیان کتێبی فێربوونی زمانی کوردین و لە ئێرەڤان بڵاودەبنەوە، بە پۆستی ئاساییدا نێردراون بۆ سەرۆکی یەکێك لە هۆزەکانی کوردی تورکیا کە وەك پەنابەرێکی تورکیا لە دیمەشق دەژی. هەروەها بۆ یەکێك لە کەسایەتیە کۆمەڵایەتیەکانی کورد لە مووسڵ دەنێررێ. ئەم دوو کوردە، بەبۆنەی ئەو کتێبانەوە، سوپاسی خۆیان ئاڕاستەی سەرنووسەری ڕۆژنامەکە کردووە. سەرەڕای سادەو ساکاری ئەم کردەوەیە، من پێشنیارم بە هاوڕێیانی بەرپرسی ئەرمەنی (لەوانە هاوڕێ تیر گابریلیان سەرۆکی شوورای کۆمیتەی کۆمیسیار"سەرۆکی شوورای وەزیران"ی ئەرمەنستان لەم مەسەلەیە ئاگاداربوو) کرد، بەزووترین کات واز لەم کردەوەیە بهێنن، تەنیا لەو چوارچێوەیەدا بهێڵرێتەوە کە ڕۆژنامەکە بنێردرێ بۆ خوێنەرێکی ئاسایی کە ئابوونە دەدات و، بەڵێنیان پێدام کە جێبەجێی بکەن.

من داوام لە هاوڕێیانی ئەرمەنی کرد بە هۆشیارییەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەی کورددا بکەن و، لێی دوورەپەرێز بن، بەتایبەت هەستیاریی دەوڵەتی تورکیا بەرانبەر بەم کێشەیە لەبەرچاو بگرن. پەیوەندیی نێوان کۆنسوڵەکانی تورکیا لە ئێرەڤان و لینینەکان، لەگەڵ هاوڕێیانماندا لە ئەرمینیا لەپێشەوەی هەموویاندا نوێنەرانی دیپلۆماتمان، چاوەڕێی بەرەو باشتربوونی لێ دەکرێ. کۆنسوڵەکانی تورکیا سەبارەت بە پەیوەندی کوردو ئەرمەن گوشاری تاڕادەیەك توندوتیژیان دەکردو، دەتوانین بڵێین ئەوانە دژ بە ئەرمەنستانی سۆڤێتی دەجووڵێنەوە. لەم بارەوە بەوردی لە نامەی ٢٣و ١٢و ... ژمارە ٤٧٣ی زۆر زۆر نهێنی هاوڕێ تسوکیرمان ئاگادارکراوەتەوە.

لەوانەیە، ئەو هاوڕێیانەی ئەرمەنستان و، ئەو دەورەی ئەم دوو کۆنسوڵە لە پەیوەندیەکانی سۆڤێت و تورکیادا دەیبینن، بگرە لە مەسەلەی بچووکیشدا، بەتایبەت

له بواری پرۆتۆکۆلەکاندا "واتە پەیماننامەکان" هەڵناسەنگێنن. بەداخەوە بۆ یەکەمجار، واتە لە ١٣ی تشرینی دووەم (نۆڤەمبەر) توانیم بەرەو ئێرەڤان سەفەر بکەم. کۆتایی مانگی مایس هاتمە تفلیس و، هاوڕێ لیفتاشڤیلی جێگرم لە نیوەی مانگی ٧دا تەواوی مانگی ٨ لەگەڵ شاهین بووەو، مانگی ئاب مۆڵەتی هەبوو. لە ئەیلوولیشدا بەهۆی نەخۆشییەوە مۆڵەتی وەرگرتبوو. پێم وایەو وا باشترو پێویستترە زوو زوو سەردانی ئەوێ بکرێ. بە دوورودرێژی وتووێژم لەگەڵ هاوڕێیانی خۆمان و کۆنسوڵەکاندا کردووە. بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی کەش‌وهەواکە، چەند فەرمانم بە نوێنەری دیپلوماسیمان هاوڕێ نەیمارك داوە. ئەگەر بێتوو لە داهاتوویەکی نزیکدا پەیوەندیەکانی ئێمەو ئەوان (تورکەکان) بەرەو باشی نەڕوات، ئەوەدەم پێویستە هەنگاوی ڕادیکالانەتر بۆ چارەسەری کێشەکە بگیرێتەبەر.

هەروەها چاوەڕێ دەکرێ پەیوەندیەکانی ئێمەو ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵیش بەرەو باشی بڕۆن، هاوڕێ ڕوت تیر کونسوڵی خۆمان بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی نووسیوەو دەنووسێ: پەیوەندیە بازرگانیەکانی ئێمەیش لەگەڵ ئەنادۆڵی ڕۆژهەلاتدا هەمووی ئاسایی نییەو، بەکردەوە سەروبەر لەژێر دەستی دامودەزگاکانی وەزارەتی بازرگانی دەرەوەدا لە تفلیس، نەك نوێنەری بازرگانیمان، کۆکراوەتەوە. هەروەها هیچ چەشنە پەیوەندییەکی کولتووری لەنێوان هەرێمی پشت قەفقاس‌و ئەنادۆڵی ڕۆژهەلاتدا نییە. دوای دیاریکردنی هاوڕێ ڕوت تیر وەك کۆنسولی سۆڤێت لە قارس مانگی ئاب (تا ئەم دەست نیشانکردنەی کۆنسوڵخانەی ئێمە بەبێ کۆنسول بووە)، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەم کێشانە لەگەڵ هاوڕێ ڕوت تیردا چارەسەر بکرێن و، پێویستە بخرێنە بەردەمی دامودەزگاکانی هەرێمی قەفقاس (لە برووسکەیەکدا لە ١٢/٢٧دا هاوڕێ کریستنیسیکیم ئاگادارکردووەتەوە).

نوێنەری وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت[٨٨]

سکوبلیوڤ. م

---

[٨٨] هەمان سەرچاوە، ل٩٣.

# هێندێ ڕاستیی مێژوویی

جاڕدان و بانگەوازو ئەو هەموو نوسراوو پروپاگەندانەی دەسەلاّتدارانی سۆڤێتی هەر لە سەرەتای هاتنەسەر کار تا ڕووخانیان سەبارەت بە یەکسانی و مافی چارەنووسی گەلان و ئینتەرناسیونالیزم و چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی و، پشتیوانیکردنی گەلانی چەوساوەو ژێردەست و سەدان دەربڕینی دیکەی بە وتن و نووسین تا جێبەجێکردن و بوونیان، نەك تەنیا یەکیان نەگرتوەتەوەو دژ بوون، بەڵکوو بەپێچەوانەوە بووە. لێرەدا هەندێ بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنت و سەرچاوە لەگەڵ ئەزموون و ئەو وتووێژانەدا کە لەنزیکەوە کردوومن و کەوتوونەتە بەر گوێم، دەیانخەینە بەرچاو، تا تراژیدیای کوردەکانی سۆڤێت (یا کوردستان یا کوردی ڕووسیا یا کوردستانی قەفقاس) لەگەڵ تراژیدیای کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستاندا بەراورد بکەین، دەبینین گەلێك کارەساتبارترو خەمبارترە.

مەبەستی لێکۆڵینەوەکەم چەند خاڵی سەرەکی بوو، لەوانە:

١. بەپێی سەرچاوەکانی ڕووسی-سۆڤێتی، بەشێکی کوردستان لە ئەنجامی شەڕەکانی ڕووسیاوە لەگەڵ تورکە عوسمانیەکان و شاکانی ئێراندا لە سەدەی نوزدەهەمدا کەوتە سەر خاکی ئیمپڕاتۆریی ڕووسیا. ئەم بەشەی کوردستان درێژەی نیشتمانی کوردانە، واتە گەلێکی دیکە ناکەوێتە نێوانیان، بە چەشنێك کە هۆزو خێڵ و تەنانەت زۆرینەی ماڵە کوردەکانیش پاش دانانی سنووری دەستکردی نێوان ڕووسیاو تورکیاو ئێران، کەوتنە ناو سنووری ئەم دەوڵەتانەو بەسەریاندا دابەش کران.

٢. کوردستانی بن دەستی ڕووسیا هەتا هاتنە سەر کاری بەلشەویکەکان لە ١٩١٧دا، بەهۆی شەڕە ماڵوێرانکەرەکانیانەوە تووشی زەرەرو زیانێکی ماڵی و گیانی بوو، بە چەشنێك کە ژمارەیەکی زۆری گوندو خانووبەرەی کوردان بەیەکجاری وێران و خاپوور کران و، زۆربەی دانیشتوانیان ناچار بوون بەرەو پارچەکانی دیکەی کوردستان (کوردستانی بن دەستی ئێران و تورکیا) هەڵبێن و، بۆ هەمیشە بواری گەڕانەوەیان پێ نەدرێ و، لە ئێران و تورکیایش بەبیانووی ئەوەی کە ئەوان خەڵکی وڵاتێکی دیکەن، دەیانگوازنەوە بۆ دەرەوەی کوردستانی بن دەستیان یا ناهێڵن لە ناوچە سەرسنووریەکاندا جێگیر بن (لەم بارەوە بڕوانە کتێبی کورد لە شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی).

٣. تراژیدیای کوردی کوردستانی سۆڤێت، لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی بەلشەویکەکاندا تا ڕووخانی یەکێتیی سۆڤێت، چەند قۆناغ و کێشەی گرنگ دەگرێتە خۆ: وەك سەرژمێری کوردان بەپێی سەرژمێریەکانی سۆڤێت، دروستبوونی کوردستانی سوور (١٩٢٣-١٩٣٠) و هەڵوەشانەوەی کۆنفرانسی کوردناسی ١٩٣٤، بەزۆر ڕاگوێزانی ساڵانی١٩٣٧و ١٩٤٤و درێژەی تراژیدیاو نەگەڕانەوەیان بۆ شوێنی باووباپیرانیان و چەند بابەتی دیکە.

٤. تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤێتی بەرامبەر بە گەلی کوردی وڵاتەکەی خۆی، دەکرێ تەنیا لە چوارچێوەی جینۆسایدو پاکتاوی ڕەگەزیدا لێی بکوڵرێتەوە؛ ژینوسایدێکی ڕانەگەیەنراوو بێدەنگ و نادیارو دوورودرێژو لەسەریەك، وەك دوورخستنەوەی بە هەزاران کیلۆمەتر کورد لە نیشتمانی خۆی و، دابەشکردنیان بەسەر گەلێك کۆمارو ناوچەو نەتەوەو زمان و دابو نەریتی جیاوازداو، کەش‌وهەوایەکی دیکەو تواندنەوەیان. واتە کاتێك بۆ مرۆڤێك یا گرووپێك یا گەلێك لە خانوو یا گوندو شارو وڵاتی خۆی دایدەبڕن و بەزۆر زەوتی دەکەن و، دەیدەن بە خەڵکی دیکە، تاوان لەوە گەورەترو قورستر نەبووەو نابێ، قەوارە بسڕنەوەو شوێنەواری نەهێڵن، لەوە قورستر نابێ. لە جێگەیەکدا لە دژوارترین بارودۆخدا نیشتەجێ بکەن و، بەزۆر کار پێ بکرێ،

ناسنامه وەربگیرێتەوە، مافی ڕۆیشتن بۆ ئەملاو ئەولا نەبێ و، تەنانەت مافی هاوولاّتیشت لە تاراوگەدا نەبێ! چۆنیەتی گواستنەوەی کوردەکان لە نیشتمانی خۆیانەوە بۆ کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و سیبریا، بە چی گواستوویاننەوەو، چۆن خەڵك لە ڕۆژو وەرزی ساڵدا، لەڕێ بە سەرماو برسێتی و نەخۆشی مردوون‌و، چەند بەڕێگەوە بوون، چۆنیەتی بارودۆخی نیشتەجێی تازەیان، چەند هاوارو هانا بردنە بەر دەسەلاّتدارانی سۆڤێت تا بگەڕێنەوە؟ چۆن وەلاّم دراونەتەوە؟

کورد، بەهۆی شۆڕشەکان و سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە، تووشی ماڵوێرانی و ڕاونان و گواستنەوە و دەربەدەری بووەتەوەو، کوردستان بە عەرەب و تورك و فارس کراوەو ڕووبەڕووی هەڵمەتەکانی جینۆسایدو ئەنفال و کیمیاباران و... بووەتەوە، بەلاّم زۆربەیان هەر لەسەر خاکی باپیرانیان ماونەتەوەو، ئەوانەیش دەربەدەرو ئاوارە، یا تووشی ڕاگوێزان بوون. پاش ماوەیەك بەهۆی گۆڕانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان یا بە لێبوردن گەڕانەتەوە بۆ کوردستان. زۆر جار کورد پەنای بۆ شاخ و چیا و (پێشمەرگە) بەئەمەکەکانی کوردستان بردووە، یا بەهۆی وتووێژی هێزە کوردیەکانەوە لەگەڵ ڕژێمدا بوارێکیان بۆ هەڵکەوتووەو گەڕاونەتەوە، تەنانەت هەندێکیشیان بە واسیتەو بەرتیل و دزییەوە گەڕاونەتەوە یا خۆیان تەسلیم کردوەتەوە. ئەمانە هیچ کامیان بۆ کوردی سۆڤێت نەڕەخساوە، تا بگەڕێنەوە بۆ سەر ئاوو زەوی باووباپیرانیان. کوردی سۆڤێت لە شارو گوندەکانی کوردستان گەمارۆ دراون. ئەوانە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بووە بۆیان. شۆڕشێکیان نەکردووە تا سزا بدرێن، دژی دەسەلاّتی سۆڤێت نەبوون، تا چاوەڕێی شتێکی ئەوتۆ بکەن. بواری ڕاکردنیشیان بۆ شاخ یا بۆ دەوڵەتێکی دراوسێ یا بۆ شارو گوندێکی دیکە نەبوە، وەك کوردی کوردستانی باشوور (بۆ نموونە) تا ڕابکەن و لە ولاّتێکی دیکەی وەك ئێران ببنە پەنابەرو، لەوێ هاوولاّتیە کوردزمانەکانی بێن بە هانایانەوە.

تاوانێك ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بەرامبەر بە کورد کردوویانە، لەلایەن هێزو کەسایەتی و... کوردیەکان‌و، کۆمەڵگەی نێوەتەوەیی و ڕێکخراوەکانی مافی

مرۆڤ و ڕۆژنامەنووس و کەسایەتی دەوڵەتانەوە، کەم یا زۆر لەقاو دراوە. بەڵام تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤێتی، بەتایبەت ستالین، بەرامبەر بە گەلی کورد لەقاو نەدراوەو، ڕەخنەی لێ نەگیراوەو پرۆتیست نەکراوە. بەتایبەت پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان کە زۆر لە ئەندام و لایەنگرو تەنانەت ئەندامی سەرکردایەتیشیان لە سۆڤێت و ئازەربایجان و ئەرمەنستان و.. ژیاون و خوێندوویانەو، لە نزیکەوە کەم یا زۆر کوردی سۆڤێتیان بینیوەو، هەندێکیان شاهیدی ئەو کارەساتانە بوون و، بەدرێژایی تەمەنی سۆڤێتی بێدەنگ بوون و، یەك وتار یا لێکولینەوەیان لەم بارەوە نەنووسیوە، بەڵکوو هەر بە بەژن و باڵای سۆڤێتدا هەڵیان داوە.

باسی پارت و ڕێکخراوە کوردیەکانیش ناکەم، کە خۆیان لە پارتە کۆمۆنیستەکانی ئێران و عیراق و سووریاو تورکیا بە چەپترو مارکسی–لینینیتر زانیوەو، سۆڤێتیان بە قەڵای ئاشتی و ئازادی و پشتیوانی گەلانی چەوساوەو کوردو کوردی سۆڤێتیان هەر زۆر بە بەختەوەرتر داناوە لەچاو کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان، گوایە هەموو مافێکیان دەستەبەر کراوە، لەکاتێکدا لە خۆیان نەپرسیوە بۆچی قەوارەی کوردەکانی سۆڤێت هەڵوەشاوەتەوە؟ بۆچی کوردەکان ڕاگوێزراون؟ بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارو پەیمانگەو ناوەندێکی کوردناسی نییە ؟ هەزاران پرسیاری دیکە. ئەگەر هەستی مرۆڤایەتیو نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و ئینتەرناسیۆنالیستییان هەبوایە، نەك تەنیا ڕیزەکانی ئەو حیزبەی کە تێیدان بەجێیان دەهێشت، بەڵکوو ڕەخنەو پرۆتیستی خۆیان ئاڕاستەی سۆڤێت و ئۆردووگای سۆسیالیزم دەکرد، تا نەوەکانی گەلەکەمان چیتر فریوی ئەو درۆو دەلەسانەیان نەخۆن و، بەرەو هەڵدێریان نەبەن. کورد کادێریکی زۆری ناردوەتە یەکێتیی سۆڤێت، دەورەی حیزبی ببینن و فێربنو بزانن چۆن کێشەی نەتەوەیی لەم وڵاتە چارەسەر کراوەو سۆسیالیزم بنیات نراوە؟ بەڵام تۆ بڵێی ئەو کادیرانە جارێك داوایان نەکردبێ بیانبەن بۆ لای برا کوردەکانیان، تا بزانن چۆن دەژین وچی دەڵێنو چۆن کێشەکەیان چارەسەرکراوە؟ ئەگەر بێتوو کوردی بەشەکانی

کوردستان بیانزانیبایە بە فەرمانی هاوڕێ ستالین قەوارەکەی هەڵوەشاوەتەوەو ڕاگوێزراون، هەموو کوردستان لە سۆڤێت و پارتە کۆمۆنیستەکان هەڵدەگەڕانەوە، شەرەف و ئابڕووی سۆڤێت و پارتە کۆمۆنیستەکانی ئێران و سووریاو تورکیاو عیراقمان دەچوو.

ئەگەر فاشستێکی وەك ستالین سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانی لە ١٩٤٤دا، بیانوویەکی بێبناغەی بۆ فریودانی خەڵك هێنابوە گۆڕێ، کوردەکانی سۆڤێتی لەبەر هاوسنووری لەگەڵ تورکیادا گواستەوەو گومانی لێ کردبوون، ئەی هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور کە هەر بە فەرمانی ئەو لە ١٩٣٠ دا جێبەجێ کرا، چ بیانوویەکی هەبوو، ئەی بۆ گواستنەوەی کوردەکانی ئەرمینیا لە ١٩٣٧و، گواستنەوەی کوردی دیکە پاش دووهەمین جەنگی جیهانی، چ بیانوویەکی هەبوو؟!

جەنگ کۆتایی هات، بەڵام ڕاگویزان هەر بەردەوام بوو. کوردەکان چاوەڕێ بوون بۆ نیشتمانی خۆیان بگەڕێنەوە. بەردەوام داوایان کردو پاڕانەوەو گریان. سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانی و پاش جەنگ، پەیوەندییان بە کارەساتی کوردی سۆڤێت و ڕژێمە تاوانبارەکەی سۆڤێتەوە هەیە، من بەجیا لێم کۆڵیوەتەوەو، تەنیا ئاماژەی پێ دەکەم:

ئـ . قازی محەمەد ساڵی ١٩٤٢ بە یاوەری دەستەیەکی نوێنەرایەتی کوردی ڕۆژهەڵات، لەلایەن دەوڵەتی سۆڤێتەوە بانگ کرا بۆ باکۆ، گوایە سۆڤێت لە کوردستانی ڕۆژهەڵات پشتی کوردی گرتووەو، گەلێك بەڵێن و قسەی فریودەرو بێناوەڕۆکی پێ داوە. ئەمە لەکاتێکدا پێشتر کوردستانی سوور لە١٩٣٠دا، هەر لەلایەن ئەم ڕژێمەوە هەڵوەشێنراوەتەوەو لە ١٩٣٧وە کوردی سۆڤێتیان ڕاگواستووەو، قورسترین قۆناغی گواستنەوەی کوردەکانی سۆڤێت ١٩٤٤ بووە.

چۆنیەتی سەرهەڵدانی کۆماری مەهابادو ئاشبەتاڵکردنی، یا بە واتایەکی دیکە، فرۆشتنی ئەم کۆمارە بە نەوت و شای ئێران، هەر لەلایەن هاوڕێ ستالینی مامۆستای کرێکاران و زەحمەتکێشانی جیهانەوە تاوانێکی دیکەیە (تێزی نامەی دوکتۆراکەم بوو، گەلێك بەڵگەم لەم بارەوە خستوەتە ڕوو). سۆڤێت بەڕواڵەت

پشتگیری کوردی کردووەو، هاوکات لەوبەری ڕووباری ئاراس بەپێچەوانەی ئەمبەری ڕووباری ئاراسەوە (کوردستانی ڕۆژهەڵات) جووڵاوەتەوە. ئەم فەلسەفەیەی دەسەڵاتدارانی سۆڤێت دەکرێ تەنیا لەگەڵ سیاسەتی ڕژێمە داگیرکەرەکانی دیکەدا بەراورد بکرێ. زۆرجار بەناو پشتی کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستانیان گرتووەو، کوردەکانی خۆیان دوچاری کوشتارو گواستنەوەو کوردستانیان کاول کردووە. وێنەی شای ئێران لە١٩٧٠-١٩٧٥دا.

ب. پاش هەرەس پێهێنانی کۆماری مەهابادو هاتنی بارزانی نەمر بۆ سۆڤێت لە١٩٤٧دا، ئەو دەمەی بارزانی و هەڤاڵانی لە ئازەربایجان بوون، هەندێ کاربەدەستی سۆڤێت لە ئازەربایجان پێشنیاریان کرد: بۆ ئەوەی بارزانی لەبەر چاوان نەبێ و ڕەخنەی ئێران و عیراق... نەیەتە سەریان (هێشتا سۆڤێت بە تەمای نەوتەکەی ئێران بوو و بەلایەکدا نەکەتبوو)، باشتر ئەوەیە بەسەر ناوچەو گوندە کوردنشینەکانی خۆیان (کۆماری ئازەربایجان-کوردستانی سووری پێشوو)دا دابەش بکرێن و، لەناو خێڵ و هۆزەکانی خۆیاندا بن. بەڵام لەبەر گەلێك هۆ، ئەم پێشنیارە پەسند نەکرا. پاشان بڕیار درا بارزانی و هاوالانیشی بگوازنەوە بۆ ئۆزبەکستان. ئەویش بەزۆرو بە نابەدڵی بارزانیەکان. ئەم ڕووداوانە لە کتێبی (بارزانی لە هەندێ بەڵگەو دیکۆمێنتی سۆڤێتی پێشوو ١٩٥٨، ١٩٤٧، چاپی هەولێر، ٢٠٠٢)ی نووسەری ئەم کتێبەی بەردەستدا بڵاوکراوەتەوە. نامەوێ لێرە ئەم سیاسەتە ئابڕووبەرو تۆتالیتارەی ڕژێمی سۆڤێتی لەگەڵ ڕژێمەکانی دیکەدا بەراورد بکەم.

پ- پاش مردنی ستالینی دیکتاتۆرەکەی کریملین لە ١٩٥٣داو، هاتنەسەر کاری خرۆشچۆڤ و ڕەخنەگرتنی توند لە کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت و، شەرمەزارکردنی ئەو تاوانانەی ستالین بەرامبەر بە گەلان و کۆمەڵگەی سۆڤێتی کردوونی، تا ڕووخانی ئەم ڕژێمە (سەردەمی برژنیڤ، ئاندرۆپۆڤ و چێرنینکا و گەرباچۆڤ) بوار بە کورد نەدرا بۆ نیشتمانەکەی بگەڕێتەوەو، قەوارەکەی خۆی دابمەزرێنێتەوە.

٥. بەپێی بەڵگەنامەو دیکۆمێنت و نووسراوەکانی سۆڤێت، پاش گەڕانەوەی بارزانی و هەڤاڵەکانی لە ساڵی ١٩٥٨دا تا ڕووخانی، هەڵوێستی سۆڤێت بەرامبەر بە کورد هەر دووڕوویی و لەپێناوی بەرژەوەندەکانیدا بووەو، ئەوەیش کە وتراوەو نووسراوە گوایە سۆڤێت لە فلان ساڵدا بەیاننامەی دەرکردووە یا یارمەتی شۆڕشی کوردی داوە، هەر بۆ مەبەستی سیاسی و بەرژەوەندی خۆی بووەو، خۆی دەست پێشخەری ئەو یارمەتیانە بووە. گەلێك جار کورد هانای بۆ بردووەو، لە ئاڵۆزترین قۆناغی شۆڕشەکانی داوای یارمەتی کردووەو، وەڵامی نەدراوەتەوە. بڕوانە کتێبی "کوردستانی گڕگرتوو" کە ساڵی ٣٥٥٥ لە ڕووسیا بە ڕووسی دەرچووەو، منیش وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

٦. کورد بۆی هەبوەو بۆی هەیە هەمیشە ئەو پرسیارە بکات: ئەگەر سۆڤێت هەڵویستی باشی بەرامبەر بە کورد هەبوە، بۆچی جینۆسایدی کوردەکانی خۆی کردووە؟ بۆ ڕێگەی پێ نەداون بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بۆچی نموونەیەکی باشی نیشانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستان و گەلی کوردو جیهان نەدا کە کێشەی نەتەوەیی چارەسەر کراوە.

دەسەڵاتدارانی ڕژێمی سۆڤێت هەر لە سەرەوە تا خوارەوەو هەموو سەران و بەرپرسانی هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئەم ڕژێمەوە تا ڕووخانی بەرپرسی ئەو تراژیدیایەن کە بەسەر گەلی کورددا هێنراوەو، تاوانبارن بەرامبەر بە مێژووی مرۆڤایەتی و لێبوردنیان بۆ نییەو، پاکانەیان بۆ ناکرێ. گومان لەوەدا نییە کە ئەم دادگا مێژووییەیش هەر ڕۆژێك بێ بەرپا دەکرێ، نەك تەنیا بۆ ستالین، بەڵکوو بۆ ئەوانەیش کە پاش ئەو هاتوونەتە سەر دەسەڵات، چونکە بواریان نەدا کورد بۆ شوێنی باووباپیرانیان بگەڕێنەوە.

٧. بەڵگەو بابەتی نووسراوەکەیش، وەڵامدانەوەی ئەو بۆچوونە هەڵەیەیە کە بەشێوەیەك ویستویانە تاوانەکە بخەنە ئەستۆی دەسەڵاتدارانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و گورجستان، گوایە ئەوان تاوانبار بوون، یا ئەوانەی پاکانە دەکەن بۆ خرۆشچۆڤ و بریژنیڤ و... تا بە گۆرباچۆف دەگات، یا بەرپەرچدانەوەی ئەو

بۆچوونانەیە کە دەڵێن کوردی سۆڤێت خاوەنی خاك و نیشتمانی خۆیان نەبوون، یا هەندێك دەڵێن ئەوانە لە تورکیاو ئێران و...ەوە هاتوون. بەرپەرچی ئەو بۆ چوونانەیشە کە دەڵێن کورد لە هەندەران و تاراوگە نیشتەجێ دەبێ و، کارو خانووی خۆی دەبێ‌و لەگەڵ زمان و کولتوورو کەش‌وهەوای ئەوێ ڕادێ و نایەوێ بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی. ناردنی نامەو دەستەی نوێنەرایەتی کوردی سۆڤێت بۆ مۆسکۆ، وەڵامدەرەوەی ئەم درۆیانەیە. یا نووسیویانە ئەگەر هاتبایە گەڕابانەوە لەگەڵ دانیشتوانی نوێ (ئازەری و ئەرمەن و جۆرجی و...) تووشی کێشە دەبوون، کەچی هەموو چیچنی و ئینگووشەکان دەرکران و خەڵکی دیکەیان لە جێیان نیشتەجێ کردو، هەموویان گەڕانەوەو میوانە هاوردەکانیان یا بە ڕەزامەندی خۆیان یا بە هەڕەشە دەرکردو، نەبوە مایەی کێشە، چونکە بڕیارەکە لە مۆسکۆ درابوو. کەس ناوێرێ لە بڕیاری مۆسکۆ دەرچێ. هەروەها بەرپەرچدانەوەی ئەو نووسراوانەیە کە بەدرۆ باسی پێشکەوتن و دەسکەوتی کوردی سۆڤێتیان کردووە، تەنانەت هەندێ لەوانە کە گەورەترین پلەی زانستی وەك دکتۆراو پرۆفسیۆری‌و ئاکادیمیکیان پێدراوەو، بە کوردناس لەقەڵەم دراون، نەك تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و مێژوویيان لەسەر کوردی سۆڤێت نەکردووەو، ئەم تاوانەیان ئاشکرا نەکردووە، بەڵکوو لە نووسراوەکانیاندا زیاتر بۆ خۆشەویستکردنی خۆیان و وەرگرتنی پاداشتی زیاتر بێشەرمانە بەرپەرچی هەندێ نووسراوو بەڵگەی مێژوویی‌یان داوەتەوەو، تەنانەت بەشێکی کوردستانی باکووریشیان بە ئەرمەنستانی ڕۆژئاوا داناوە.

٨. کوردی سۆڤێت بۆی هەیە هەمیشە داوای مافە زەوتکراوەکانی خۆی بکاتەوە، نەك تەنیا لە کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو، بەڵکوو لە دادگایەکی نێودەوڵەتیش بخوازێ کێشەو مافەکەی خۆی چارەسەر بکات. ڕژێمی ستالین بەبێ هیچ بەڵگەو بیانوویەك ئەم تاوانەی بەرامبەر بە کورد کردووەو، تائێستا تەنانەت یەك بەڵگە یا هەواڵێك یا نووسراوێکی تایبەت بەو تاوانانەی کە ڕژێمی سۆڤێتی بۆی هەڵبەستبوو، بەدەستەوە نییە، یا ئاشکرا نەکراوە. کردەوە دژە

مرۆڤایەتیەکانی ستالین، نەك تەنیا دژی یاسای نێوەنەتەوەیی و مافی مرۆڤ، بەڵکوو دژی یاسای ئەو سەردەمەی سۆڤێتیش بووە، بەتایبەت دژی یاسای بنچینەیی سۆڤێت بووە. بۆ وێنە، هەڵوەشانەوەی قەوارە یا بەڕێوەبەرێتی یا گۆڕینی دەبێ بە ڕەزامەندی و پەسندکردنی نوێنەران یا دەسەڵاتدارێتی ئەو گەلە لەگەڵ ناوەندا بێ، سا ئیدی ئەو ناوەندە باکۆ یا مۆسکو بێ، چونکە کوردستانی سوور لە چوارچێوەی کۆماری ئازەربایجاندا بوو کە ساڵی١٩٣٠ بەبێ هیچ بنەماو هۆیەك هەڵوەشێنرایەوە، بەبێ ئەوەی پرس بە دانیشتوانی بکەن. ئیدی باسی بەکۆمەڵ گواستنەوەی ١٩٣٧و ١٩٤٤ ناکرێ، باسی ئەو هەموو خەڵکە بێتاوانە ناکرێ کە کاتی گواستنەوەو لە ئۆردووگا زۆرەملێکاندا مردوون. ڕژیمی هیتلەر هەشت ساڵ بەر لە ڕژێمی ستالین کەوت، کەچی ئەو گەلانەی کە ڕووبەڕووی کوشتارو ڕاونان و زیانی ماددی بوون، هەتا ئەمڕۆیش داوای قەرەبووکردنەوە لە دەوڵەتی ئەڵمانیا دەکەن.

گەرچی تورکیاو ئێران سەردەمی دووهەم جەنگی جیهانی بەڕواڵەت بێلایەنی خۆیان بەرامبەر بە شەڕ ڕاگەیاندبوو، هاوپەیمانان بڕوایان بەو ڕاگەیاندنانەی تورکیاو ئێران نەبوو. ئەوەبوو ئابی ١٩٤١ ئێرانیان داگیرکرد، بووە هۆی ئەوەی کە سۆڤێت لە دەرەوەی سنوورەکانی بەرەیەك لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیزدا بۆ بەربەرەکانی هاتنی سوپای ئەڵمانیای فاشی بەڕێگەی ولاتانی ڕۆژهەلاتدا، بەتایبەت ئێران و تورکیاو عیراق، دروست بکات. واتە ئەگەر هاتبایە بەرەی شەڕ لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بکرایەتەوە، ئەوا سۆڤێت شەڕەکەی دووردەخستەوە لە سنورەکانی خۆی. بەلام دەبینین پاش سێ ساڵ، واتە ١٩٤٤ کوردو گەلانی دیکەی سەرسنوورەکانی سۆڤێت لەگەڵ هەریەکە لە ئێران و تورکیا گوازرانەوە.

تورکیا بە هاتنی سوپای هاوپەیمانان بۆ ئێران زۆر ترساو سوپای خۆی لەسەر سنوورەکانی سۆڤێت و ئێران کۆکردەوە. مەبەستم لێرەدا ئەوەیە کە بەرەی قەفقاس لەلایەن سۆڤێتەوە پارێزرابوو، مایەی مەترسی نەبوو. کەواتە بیانوو بۆ دوورخستنەوەی ئەو گەلانە، بەتایبەت گەلی کورد، نەبوو. گواستنەوەشیان لەکاتێکدا بوو کە فاشیزم لە بەرەکاندا بەرەو شکست و پاشەکشێ چوو. بەرەکانی شەڕ لە

ڕۆژئاوای سۆڤێت بوو، فاشیستەکان لەوێ پێشڕەوەییان کردبوو و خاکی سۆڤێتیان داگیرکردبوو، نەك لە قەفقاس کە سەربازی نازی پێی نەنابوە هیچ شوێنێکی قەفقاس.

ڕۆژئاوای سۆڤێت، ڕێکخراوی سیاسی و چەکداری و خراپکار و سیخوڕی سەر بە ئەڵمانی لەناو گەلانی پراڤاس و ڕووسزماندا لەچاو شوینەکانی تری سۆڤێتدا زیاتر بوو.بەلاّم دیارە ئەم هەلومەرجە بۆ ستالین و هاوڕێکانی بیانوو یا بوارێکی هەڵکەوتوو بوو، تەواوکردنی پاکتاوکردنی کوردەکان و گەلانی دیکە بوو.

کوردی خوار کوردستانی سۆڤێت، واتە کوردستانی ڕۆژهەلاّت، یارمەتی و خواردن و گۆرەوی و ملپێچ و کلاّویان بۆ سوپای سوور و بەرەکانی شەڕ دەناردو، کوردی سۆڤێت پیاوەکانیان لە بەرەی شەڕدا بوون. ئەوانەیش کە مابوون، شەوو ڕۆژ کاریان دەکرد بۆ بەرەکانی شەڕ. گوایە لەوبەری سنوور سوپای سوورو هاوڕێ ستالین یارمەتی کوردی کوردستانی ڕۆژهەلاّتیان دەدا! کوردی ڕۆژهەلاّت و باشووریش دەهاتنە لای کاربەدەستانی سۆڤێت لە کوردستانی ڕۆژهەلاّت و، داوای ڕۆیشتنیان دەکرد بۆ بەرەکانی شەڕ(٨٩).

بەلاّم قاسیدو تەتەر یا پەیامنێرێك نەبوو، خۆی بگەیەنێتە کوردستانی ڕۆژهەلاّت و هەواڵی قەلاّچۆکردنی کوردستانی سۆڤێت بە خەڵك بگەیەنێ و، هیچ نەبێ کۆمەڵەی ژێکاف و بارزانی و قازی محەمەدو کەسایەتیەکانی دیکەی بزووتنەوەی کورد ئاگادار بکاتەوە، تۆ بڵێی هەڵوێستیان نەگۆڕابایە؟ تو بڵێی بێدەنگ بوونایە لەو تاوانە قورسە؟ تۆ بڵێی پرسیاریان لە خۆنەکردبایە: ئەمە چەندی بە چەندە؟ ئێوە بەناو لێرە پشتی ئێمە دەگرن، لەولایش لای خۆتان برا کوردەکانمان قڕدەکەن؟! گومان لەوەدا نییە کە هەڵوێستیان شتێکی دیکەو، ڕەوتی ڕووداوەکان و چارەنووسی گەلی کورد بە شێوازێکی دیکەو ڕێبازی هێزە سیاسیەکانی کورد لە پەنجا ساڵی دواییدا بەرامبەر بە سۆڤێتو چارەنووسی گەلی کوردیش شتێکی دیکە دەبوو.

---

(٨٩) بڕوانە هەمان بەرهەمی نووسەر،"بارزانی لە هەندێ بەڵگەو دۆکیۆمێنتی سۆڤێتیدا ١٩٤٧ -١٩٥٨.

ئەی ئەگەر هەڵوەشانەوەی کوردستانی سووریا لە ١٩٣٠دا بەوانە ڕاگەیەندرابایەو، لە یەکەم قۆناغی بەکۆمەڵ گواستنەوەی ساڵی ١٩٣٧ی کوردەکانی سۆڤیێت ئاگادار بوونایەو، پەیمان شکێنی وەك ئەوەی بەرامبەر بە سمکۆی قارەمان و شێخ مەحموودی نەمریان زانیبایەو، لە بەشداری ڕاستەوخۆی سۆڤیێت لە جوانەمەرگکردنی شۆڕشەکەی شیخ سەعیدی پیران و ڕاپەرینەکەی ئارارات ئاگاداربوونایە!! [٩٠]

جگەلەوە، ئەگەر کوردی موسڵمانی دانیشتووی سەر سنوور هاوهەستی نازیەکان بوون و گواسترانەوە، ئەی بۆچی ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجی نەگوازرانەوە؟! ڕاستە هەندێ موساواتی و مەنشەویکی جۆرجی و داشناکی ئەرمەنی بەهۆی سیاسییەوە گیران یا گوێزرانەوە. ئازەری کە ژمارەیان دە ئەوەندەی کوردو هاوڕەگەزو هاوزمان و هاوهەستی تورك و موسڵمانیش بوون، لەم بارەوە مەترسییان لە کورد یا گەلانی دیکە زیاتر بوو؟ ئەوان باقیروفیان هەبوو و، ئەندامی سەرکردایەتی پارتە سەرکوتکەرو دەسەلاتدارەکەی دەوڵەتی سۆڤیێت بوو. ئەرمەنی یەکێکی وەکوو میکویانیان هەبوو، کە ئەندامی سەرکردایەتی و هاوڕێی نزیك و هاودەمی ستالین بوو و، جۆرجیش هاوڕێ ستالینی هەبوو کە خۆی خەڵکی ئەوێ بوو.

پاش شەڕ ئەو هاوڕێیانە زۆربەی هاوولاتیانی خۆیان گەڕاندەوە بۆ وڵات و کۆمارەکەی خۆیان. کورد باقیرۆف و میکویانێکی... نەبوو. هەر ئەو دەسەلاتدارانە ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجییان ناردە سەر جێ و ماڵ و کێڵگە و هەوارگەی کوردان و، ئاژەڵ و مەڕوماڵات و ئەسپ و گاو مریشك و دانەویڵەی ئبۆ زستان عەمبارکراوی کوردەکانیان بەخشی بەوانەو، کوردیش بە برسێتی و زستان ڕەوانەی کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و سیبیریا کران و، پاشان ناوی گوندو ناوچەکانی کوردیان گۆڕی.

شەڕ تەواو بوو، نێوان سۆڤیێت و تورکیا و ئێرانی سەر بە ڕۆژئاواو ئیمپریالیزم ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو. کوردە دەربەدەرو ئاوارەکە، کۆچەرو

---

[٩٠] بڕوانە: بەرهەمی نووسەر، "شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و سۆڤیێت"، سلێمانی، ٢٠٠٣.

ئاژەڵدارو نەخوێندەوارو نەخۆش و برسی، بە ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتیمان هەر لە هەندەران مانەوە. پێم وایە لێکۆڵینەوە لە کوردی سۆڤێتی پێشوو (کوردستانی قەفقاس) باشترە بەپێی چەند قۆناغێکی مێژوویی گرنگ و، چەند کارەسات و شەڕێکی ولاتانی داگیرکەری کوردستان بنووسرێتەوە، واتە:

١. کوردی سۆڤێت لە سەردەمی شەڕەکاندا (مێژووی جێگیربوونیان لەناوچەکەدا).

٢. دابەشبوونیان بەسەر ئیمپڕاتۆریەکانی ئێران و تورکیادا، تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم.

٣. داگیرکردنی بەشێکی کوردستان (کوردستانی قەفقاس) لەلایەن ئیمپڕاتۆریی ڕووسیاوە.

٤. کورد لە سەردەمی دەسەلاّتی سۆڤێتدا.

٥. کورد پاش ڕووخانی سۆڤێت.

ئێمە کە دەڵێین کوردی ڕووسیا یا کوردی سۆڤێت یا کوردستانی قەفقاس یا کوردستانی سوور، ئەم ناو و ناولێنانانە هەموویان گریمانەن، وەك چۆن دەنووسرێ کورد یا کوردستانی ئێران‌و تورکیاو عیراق‌و سووریا، لەکاتێکدا ئەو بەشانەی کوردستان هەموو لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە داگیر کراون‌و، ئەو ناونانە واقیعی باری دەوڵەتی و جوگرافیای سنوورە دەستکردەکانی ئەو دەوڵەتانەیە، زیاتر لەبەر ئەو ڕووداوانەی کە بەسەریاندا هاتوون. با لێکۆڵینەوەی ڕاپەرینەکانیان لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتانەدا بێ. کەم یازۆر گەلێك کتێب لەسەر چوار بەشەکەی کوردستان، واتە عیراق و ئێران و سووریا و تورکیا نووسراوەو، ئەوەی کە لەسەری نەنووسرابێ و، بگرە ناویشی سڕابێتەوە و باسیش نەکرابێ، بەشی پێنجەمی کوردستانی داگیرکراوە، واتە کوردستانی سۆڤێت یا ڕووسیا یا قەفقاس. بۆیە بەگشتی ناوی لە داموودەزگای هێزە سیاسیەکانی کوردستاندا نییەو، بەڵکوو تاقە جارێکیش بیری کۆمەلاّنی خەڵك ناخرێتەوە کە بەشێکی گەل و خاکەکەیان لەوێیە.

وەنەبێ سەرچاوە لەسەر مێژووی کوردستانی قەفقاس نەبێ، بەڵکوو کەس بۆ لێکۆڵینەوەی تەرخان نەکراوەو، هێزە سیاسیەکانی کورد کە زۆربەی ڕووناکبیرو

مێژوونووسانی کوردیان له دەوری خۆیان کۆکردوەتەوە، هانیان نەداون لەم بارەوە لێکۆڵینەوە بکەن، یا ئەو تراژیدیایەی کە بەسەریاندا هاتووە لەقاوی بدەن و، کۆڕوکۆمەڵگەی جیهانی ئاگادار بکەنەوە کە ڕژێمە دیکتاتۆرەکەی ستالین قەلاچۆی کوردی کردووە. یا پاش ڕژێمی ستالین، ڕژێمەکانی دیکەی سۆڤێتی ئەو زیانە گیانی و ماددییەی کە لە کورد کەوتووە، بۆی قەرەبوو بکەنەوە. ئەوانە نەك تەنیا هەڵوێستیان نەبوەو بێدەنگ بوون. بگرە درۆو دەلەسەیشیان لەسەر کوردی سۆڤێت بلاْوکردوەتەوە، گوایە کوردی سۆڤێت مافی خۆیەتی هەر دژایەتی ڕژێمەکانی تورکیاو ئێران و سووریاو عیراق و ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و...بکات، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە داگیرکەرو چەوسێنەری کورد هەر ئەوانن. ڕەخنە لە سۆڤێت نەگیرا لەسەر کورد، نەوەك دوژمنان پێیان خۆش بێ و، ئابڕووی سیستمی سۆڤێتی بچێ کە کێشەی نەتەوەیی بە هی کوردیشەوە چارەسەر کردووە.

تراژیدیای کوردی سۆڤێت، هەر گواستنەوەیان نەبوو لە ۱۹۳۷و ۱۹٤٤دا، بەڵکوو پاش هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور لە ۱۹۳۰دا کەوتنە داخستنی قوتابخانەو ڕۆژنامە کوردیەکان. ئەی بۆ لەودەمەوە تا ڕووخانی سۆڤێت کە شەست ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، ئەمە تەنیا بۆ جارێکیش نەبوو بە مایەی هەڵویست دیاریکردنی هێزێکی سیاسیی کوردی، یا وتاری ڕۆژنامەیەکیان، یا جارێك نوێنەر یا دەستەیەکی نوێنەرایەتی کورد کە سەدان جار سەردانی سۆڤێتیان کردووە، سەریان لەو ناوچە کوردنشینانەی سۆڤێت نەدا، لەنزیکەوە دەسکەوتەکانی سۆسیالیزم و چارەسەری کێشەی کوردی ئەم وڵاتەو کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکەیان ببینن و، ئەزموونێکی لێ فێر بن، تا کاتی گەڕانەوەیان بۆ کوردستان لەڕێگەی چاپەمەنیەکانیانەوە بۆ خەڵکی بگێرنەوە، سەرجەمی هێزە سیاسیەکانی کورد لە سەردەمی ڕژێمی سۆڤێتدا کێبەرکێیان بوو کامیان زیاتر خۆی لە ڕژێمە کوردکوژەکەی سۆڤێت نزیك بکاتەوەو لایەنگری بێ.

مایەی سەرسوڕمانە، سۆڤێت نەك تەنیا ئەو هەموو ناڕەوایی و تاوانەی بەرامبەر بە کوردەکانی خۆی کردو، کەس باسی نەکرد. سۆڤێت چەندجار بە

ئاشکرا کوردو شۆڕشەکانی فرۆشتووە، هەلومەرجی ئالوگۆڕێك لە سیاسەتی هێزە سیاسیەکانی کورد بەرامبەر بە ڕژێمی سۆڤێتی نەکرا.

بەکورتی هەر ئەندام و لایەنگرانی هێزە سیاسیەکانی کوردستان و، ولاتە داگیرکەرەکانی کوردستان نەکەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەم پڕوپاگەندانە، بەڵکوو ژمارەیەکی زۆریش لە شاعیرو هونەرمەندی کورد لەژێر کاریگەریی ئەم درۆودەلەسانەدا بە شیعرو گۆرانی کەوتنە پێداهەڵدان و ستایشی ئەم ڕژێمەو هۆنراوەو گۆرانی گەلێك بەسۆزو جوانیان دانا، کە لە ئەدەبیات و هونەری کەم گەلدا هەیە. شیعرەکانی جگەرخوێن، بۆ وێنە، لەلایەن شڤان پەروەرەوە کران بە گۆرانی، وەك زانستیی مارکسیزم بخوێنرێن و... بوونە هۆی ڕاکێشانی خەڵك و خۆشەویستییان بەرامبەر بە سۆڤێت. من لێرە مەبەستم ڕەخنەگرتن یا بەدناوکردنی ئەو بەڕێزانە نییە، چونکە هۆنراوەو گۆرانیەکانی ئەوان لە هەستێکی نیشتمانپەروەری و خۆشەویستی بۆ کوردایەتی و ئازادی نیشتمانەکەیانەوە سەرچاوەی هەڵگرتووەو، خزمەتی زۆریان کردووەو هونەریان نەمرە.

ئیدی باسی ئەوەیش ناکرێ کە چەند کەس لەسەر نووسراوە کلاسیکیەکانی مارکسیزم - لینیزم و هاوڕێ ستالین و بریژنێڤ و... گیراون و کوژراون، یا وێنەکانیان لە ماڵ و گیرفاندا دۆزراونەتەوەو، بوونە گەورەترین بەڵگەی تاوانباربوونیان، یا لەسەر ئالای سوورو چەکوش و داس خراونەتە زیندان.

کوردی سۆڤێت، بەپێی بەڵگەو نووسراوەکان، هەر لە سەرەتای سەقامگیربوونی دەسەلاتی سۆڤێتییەوە لە قەفقاس بەهانایانەوە چوون و، لە پیلانگێڕانی موساواتیەکانی ئازەربایجان و، داشناکەکانی ئەرمینیا یا مەنشەویکەکانی جۆرجیا، کە لەو کۆمارانەدا دژی دەسەلاتداریتی سۆڤێت وەستاونەتەوە، لە یەکەمین جەنگی جیهاندا لەڕیزی هێزەکانی ڕووسیادا دژی بەرەی ئەڵمان و تورکیا بەشدارییان نەکردووە، بە پێچەوانەوە کوردی باکوور بەشدارییان کردو کوژراوو برینداریان داو، بوونە ڕێنوێنی ڕێگەی پێشڕەویکردنی سوپای ڕووسیا بۆ ناو خاکی تورکیاو هەواڵگریان بوون و، بە کەرەستەو خۆراك

یارمەتییان دان و، لە ڕیزەکانی سوپای تورکیا هەڵهاتن بۆ ناو سوپای ڕووس. هەر ئەوانەبوون کە ڕووسیا بەڵێنی ڕزگارکردنیان لە ژێردەستەیی تورکیا پێدابوون، لەبری ئازادکردنیان ئەو کارەساتەیان بەسەردا هێنان. کەچی ئەوانەی دژی دەسەڵاتی سۆڤێتی بوون و، هاوکاری تورك و هێرشی بەریتانیایان بۆ سەر قەفقاس دەکردو، وەك کوردیش لەسەر سنوور دەژیان، قەوارەی بۆ پێکەوەنان و، ئەوانیش وەك کورد ڕانەگوێزران. ئەمە بوو پاداشتی دەوڵەتی ڕووسیاو، پاشان سۆڤێتی بۆ گەلی کورد. گرنگ نەبوو چ ڕژێم و سیستمێك لە ڕووسیا دەسەڵاتی بەدەستەوە بێ، گرنگ ئەوەیە کورد لە بازنەی بەرژەوەندەکانی ئەم وڵاتەدا جووڵاوەتەوە. ئەو کۆمارانەی کە سۆڤێت لە قەفقاس پێکی هێنان و، پاشان سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند، ئەمڕۆ دژ بە ڕووسیاو بەرژەوەندەکانی دەجووڵێنەوە. هەر ئەوانەی کە نیشتمانی کوردەکانی پێ بەخشین و، لەکوڵی ڕەگەزپەرستی ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجی کردنەوە، لە کۆمارێکی وەك ئازەربایجاندا کە جگە لە کورد تالشی و لازی، واتە تالیشیستان و لازستانی لێیە، قەوارەی نەتەوەیی بۆ ئەوانیش پێك نەهێنا. بەڵام ئەوانە وەك کورد لەسەر نیشتمانەکەیان دەرنەکران و، ئەمڕۆ کەوتوونەتە بەر شاڵاوی تەنگ پێهەڵچنین و چەوساندنەوەو تواندنەوەو، کێشەکەیان چارەسەرنەکراو، ئێستا پەرۆشی داهاتووی خۆیانن.

پارتی داشناك کە پاش ڕووخاندنی سۆڤێت لە ئەرمەنستان، وەك ١٩١٧، دەسەڵاتی گرتەدەست و، گوایە ئەم پارتە دۆستی کوردان بووەو، بەرنامەی هاوبەشی لەگەڵ کورددا دژی ئیمپڕاتۆریی عوسمانی هەبوە، ئەوە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە. بۆچی نەیهێشت کوردەکانی کۆمارەکەی بگەڕێنەوە؟ بۆچی کوردە ئێزدیەکانی بەپارە هەڵخەڵەتاندو لە کوردی جیاکردنەوەو، وەك نەتەوەی جیاواز لە سەرژمێریەکانیدا نووسیونی و، تا ناگوڕناقەرەباغیان نەگرتبوو، کوردەکانی چەکدارکردو بەکوشتی دان، گوایە کوردستانی سووریان بۆ دادەمەزرێنێتەوە، کەچی نەیهێشت یەك کورد بۆ سەر ئاوو خاکی خۆی بگەڕێتەوە.

ئەم شتانەو گەلێك بابەتی دیکە هەیە کە نامەوێ لێرەدا زۆر لەسەریان بڕۆم، مەبەستم ئەوەیە چەند مێژوومان چەواشەکراوە درۆی تێدا نووسراوە، هەر باسی برایەتی کوردو ئەرمەنمان کردووە، زۆرباسی ئەوە کراوە کە کوردی ئەرمەنستان خاوەنی هەموو مافێکە. منیش لەگەڵ برایەتی کوردو ئەرمەن و ئازەری و... بەڵام ئەی نابێ بەم برایانە بڵێن بۆ وامان لێ دەکەن، ئەی ئەو برا ئەرمەنی و ئازەریە رووناکبیرو زاناو مێژوونووس و مافپەرەوەرو... لەکوێن ڕەخنە لە دەسەڵاتدارانی خۆیان بگرن و، بڵێن بۆچی وا بەو گەلە دەکەن؟ بۆ ناهێڵن بگەڕێنەوە؟ لەکاتێکدا لەو هەموو تاوانەی بەرامبەر بە کورد کراوەو دەکرێ، باش ئاگادارن. ناڵێن ئێمە لەگەڵ کورد هاوسێ و تێکەڵین و زۆر مەسەلە هەن ئێمەیان پێکەوەگرێ داوەو، نە ئینترناسیونالەکانی دوێنێ و نە دیموکراتەکانی ئەمڕۆ لەم بارەوە هەڵمێکیان لێوە هەڵنەسا.

ژمارەیەکی کەم لەو کوردانەی ئەرمەنستان، بەتایبەت کوردی ئێزدی، هەر لەگەڵ ئەرمەنیەکان ئەوانیش کەوتوونە بەر هەڵمەتی ڕەشەکوژی و لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا پێکەوە هەڵاتوون بۆ ئەرمەنستانی ڕووسیا (سۆڤێتی جاران) یا ئاوارەی بەشەکانی دیکەی کوردستان بوون. بەڵام بۆ تائێستا چەند جار لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەرمەنییەوە ڕاونراون و، کوردە موسڵمانەکانیان بۆ ئازەربایجان دەرکردووە. پاش داگیرکردنی ناگورناقەرەباغ پاشماوەی دانیشتوانی کوردستانی سوور یەك کەسیان نەیانوێرا لەوێ بمێننەوەو، هەموویان لەگەڵ ئازەریەکاندا هەڵهاتن و تائێستاش لە دەربەدەری و ئوردووگاکاندا دەژین. بۆچی دانیشتوانی ئەرمەنی ناگورناقەرەباغ براکوردەکانی خۆیان ڕزگارنەکرد؟ بۆچی سوپای ئەرمەنستان یا دەوڵەتی ئەرمەنستان بانگەوازی مانەوەی بۆ دەرنەکردن کە ژیان و ماڵیان لەمەترسیدا نابێ؟ یا پاشان بانگەوازێکی بۆ گەڕانەوەیان دەرنەکردو، وەك ساڵانی١٩٣٧ و١٩٤٤ یان لێ کردنەوە. ئەمە تاوانێك نییە چاوی لێ بپۆشرێ.

ئایا هەڵاتنی کوردەکانی ناگورناقەرەباغ، لە ئەنجامی ئەزمونی تاڵی ڕابردووەوە نەبوە؟ بۆ کوردی ناگورناقەرەباغ جیاواز نەبوەو نییە، لەوێ دەسەڵات

ئەرمەنی یا ئازەری بێ. گرنگ ئەوەیە تائێستایش ئەو دوو دەوڵەتەی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و، هەروەها کۆمەڵگەی نێوەنەتەوەیی نەیانتوانیوە کێشەی ناگورناقەرەباغ چارەسەربکەن و، لانی کەم ڕێ بە ئاوارەکان بدەن بگەڕێنەوە، یا بەپێی سەرژمێری دانیشتوانی ئەرمەنی و ئازەری و کورد دەسەڵاتی ئەوێ دابەش بکەن، یا هێزێکی نێونەتەوەیی پارێزگاری وڵات بکات.

ئەمەیش یەکێك لە میراتە شوومەکانی سەردەمی ستالین و سۆڤێت بوو، کە بێبناغەو ناعادیلانە کێشەی نەتەوەکانی چارەسەرکردو، ئەو شەڕو کارەساتە خوێناویەی بەدواوە بوون. پاشماوەی کوردەکانی کوردستانی سوور، تەنانەت ئەوانەیشیان کە بوونەتە دانیشتوانی ناگورناقەرەباغ، وەك ڕابردوو بەبێ هیچ قەوارەو تەنانەت مافی کولتووری مانەوە. کارەساتەکە لەوەدایە، کوردەکانیش لەسەر شەڕی ئازەری و ئەرمەنی بوون بە دوو بەشی دژ بەیەك و، لە دوو بەرەی جیاوازو بەرامبەر بەیەکدا، هەرکامیان لایەکەی دیکەیانی بەتاوانبار دانا، ئەمە سەرباری ئەو هەموو کوردەی کە لە هەردوولا کوژران و برینداربوون و بەدیل گیران. کەچی لایەکیان نەیتوانی مافێکی سەرەتایی خۆیان بەدەست بهێنن و، تائێستایش پاش تەواوبوونی شەڕ کوردی فەلەستان (ئەرمینیا)و کوردی عەجەمستان (ئازەربایجان) مرخ لەیەکتر خۆش دەکەن، لەبری ئەوەی هەوڵێکی هاوبەش بدەن بۆ گەڕانەوەیان یا داوای مافەکانی خۆیان بکەن.

کوردو کوردستان بایەخێکی تایبەتی هەبوە بۆ ڕووسیا، بەتایبەت لەو سەردەمەیدا کە بەرەو قەفقاس هات و، دەیویست لەوێشەوە خۆی بگەیەنێتە ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارسی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەڕێگەی ئەوان و وڵاتەکەیانەوە، واتە کوردستان، زۆرجار توانیویە گەلێك گوشار بخاتە سەر تورکیاو ئێران یا ئاژاوەیان پێ بنێتەوە. گەلێك جار نوێنەرانی خۆی ناردوەتە لایان و نامەی بۆ نووسیون و داوەتی گەلێك سەرۆك و ناوداری کوردی کردووەو بەڵێنی زۆری پێ داون. بەڵام کە بەڵێنەکانی نەبردووەتە سەر، ئەمە بابەتێکی دیکەیە. تەنانەت زۆرجار کورد ئامادە بووە نەك تەنیا یارمەتی ڕووسیا بدات،

بەڵکوو وڵاتەکەیشیان بکەوێتە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەکەیانەوە، یا دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بە پشتیوانی ڕووسیا دابمەزرێنن، بەڵام ڕووسیای تزاری لە سەردەمی سۆڤێتدا کەوتە چەوساندنەوەو ڕاونان و سەرئەنجام قەڵاچۆکردنی کورد.

کوردی ڕووسیا یا سۆڤێتی جاران کە لە دەرەوە نەهاتبوو، نەوەی ئەوانە بوون کە ڕووسیا لەکاتی داگیرکردنی قەفقاسدا هانای بۆ بردبوون، ئەوانەی کە لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ تورکیاو ئێراندا لە سەدەی نۆزدەهەمدا یارمەتی ڕووسیایان دا. لە سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانیشدا، هەر کوڕی ئەوانە بوون کە لە ڕیزی سوپای ڕووسیاو دواتر سۆڤێتدا، لەپێناوی ئەم وڵاتەدا شەهیدکران و شەڕیان کرد، خەڵات و میدالیایان پێشکەش کرا، سنوورپارێزی ئەم وڵاتەو گوێڕایەڵ و هاووڵاتی ڕووسیا بوون و خزمەتیان بەم وڵاتە کردو دەوریان لە بواری ئابووری ئەم وڵاتەدا هەبوە. چۆن بوو ئەم گەلە لەناکاودا بە ناپاک و گومانلێکراوو بێکەڵك و هاوهەستی ئەڵمانیای فاشیستی و...دانرا!

کوردی سۆڤێت قەوارەیەکی نەتەوەیی نەبوە، تا ترسی جیابوونەوەی لێ بکرێ و، لەباری ژمارەیشەوە ئەوەندە نەبوە کە هەڕەشە یا مەترسییەك بۆ سۆڤێت پێك بهێنێ و، ڕێکخراوو پارت و بزووتنەوەیەکی سیاسی یا چەکداریشی نەبوە، وەك موساواتیەکانی ئازەربایجان و داشناکەکانی ئەرمەنستان و مینشەویکەکانی جۆرجیاو پارت و ڕێکخراوی ئاینی و بورژوازی قەفقاس کە دژی دەسەڵاتدارێتی سۆڤێت بوون، یا بەڵگەو نووسراوێك لەم بارەوە هەبێ، کە سیخوڕی ئەڵمانیای فاشی لەناویاندا کاری کردەوەو چەك و پارەی بەسەردا دابەش کردوون و، هێزی چەکدار و خراپکاری هەبوە، تا وەك هەندێ لەو گەلانەی کە بەم بیانووەوە دوورخرانەوە، بکەوێتە بەر شاڵاوی کوشتن و، سیاسەتی ڕاگوێزانی ستالین. وڵاتانی دەوروبەریشیان، وەك ئێران و تورکیا کە داگیرکەری نیشتمانەکەی بوون، بەدرێژایی مێژوو کورد بەرامبەریان لە ڕاپەڕیندا بووەو لە سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانیدا هاوهەستی ئەڵمانیای فاشی بوون، تا گومانی لێ بکرێ کە کوردی سۆڤێت لەگەڵ ئەوانەدا پەیوەندیی باشە!

ئەگەر تورك و فارس و عەرەب، بەهۆی ڕاپەڕین و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردەوە، کەوتوونەتە کوشتن و بەزۆر ڕاگواستنەوەی کورد، واتە بیانوویەك بۆ لێدانی کورد هەبوە بۆ بەعەرەب و بەتورك و بەفارسکردنی کوردستان، بەڵام سۆڤێت چ بیانوویەکی هەبوە؟ کام بزووتنەوەو ناڕەزایی کورد بووەتە مایەی بیانووی ئەو تاوانانەیان، کورد، لە سەردەمی یەکەمین و دووهەمین جەنگی جیهانیدا، یارمەتی وڵاتانی سەرکەوتووی داوە.

کوردەکان، پاش شۆڕشی ١٩١٧، بەهۆی کاری هەرەوەزییەوە، سەرئەنجام بەزۆر ڕاگوێزانی کوردەوە زیانێکی قەرەبوونەکراوەی لەم گەلە دا. کوردەکانی سۆڤێت، بە پێچەوانەی گەلانی دیکەوە کە بەزۆر دوورخرابوونەوە، دووجار بەڕەسمی لە ١٩٣٧و ١٩٤٤دا لەلایەن ڕژێمی ستالینەوە قەڵاچۆکران. ئەگەر کوردو گەلانی دیکە لە سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانیدا بە بیانووی جۆراوجۆرەوە دوورخراونەتەوە، دەکرا ئەم تاوانە پاکانەی بۆ بکرێ. ئەی ١٩٣٧ کە هێشتا هەواڵ و نیشانەیەك لە هەڵگیرسانی شەڕ بەدەستەوە نەبوو، چ بیانوویەك هەبوو؟ جگە لەوە، بەرەی شەڕ لە ناوچەکانی نیشتەجێی کوردان دووربوو. لە هەمووی گرنگتر، لەو سەردەمەدا سوپای سوورو ئینگلیز ئێرانیان داگیرکردبوو، واتە ئەوبەری ڕووباری ئاراس سوپای سووری لێ بوو، بەناو یارمەتی کوردی کوردستانی ڕۆژهەڵاتیان ئەدا. ئەمە تاوانێکەو پاکانەی بۆ ناکرێ. ئەگەر بۆ دواوەیش بگەڕێینەوە، کاتێك بڕیاری دروستکردنی کوردستانی سوور لە ١٩٢٣دا درا، سەردەمی پەیمانی سیڤەرو باسی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەلایەن ئینگلیز و فەرەنساو کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە لەئارادابوو. ئەگەر هاتبایەو سەری گرتبایە، دەوڵەتێکی سەربەخۆی هاوسێی سۆڤێت بەناوی کوردستانەوە دروست دەبوو. بۆیە دەسەڵاتدارانی سۆڤێتیش کەوتنە هەوڵدانی دروستکردنی قەوارەیەك بۆ کوردەکانی ژێردەستی خۆیان، تا هەم وەك گەلانی دیکە مافیان هەبێ و، هەم کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستانیان پێ ڕابکێشن. مەبەستم ئەوەیە دەسەڵاتدارانی سۆڤێت خۆیان دەستپێشخەر بوون. ئەو پرسیارە دێتە بەر زەین،

ئەویش ئەوەیە بۆچی هەر بۆ خۆیان هەڵیاننەوەشاندەوە؟ ئایا لە ئەنجامی پووچەڵبوونەوەی پەیمانی سیڤەرەوە بوو لە لۆزاندا ؟ کە تورکیای لە دابەشکردن ڕزگارکردو، تورکیای دۆستی ستراتیژی و هاوپەیمانی ئەو سەردەمەی سۆڤێت داوای لەم دەوڵەتەکرد کوردستانی سوور هەڵبوەشێنێتەوە؟ یا هەر خۆیان ئەم بڕیارەیان داو لەژێر ناوی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی بەڕێوەبەرێتی ناوچەکانی ئازەربایجاندا کوردستانی سووریان هەڵوەشاندەوەو، هەر ناوچەیەکیان دا بە هەرێمێك و شارێك. لە هەمووی خراپتر، نەیانهێشت لە وڵاتەکەی خۆیاندا بمێننەوەو، ڕاگوێزرانو، تووشی ئەو تراژیدیا نەبڕاوە بوون کە تائێستایش بەردەوامە.

تراژیدیای ئەوانە، تەنیا دەرکردن و داگیرکردنی وڵاتەکەیان و ئاوارەبوون و دەربەدەری نەبوو، نەك تەنیا لەوەدا نەبوو بەسەر چەند کۆمارو نەتەوەدا دابەش بکرێن و بەڕێوە لەکاتی ڕاگوێزانیاندا هەزاران کەسیان لێ بمرێ، بەڵکوو ئەم تراژیدیا قووڵ و دەردناکەیان بێسنوورو بێبیانوو و بووە. کاتی گواستنەوە زۆرینەی ماڵەخزم و خوشك و برای یەکتر، تەنانەت کوڕ لە باوكو دایك دابڕاو، بە شەمەندەفەرو قافڵەی جۆراوجۆر بۆ شوێنی جۆراوجۆر گوێزرانەوە. "کەلکنیاز" ناوێك لەم بارەیەوە بۆی گێڕامەوە: من براکەم لە شارێکی دیکەی کازاخستانو، خوشکم لە کۆماری قرقیزستانەو، هەندێکمان لە ئازەربایجان ماوینەتەوە. بۆم دەرکەوت لە هۆز وخێڵاەکانی کوردستانی داگیرکراوی تورکیاو ئێرانو ئەوبەری ڕووباری ئاراس و داوێنی چیاکانی ئاگری (ئارارات)تە.

مردنی خەڵك لەڕێگەدا، خۆسووتاندن و خۆکوشتن بەشێوەی جۆراوجۆرو خۆفڕێدان و هەڵاتن، تەنانەت شەڕکردن لەگەڵ پاسەوانە جەللادەکان و کوشتنیان، سەرباری لە برساندا خواردنی گۆشتی ئاژەڵ و سەگ و پشیلەو گژوگیاو... لە دیمەنەکانی دیکەی ئەم تراژیدیا گەورەیە بوون. کاتی گواستنەوە، هەندێ جار لە ڕێگەدا شەمەندەفەرەکانیان لە ئێستگەکان ڕاگرتووە بۆ وەرگرتنی ئاو یا کڕینی شتومەك، یا لەبەر بەرنامەی هاتوچۆی شەمەندەفەرەکانی دیکە، یا

خواستی خودی پاسەوانەکان، سەرەڕای چاودێری و کۆنترۆڵی توند بەسەریانەوە، بە خەڵکەکەیان گوتووە: ئەمانە ناپاك و خۆفرۆش و گومانلێکراون و هاوکاری ئەڵمانیای فاشین، ئاگاداریان دەکردنەوە کە تێکەڵیان نەکەون و، پەیوەندییان پێوە نەکەن. هەندێ لەوانە کە ئاگاداری ئەم تاوانە قورسانە نەبوون و، باوەڕیان بە پاسەوانە جەللادەکان کردووە، جنێویان پێ داون و بەردباران و سووکایەتییان پێ کردوون. لە شوێنی نیشتەجێبوونی نوێشیاندا هەمان شت لە خەڵکی ناوچەکە گەیەنراوە. سەرەڕای کۆنترۆڵ و چاودێریکردنیان لەلایەن دامودەزگا داپلۆسێنەکانی ڕژێمی ستالینەوە، سنوورێکیان بۆ دیاری کردوون کە هاتوچۆی ئەملاو ئەولا نەکەن.

جگە لەوە، ئەوانە دەبوایە هەندێکیان ڕۆژانەو هەندێکی دیکەیان هەفتانەو کەسانێکیشیان مانگانە خۆیان بە کاربەدەستان یا بەرپرسی ناوچەکە بناساندبایەو مۆریان بکردبایە کە لە شوێنی خۆیاندان و رایان نەکردووە. خراپتر لە هەمووی، بۆ هەر پێنج یا دە یا پانزە ماڵێك، گەورە یا بەرپرسێکیان لە خۆیان داناوە، کە لە هەموو کاروبارو ڕووداوێك بەرپرس دەبوو. دەبوایە چاودێری و کۆنترۆڵیان بکات و ئاگاداریان بێ، چی لەناویاندا ڕوودەدات بە ڕاپۆرت یا بەدەمی بەرپرسانی لێ ئاگادار بکاتەوە، واتە لە سێ لاوە کۆنترۆڵ و چاودێری دەکران:

١. لەلایەن دامودەزگاکانی ئاسایش و پۆلیس و هێزی سەربازییەوە.
٢. لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە.
٣. لەلایەن خۆیان و خەڵکی ناوچەکەیشەوە زۆرجار جموجۆڵ و هەڵاتنی ڕاگوێزراوەکان، یا هەستی گلەیی و ناڕەزاییان گەیاندووەتە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش و، گەلێکیان لێ گیراون، یا زیندانی یا گوللەباران کراون.

ئای لەم تاوانە شاردراوەو نهێنیانە، چەند ئازاربەخشن و قەڵەم دەهێنێتە زمان. باسی داوێنپیسی و دەستدرێژیکردن بۆ سەر ناموس و بەرتیل و پارانەوەکانیان ناکرێ. ئەو کلۆڵانە نەیانوێراوە لەبەر شەرمەزاری و شەرەف و ناموس بیدرکێنن، بەڵام گوتوویانە کێ و کێ وای لێ کردوون!

پێم وایە کوردی سۆڤێت یەکەم گەلە زیاتر لە هەموو گەلانی دیکە لەم ڕژێمی سۆڤێتی ستالینی بەلشەویکی زیانێکی قەرەبوونەکراوی لێ کەوتووە. ئەگەر گەلانی دیکە بۆ جارێك ڕاگوێزراون‌و، پاش شەڕ گەڕاونەتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان و قەوارەکەیان بۆ دروست کراوەتەوە، یا بۆیان دروست کردوەتەوە، کوردەکە دووجاڕ ڕاگوێزراوەو، نەك تەنیا قەوارەی بۆ دروست نەکراوەتەوەو نەیانهیشتووە بگەڕێتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی، بەڵکوو سەدان تاوانی دیکەیان دەرهەق کردووە. ئەو گەلانەی کە نێردراونەتە شوێنەکانیان، وەك ئازەری و ئەرمەن و جۆرجی‌و، بەدرێژایی مێژوو پێکەوە ژیاون و لەژێر زوڵم و زۆری شاکانی ئێران و سوڵتانەکانی تورکیاداو، لە خۆشی و ناخۆشی یەکتردا بەشدار بوون و ژن و ژنخوازییان لەناوداو داب‌و نەریتیان لەیەکەوە نزیك بووەو، شەڕو کێشە لەنێوانیانداو، بیرەوەرییەکی تاڵیان لەگەڵ یەکتریدا نەبوەو، زۆریان فێری زمان و خواردن‌و هەڵپەڕکێی یەکدی بوون، بەتایبەت لە کێڵگەو کارگەو هەوارگەکان و بەرەکانی شەڕ و قوتابخانەکاندا پێکەوە بوون، ئەوانە ڕازی نەبوون بە گەڕانەوەی کوردەکان. هۆیەك نەبوە ئەمانە بەرەو ڕووی یەکدی بکاتەوەو بیانکاتە دوژمنی یەکتر. ئەوە هەمیشە دەسەڵاتدارانی باڵاو خۆجێیی بوون دووبەرەکییان خستوەتە ناویان‌و نەیانهێشتووە کورد بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی باووباپیرانی.

کوردی سۆڤێت ئەو هەموو کارەساتەی بەسەردا هات، کەس لە سەری نەهاتوەتە دەنگ. ئەگەر دیلەکانی دووهەمین جەنگی جیهانی، لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوەو بەپێی یاساکانی مافی دیل، ئاوڕیان لێ دەدرایەوەو پارێزگارییان لێ دەکرا، هەوڵی گەڕانەوەیان بۆ دەدرا. هیچ لایەك نەبوو پارێزگاریی لێ بکات، یان لەسەری هەڵبداتێ.

دەوڵەتی ژاپۆن، لەکاتی بەزۆر ڕاگوێزانی کۆریەکاندا، ناڕەزایی خۆی ئاڕاستەی دەوڵەتی سۆڤێت کردووەو، ئەم تاوانە گەورەیەی لەقاوداوە. دەوڵەتانی وەك ئەڵمانیاو یۆنان‌و ئیسرائیل، پارێزگاری‌و یارمەتییان داوەتە ڕاگوێزراوەکانی

خۆیان‌و، زۆربەیان لێ گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان. کوردەکە، کەسی نەبوە پشتگیریی لێ بکات[٩١].

هاووڵاتیانی کوردی سۆڤێت، لەبەر بێکەسی و نەگەیشتنی هاواریان بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و، دوور لە هەموو داب‌و نەریتێك و یاساکانی مرۆڤایەتی، ئەو هەموو تاوانەیان بەرامبەر کردوون. هەندێ خۆفرۆشی کورد تاوانبارن کە بۆ پلەوپایەی زانستی و دەوڵەتی و بۆ پارە، نەك تەنیا نەیانهێشت ئەم تاوانە بێ‌وێنەیە لەقاو بدرێ، بەڵکوو دژی ئەوانەیش بوون کە لەملاو لەولا هەوڵیان دەدا مافی زەوتکراوی گەلەکەیان بگەڕێننەوە‌و، ڕاپۆرتیان لەسەر دەنووسین‌و، بەگرتیان دەدان‌و، چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسییان لێ زەوت دەکردن‌و، دەرگای ناوەندو ڕێکخراوە سیاسیەکانیان پێ دەگرتن‌و، بۆ ئەوەی وەك ڕابردوو هەر خۆیان دەمڕاستی کوردو بە نوێنەری کورد بزانن، وەك ڕابردوو لەناو دەزگاکانی پاراستندا دەستیان دەڕۆیشت و، سەریش کەوتن، بۆ ئەوەی ئەوی تائێستا نووسیوویانەو گوتوویانە بەدرۆ نەخرێنەوە.

داخەکە لەوەدایە کە هێزە سیاسیەکانی کوردیش، چ سەردەمی سۆڤێت و چ پاش هەڵوەشاندنەوەی، هەر پەیوەندییان بەوانەوە هەبوو، یا ئەوان توانییان پەیوەندی بکەن بە هێزە سیاسیەکانی کوردەوە‌و، وەك جاران بانگیان دەکەن بۆ کوردستان و ئەوروپا؛ بەناوی کارکردنەوە بۆ کوردی سۆڤێت گیرفان پڕدەکەن و، کتێبێکیان لەسەر ئەم تراژیدیایە نەنووسی و، خۆپیشاندان و کۆنفرانسێکیان نەگرت‌و، بەرنامەو ڕێپۆرتاژێکیان لەبارەوە نەنووسی.

ئەوی سەبارەت بە ڕژێمی سۆڤێتی و سەرکردەکانی و دەسکەوت و دادپەروەرییەوە، بە ڕۆمان و چیرۆك و هەڵبەست و گۆرانی و سروودو شانۆو فیلم و... بە کتێبەکانی مێژووشەوە نووسرابوون و بەرهەم هێنرابوون، دەرکەوت هەمووی درۆ بوو. بە ڕووخانی ڕژێمەکەو داگرتن و پەتکردنی پەیکەرەکانیان و

[٩١] بڕوانە: ئەو وتارانە لە "کوردستانی نوێ"دا، ژمارەکانی ٢٧٨٢-٢٧٧٦، سلێمانی، ٢٠٠٢ و، گۆڤاری "کوردستانی ئەمڕۆ".

سڕینەوەی ناویان لەسەر گۆڕەپان و جادەی شارو شارۆچکەکان و...، لەجیّی ئەوان ناوی خەباتگێڕ و شەهید و سەربازە ونەکان و... دانراَن. کتێبە مێژووییەکان و هی قوتابخانەکان سەرلەنویّ نووسرانەوەو، تاوانە لە ژمارەنەهاتوەکانی ڕێبەرانی کریملین بۆ مێژوو گێڕرانەوە.

لەکاتێکدا سەرقاڵی لێکوڵینەوەی ئەم بابەتە بووم، وەك ئاماژەم پێکردو خوێنەریش هەستی پیّ دەکات، زیاتر بۆچوون و هەڵوێست دەربڕینی خۆم و پرسیارکردن لە خۆم و، وەڵامدانەوەم بۆ ئەو پرسیارانەم بۆ هاتەپێش کە پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، واتە تورکیاو ئێران و عیراق و سووریا (کە زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتییان کورد بوون و، تەنانەت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش دوو کورد سکرتێری پارتە کۆمۆنیستەکانی سوریاو عیراقِ بوو) ئاگایان لیّ نەبوەو لێیان شاردوونەتەوە، بەڵام ئەی پاش مردنی ستالین، دوای ئەوەی خرۆشچۆڤ لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتدا پەردەی لەسەر تاوانەکانی ستالین و هاوکارەکانی هەڵدایەوەو، شەرمەزار کران و داوای لێبووردن لە گەلانی سۆڤێتو بەتایبەت گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو کرا، بۆچی وەریان نەگێڕایە سەر زمانی ڕەسمی وڵاتەکەیان و کۆمۆنیستە کوردەکانیش وەریان نەگێڕایە سەر زمانی کوردی تا گەلەکەیان ئاگادار بیّ، چی بەسەر گەلی کوردو گەلانی دیکەدا هێناوە. جگە لە کۆنگرەو پلینۆمەکانی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، بڕیاری پەرلەمان و دەوڵەت و دامودەزگاکانی دیکەی ئەم وڵاتە دەیان جار تا ڕووخانی سۆڤێت ئەم تاوانانەیان شەرمەزار کردووەو دژ بە یاسا هەڵیانسەنگاندووەو، خوازیاری قەرەبووکردنەوەی ئەو زوڵمە بوون کە لێیان کراوە، بەتایبەت سەردەمی گۆرباچۆڤ و پاش ڕووخانیشی بە شێوەیەکی بەربڵاوترو بە بەڵگەو بە دۆکیۆمێنتەوە بەردەوام بوون. بەڵام ئەی بۆ جارێك لاپەڕەی ڕۆژنامەو چاپەمەنیەکانیان یا چەند کتێبێکیان بۆ ئەم تاوانانە تەرخان نەکرد، بۆ قوتابی و نوێنەرەکانی خۆیان لە سۆڤێت ڕانەسپارد کە لەم بارەوە لێکوڵینەوەیەك بکەن. پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت و پارتی دەسەڵاتدار

پەردەیان لەسەر ئەم تاوانانە هەڵداوەتەوە، ئیدی ترس و کۆسپێك لەڕێگەدا نەما؛ یا ترساون بەئاشکراکردنی تاوانەکانی حیزبی براگەورەو قەڵای ئاشتی و سۆشیالیزم تاوانی ڕژێمە دڕندەو دیکتاتۆرەکانی تورکیاو سوریاو ئێران و عیراقدا سپی بکەنەوە؛ یا لەبەر وەرگێڕانی بەرهەمەکانی هاوڕێ ستالین، بەتایبەت لەسەر کێشەی نەتەوەیی و چارەسەرکردنی، نەیانوێراوە خۆیان بەدرۆ بخەنەوە.

بەهەشتی بەرینی گەلانی سۆڤێت لە سەردەمی هاوڕێ ستالیندا زۆریان لەبارەوە وەرگێڕاوەو کتێبو گوتاریان لەسەر نووسیوە. پاش مەرگیشی نووسیویانە: هاوڕێ ستالین کێشەی نەتەوەیی گەلانی بەڕێگەی گرتن و کوشتن و چەوسانەوەو ڕاگواستن و دەربەدەرکردنو تواندنەوەیان لەناو گەلان و کولتووری جیاجیادا، کێشەکانی (ئێمە تەنیا لێرە باسی گەلی کورد لە سۆڤێت دەکەین) چارەسەر کردووەو، ئەو میراتە شوومەی بۆ ڕژێمەکانی پاش خۆی بەجێهێشتووەو، ئەوانیش چارەسەریان نەکردووە. چما سکرتێرە کوردەکانی پارتی کۆمۆنیستی سووریاو عیراق، یا ئەندامە کوردەکانی سەرکردایەتیی پارتە کۆمۆنیستەکانی تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا، بۆ جارێکیش بەشێوەیەکی هاوڕێیانە ئەم کێشەیەیان لەگەڵ سەرکردایەتیی سۆڤێتدا کە زۆرجار یەکتریان بینیوەو لە مۆسکۆ پێشوازییان لێ کردوون، باس کردووە و، خوازیاری چارەسەرکردن و گەڕاندنەوەی برا کوردەکانیان بوون! بێگومان ناکاریگەر نەدەبوو جاروبار گوێیان لە پارتە براکانیان بگرتایە. ئەگەر گوێگر بوونایە، با بۆ بێزاری دەربڕین ڕیزەکانی پارتەکەی خۆیان بەجێهێشتبایەو، ئەم تاوانە گەورەیەیان لەقاوبدایە، دنیای ئەو سەردەمەی دەتەقاندەوەو، دەسەڵاتدارانی سۆڤێتیش ناچاردەبوون بۆ پینەکردنی ئەم بەدناوییەیان هەنگاو هەڵگرن. بەڵام بێدەنگ بوون و، هەر باسی دەسکەوتە مەزنەکانی سۆڤێت و فەرموودەکانی پارتی براگەورەیان کردو، پاش ڕووخانیشی، قوڕیان بۆ پێواو، ئێستایش هەر بەداخن و پارێزگاریی لێ دەکەن و، نازانن ئەو ڕژێمە داڕزاوە نە بەوان ڕزگاری دەبێ و نە گەڕایەوەو، نە کوردیش ئەو ڕژێمەی ڕووخاندووە یا دەستی لە

ڕووخاندنیدا هەبوە. هەر نەتەوە یا گەلێکی دیکە، کەم یا زۆر پارێزگاریی لەم ڕژێمە کردبێ، گازەندەو لۆمەی زۆری ناکرێ، بەلام تاك تاکی مرۆڤی کورد لە هەرکوێیەك بێ، ئەوەندەی هەستی پێ کردبێ، بۆی نەبوەو بۆی نییە داکۆکی لە ڕژێمێکی تەواو فاشیستی وەك ڕژێمی ستالین و حیزبەکەی بکات.

ڕژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستان، دوانیان هاوسنووری سۆڤێت بوون. بێگومان ئاگاداری ئەزموونی سەرکوتکردنی کورد یا چارەسەری کێشەکەی لەلایەن سۆڤێتەوە بوون و، کەڵکیان وەرگرتبوو. بارودۆخی کورد لە سەردەمی ئەتاتورکی دۆست و هاوپەیمانی سۆڤیتدا، کە سوپاکەی پەروەردەی قوتابخانەی سۆڤێتی بوو، بیر بهێنینەوە، بەهەمان شێوەیش سوپاو دەزگای پاراستنەکەی ڕژێمی بەعس (باسی چەك و فڕۆکەو فڕۆکەوان و بۆمبا و گازو چەکە یاساغکراوەکانیان ناکەم کە دایان بەو ڕژێمەو دژی کورد بەکاری هێنان). باسی ئەو سەردەمانە ناکەم کە لەوبەری ڕووباری ئاراس و، ئەودیوی چیای ئاگری (ئارارات)ـەوە، هەر لە سەردەمی ستالیندا، تورك و فارس چییان بە کورد کرد. ئەوە بابەتێکی دیکەیەو هەمووی لە قۆناغێکداو، لەیەکچوونی میتۆدی سەرکوتکردن و سیاسەتیان تەواوکەری یەکترن و، یەك لەیەك دڕندەتر بوون. یەکێك لەو مەرجانەی کە بەسەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردو هێزە سیایەکانیدا سەپێندرا، دۆستایەتی سۆڤێت و ئۆردووگای سۆشیالیزم و، ڕەنگدانەوەی ئەم سیاسەتە لە گوتارو کردەوەی کورددا و، دژایەتی ئیمپریالیزم و ڕۆژئاوا بوو. واتە پاشکۆو گوێڕایەڵی پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان بوون. ئەوە نەبێ، سەرناکەون.

# کۆمەڵکوژی (جینۆساید)
# بە هەموو میتۆدو ئامرازەکانیەوە

گوللەبارانکردن و برسیکردن و نەخۆش خستن و بێکارکردن و لە سەرمادا ڕەقبوونەوەو خۆکوژی و لەخەم و ئازاردا مردن و سووکایەتیکردن بە هەموو شێوەکانیەوە، وەك ناچارکردن بە ڕەفتارکردن وەك ئاژەڵ، بگرە تا دەستدرێژیکردنە سەر شەرەف و ناموس و، ناوو نەتەوەو زمان و دابونەریت گۆڕین و، دەرکردن و زەوتکردن و داگیرکردنی نیشتمان و، گۆڕینی ناوی گوندو کانی و شاخ و هەرد و ڕووباری وڵات، گۆڕستانی مردوەکان خاپوور بکەن و، سەردانی کەس وکارو ناشتنی تەرمی مردوەکان، هەمووی بە مۆڵەتی ڕەسمی بێ و، نێرینەکان بدزن و بێ سەرو شوێنیان بکەن.

هاوڕێ ستالین دەستبەجێ فەرمانی گوللەبارانکردنی دەستگیرکراوانی نەدا، پێویستی بە هێزی کرێکار بوو. پێش مردنیان دەبوو کار بۆ کۆمەڵگەی سۆشیالیزم بکەن، کوشتنی یەکجارەکییان کەڵکێکی نەبوو، دەبوو کێڵگە بکێڵن و، ئاژەڵ بەخێوبکەن و، ڕێگە ڕابکێشن و، بیابانە چۆڵەکان ئاوەدان بکەنەوە، دواتر بمرن. میتۆدەکانی هاوڕێ ستالین لە هیتلەرو سەدام و ئاتاتورك و... ژیرانەتر بوو، دەبێ ئەزموونیان لێ وەربگیرێ. شەڕ نەدەبوو ڕابگەیەنرێ، نەدەبوو کەس ئاگاداربێ، بژی سەرۆك ستالین ڕێبەری پرۆلیتاریای جیهان، بژی سۆشیالیزم و سۆڤێت، مردن بۆ چەوسێنەران !

دەبوو هۆنراوەی شاعیرەکانی کورد بۆ هاوڕێ ستالین و سۆڤێت و ئاڵای سوورو چەکوش و داس و... سەرلەنوێ بڵێینەوە. دەبوو وەرگێڕانی

فەرموودەکانی هاوڕێ ستالین سەرلەنوێ بە کوردی بڵاوبکەینەوە؟ دەبوو کۆنگرەو بڕیارەکانی پارتی براگەورەو دەسکەوتەکانی سۆشیالیزم سەرلەنوێ چاپ بکەینەوە؟ دەبوو هەرچی درۆیە سەرلەنوێ بیاننووسینەوە؟ دەبوو باسی ئەنفالەکانی سۆشیالیزم بکەین؟ ئەنفالە سەرمۆرکراوو ڕانەگەیەنراوەکان. دەبوو ئەوەی هۆنیومانەتەوەو درۆ بوو، بەراوردی بکەین بەوەی کە ڕووی داو، لە کتێبێکدا بڵاوی بکەینەوە. دەبوو لە براکوردەکانی سۆڤێت بپرسین چۆن و چی ڕووی دا ؟ با بڕۆین بۆ سیبریاو کازاخستان و ئۆزبەکستان، با سەر لە ئەرشیڤەکانی کەی گی بی و پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت بدەین؟ با بزانین چ بڕیارێك لە کریمیلینەوە دەرچووەو، چۆن جێبەجێ کراوە؟ با بزانین چەند نامەو سکاڵای کورد گەیشتوەتە دەستیان ؟ با میوانداریی سەرکردەی پارتە کۆمۆنیستەکانی ئێران و عیراق و سووریاو تورکیاو کوردستان بۆ کازاخستان و ئۆزبەکستان و قرقیزیاو ئەرمیناو...بکەین، بزانین ئێستا چیمان پێ دەڵێن.

با گەشتێکیان پێ بکەین بۆ کوردستانی سوور، با میوانی کوردانی سۆڤێت بن، با پێیان بڵێین ڕاستتان فەرموو با ئەمجارە لەبری کریملین میوانی ئاژەڵدارو کرێکارو جووتیارانی کورد بن و، چاوەڕێیان دەکەن ئەگەر ئەم بانگەوازە پەسند بکەن. با سەر لە گۆڕستانی کوردە ئەنفالکراوەکانی سۆڤێت بدەن، کە بە پێچەوانەی ئەنفالەکانی سەدام ئاسەواریان ماوە، با بێن و تەماشای دیمەنی سەدەکانی ناوەندی ئەم گەلە بکەن، با ئەوەی کراوەو نەیانبیستووە بۆیان بگێڕنەوە، با لەبەرگیراوەی فەرمانەکانی هاوڕێ ستالین و بڕیارەکانی پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤێتییان پێشان بدەن. با بێن و، ئەمجارە لەبری میداڵ و نیشانەکانی جارانیان ژمارەی تەنەکەکانی ئۆردووگا زۆرەملێکان و زیندانیەکانی کوردی سۆڤێت لەگەڵ خۆیان بەرنەوە. با بێن و کە گەڕانەوە، بەڵکوو لە هەموان و، لەوانەی لەسەر سۆڤێت شەهیدو بەدیل گیران، پاکانە بۆ خۆیان و هەڵوێستیان بکەن و داوای لێبووردن بکەن.

یەکێك لەو بابەتە گرنگانەی کە پێویست بوو بەوردی یا بەکورتی لەسەریان بنووسم، سەبارەت بەو جەللادانە بوو کە لە جێبەجێکردنی دەستوورەکانی کاربەدەستانی بالآی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا دەوریان هەبوەو، بەرامبەر بە ئازاردان و کوشتنی ژن و منداڵ و گواستنەوەی بەزۆرو بەکۆمەڵی گەلان، پلەوپایەی عەسکەری و مەدەنی و پارەو خەڵات و میداڵ و نیشانەیان وەرگرتووە. بەلامەوە زۆر سەیربوو، کاتێك هەندێ بیرەوەری‌ی نوێنەری ئەو گەلانەم لە گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبدا خوێندەوە. سەیرە ئەو مرۆڤانە بەلای خۆیانەوە لە کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستی و بە بیری مرۆڤایەتی و ئینتەرناسیۆنال و... پەروەردەکراون، چۆن ئەوەندە بێبەزەیی و دوور لە هەستی مرۆڤانە لەگەڵ ئەو خەڵکە بێتاوانانەدا هەڵسوکەوتیان کردووە؟ چۆن ویژدان و کەرامەتیان ڕێی پێداون لە فارگۆنی شەمەندەفەرەکاندا خەڵك لەپێش چاویانەوە بە سەرماو نەخۆشی و برسێتی بمرن، یا بیانکوژن و فڕێیان بدەنە خوارەوە، یا لە شوێنی جێگیرکردنی نوێیان بە هەزاران کەسیان لەسەر شتی سادە یا تاوانێکی بچووك بکوژن، یا زیندانی بکەن، یا بۆ ئۆردووگا زۆرەملێکان بۆ کاری سوغرە بنێردرێن. ئەوانە کام یاسایان پەیڕەوی کردبوو. یاساکانی سۆڤێت، لە سەرەتای دروستبوونی سۆڤێتدا، هەموو یاسای باش بوون. ئەم گەلانە دیلی شەڕیش نەبوون. تەنانەت یاسای نێونەتەوەیی بوار نادات بەو چەشنە لەگەڵ دیلەکاندا ڕەفتاربکرێ.

بابەتێکی دیکە، کە لەوانەیە خوێنەران لەکاتی خوێندنەوەی هەندێ بەڵگەنامەدا سەرنجیان بدەنێ، ناوی کەڵخۆزو سەڤخۆزو گوندو ناوچەو شارەکانە کە یا بەناوی جەللادەکانەوە ناونراون، یا بەناوی ڕۆژ یا کۆڕو کۆبوونەوەو کۆنگرەیەکی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە. تەنانەت گوند یا کەڵخۆز یان سەڤخۆزێکیش کە بەدەستی ئەو گەلە ڕاگوێزراوانە بنیات نراوە، ناوی هاوڕێ ستالین یا مۆلەتۆڤ یا میکۆیان یا ڤەرەشیلۆڤ یا مالینکۆڤ و...یان لێ نراوە. یا ناوی شارو گوندێك کە دەیان یا سەدان ساڵە ناوێکی هەیە، ناویان گۆڕیون و ناوی سەرکردەکانیان لێ ناوە. کەچی زۆربەیان پێش ئەوەی سۆڤێت بڕووخێ،

دیسانەوە گۆڕدراون‌و، بە مردنی ستالین و گرتن و کوشتنی هاوبیرەکان و یاوەرانیان، ناوەکانیان لەسەر گوندو شارو سەقخۆزو کەڵخۆزو جادەو کوڵان و کارخانەو...هەڵگرتووە و، ناویان نەك هەر دەسڕنەوە، بەڵکوو بەدناونیشیان بۆ دەمێنێتەوەو، مێژوویەکی ڕەش لەدوای خۆیان جێدەهێڵن. پەیکەرەکانیان پەت دەکرێن و دەبرێنە مۆزەخانەکان، وەك دەسەلاّتدارەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، کە یەك لەدوای یەك دەڕووخێن و، ئاسەوارێکی باش دوای خۆیان بەجێناهێڵن.

# گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو
# (سەردەمی حوکمی ستالین)

١. ئاستی تیرۆرو چەوسانەوەو جینۆسایدی ڕژێمی ستالینی . سۆڤێتی دژ بە ژمارەیەکی زۆری گەلانی سۆڤێتی پێشوو نیشان دەدات (جگە لە ئازادیخوازو ڕووناکبیری گەلانی دیکە کە بە تاوانی ناڕەوا گیرابوون و کوژران و دوورخرانەوەو ئاوارەی هەندەران بوون).

٢. نوێنەرو کەسایەتی و ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەم گەلانە، نووسەرانیان لە کۆڕو کۆمەڵ و نووسراوەکانیاندا کە لە ئازارو ئەشکەنجەو کێشەی گەلانی خۆیان دواون، باسی کوردی سۆڤێتیشیان کردووە.

٣. زۆربەیان لە تاراوگە پێکەوە لەگەڵ کورددا ژیاون و، وەك دەڵێن هاوخەمی یەکترن.

٤. بۆ ئاشنابوون لەگەڵ بەسەرهات و مێژوویان و بەراوردکردنیان لەگەڵ کورددا، بە هەموو بەشەکانیەوە و چۆنیەتی دروستبوونی قەوارەو ژمارەی دانیشتوانیان، هەڵوەشانەوەو سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی قەوارەکەیان و، گەڕانەوەیان. هەروەها ئەو گەلانە کە قەوارەی نەتەوەیی یا تریتۆرییان (خاکیان) نەبوە، بەراوردکردنیان لەگەڵ کورددا. لەناویاندا گەلی وا هەبوە، پاش کورد قەوارەیان بۆ پێك هێنراوە، یا ژمارەیان لە کورد کەمتر بووە، یا پانتایی (پانیو بەرینی) نیشتمانەکەیان لە کوردستان کەمتر بووە.

٥. ڕێژەی دانیشتوانی ئەو گەلانە لەچاو ڕێژەی کورددا کەمتر بووە. کورد لە نیشتمانی خۆی لە سۆڤێت زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی نیشتمانەکەی پێك هێناوەو، گەلانی دیکە کەمتر لەناویاندا ژیاون، (مەبەستی گەلانی غەیرەکوردە).

٦. کوردەکانی سۆڤێت، بەپێچەوانەی زۆر گەلی دیکەوە، پەیوەندیەکانی خاك و هۆزو نەتەوەییان لەگەڵ دانیشتوانی ئەوبەری سنووره دەستکردەکانی سۆڤێت و ولاتانی هاوسێدا نەبوە. بۆ وێنە، زۆر هۆزو خێڵ و بنەماڵەی کوردی سۆڤێت لەوبەری ئاراس یا چیای ئاگری، خزم و هاوخێڵ و هۆزی خۆیان هەیەو، تەنیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا، پاش داگیرکردنی قەفقاس ئەم گەلە لە دوو بەشەکەی دیکەی نیشتمانەکەیدا، واتە کوردستانی بندەستی تورك و فارس جیادەکرێتەوە.

٧. پێشینەی مێژووی گەلی کورد لە ناوچەکەدا، لەچاو زۆر گەلی دیکەو، تەنانەت ئەوانەی ئەمڕۆ خاوەن و داگیرکەری کوردستای سۆڤێتی یا ڕووسیای پێشوون، بەپێی بەڵگەو سەرچاوەکانی مێژوویی کۆنترەو، بگرە کورد لە ناوچەکەدا دەسەلات و حوکمڕانیی هەبوە.

٨. کورد لەچاو هەندێ لەو گەلانە زیاترو چەندین جار دوچاری ڕاگوێزان و دەربەدەری و قەلاچۆکردن بووەتەوە، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەهەمو کاتی شەڕەکانی ڕووسیا لەگەڵ تورك و فارسدا و، سەردەمی سۆڤێتیش بە ڕەسمی لە ١٩٣٧ و ١٩٤٤دا لە نیشتمانەکەی دووردەخرێتەوە. زۆربەی ئەو گەلانە پاش ١٢ ساڵ دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆیان و قەوارەی خۆیان، کوردەکە پاش دەیان ساڵ تائێستایش بواری گەڕانەوەی پێ نەدراوە.

٩. زۆربەی ئەو گەلانە، پاش گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆیان و پێکهێنانی قەوارەی خۆیان کە زیندووکردنەوەی کولتوورو زمان و ئابووری و... خۆیانی بەدواوە دەبێ و، ترس و گوشاریان بەسەرەوە نامێنێ‌و، ژمارەیان چەند ئەوەندە زیاد دەکات. کەچی کوردی بێ قەوارەو نیشتمان و دەربەدەرو ئاوارەو دابەشبوو بەسەر چەند کۆمارو گەلی سۆڤێتی پێشوودا، بەناچاری کەوتە بە زەبری ژیان و گوشاری نەتەوەی خاوەن دەسەلاتی ئەو کۆمارانەو، نەك تەنیا دەستبەرداری ناسنامەی خۆی بووە، بەڵکوو ناوو ناسناوی خۆیشیان گۆڕیوە.

١٠. کورد لەچاو هەندێکیاندا کە لە دەرەوە پشتیوان‌و دەوڵەتیان هەبوەو، یارمەتییان داون، یا لەکاتی تەنگانەدا بۆ نیشتمانی خۆیان گەڕاونەتەوە، وەك

کۆری و یۆنانی و ئەڵمانی و...بۆ کورد ئەمە نەگونجاوەو، یەکێك لە فاکتەرە سەرەکیەکانی دیاریکردنی چارەنووسی کوردی سۆڤێتی بووە. کورد دەوڵەتێك نەبوە لەسەری هەڵبداتێ و، گوشار بخاتە سەر دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی.

١١. کورد لەچاو هەندێکیاندا، بەپێی بەڵگەی ڕووسی و سۆڤێتی، هەمووکاتێك دەتوانێ داوای مافی خۆی لە گەڕانەوەدا بۆ نیشتمانەکەی بکات، وەك هەندێك لەو گەلانە پەنابەرو هەڵاتوو نەبوە، بەڵکوو نیشتمانی خۆیی هەبوە.

١٢. بەپێچەوانەی هەندێ لەو گەلانە، وەك ئەڵمانی یا تورکی و کۆریایی و... سەر بەو دەوڵەتانە بوون کە دژی سۆڤێت لە بەرەی شەڕدا بوون، یا ڕێکخراوێکی سیاسی یا چەکداری دژی سۆڤێت نەبوەو، تا ئێستایش یەك بەڵگەنامە یا هەواڵێك لەم بارەیەوە نییە (گەرچی من لەگەڵ ئەوەدا نیم کە ئەو گەلانە بەو شتە هەڵبەستراوانەی ڕژێمی ستالین کە سەرلەبەری گەلێکی پێ تاوانبار کردوون، ئەگەر بیانووییەکی وایش هەبووبێ، ژمارەیەك کەس یا هێزێکی سیاسیی ئەو گەلانە بەم کردەوانە هەڵساون، نەك تەواوی گەلەکە. واتە پاکانە بۆ ئەو تاوانانەی ستالین ناکرێ).

١٣. کورد لەچاو هەندێ گەلدا کە خاوەنی خاك نەبوون و پێکەوە لە هەرێم یا ناوچەیەکدا نەژیاون و بەربڵاو بوون. بۆ وێنە، جووەکانی سۆڤێت مافی ئۆتۆنۆمییان پێ دەدرێ. لە هەرێمی دالنی وەستوك لە ناوچەی خاباروڤسك کە ناوەندی ئەم کۆمارە جووە، شاری بیرەبیجانە. جووەکانی ئۆکرانیاو ڕووسیا کۆدەکەنەوەو بۆ ئەوێیان دەنێرن. بیروڕای جیاواز لەم بارەیەوە هەیەو، هەندێك دەڵێن دانیشتوانی ئەوێ، واتە دالنی وەستوك، دوای ١٩٣٤ کە نزیکەی چوار ملیۆن کەس دەبن، بەهۆی برسێتی و لە ئەنجامی لەناوبردنی دەرەبەگ و دەوڵەمەندو خاوەن زەوی و کارخانەو بازرگان و...، کاری هەرەوەزیی سەردەمی ستالینەوە لەناودەچن و، یا دەبنە پەنابەری چین و شوێنەکانی دیکە و، ئەو هەرێمە چۆڵ دەبێ و، ستالین بڕیار ئەدات ئەو هەرێمە بە جوو و گەلانی دیکە ئاوەدان بکاتەوە. ئەوە بوو ساڵی ١٩٣٧ کۆماری هەرێمی جووەکان لەوێ دادەمەزرێنێ. هەندێك پێیانوایە ڕژێمی ستالین ڕقی لە جوەکانیش بووەو، بۆ

خۆڕزگارکردن لە دەستیان و کۆنترۆڵکردنیان، ناردوونی بۆ ئەوێ. هەندێکیش پێیانوایە گوشاری جووەکانی دەرەوە و ناوەوەی سۆڤێت، بەتایبەت ئەوانەی لە ئاستی سەرکردایەتیی حیزبی و دەوڵەتی و پەرلەمانیدا دەبن، لەگەڵ نوێنەرانی ڕووناکبیرو نووسەرو زاناو...جووی دانیشتووی سۆڤێتدا، کە قسەڕۆیشتوو بوون و دەوریان هەبوە، داوای پێکهێنانی ئەو کۆمارە ئۆتۆنۆمییە دەکەن.

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان، گەلی جوو لە سەردەمی دووهەم جەنگی جیهانیدا گەورەترین زیانی گیانی و ماددیی لێ دەکەوێ، بەتایبەت لەلایەن ڕژێمی ئەڵمانیای فاشی و هاوپەیمانەکانیەوە. لەلایەن هەم ئەڵمان و هەم ئەو وڵاتانەی کە ئەڵمانیای نازی و هاوپەیمانەکانی داگیریان کردبوون، کەوتنە بەر شاڵاوی جینۆسایدو قەڵاچۆکردن و، ژمارەیەکی زۆریان لە وڵاتانی ئەورووپا پەرتەوازەی سۆڤێتی پێشوو و ئەمەریکاو کەنەداو وڵاتانی دیکە دەبن و، ئەم وڵاتانە داڵدەیان دان. بەڵام پاش شەڕ جووەکانی سۆڤێتیش بە تاوانی هاوکاریکردن لەگەڵ زایۆنیەکانی جیهانی و ئیمپریالیزم و دژی سۆڤێت، ئەوانیش دەکەونە بەر شاڵاوی بێبەزەییانەی ڕژێمی ستالین و، پاش ستالینیش تەنگیان پێهەڵدەچنن و، ژمارەیەکی زۆریان ئاوارەو پەنابەری وڵاتانی دیکەی جیهان دەبن، بەتایبەت پاش پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ١٩٤٨دا، زۆربەی هەرەزۆریان پاش تێکچوونی سۆڤێت، بەپێی هەندێ سەرچاوە زیاتر لەیەك ملیۆن جوو لە سۆڤێتی پێشوو تائێستا کۆچەری ئیسرائیل بوون.

# "کورتە زانیارییەك سەبارەت بە گەلانی دوچاری شاڵاوی بەزۆر ڕاگوێزانی ستالین و ڕژێمەکەی"

**١ـ بالکارەکان**

بەپێی سەرچاوەکانی ڕووسی تا ١٩١٧ و بڵاوکراوەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بالکارەکان بە تاتارە چیاییەکان ناویان هاتووەو بەناوبانگ بوون. بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ سۆڤێتی، ژمارەیان ٨٥,١٢٨ کەسەو، ٧٨,٣٤١ یان لە کۆماری فیدراتیڤی ڕووسیا دەژین. لەنێوان سەرژمێریەکانی ١٩٥٩-١٩٨٩دا، ژمارەیان دووئەوەندە زیادئەکات، ئەویش بەهۆی تەوژمی ئاسایی زۆری منداڵبوون و، بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتی ئەم گەلەوە. دوای کاباردین و ڕووسەکان، سێهەم نەتەوەی کۆماری کاباردین، بالکار دانیشتوانی ئەم کۆمارە پێك دێنن، واتە ٩,٤٪ . بالکارەکان لە داوێنی زنجیرە چیاکانی باکووری قەفقاسدا دەژین. لە باری ئانترۆپۆلۆژییەوە، لە بنەماڵەکانی ڕەگەزی باڵکان- قەفقاسن و، سەر بە ڕەگەزە ئەوروپییەکانن. موسڵمانی سونی مەزهەبن و، ئیسلام لە ناوەندی سەدەی هەژدەهەمدا گەیشتوەتە وڵاتەکەیان. زمانەکەیان لە گرووپی تورکی سەر بە بنەماڵەی زمانەکانی ئاڵتایین. زمانی ئەدەبی (نووسراویان) دوای ١٩٢٤ پەیدا بووە. سەرەتا بە پیتی لاتینی و، پاشان بە پیتی ڕووسی نووسیویانە. لە هێرشی تاتارو مەنگۆلەکاندا، زیانێکی زۆریان لێ دەکەوێ و، بۆ ماوەیەك ئاوارەو دەربەدەر دەبن، تا خۆیان لەدەست قوتار بکەن. زۆربەیان بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریکن. ١٩٨٨ بیست و شەش کتێب بە زمانی بولکاری دەرچووە و، دوو

گۆڤارو یەك ڕۆژنامەیشیان دەرکردووە. ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بالکار لە چوارچێوەی کۆماری ڕووسیای فیدراتیڤدایە. سەرەتا لە یەکی کانوونی یەکەمی ١٩٢١ هەرێمی ئۆتۆنۆمی پێك هات (تا ئەودەمە کاباردین لە چوارچێوەی ناوچەی چیایی ئۆتۆنۆمی سۆشیالیستی سۆڤێتیدا بووە، کە لە مانگی ١٩٢١/١١ پێك هات). پاشان ١٩٣٦/١٢/٥ لە ئۆتۆنۆمی بالکارو کاباردین، کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی نوێ بەناوی کۆماری ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بولکارەوە پێك هات. مانگی ئازاری ١٩٤٤، بە دەستووری پەرلەمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت، دانیشتوانی بالکاری ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بالکار بەزۆری و بە ناچاری کۆچیان پێکرا و، ناوی ئەم کۆمارە ئۆتۆنۆمییە گۆڕا بە کۆماری ئۆتۆنۆمی کاباردین (ناوی بالکاری لەسەر هەڵگیرا) و، تەواوی دانیشتوانی ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بالکار گوازرایەوە بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکانی یەکێتی‌ی سۆڤێت، واتە قەوارەو دەوڵەتە نەتەوەییەکەیان لێ سەندرایەوە. هۆی گواستنەوەو دەرکردنیان لە نیشتمانەکەیان، هاوکاریکردنیان بووە لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا و خراپەکارییان دژی سوپای سور، بە پێکهێنانی هێزی چەکدارو ڕێنوێنیکردنی فاشیستەکان لە قەفقاسو ئەو شوێنانەی کە داگیریان کردبوون و، بەگشتی دژی دەسەلاتی سۆڤێتی ڕاپەڕیبوون.

دوای دوازدەساڵ دەربەدەری و چاودێریکردن، لە ١٩٥٦/٤/٢٨دا، پاش دەرچوونی بڕیاری پەرلەمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت، سەبارەت بە هەڵگرتن یا لابردنی بڕیاری ڕاگوێزرانی تایبەتی لەسەر بالکارو کوردو تورك و تاتاری کریم و خیمشینەکان، کە لە سەردەمی شەڕی نیشتمانی‌ی گەورەدا دوورخرابوونەوە، ئازاد کران. لە ١٩٥٧/١١/٩دا پەرلەمانی سۆڤێت بڕیاری گەڕانەوەو پێکهێنانەوەی قەوارەکەیانی دا، واتە گۆڕینی کۆماری ئۆتۆنۆمی کاباردین بە کۆماری ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بالکارو، بەم چەشنە گەلی بالکار بواری پێ درا بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی. لە سێهەمین خولی کۆبوونەوەی پەرلەمانی کۆماری ئۆتۆنۆمی کاباردین ـ بالکاردا لە ١٩٩١/١١/٣٠دا"بڕیاری سەربەخۆیی‌ی کۆماری سۆڤێتی‌ی سۆشیالیستی کاباردین ـ بالکار درا"و، بەپێی ئەم بڕیارە ئەبوو کاباردین و

بولكارەكان، هەركاميان وەك ئەبيكين سەربەخۆ لە يەك كۆماری يەكگرتوودا بژين، هەركاميشيان مافی سەربەخۆيی كۆماری جياوان، واتە مافی جيابوونەوەو پێكهێنانی دەوڵەتێكی سەربەخۆيان هەبێ[٩٢].

لە كتێبی قەفقاس، سەرچاوەی ئامارەپێكراوو لاپەڕەی ٢٩٩دا هاتووە، كە لە٦٢ گوندو شارۆچكەی بالكارەكان، پاش گواستنەوە تا گەڕانەوەيان ١٨يان دەمێننەوەو، ئەوانی ديكە دەڕووخێن و، بالكارەكان لەو سەردەمەدا بەپێی سەرژمێریی ڕەسمیی دەوڵەتی ژمارەيان ٣٥ هەزار كەس بووە. كەچی ئەم گەلە كۆڵنەدەرە، سەرەڕای ئەو تراژيدياو كەندو كۆسپەی هاتە سەر ڕێگەيان، گەڕانەوە بۆ نيشتمانەكەی خۆيان.

**٢ـ يۆنانيەكان:**

ڕگۆميوسەكان كە لە وشەی ڕۆم يا ڕيم واتە "ڕۆميەكان"ـەوە هاتووە، خاوەنی ئيمپراتۆريەتی ڕۆم بوون و، بەهۆی بڵاوبوونەوەيانەوە لە يۆنان، ڕووسيا، ئۆكرانيا، جۆرجياو ئازەری و...هتد. يۆنانيەكان لە سەدەكانی ناوەندا كاكڵەی دروستبوونی ئيمپراتۆريی بيزانتی بوون. بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ی سۆڤێتی، لەم وڵاتەدا ٣٥٨,٠٦٨ يۆنانی دەژين، يۆنانيەكانی سۆڤێت بە هۆ و چۆنايەتیی جۆراوجۆرەوە هاتوون و، نيشتەجێبوونيان لە سۆڤێتدا لەيەك جياوازن.

هەندێكيان هەر لە سەدەی ٥-٧ی پێش زاينەوە نيشتەجێ بوون، بەتايبەت لە دوورگەی كريم و ٢٩ گونديان داوودەزگای بەڕێوەبەرايەتييان هەبوە. لەكاتی گرتنی (كريم)دا شاژنی ڕووسيا يكاترينای دووهەم لە ١٨٥٩دا بڕياری ڕاگوێزانی داون. بەڵام يۆنانيەكانی قەفقاس، بەهۆی ئەو زوڵم و ئەگەر بگەڕێينەوە بۆ دواوە، كاتێك توركە سەلجوقيەكان زۆرە نەتەوەيی و دينی سوڵتانەكانی عوسمانييەوە، نێوان سەدەكانی ١٨ و ١٩ لەتوركياوە هاتوونەتە ئەم هەرێمە. ئەوانە بەرەو قەفقاس كۆچيان كردووە بۆ پاراستنی نەتەوەو دين و زمان و گيانی خۆيان.

---

[٩٢] هـ.س، ل٢٥٧-٢٥٨.

ناوچەکەیان داگیر کرد، کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنینی یۆنانیەکان. یۆنانیەکان، نەك تەنیا لە تورکیا بەڵکوو لە ئازەربایجانی ئێرانیشەوە کۆچیان کرد بەرەو قەفقاس. بەکۆمەڵ کۆچکردنی یۆنانیەکان لە ئانادۆڵەوە لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکردووە. کاتی شەڕی ڕووسیا ـ تورکیا لە ١٨٣٨-١٨٣٩داو، پاش پەیمانی ئاشتیی نێوان هەردوو دەوڵەتی ناوبراو، کۆچی بەکۆمەڵی یۆنانیەکان لە پاشایەتی ئەرزەڕۆمەوە بۆ جۆرجیا دەستی پێکردووەو، کۆچی یۆنانیەکان لە تورکیاوە بۆ ڕووسیا تا سەرەتای سەدەی بیستهەمیش هەر بەردەوام بووە.

کاتی یەکەمین جەنگی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)، سەرلەنوێ یۆنانیەکان لە تورکیاوە کۆچین کرد بۆ قەفقاس و، سەرەنجام بەپێی پەیمانی لۆزان ١٩٢٢-١٩٢٣ ئاڵوگۆڕی دانیشتوانی نێوان تورکیاو یۆنانیەکان کرا. واتە تورکەکانی دانیشتووی یۆنان گۆڕدرانەوە بە یۆنانیەکانی دانیشتووی تورکیاو، لەم کاتەدا زۆربەی یۆنانیەکانی تورکیا ئامادە نەبوون بگەڕێنەوە بۆ یۆنان، بەڵکوو کۆچیان کرد بەرەو یەکێتیی سۆڤێت و، بۆ هەرێمی قەفقاس. لەکاتی دووهەم جەنگی جیهانیدا، بەشێك لە یۆنانیەکانی جۆرجیا و کریم، وەك گەلانی دیکە، هەر بەو تاوانە هەڵبەستراوانە بەزۆر گوێزرانەوە بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و، ئێستا دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ یۆنان. ساڵی ١٨١٤ یۆنانیەکانی ئۆدیسا لە ڕووسیا پلانی ڕاپەڕینی دژی تورکیای عوسمانییان داڕشت، کە پاشان بوو بەهۆی ڕاپەڕینی چەکدارانە بۆ سەربەخۆیی یۆنان لە ١٨٢١-١٨٢٩دا. تەنانەت بەشێکی یۆنانیەکان لە کۆتایی سەدەی ١٨دا کە زمانی تورکییان بە زمانی دایکی خۆیان پەسند کرد، لە کوشتارو تەنگ پێ هەڵچنین ڕزگاریان نەبوو. هەر بۆیە یۆنانیەکانی سۆڤێت هەموویان زمانی یۆنانی نازانن و، بەشێکیان زمانی دایکیان تورکی و ڕووسی و تاتاری کریم و...هـ. جگە لەوە، ئەوانەش کە بە یۆنانی دەپەیڤن، سەر بە چەند زاراوەن، بەڵام هەستی نەتەوەییان هەیەو، هەوڵی فێربوونی زمانی خۆیان ئەدەن.

ساڵانی٢٠و ٣٠ی سەدەی بیستەم چاپەمەنی بە زمانی ڕۆمی (یۆنانی) بڵاو دەبووەوەو، یۆنانیەکان لە قوتابخانەکاندا بە زمانی یۆنانی و تاتاری کریمی

دەیاخوێند. ڕۆژنامەی کۆمۆنیست کە نێوان ١٩٣٧.١٩٣٦ لە ڕەستوۆ نادانو بڵاودەکرایەوە، تریبونی تەواوی یۆنانیەکانی یەکێتیی سۆڤێت بوو و، لە ئانجازیا ڕۆژنامەی "کوك کینوس کاپانس" و لە ئۆکرانیا ڕۆژنامەی "کەلیك تی ڤیستیس" بڵاودەبوەوە. ساڵی ١٩٣٧ بووژانەوەو پێشکەوتنی سروشتیی کولتووری یۆنانیەکانی دانیتسك وەستا، کەسایەتیە کولتووری و ڕووناکبیرەکانی یۆنانی گیران و دوورخرانەوە یا دەربەدەرکران. ڕۆژنامەو قوتابخانەکان داخران و، بەزۆر خوێندنی یۆنانیەکان بووە زمانی ڕووسی.

یۆنانیەکانی جۆرجیا کە لەبارەی زمانەوە دابەش بوون بۆ دوو دەستە، واتە تورك زمانەکان "ئوروومی" کە بە زاراوەی تورکی ئانادۆڵی و، گرووپێکی دیکە کە بە زمانی یۆنانی "ڕۆمی" قسە دەکەن، قوتابخانەو چاپەمەنیەکانیان داخران.

بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەکان و ئاسەوارو دەستکردی یۆنانیەکان، هەر لەکۆنەوە تائێستا کە ماون، بەهۆی پێشکەوتنی کولتوورییەوە دەورێکی بەرچاویان لە هەموو بوارەکانی ژیانی یەکێتیی سۆڤێتدا بینیوە؛ گەلێك شارو گوندیان ئاوەدان کردوەتەوەو ڕازاندوەتەوەو، گەلێك پرۆژەی ئابووری و کولتوورییان ڕێك خستووە. وەك گەلانی دیکە، لە ١٩٤٤دا بەزۆر لە شوێن و جێگەی خۆیان ڕاگوێزران و، دەست بەسەر هەموو شتێکیاندا گیرا، هەر بەو تاوانە حازربەدەستانە تۆمەتبار کران کە ئاڕاستەی گەلانی دیکە کراون. سەرەڕای هەموو دەستورو بڕیارەکانی دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی و ڕووسی و کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو، تائێستا نەیانتوانیوە بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە.

### ٣- فینەکان یا فینلەندیەکانی سۆڤێت (ئینگرماندسکن)

لە سۆڤێت بە فینەکانی لینینگراد ناسراون، بەپێی سەرژمێری سۆڤێتی لە ١٩٢٦دا ژمارەیان ١٣٤،٠٠٧ کەسە، بەڵام بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ ژمارەیان ٦٧،٣٥٩ کەسە. ساڵانی کاری هەرەوەزی و سەردەمی دووهەمین جەنگی جیهانی و دوای شەڕ، گەلی فین یان فینلەندیەکان وەك گەلانی دیکە کەوتنە بەر شاڵاوی لێدان و ڕاگواستن. ساڵی ١٩٤٢ بەشێك لەم گەلە (٦٢ هەزار کەس) لەلایەن هێزەکانی

ئەڵمانەوە بەدیل گران و بەزۆر بۆ کۆمارەکانی پری بالتیك و فینلەند گوێزرانەوە. دوای پەیمانی ئاشتی لە ١٩٤٤دا بواری گەڕانەوەی پەنجاو پێنج هەزار کەسیان درا، بەڵام نەیانهێشت لە شوێنی پێشوو، واتە نیشتمانەکەیان، بژین و، بڵاوەیان پێ کردن و، بەشێکیان بۆ سیبریا گوێزرانەوە. ئەمانە هەموو، بوونە کۆسپی گەورەی بووژانەوەو پێشکەوتنی فینەکان و قوتابخانەو چاپەمەنیەکانیان بە زمانی فینی داخران.

## ٤- ئینگووشەکان

یەکێك لە گەلە کۆنەکانی باکووری قەفقاسن. بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩، ژمارەیان ٢٣٧,٤٣٨ کەسە، ئاژەڵداری و کشتوکاڵ پیشەی سەرەکییانە. کارکردن لەسەر خاکی ئینگووشەکان زۆر زەحمەتە، چونکە شاخاویەو دەبێ هەموو ساڵێك لە بەرد پاك بکرێتەوە. ئینگووشەکان، خان و ئاغاو دەرەبەگیان بەخۆوە نەدیوەو، ئازادانە کۆمەڵ بە کۆمەڵ خۆیان بەڕێوە بردووە. موسڵمان و سونی مەزەبن. ١٩٣٤/١/١٣، کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچنی ئینگووش دامەزرا.

بەپێی بڕیاری پەرلەمانی سۆڤێت لە ١٩٤٤/٣/٧دا، ئەم کۆمارە هەڵوەشایەوەو، دانیشتوانی بەزۆر بۆ ناوچەو شوێنەکانی دیکەی یەکێتیی سۆڤێت ڕاگوێزرانەوەو، بە تاوانی هاوکاریکردنی ئەڵمانیای نازی و پێکهێنانی دەستەی چەکدارو ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتداریێتیی سۆڤێتی و کوشتن و تاڵانکردنی خەڵك و... زوڵمێکی زۆریان لێ کرا، ئەگەرچی پێی سەربازێکی ئەڵمانیا نەکەوتبوە خاکی ئینگووشەکانەوە.

بەپێی بڕیاری ١٩٥٦/٧/١٦، لە تاراوگە کۆنترۆڵ و چاودێرییان لەسەر هەڵگیرا و، بە بڕیارو دەستووری پەرلەمانی یەکێتیی سۆڤێت لە ١٩٥٧/١/٩دا سەبارەت بە دروستکردنەوەی قەوارەی نەتەوەیی ئەم گەلەو گەڕانەوەیان، کۆماری چیچنی . ئینگووشی لە چوارچێوەی کۆماری ڕووسیای فیدراتیڤ دەرچوو و، ١٩٩٣/٦/٤ بەپێی یاسای کۆماری ڕووسیای فیدراتیڤ کۆماری سەربەخۆی ئینگووشی لە چوارچێوەی ڕووسیای فیدراتیڤدا ڕاگەیەنرا و لە چیچنیا جیابوونەوە.

### ٥ـ کالمیکەکان

بەپێی سەرژمێری ساڵی١٩٨٩ی یەکێتیی سۆڤێت ژمارەیان ١٧٣,٨٢١ کەس بوو؛ زمانیان لە بنەماڵەی زمانە مەنگۆلی (مەغۆلی)یەکانەو، لە چەند زاراوەیەك پێك هاتووە. کالمیکەکان لە سەدەی ١٦دا کەوتنە بەر پەلاماری خالخا . مەغۆلەکان و چینیەکان و کازاخەکان، کە بووە هۆی هەڵاتن و ئاوارەبوونی ئەم گەلە. ساڵی ١٦٠٨-١٦٠٩، بەپێی پەیماننامەو بەڵگەنامە، بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە هاتنە ناو ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا. کالمیکەکان لە تەواوی شەڕەکانی ڕووسیاو بزووتنەوەی جووتیاریدا بەشدارییان کردووە. لەکاتی لەشکرکێشانی پیتر (قەیسەر)ی یەکەم بۆ سەر ئێران، چالاکانە بەشدارییان کرد و، ساڵی ١٨١٢ لە ڕیزی لەشکری ڕووسیادا گەیشتنە پاریس.

زۆربەی کالمیکەکان سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، لە ناوچەکانی گوبێرنی (محافظة)ی ئاستراخان نیشتەجێ بوون. کالمیکەکان کاریەدەستێکی زۆریان لەناو دەسەڵاتداریتیی دەوڵەتی ڕووسیادا هەیە. ١٩٣٠/١١/٤ بڕیاری پێکهێنانی هەرێمی ئۆتۆنۆمی کالمیك دەرچوو و، ١٩٣٥/١٠/٢٠ ئەم هەرێمە ئۆتۆنۆمییە بووە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی.

بڕیاری هەڵوەشانەوەی کۆماری کالمیك لە ١٩٤٣/١٢/٢٧ درا، بە تاوانی هاوکاریکردن لەگەڵ ئەڵمانیای نازی و، ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتداریتی سۆڤێتی و، تەواوی دانیشتوانی بەزۆر بۆ ناوچەکانی دیکەی سۆڤێت ڕاگوێزران.

سەرەتای ١٩٥٧ دەستووری گەڕانەوەی کالمیکەکان و پێکهێنانەوەی کۆمارەکەیان درا و، دوای شەش مانگ، واتە لە ١٩٥٨/٧/٢٩دا، ئەم کۆمارە ئۆتۆنۆمیەی کالمیك دامەزرایەوەو، ١٩٩٠/١٠/١٨ پەرلەمانی کالمیك بڕیاری گۆڕینی کۆماری ئۆتۆنۆمی دا بە کۆمارێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی ڕووسیای فیدراتیڤدا.

### ٦ـ قەرەچایڤەکان

بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩، لە یەکێتیی سۆڤێت ١٥٥,٩٣٦ کەسن. زمانەکەیان لە دەستەی زمانەکانی کیپچایڤ، یا زمانی قەرەچایڤ . بالکار، یا بنەماڵەی زمانەکانی باکوورو ڕۆژئاوای ئاڵتایەو پەیوەندیەکی زۆرو نزیکی لەگەڵ زمانی

ئەسەتنیندا هەیە. موسڵمانی سونە مەزەبن. هەرێمی ئۆتۆنۆمی قەرەچایڤ . چیرکەس لە ١٩٢٢/١١/١٢دا دامەزرا. بەپێی بڕیاری پەرلەمانی سۆڤێت لە ١٩٤٣/١٠/١٢دا، ئەم ئۆتۆنۆمییە پشت بەستوو بە تاوانە هەڵبەستراوەکانی ڕژێمی ستالین هەڵوەشایەوەو، تەواوی دانیشتوانەکەی بەزۆر بۆ شوێنەکانی دیکەی سۆڤێت دوورخرانەوەو، ئەم کۆمارە سەرلەنوێ لە ١٩٥٧/١١/٩دا دامەزرایەوە.

پاش دەرچوونی بڕیارو دەستوورەکانی دەوڵەتی و حیزبی و پەرلەمانی و، داوودەزگا یاسادانەرەکان، پێشنیار کرا کە گەلانی وەك بالکارو قەرەچایڤ، لەبەر کەمبوونی ژمارەیان، پێویست بە پێکهێنانەوەی قەوارە ئۆتۆنۆمیەکەیان ناکات، بەڵام با بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و درێژە بە ژیانیان بدەن. واتە وەك گەلانی میوان و بەزۆر نیشتەجێکراوی وڵاتەکەیان پێکەوە بژین و، دەبێ لە هەندێ شوێندا خاوەن خاکەکە وەك کەمایەتی بژین، یا بە گشتی خاوەن خاکەکە لەچاو دانیشتوانی میواندا کەمترو کەمەنەتەوە بێ و، خانەخوێی نوێ یا میوانی وڵاتەکەیان کە بواریان داوە بگەڕێنەوە قەرزاریشیان بکەن و سووکایەتیشیان بەرامبەر بنوێنن. ئەوانە تاوانبارن و، بە وتەی هاوڕێ ستالین، دوژمن و گومان لێکراون و، ئەو بەدناویەیان هەر لەسەر دەمێنێتەوەو، دەستیش بەسەر سەرو سامان و خاکەکەیاندا گیراوە و، ساڵها تا ئەوانە لە تاراوگە بن ، هاوردەکان کەڵکیان لێ وەرگرتووە و، کردوویانە بە موڵکی یاسایی خۆیان و، هەردەڵێی لە باووباپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوەو، لە شیری دایکیان حەڵاڵترە و، ئامادەیش نابن بگەڕێنەوە جێ و شوێنی پێشووی خۆیان، چونکە بە دەستووری هاوڕێ ستالین جێگیر کراون ! گێرمەو کێشەی زۆرو خوێناوی زۆرجار لەم بارەیەوە ڕووی داوە، لە ڕوانگەی ستالین و هاوبیرەکانیەوە سۆڤێت نیشتمانی هەموانەو، هەر کەس کوێی پێ خۆش بێ دەتوانێ تێیدا بژی، برایەتی و یەکسانی و...ی گەلان مسۆگەرکراون.

بەڵام ئەم شەڕپێفرۆشتنە بۆ هەندێ گەل بایەخێکیان نەبوو، گەڕانەوە نیشتمانەکەی خۆیانو، بۆ هەندێ گەلی وەك کوردیش بەپێچەوانەوە بوو.

### ٧ـ کۆریەکان

ژمارەیان بەگشتی لە دنیادا ٦٥ ملیۆن کەسە، ٤١ ملیۆن کەسیان لە کۆریای باشوورو ٢٠ ملیۆنیان لە کۆریای باکوورو، ٢ ملیۆن لە چین و ٦٧٠ هەزاریان لە ژاپۆن و ٣٦٥ هەزار کەسیان لە ئەمەریکا دەژین. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٩ی یەکێتیی سۆڤێتیش، ٤٣٨٦٥٠ کەسیان لەو وڵاتە دەژینو، بەسەر چەند کۆمارو شارو هەرێمی یەکێتیی سۆڤێتدا بڵاوبوونەتەوە. سەر بە ئایینی بوزان و، بەشێکیان لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئاینی مەسیحیی وەرگرتووە و، نەوەی کۆنیش هەندێکیان تا ئێستایش سەر بە ئاینی دێرینی شامانن. بە چەند زاراوەیەك قسەدەکەن. هۆی پرژوبڵاو بوونەوەی ئەم گەلە بۆ دەرەوەی نیشتمانەکەیان، ئاڵۆزیی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییان بووە. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٢٦، ژمارەی کۆریەکانی سۆڤێت ٨٧ هەزار کەس بووە. کۆریەکان دووجار، لە ١٩٣٧ و ١٩٤٤،بە تاوانی جۆراوجۆرو بەزۆر بۆ کۆمارو ناوچەو شارەکانی سۆڤێتی پێشوو ڕاگوێزراون.

### ٨ـ ئەڵمانیەکانی سۆڤێت

لەنێوان سەدەی ١٨ و ١٩دا بەرەو ڕووسیا کۆچیان کردووە، سەر بە ئول و زاراوەی جیاوازن. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٩، لە یەکێتیی سۆڤێت، ٢,٠٣٨,٦٠٣ ئەڵمانی دەژین.ز نزیکەی یەك ملیۆنیان لە کازاخستان و هەشتسەدو پەنجا هەزار کەسیان لە ڕووسیاو، سەدهەزار کەسیان لە قرقیزستان و چل هەزار کەسیان لە ئۆزبەکستان و سی وهەشت هەزار لە ئۆکرانیاو، ئەوانی دیکە لە کۆمارو شارەکانی دیکەی سۆڤێتی پێشوو دەژین.

زۆربەی ئەڵمانیەکان لە نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا دوای بانگەوازی شاژنی ڕووسیا خاتو یەکاترینای دووهەم لە ١٧٦٢-١٧٦٣دا هاتوون. ئەم بانگەوازە بریتی بووە لەوەی کە ئەوانەی دەیانەوێ بێنە ڕووسیاو لەسەر زەویی ئازادو نەکێڵراو ئیش بکەن، زەوی وزاریان پێ ئەدرێ (لە زەویوزارە بەپیتەکانی ڕۆخەکانی ڕووباری ڤۆڵگا).

قۆناغی دووهەمی هاتنی ئەڵمانیەکان بۆ ڕووسیا، هەر سەردەمی یەکاترینای دووهەم بووە، کاتێك ڕووسیا دەستی بەسەر دوورگەی کریمدا گرت. ئەڵمانیەکانیان بۆ پاراستن و پاسەوانی سنوورەکانی ڕووسیا بانگ کرد. پاشانیش چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمو سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی ئەلیکساندەری دووهەم، ژمارەیەکی زۆری دیکە لە ئەڵمانەکان ڕاکێشران بۆ ڕووسیاو، لە چەند شوێنی ئەم ئیمپراتۆریەتەدا جێگیر کران.

سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهانی، ئەڵمانیەکانی دانیشتووی ڕووسیا، ئەوانەی کە لەنزیکی بەرەکانی شەڕدا دەژیان، گوێزرانەوە بۆ ناوچەکانی دیکە. کاتی دووهەمین جەنگی جیهانی، بەپێی بڕیاری کاربەدەستانی سۆڤێت، ئەڵمانیەکانی دەوروبەری ڤۆڵگا بەزۆر گوازرانەوە بۆ ناوچەکانی دیکەی سۆڤێت و، ئۆتۆنۆمیەکەشیان هەر لەو ساڵەدا هەڵوەشێندرایەوە.

سەدوپەنجا هەزار کەسیان کە لەکاتی هێرشی سوپای ئەڵمانیای نازیدا فریای گواستنەوە نەکەوتن، بە خەڵکی ئەڵمانیا لەقەڵەم دران و، لەکاتی پاشەکشەی سوپای ئەڵمانیای فاشیدا لە یەکێتیی سۆڤێتەوە گوێزرانەوە بۆ ئەڵمانیا.

پاش مەرگی ستالین لە ۱۹۵۵/۱۲/۱۳دا، کۆنترۆڵ و چاودێرییان لەسەر هەڵگیرا، بەڵام لێبوردنی تەواویان لە ۱۹٦۹/۸/۲۹ بۆ دەرچوو. بەڵام بواریان نەدان بگەڕێنەوەو قەوارەکەیان پێك بهێننەوە. تەنانەت لە کۆماری کازاخستانیش، پەرلەمان بڕیاری مافی ئۆتۆنۆمیی بۆ ئەڵمانیە ڕاگوێزراوەکانی ئەم کۆمارە لە چوارچێوەی کازاخستاندا دەرکرد و، ئەویش جێبەجێ نەکرا. ساڵانی حەفتای سەدەی بیستەم، ژمارەیەکی زۆر لەو ئەڵمانیانە گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات (بۆ ئەڵمانیای سۆشیالیستی سەر بە سۆڤێت). ساڵی ۱۹۸۹ سەدهەزار کەس و، ۱۹۹۰ سەدوپەنجا هەزار کەسی دیکەیان گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا و، ئەم کۆچە بەکۆمەڵە تائێستاش هەروا بەردەوامە.

### ٩. تاتارەکانی کریم (قریم)

نێوان ساڵانی ١٩٧٩ تا ١٩٨٩، ژمارەی ئەم گەلە لە ١٣٢,٢٧٢ کەسەوە گەیشتە ٢٧١,٧١٥ کەس، واتە دووقات زیادیان کرد. ئەمەش پەیوەندییەکی سەرەکیی بە هۆشیاریی نەتەوەیی‌یەوە هەیە. ئەم گەلە زۆربەیان، تا ماوەیەك لەمەوبەر، وەك نەتەوە خۆیان لەسەر نەتەوەکانی تر دەنووسی. بۆ وێنە، تاتارەکانی ڕووسیا ژمارەیان لە ساڵی ١٩٧٠دا دوو هەزار و هەشتسەد و پەنجادوو کەس و، ساڵی ١٩٧٩ ژمارەیان بە پێنج هەزار و سەدو شەست‌وپێنج کەس نووسراوە و، ئەوانی تر لەسەر ژمارەی کۆمار و نەتەوەکانی تر، یا سەر بە تاتارەکانی تر نووسراون. دەتوانین بڵێین، ژمارەیان ئەمڕۆ دەگاتە چوارسەد تا چوارسەد و پەنجا هەزار کەس.

لەکاتی ڕاگواستنیاندا، بەسەر کۆمارەکانی ئۆزبەکستان و تاجیکستان و هەرێمەکانی کراسنادار و ستاڤراپول و ئۆکرائین و شوێنەکانی تردا دابەش کران. موسڵمانی سونین و، زمانەکەیان لە بنەماڵەی زمانە تورکیەکانە.

پاش داگیرکردنی کریم لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی ڕووسیاوە، بەتایبەت پاش شەڕی کریم ،زیاتر لە دووسەد هەزار کەسیان کۆچیان کرد بۆ تورکیا.

ساڵی ١٩٢١ لەکاتی دروستکردنی ئۆتۆنۆمی کریمدا، تاتارەکانی کریم ١\٥ پێنج یەکی دانیشتوانی ئەوێیان پێك دەهێنا. ئەم کۆمارە لە ١٩٤٤دا هەڵوەشێندرایەوە و، دانیشتوانی تاتاری کە لە دووسەد هەزار کەس زیاتر بوون، لەگەڵ گەلانی تردا بەزۆر ڕاگوێزران بۆ دوورگەکان. پاش لێبوردنی ١٩٦٧، مافە دەستووریە بنچینەییەکانیان بۆ گێڕدرایەوە و، هیوای گەڕانەوە و دروستکردنەوەی ئۆتۆنۆمی کریم پەرەی سەند.

بەپێی سەرژمێری فەرمیی سۆڤێت لە ١٩٨٩، ژمارەی تاتارەکان ٢٧١,٧١٦ کەسە.

### ١٠. تورکە میسخیتیەکان

بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ی سۆڤێت، ٢٠٧,٥١٢ تورکی میسخیتی هەن. لە ماوەی سی(٣٠) ساڵدا ژمارەیان پێنج قات زیاتر بووە، بەتایبەت لەنێوان ١٩٧٩-١٩٨٩دا ژمارەیان دووقات و نیو زیاد بووە. ئەمەش تەنیا لەبەر زاووزێی ئاسایی‌یان نەبوە، بەڵکو بەهۆی بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتییانەوە بووە،

چونکه لەڕابردوودا خۆیان یا ئەوانیان لەسەر نەتەوەکانی تر دەنووسی. لە سەرژمێریە ڕەسمیەکاندا، بە تورکیان نووسیون یا لەژێر ناوی نەتەوەکانی تردا هاتوون و، هەندێ جار بە ئازەری یا ئۆزبەك یا تاتار یا موسڵمان و قەفقاسی نووسیویانن و، یا پرسیاریان لێ نەکردون لە چ نەتەوەیەکن. لەلایەکەوە، بەشێك لە تورکە میسخیتیەکان بەئەنقەست خۆیان بە نەتەوەی تر نووسیوە، بۆ ئەوەی لەسەرکار لانەبرێن، یا وەریان بگرن. لەلایەکی ترەوە، ٣\١ سێیەکی تورکە میسخیتیەکانیان بە تورك داناوە. تا ١٩٤٤ تورکە میسخیتیەکان لە گوندەکانی نێوان ڕووبارەکانی کوری و چاروخی جۆرجیای سۆڤێتدا لەگەڵ جۆرجی و کورد و تورك و ئازەریدا ژیاون.

لەسەر نەژادی نەتەوەیی تورکی میسخیتی، بیروڕای جیاواز هەیە. لە سەدەی یانزەهەمدا، خاکی میسخیتی بە شانشینی ئاخالتسیخ ناسراوە. بەپێی کۆمیتەی پارێزگاری دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت لە ١٩٤٤/١١/١٤دا، زیاتر لە سەد هەزار کەسیان لە ٢٠٩ گوندی میسخیتییەوە گواسترانەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست، بەبیانوی پاراستنی سنوورەکانی جۆرجیاوە لەگەڵ تورکیادا. تراژیدیای نوێیان ١٩٨٩، لەپێش چاوی هەموو دنیادا ڕوویدا، واتە بەزۆر دەریانکردن لە تاراوگەی دۆڵی فەرغانەی ئۆزبەکستان و، جارێکی تر ئاوارەی شار و کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤێت بوونەوە. بەڵام بەداخەوە سەرداری ئەو هەموو بڕیار و دەستوورانەی کە پاش مردنی ستالین سەبارەت بە گەلانی سەرکوتکراو دەرچووە، بەوانەوە کە پاش ڕووخانیش لە ڕووسیا و کۆمارەکانی ترو بەتایبەت کۆماری جۆرجیا دەرچوون، ئەم گەلە بواری گەڕانەوەی پێ نەدراوە بۆ شوێنی خۆی و کولتووری نەتەوەیی و زمان و داب و نەریتی لەناو دەبرێ و، وەك سەهۆڵ لەبەر هەتاوی گەرمی هاویندا دەتوێنەوە و، خەریکە وەك گەلانی تر لەسەر ئەم ئەرزە بتوێتەوە و نەمێنێ.

زۆرجار ئەم گەلە، بەتایبەت پاش ڕووخانی ڕژێمی سۆڤێتی، تووشی کارەسات بووە، بە چەشنێك کە تەلەفزیۆن و چاپەمەنیەکانی ڕووسیا ناچار بوون باسیان بکەن. بۆ وێنە، هەندێك لە تورکە میسخیتیەکان، پاش ئەوەی دەسەڵاتدارانی جۆرجیا نەیانهێشت بگەڕێنەوە و ئاوارەی ئۆزبەکستان بوون و لەوێش دەرکران و

زۆریان لێ کوژرا، پەنایان بۆ ڕووسیا برد و، هەندێکیان لە هەرێمی کراسنادار جێگیر بوون و، لەوێش لەلایەن کاربەدەستان و دانیشتوانی ناوچەکەوە تەنگیان پێ هەڵچنرا. ئەمە بووە هۆی تێکهەڵچوونیان لەگەڵ پۆلیس و دانیشتوانی ناوچەکەدا.

ژمارەیەك لەو تورکە میسخیتیانە کۆچیان کرد بۆ تورکیا و، بەپێی هەندێ سەرچاوە، گوایە لە کوردستانی باکوور (تورکیا) جێگیر کراون.

لە کتێبی قەفقاس، ل٣١٤دا هاتووە، کە تورکە میسخیتیەکانی بەشداری شەڕی جیهانی دووهەم، قارەمانی کارو ڕووناکبیرانیان لە ئۆزبەکستان ساڵی ١٩٦٤ کۆمیتەیەکی کاتییان دروست کرد و داوای گەڕانەوەیان لە کاربەدەستانی سۆڤێت کرد بۆ کۆماری جۆرجیا. لەوەڵامدا پێیان وترا: بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەوانە (تورکە میسخیتیەکان) لە تاراوگەدا هەموو کارو خانووبەرەیان هەیە و گێرە و کێشەیان نییە، گەڕانەوەیان پێویست نییە یا نابێ بگەڕێنەوە. با وای دانێین واش بووە، بەڵام خۆ هیچ شوێنێکی تر نابێتە نیشتمان بۆ ئەوان و نیشتمان نیشتمانە، خۆ جوان و ئاوەدان و دەوڵەمەندیش نەبێ، ناگۆڕدرێتەوە.

ساڵی ١٩٨٦یش ژمارەیەکیان لە ئۆزبەکستان گەڕانەوە بۆ جۆرجیا. بەڵام نە خانوو نە کاریان پێ نەدرا و ناچار بوون بگەڕێنەوە بۆ ئۆزبەکستان و، بەشێکیان کۆچی کرد بۆ کراسنادار و ستاڤراپول و، لەوێش دوچاری تەنگ پێهەڵچنین و دەرکردن بوون و، پێیان وترا لەکوێوە هاتوون بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ و، ئەو شوێنەش کە لێوەی هاتبوون، هەروایان پێ وتبوون بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆتان. بەڵام نیشتمانیان داگیر کرابوو.... ئەمەیە ئازاری بێوڵاتیو بێکیانیو بێناسنامەییو بێئالایی. مانگی دووی ساڵی ٢٠٠٤ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ڕایگەیاند: دەهەزار کەس لەو تورکە میسخیتیانەی سۆڤێتی پێشوو وەك پەنابەر وەرگیراوە.

### ١١- چیچێنیەکان

بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩، لە یەکێتیی سۆڤێت ٩٥٦٨٧٩ چیچنی دەژین. زمانەکەیان سەر بە لەفیك لەناخ و ڤیناخی زمانەکانی قەفقاسە، کە جگە لە زمانی چیچنی، زمانی ئینگووشی و باتس بیش دەگرێتەوە. چیچانیەکان دو زاراوەی

چیایی و دەشتییان هەیە. تا سەد ساڵ لەمەوبەر وڵاتی چیچنی بە دارستان داپۆشرابوو، بەڵام ئەم دارستانە ئەمڕۆ لە شوێنە بەرزەکان و داوێنی چیاکاندا ماوە، موسڵمانی سونین و ئەم ئاینە لە سەدەی ١٦ەوە بووەتە ئاینێکی گشتی و ڕەسمییان.

١٩٣٤/١١/١٥، کۆماری ئۆتۆنۆمی هەرێمی چیچانی-ئینگوشی دامەزرێنرا و، لە ١٩٣٦/١٢/٥دا بووە کۆماری ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی ڕووسیای فیدراتیڤدا.

١٩٤٤/٣/٧ ئەم کۆمارە هەڵدەوشێندرایەوە و، تەواوی دانیشتوانی و هەروەها چیچانیی دەوروبەری ئەم کۆمارە بەزۆرەملێ دوورخرانەوە.

پەرلەمانی چیچنی-ئینگوشی بڕیاری لەسەر سەربەخۆیی ئەم کۆمارە دا.

لە ١٩٩٢/٣/٣١دا، بەپێی پەیمانێك لەنێوان دەوڵەتی ناوەندی ڕووسیا و کۆماری چیچنیدا، سنوور و دەسەڵاتی نێوانیان دیاری کرا. بەڵام نوێنەرانی چیچانیا ئەم پەیمانەیان مۆر نەکرد. گەرچی ڕووسیا ئەم کۆمارە بە کۆمارێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی ڕووسیای فیدراتیڤدا ناساند و، بە پێچەوانەی کۆمارەکانی ترەوە دەسەڵاتی زیاتری پێ دا.

چیچانیەکان، زۆربەی هەرە زۆریان گوازرانەوە بۆ کۆماری کازاخستان و قرقیزستان. پاش مەرگی ستالین، بڕیاری ئازادکردن و گەڕانەوە و دروستکردنەوەی قەوارەکەیان درا، بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە لای کاربەدەستانی نوێ و ناشەرعی و ناچیچانی، پێشنیار و هەوڵێکی زۆریان دا کە نەگەڕێنەوە، لەبەر ئەوەی گوایە ئێستا خەڵکی تر لە شوێنەکانیان دەژین و ڕازی نین بگەڕێنەوە و تووشی گێرە و کێشە و شەڕ دەبن و، پێشنیاریان کرد جۆرە ئۆتۆنۆمی یا بەڕێوەبەرایەتی یا ئۆتۆنۆمییەکی کولتوورییان لە کازاخستان و قرقیزستان بدرێتێ، کە چیچانیەکان دژی ڕادەوەستن و سوور بن لەسەر گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان. لەلایەکی ترەوە، دەسەڵاتداران و دانیشتوانی قرقیزستان و کازاخستان دژی ئەو چەشنە پێشنیارانە بوون کە قەوارەی تایبەتیان لەسەر خاکەکەیان بۆ دروست بکەن. مۆسکۆش لەگەڵ ئەوەدا بوو کە ئەوانە لە هەندەران بگەڕێنەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئەوە بەپێچەوانەی دەستوور و بڕیارەکانی پێشووی خۆیان بوو، نەیانوێرا بەرگری لە گەڕانەوەیان بکەن. وەك وترا، پاش

هەڵوەشانەوەی کۆماری چیچانی-ئینگووشی، نیشتمانەکەیان بەسەر چەند ناوچە و کۆماری تردا دابەش کرا و، خەڵکی تر نێردرانە جێیان و، دەست بەسەر هەموو شتێکیاندا گیرا. واتە هەم دەسەڵاتدارانی نوێ و هەم دانیشتوانی نوێ، واتە هاوردە، دژی گەڕانەوەیان بوون و، بیانووی زۆریش گیرا کە گوایە پارە و کەرەستە نییە بۆ گەڕانەوەیان، یا پارەی قەرەبووکردنەوەی زیانەکانیان و دروستکردنی خانووبەرە و قوتابخانە و..... نییە. لەلایەکی ترەوە، دەیانوت ناوچەکە بەرگەی هەڵگرتنی ئەو هەموو خەڵکەی ناگرێ و....

بەڵام ئەم وتە گێچەڵپێفرۆشە کۆڵی بە چیچنیو ئینگووشەکان نەدا و چۆکیان بە دەسەڵاتدارانی سەرەوە تا خوارەوە دادا و، هەموو پیلانەکانیان پووچەڵ کردەوە. لەلایەکی ترەوە، چیچنیو ئینگووشەکان لە کۆمارەکانی کازاخستان و قرقیزستان دژی پێکهێنانی ئۆتۆنۆمی یا ئیدارەیەك بوون لەسەر خاکی گەلانی تر و، پێیان لەسەر ئەوە داگرتبوو کە ئۆتۆنۆمی و ژیانیان لەسەر خاك و نیشتمانی باووباپیرانی خۆیان دەوێ و دەبێ دایبمەزرێنینەوە. وێڕای سوپاس و ئەمەکناسی بۆ گەلی میواندار و دەسەڵاتدارانی کازاخستان و قرقیزستان کە هەڵوێستی چیچنیو ئینگووشیەکان جێی ڕەزامەندی هەردوولای ئەو دوو کۆمارە بوو، گەڕانەوە. ئەوەش چیچنیو ئینگوشەکانی نەترساند لەوەی کە دەوڵەت پارە و کەرەستەی نییە بۆ گەڕانەوەیان و، جارێ دەبێ چاوەڕوان بن، یا لەوێ شوێن و خانووبەرە و ئیش‌وکاریان نابێ و، دەبێ هەرچۆنێك بێ بە پارە و بە کولەمەرگی خۆیان بگەیەننەوە نیشتمانەکەیان. مرۆڤ یا گەلێك بەبێ نیشتمان، ئەگەر لەناویش نەچێ، بەرە بەرە هەمووشتێکی خۆی لەدەست ئەدات. زمان و کولتوور و داب و نەریتو، بگرە ناوو نەتەوەکەیشی، دەتوێتەوەو، ڕێز و قەدری لەناو گەلانی تردا نابێو، دەکەوێتە بەر تانە و تەشەر و سووکایەتی و، تەنانەت تەنگ پێهەڵچنین و دەرکردن.

ئەی ئەگەر کوردەکانیش سوور بوونایە لەسەر گەڕانەوە و، سەربەخۆ دەستیان بە گەڕانەوە بکردایە و، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانییان بکردایە، بگەڕانایەتەوە و، لەوێ بەرامبەر بە بارەگاکانی پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەت و لەسەر جادە و

گۆڕەپان و هێڵە ئاسنینەکان ئۆردووگا و چادریان هەڵبدایە، چونکە بەپێی بڕیار و دەستوورەکانی حیزب و دەوڵەت و پەرلەمانی سۆڤیێتی، وەك گەلانی تر مافی گەڕانەوەیان هەبوو. دەسەڵاتدارانی ئازەربایجانی و ئەرمەنستان و جۆرجیاش وەك دەسەڵاتدارانی نوێی وڵاتی چیچنیو ئینگووشی با هەر دژایەتیسان بکردایە. ئایا کوردەکان ڕێکخەر و هاندەریان نەبوە، یا فریوی بەڵێنەکانیان خواردو چاوەڕێیان کرد ؟ بەڵام دوای چەند ساڵ هەست و هیواکانیان بەرە بەرە توانەوە، یا دەسەڵاتدارانی کریملن نەیاندەویست ئەوانە بگەڕێنەوە و درۆیان لەگەڵدا کردن. یان با وای دابنێین کوردەکان بۆ خۆیان هەوڵیان نەداوە یا بواریان پێ نەدراوە، ئەو پرسیارە دێتەپێش کە بۆچی دەسەڵاتدارانی مۆسکۆ خۆیان دەسپێشخەری گەڕانەوەیان نەبوون، خۆ بڕیار و دەستوور و یاساکانیان بۆ هەموان بووە ؟ تاوانەکەش دانی پێدانراوە و دەبێ بەکردەوە پاکانەی بۆ بکرێ، نەك هەر لەسەر کاغەز بمێنێتەوە. یاسا چ مانایەکی هەیە، ئەگەر بێتو جێبەجێ نەکرێ و بەرهەمی نەبێ یا هەستی پێ نەکرێ !

کۆماری چیچنی-ئینگووشی کە ١٩٤٤ کۆمارەکەیان هەڵوەشاندنەوە و بەسەر جۆرجیا (ئەستینی باکوور) و داغستان و ستاڤراپولدا دابەش کرا، واتە هەرکامیان بەشێکی ئەم وڵاتەیان بەرکەوتبوو و کۆمارەکەی خۆیان لەسەر حسابی گەلانی تر و خاکی تر پەرەپێدابوو، خەڵکی خۆیان واتە هاوردەیان تێدا جێگیر کردبوونو ئامادە نەبوون نە چیچنیو نە ئینگووشەکان بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان و بەشە بەزۆر لکێندراوەکەی وڵاتەکەشیان بدەنەوە بە خاوەنەکانیان، بەتایبەت دەسەڵاتدارانی ئەستینی باکوور کە تائێستاش هەندێ ناوچەیان نەگەڕاندووەتەوە بۆ ئینگووشی و چیچانیەکان.

کاتێك لە ئەرشیڤ بەدوای بەڵگە و دیکومێنتی تایبەت بە کورددا دەگەڕام، ڕاپۆرتێکی یەکجار زۆرم لەسەر ئەو گەلە بەزۆر دوورخراوانە دی، هەروەها لەسەر دیلە ئەڵمانیەکانی سەردەمی شەڕی جیهانی دووهەم کە چۆن و لەکوێ دژوارترین کاریان پێ کردوون، وەك کاری ئیجباری و ڕێگەوبان و خانووبەرە دروستکردن.

هەندێکیان هەر لەوێ لەسەر ئیش مردوون، یا خۆیان کوشتوەو هەر لەوێ ناشتوویانن. هەروەها هەندێ بەڵگە باسی کەسایەتیە کۆمەڵایەتی و ئاینیەکانی چیچنیو ئینگووشی و گەلانی تر دەکەن، چییان وتووە و لەکوێ و لەگەڵ کێ قسەیان کردووە و دژی سۆڤێت و ستالین و حیزب و دەوڵەت ناڕەزاییان دەربڕیوە، بەشدارییان لە جەژنەکان و ڕێوڕەسمەکانی سۆڤێتدا نەکردووە، یا لە هەڵبژاردنەکاندا بەشدارییان نەبوە یا دەنگیان بەو نوێنەرانە نەداوە کە ڕژێمی سۆڤێتی پاڵاوتوویانن و، ڕەخنەیان گرتووە کە دەبێ لە نەتەوەکەی خۆیان بێ. باسی بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی ئوسووڵی و نوێژکردن و بەجێهێنانی داب و نەریتی خۆیان نەك سۆڤێتیان کردووە. لەسەر ئەمە بانگ کراون و خرونەتە زیندان و ... هتد. نەدەکرا وێنە یا کۆپییان هەڵگرم، چونکە یەکجار زۆر و دڵتەزێن بوون. لەوێ هەستم بەبێ بەزەیی مرۆڤەکان کرد، بەوەی کە ڕژێم بە چەشنێك پەروەردەی کردوون تەنیا بۆ ئازاردان و کوشتن و سیخوڕیکردن بشێن. هەستم بە هێندێ تاوان کرد کە لە ڕابوردوووداو لە ژیانمدا نەمبیستبوون. هەستم کرد هەرچی لەسەر ئەم ڕژێمە بڵێین و بنووسین هێشتا کەمە.

لە ئەرشیڤ ژمارەی لێکۆڵەرانی ئەڵمانی لە تەواوی سەرجەمی لێکۆڵەرانی تر زیاتر بوون و، زۆربەشیان لەوانە بوون کە بەپەلە فێری زمانی ڕووسی ببوون و، دەورەیەکی کورتیان بینیبوو، یا خەڵکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوون و، دەوڵەتی ئەڵمانیا پارەیەکی زۆری بۆ ئەم لێکۆڵەرانە تەرخان کردبوو. ئەوانە بەڵگەکانیان کۆپی دەکردو بە کۆمپیوتەر دەیاننووسییەوەو، ساڵ بەساڵ ژمارەیان زیاد دەبوو. لەماوەی چەند ساڵی کارکردنمدا، کوردێکم لە هیچ ئەرشڤێك نەدیت. ئەرشیڤەکانی سۆڤێتی پێشوو (ڕووسیای ئەمڕۆ) زۆر دەوڵەمەندن و، زۆر جاریش بۆ ئەم مەبەستە نامەو پێشنیارم خستوەتە بەردەم هەندێ کوردو پارتە کوردیەکان.

پاشان کۆمەڵە ڕێپۆرتاژێکی تەلەفزیۆنیی ڕووسیم لەسەر ئەو بینا گەورەو ڕێگە دوورو درێژو تونێل و پڕۆژەی نهێنیی تر بینیوە کە بەدەستی ئەو دیل و گەلە تاوانبارکراو و مرۆڤە سیاسیو ڕووناکبیرە ناڕازیانە لە ڕژێمی سۆڤێتی

سازکرابوون. به بینینی بەڵگەکان و فیلم و چەند بینای گەورە لە مۆسکۆ کە بە دەستی دیلەکان دروست کراون، تاوانەکانم لەلا زیندوو دەبوونەوەو، هەستێکی پڕ لە ناسۆرم لەلا دروست دەبوو.

## ١٢ـ ئێرانیەکان و نەتەوەکانی تر

ئێرانیە پەنابەرەکانی ناوچەی قەفقاس‌و ئاسیای ناوەڕاست و شوێنەکانی تر، لە ریزی ئەو گەلانەدا بوون کە بەزۆر دوورخرانەوە. ئەوانە سەر بە نەتەوەکانی ئێرانن و، ژمارەیەکی زۆریش کوردیان لەناودا ماوە؛ هەروەها بەشدارانی شۆڕشی جەنگەڵ (کۆماری گیلان لە باکووری ئێران)یش کە دوای هەرەس پێهێنانی جووڵانەوەکەیان ئاوارە و پەنابەری سۆڤێت بوون‌و، بەشدارانی شۆڕشەکانی کورد لە خۆراسان، واتە خدو (خودایار)خان و سەرداری جەنگ و لەهاکخانی باوەند (کە بەجیا لەسەرم نووسیون و بڕیارە گۆڤاری "هاوار" لە ئەڵمانیا ئەم بابەتە بڵاوبکاتەوە). ژمارەیەکیش لەوانە سەر بە پارتی عەدالەت (پارتی کۆمۆنیستی ئێران کە پاشان بووە توودە، بوون‌و، لەگەڵ چەند کرێکارێکی ئێرانیدا کە بۆ کار چوونەتە سۆڤێت‌و، هەندێکیان کادیری حیزبییان بۆ شۆڕشی سۆسیالیستی لێ پێگەیەنراوە و ماونەتەوە، تەنانەت هەندێ کادری حیزبی عەدالەت (کۆمۆنیستی ئێران) کە لە ئێران بە نهێنی چالاکی دەکەن و ئاشکرا دەبن و بۆ سۆڤێت ڕادەکەن، لەوێن.

بەکورتی، ئەو ئێرانیە چارەڕەشانە لە چەند قۆناغی جیاوازدا هاتوونەتە سۆڤێت و، زۆربەیان پاش هەرەس پێهێنانی شۆڕشی گیلان هاتوون و، سەرەتا لە ئازەربایجان بوون و، هەندێکیان خەریکی خوێندن و کارکردن بوون.

ژمارەیەک لەو ئێرانیانە چ ئەندام و لایەنگری پارتی عەدالەت و چ بەشدارانی شۆڕشەکانی خۆراسان کە ڕەخنە لە سیاسەتی تاوانباری ستالین دەگرن سەبارەت بە کۆتاییهێنان بەو شۆڕشانە، چونکە (ڕژێمی سۆڤێتی لەگەڵ کاربەدەستانی ئێراندا پێک هاتوون و پشتی شۆڕشەکانیان بەرداوە)، پێش گواستنەوەیان زیندانی کراون و دوور خراونەتەوەو، هەندێکیان کوژراون یا خۆیان کوشتووە. لەکاتی شەڕی جیهانی

دووهەمیشدا، ڕژێمی ستالین هەلێکی لەباری بۆ هەڵکەوت تا زۆربەی ئێرانیەکان بگوازێتەوە، ئەویش هەر بەتاوانی ئێرانیبوون و گوایە ئێران (ئێرانی ڕەزاشا کە لایان بردبوو و، دوورخرابووەوەو، کوڕەکەیان لەجێی ئەو دانابوو. ئێرانیش لەلایەن هێزەکانی سۆڤێت و بریتانیاوە داگیرکرابوو) هاوهەستی ئەڵمانیایەو، لەوانەیە ئەو ئێرانیانە سیخوڕی بکەن و هتد. لەلایەکی ترەوە ئەم ئێرانیانە بەلای خۆیەوە پەروەردەی قوتابخانەی خۆیان بوون، سیاسیو ڕووناکبیرو بەرهەڵستکاری ڕژێمی شای ئێران بوون و، ئەوانە زۆربەیان بە هۆی سیاسیو ئابوورییەوە لە دەستی ڕژێمی شا هەڵاتبوون و، تەنانەت زۆربەشیان پاسپۆرتی سۆڤێتیان وەرگرتبوو و، بووبوونە هاووڵاتی سۆڤێتی. بریندارو زیندانیکراوی ڕژێمی پاشایەتییان لەناودا هەبوو. جگە لەوە، بە دەست پێکردنی شەڕی جیهانی دووهەم، ژمارەیەکی زۆریان چوونە بەرەکانی شەڕی دژی فاشیزمو کوژراوو بریندارکیان هەبوو و، میدال و نیشانەی قارەمانیەتییان وەرگرت.

لێکۆڵینەوە لە چارەنووسی ئێرانیە بەزۆر ڕاگوێزراوەکان، پێویستی بە کات و وردبوونەوەو ماندووبوون هەیە. تراژیدیای ئەو ئێرانیانە دیمەنێکی تری نامرۆڤانەو بێڕەحمی ڕژێمەکەی ستالین نیشان ئەدا. کاتێك لە ئەرشیڤی کۆمینتێرن خەریکی لێکۆڵینەوە بووم، نەوەی یەکێك لەو ئێرانیانەم بینی کە هاتبوو زانیاری لەسەر باپیری کۆبکاتەوە. بەداخەوە ئەودەمە منیش سەرقاڵی بابەتێکیتر بووم و، نەمتوانی بەگوێرەی پێویست زانیاریی بدەمێ و، پێیان گوتبوو دەبێ ئەو بابەتە لە ئەرشیڤی ك. گ.ب. (KGB) بەدوایدا بگەڕێی. پاشان کە بینیمەوە، گوتی بواریان نەدامێ بچمە ناو ئەو ئەرشیڤە. دووسێ کەسی ترم بینی ڕووس و یەکێکی ئێرانی کە پەنابەری فەڕانسا یا ئەمەریکا بوون، ئەوانیش بەدوای زانیاریدا بۆ بابەتی پەیوەندیەکانی دەوڵەتی سۆڤێت هەم لەگەڵ ڕژێمەکانی ئێران و هەم لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئێراندا دەگەڕان.

زۆری پێنەچوو کاتێك بۆ بەڵگەو دیکومێنت لەسەر کۆماری مەهاباد دەگەڕام، بابەتی باشم لەسەر کۆماری گیلان و شۆڕشەکانی کوردی خۆراسان و حیزبی توودە دەست کەوت. کە ئەویش وەك کۆمەڵە گوتارێك ناردوومە تا بڵاوببێتەوە.

لە سەرژمێری گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوەکاندا، لە زۆر ڕاپۆرتدا ناوی "گەلانی تر" یا "هتد، میتر" هاتووە، کە ژمارەیان زۆرەو ئەمانە سەر بە گەل و نەتەوەو ئاین و بیروڕای جیاوازن. لەناو ئەوانیشدا بێگومان کورد هەیە و دەبێ لە ئەرشیڤی ئەو کۆمارانەدا کە جێگیر دەکرێن بەدوایاندا بگەڕێین، چونکە هێشتا لیستی ناوی ئەم گەلانەیان لە مۆسکۆ ئاشکرا نەکردووە و، ناهێڵن دەستیان پێ ڕابگات. واتە ناوی تەواوی ئەو گەلانە لە کام گوندو شارو شارۆچکەو کۆمارەوە هاتوون یا نێردراون و لە کام ئۆردوگا جێگیر کراون.

جگە لەوە، زۆر کورد لە ترسان تەنانەت لە ئاوارەبوونیاندا خۆیان بە جۆرجیو ئەرمەنیو ئازەری لەقەڵەم داوە، بەڵکوو لە داهاتوودا بگەڕێنەوە بۆ ئەو کۆمارانە. نامەوێ جارێ لەسەر ژمارەی گشتیی کوردی سۆڤیێت دەست پێشخەری بکەم و بێبەڵگە بڵێم ژمارەیان ئەوەندەیە، چونکە کەس تائێستا نازانێ چەندن. بەڵام شکم لەوەدا نییە کە کوردی سۆڤیێت پێنج تا شەش ئەوەندەی ئەو سەرژمێرییە درۆزنانەیە کە دواین جار پێش ڕووخانی سۆڤیێت کردوویانە. سەرژمێریەکانی سۆڤیێت بۆ خۆیان ئەو ڕاستیە دەرئەخەن. لەلایەکی ترەوە، ئەو گەلانەی کە لەگەڵ کورددا بەزۆر ڕاگوێزران و، پاشان بواریان بۆ هەڵکەوت و قەوارەی خۆیان دامەزراندەوە، کاتێك سەرژمێری گەلەکەی خۆیان دەکەن، چەند ساڵ (دوای ڕووخانی سۆڤیێت) چەند ئەوەندە زیادیان کردووە.

# لێکۆڵینەوەو کتێب
# دەربارەی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو

**١- کتێبی (ئەمە ئاوابوو):**

نووسەرەکەی خاتوو سڤیتلانا عەلییڤایە کە باوکی قەرچایڤ و دایکی ڕووسە، ساڵی ١٩٩٣ ئەم کتێبە بەنرخەی کە لە سێ بەرگ پێ کهاتووە، بڵاوکردوەتەوە. سەرجەمی سێ بەرگەکە هەزارو بیست لاپەڕەیەو لە مۆسکۆ لەلایەن فۆندی کولتووری نێونەتەوەیی ڕووسیاوە لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (ئینسان)ـەوە بڵاوکراوەتەوە. گەرچی کتێبەکە دوو ساڵ بەر لە چاپکردنی، واتە بەر لە ڕووخانی سۆڤێت، چاپ و بڵاو کراوەتەوە (تیراژی یەکەمی کتێبەکە پەنجاهەزار دانەیە).

هەروەك نووسەر بۆ خۆی دەنووسێ: ئەم کتێبە یەکەمجارە بە یارمەتی بەڵگەو سەرچاوە سەرژمێرییەکان، فاکتە مێژووییەکان، بیرەوەریو بۆچوونەکانی خۆم و بڵاوکراوەکانی تر بڵاو دەبێتەوەو، دیمەنێکی تابلۆی سیاسەتی نەتەوەیی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوی یەکێتیی سۆڤێتە. خوێنەر بە یارمەتی ئەم کتێبە بواری تێگەیشتن یا دەربڕینی بۆچوونی خۆی لەسەر سیاسەت و کێشەی نەتەوەیی لە یەکێتیی سۆڤێت و، هەروەها هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە "سزادانی" ئەو گەلانە لەلایەن ستالینەوە دەربڕێ و، ئەم سیاسەتە تاوانبارانەیەی ستالین تێدەگات.

بەشێکی ئەم کتێبە بەنرخە تەرخان کراوە بۆ کوردەکانی سۆڤێت و، تراژیدیای ئەم گەلە. جگە لەوەش، لە زۆر جێگای کتێبەیدا کورد وەبیردێنێتەوە. وێڕای سوپاس و پێزانین و ڕێز لەم خانمە دڵسۆزو ئازایە، بەشێك لەو بیرەوەریانەی کە نووسەر خۆی کۆی کردوونەتەوەو، خاتوو سڤیتلانا یەکەم کەسە لەناو کوردناس و نووسەری سۆڤێتیدا (چ کورد و چ غەیرە کورد) دەستی داوەتە ئەم ئەرکە پیرۆزە، ڕێچکەی شکاندو، پاشانیش هەندێ دڵسۆزی تر لەم بارەوە شتیان بڵاوکردەوە.

پێش ئەوەی کتێبی ناوبراو بڵاوبێتەوەو، بزانم خاتوو سڤێتلانا کارێکی وای بەدەستەوەیە، لە ئەرشیڤەکان بینیبووم. پاشانیش کە بەڵگەو دیکومێنتی ئەرشیڤەکانم بینی لە هەندێکیاندا ناوی خاتوو عەلییڤا.س پێوە بوو، من زیاتر بەدوای بەڵگە لەسەر کوردی بەشەکانی تری کوردستانی داگیرکراو بەتایبەت بۆ نامەی دوکتۆراکەم لەسەر کۆماری مەهاباد ئەگەڕام. بڕیارم دا ئەوی پەیوەندیی بە کوردی هەر پارچەیەکی کوردستانەوە بێ، کۆیبکەمەوەو، تا ئەو جێگەیەش کە توانیم کۆم کردنەوە لەسەر کوردی خۆراسان و سۆڤێت و شۆڕشەکانی کورد لە سەدەی بیستەم و.... هێشتا ترس و گومانەکان نەشکابوون، بەتایبەت لەنێوان کەسانێکدا کە یەکتر نەناسن و نەوێرن بەوردی لە مەبەست و لێکۆڵینەوەی یەکتر تێبگەن بۆ پشکنینی ئەرشیڤەکان و گەڕان بەدوای بەڵگە و دیکومێنتە نهێنیەکاندا و پەردەلادان لەسەر تاوانەکانی دەسەڵاتی سۆڤێتی، بۆ ئەوەی ئاڵوگۆڕی زانیاری یا لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەش بکرێ و لێکۆڵینەوەکان فراوانترو دەوڵەمەندتر بن.

دیارە وەك لە کتێبەکەی خاتو سڤێتلانادا هاتووە، نووسەر مەبەستی تایبەتی لێکۆڵینەوەیە لەسەر گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوی سەردەمی سۆڤێتی. بۆیە بڕیارم دا لەم کتێبەو ئەوانی تردا لەگەڵ هەندێ بەڵگەو دیکومێنتی نوێو بۆچوونی خۆمدا پێکەوە وەریان بگێڕمە سەر زمانی کوردی و بیخەمە بەرچاوی خوێنەرانی کورد، بەو هیوایە ئەم لێکۆڵینەوەیە پەرەی پێ بدرێ و دەوڵەمەند بکرێ. دەستکورتی لەرووی ماددییەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە بە زمانی ڕووسی کە زۆر پێویست بوو و، هەروەها سەفەرکردن بۆ ئەو شوێنانەی کە کوردەکانیان لێ دوورخستوونەتەوەو بۆ ئەو شوێنانەش کە تێیدا جێگیریان کردوون، هەر پێویستیان بە تواناو پشتگیریی ماددی هەبوو، کە بەداخەوە هیچ کەس و لایەنێك ئامادەی ئەوە نەبوو یارمەتی بدات و، تەنانەت هەندێکیشیان لە ترساندا گوێی خۆیان کەڕکرد و..... سڤێتلانا عەلییڤا لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا، ل٣١٨ لەژێر سەردێڕی "بۆنی میلیکەکان" (وەنەوشەکان)" بەجیا بیرەوەریەکی خۆی دەنووسێ:

باسی ئەو گوڵە میلیکانە دەکات کە هەر لە منالییەوە خۆشی ویستوون و، بە جوانی و بۆنیان ڕاهاتووەو، گوایا هەر لە نیشتمانەکەی لە قەفقاس دەڕوێن. لە قەفقاس، هێشتا منال دەبێ و لەگەڵ دایك و باوكیدا دووریان دەخەنەوە. باسی چیرۆکەکان و گێڕانەوەکانی باوکی دەکات کە لەوێو لە هەندەران بۆی هۆنیوەنەتەوەو لەبیری ماون و بە ئاواتە بگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی و بیرەوەری منالێو چیرۆك و گێڕانەوەکانی باوکی نوێ بکاتەوە. هەمووی لە دڵ و دەروونیدا پاراستووە و هیوای گەڕانەوە لە مێشك و خەونەکانیدا خولاوەتەوە. دەڵێ ئەم بیرو هیوایانە جێیان نەدەهێشتم، ئاخر ئەوێ بۆ من جوانترین شوێن و هیچ وڵاتێکی تر وەك ئەوێ جوانتر نەبوو. وابزانم گوڵ و کانی و ڕووبارە سەرکەشەکانی لە هیچ شوێنێکی تردا نین. ئەو وەنەوشە بۆن خۆشەی کە هەر لە سەرەتای بەهاردا سەردەردێنێ. بەتەما بووم چەپکێك دیاری بۆ خۆشەویستەکەم بچنم. ئێمەیان لە نیشتمان دوورخستەوە بۆ شوێنێکی ترو وڵاتێکیتر، کە هیچی لە وڵاتەکەی من نەدەچوو. لەوێ ئێمە بە گەلێکی تاوانبارو خراپ ناسێندراین و بە چاوێکیتر تەماشایان دەکردین. باوکم کە ئەو دەمە ٣٣ساڵ تەمەنی بوو، فرمێسکەکانیی لە ئێمە دەشاردەوە. ئێمە قەرەچایڤ بووین و، گوایە گەلێکی ئەوتۆ و گەلانی تریش ئەوانەی وەك ئێمە دوورخرابوونەوە لە سروشتدا نەبوون و نین.

باوکم قەرەچایڤەو بە تاوانبار لەقەڵەم درابوو، دایکم ڕووس ئەویش هەر بەو تاوانە. کە ژنی قەرەچاییڤێکی مامەکانی کە مێجەرو عەریف (استوار) بوون و لە بەرەکانی شەڕدا بریندار ببوون، وتی: باوکم مامە کایسین قولییێف ئەوانیش لە بەرەکانی شەڕدا شەڕیان کردبوو و، هەندێکیان بێ پلەو میداڵ و نیشانە بوون و، وەك تاوانبار دوورخرابوونەوە بۆ فرونزە، من دەمزانی ئەوانەو منی بچووکیش تاوانبار نین و، لە قەفقاسیان دابڕیوین.

لەبیرم دێ چۆن دایکم و هاوسێکانمان بەڕێ کران بۆ بەرەکانی شەڕو پاشانیش چۆن کۆیان کردینەوەو ڕایان گواستین. لەوێ، جگە لە ئێمە، خەڵکی تریان هێنابوو. من لەگەڵ منداڵەکانیان یاریم دەکرد. پاشان کە چوومە قوتابخانە،

منیان بە منداڵە تاوانبارەکان ناساندبوو، مناڵەکانی هاوپۆلم نازانم لەکێیان بیستبوو، لێم دوورەپەرێز دەوەستاند، بە چاوێکی تر سەیریان دەکردم، تانەو تەشەرو سووکایەتیم پێ دەکراو، گەلێك جار دڵمیان بریندار دەکرد.

... ساڵی ۱۹۵۱ وەك لە یەکێتیی سۆڤێت باو بوو، لە قوتابخانەکان خەڵکیان دەکرد بە کەمسەمۆل.

... ساڵی ۱۹۵۲ پۆلیس هاتبوە ماڵەوەمان و سەرئەنجام منیان لەگەڵ خۆیاندا برد. دایکیشم لەگەڵم هات ... لەوێ فۆرمێکیان خسە بەردەستم و داوایان لێ کردم ئیمزای بکەم. ئەمە بەڵگەی تاوانباری گەلی قەرەچاییڤ بوو کە لەلایەن ستالین و مۆلەتۆڤەوە پەسند کرابوو. منیش خوێندمەوەو خستمەوە بەردەمی پۆلیسەکە. وتی : ئیمزای بکە، وتم نایکەم، من خیانەتم بە کەس نەکردووە. پۆلیس فۆرمەکەی خستەوە بەردەستم، وتم نا و دیسانەوە خستمەوە بەردەمیو، بە هێمنی بۆم ڕوون کردەوەو، وتم : ئێوە دەزانن ئەم شتە فڕی بەسەر ڕاستیەوە نییە. چۆن من دەتوانم خیانەت بکەم و نیشتمانم بفرۆشم بە فاشیستەکان، ئەویش لەکاتێکدا کە من لەوێ لە نیشتمان نەبووم، کاتێك فاشیستەکان ئەوێیان داگیر کرد. ئەگەر لەوێش بوومایە کاتێك نالچیك (پایتەختی ئینگووشەکان)یان گرت، من تەمەنم چوار ساڵ بووە، کەیو چۆن بەو تەمەنەوە دەتوانم خیانەت بکەم.

وتی: ئەبێ ئیمزای بکەی، دەبێ..

وتم: ئیمزای ناکەم، من کەمسەمۆڵم و....

یەکێکی تر هات و، هەڕەشەی لێ کردم ئیمزای بکەم و نەمکرد. منی بەسەر مێزەکەدا ڕاکێشاو جنێوی زۆری پێدام. یەکەمجار بوو جنێوی وا ببیستم. قەڵەمی دامێو قیڕاندی بەسەرماو، وتی : لەم ژووره دەرناچی تا ئیمزای نەکەی. ڕۆیشتە دەرێو دەرگاکەی بە کلیل لەسەرم داخست. هەرچۆنێك بێ لە پەنجەرەی ژوورەکەوە ڕامکردو چوومەوە ماڵێ.

مانگی دوو بوو، تەمەنم چواردەساڵ بو.و سەرەنجام دایکم، لەبەر من و خۆیو باوکم، وابزانم ئەو بەڵگە دەستکردە تاوانبارکەرەی لەباتی من ئیمزا کردبوو.

دەبوو هەموو ڕۆژێکیش بچم و خۆم پیشان بدەم و ئیمزا بکەم. بەڵام دایکم دەچوو، لەبەرئەوەی من هێشتا لە باری یاسایی‌یەوە گەورە نەبووم و، دەکرا دایکم لەباتی من ئیمزای بکات. پاشان دایکم نامەی بۆ یوسیف ویسارۆڤیچ ستالین دەنووسیٚ کە ئەو وەك ئافرەتێکی ڕووس لەگەڵ قەرەچاییڤ و بالکارو ئینگووشیو چیچانیەکان بەزۆر ڕاگوێزراوە، داوای لە ستالین کردبوو لەم کێشەیە بکۆڵێتەوە.

وەڵامەکەی پایز هاتەوەو، دایکمیان بانگ کردە پۆلیسخانەو وەزارەتی ناوخۆ. پێیان وتبوو : ژنی کابرایەکی قەرەچاییڤی‌یە، واتە ژنی "عەلییێڤ"ی باوکم، ئەگەر بێتوو (لێی جیابێتەوەو تەلاق وەربگریٚ، ئێمە لە لیستی ڕاگوێزراوی تایبەت لای دەبەین (بەدوو منداڵەوە)و دەتوانیٚ منداڵەکانیش لەگەڵ خۆی بەریٚ.

پاش دایکم، منیان بانگ کردو پێیان گوتم: دەبیٚ پاش دوو ساڵی تر پاسپۆرت وەربگرم. ئەگەر بێتوو خۆم لەسەر نەتەوەی باوکم بنووسم، پێم نادریٚ و، وەك ڕاگوێزراوی تایبەت لەویٚ دەمێنمەوە. ئەگەر خۆم لەسەر نەتەوەی دایکیشم (ڕووس) بنووسم، پێم ئەدریٚ و ئازادم بۆ هەرکویٚ بڕۆم و، دەتوانم بۆ خوێندن بچمە مۆسکۆ.

ژنەکە، ئەو شتانەی پیٚ گوتم و، پاشان بەبیٚ ئەوەی ئەوان دەیانویست بینووسم، کاغەزیان دامیٚ و بەزۆر پێیان نووسیم. باش تێکستەکەم لەبیر نییە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی ئەمەبوو: بە لەبەرچاوگرتن و پیٚزانینی تاوانی گەلی قەرەچاییڤ بەرامبەر بە نیشتمان و هاوڕیٚ ستالین، من حاشا لەم گەلە تاوانبارە دەکەم (واتە لە باوکم و لە گەلەکەم) و داوا دەکەم نەتەوەی من لە پاسپۆرتەکەدا بە ڕووس بنووسن. نازانم ئەم بەڵگانە تاکەی ئاشکرا ناکرێن و هەڵیان دەگرن، نازانم ئەم دەستنووسەی سەردەمی منداڵیم کە لە نووسیندا ماندوو نەدەبووم هەر ماوە و، تێیدا من حاشام لە باوکی خۆشەویستم و گەلەکەی کردووە—ئەمە نەنگ و عارییەکی هەتاهەتاییە بۆم، شەرمەزارییەکە لەبیر ناچیٚو جێم ناهێڵیٚ. براکەم بەختی هەبوو، دوو ساڵ دوای من لەدایك بووەو، پاش چوار ساڵ پاسپۆرت وەردەگریٚ.

تەمەنم پانزەساڵ بوو، زۆر حەزم دەکرد لەگەڵ کچە هاوپۆلەکانمدا لە یەکەم پەژارە و هیوا و شادیی کچانەدا پێکەوە بین، بەڵام .... لەم ماوەیەدا بیستم

سۆنیا کە کچێکی قسەخۆشی قەرەچاییڤی و قوتابیی پەیمانگە بوو، بە ئیجازە دەچێتە قەفقاس و، لەوێ دەیگرن و ٢٥ساڵ زیندانی بۆ دەبڕنەوە.

بەهار، بە ڕۆژانێکی خۆش و سروشتی پاك و جوانەوە، لە یەکی مارتەوە لە فرونزە (پایتەختی قرقیزستان) دەست پێدەکات و ، ئەم ڕۆژانە چاوەڕێی تراژیدیاو کارەسات ناکەن، بەڵام کتوپڕ ڕادیۆ ڕایگەیاند:

هاوڕێ ستالین کتوپڕ نەخۆش کەوتووە. کەس باوەڕی نەدەکرد، لەبەرئەوەی ئەو بە نەمر لەقەڵەم درابوو. لە بەیانیەوە تا ئێوارە هەر ئەم شتانەیان پێدەوتین، ئێمە لەم بارەیەوە گۆرانیو سروودمان دەگوتەوە. ئێمە بەناوی ئەوەوە سوێندمان دەخواردو دەچووین بۆ بەرەکانی شەڕ، بەڵام کتوپڕ ستالین نەخۆش کەوت. چۆن ستالینیش وەك هەموو مرۆڤەکان نەخۆش دەکەوێ و سەرمای دەبێ ؟

ئەم لاوازیانە لەگەڵ ناوی هاوڕێ ستالین ناگونجێ.

هاوڕێ ستالین ٥ی مارتی ١٩٥٣ کۆچی دوایی کرد، هەموان بۆ ستالین گریان و، منیش لەگەڵیان دەگریام. لە ئێمەی قوتابیانی کچ، کێشکچی شەوو ڕۆژیان لەلای پەیکەرەکەی هاوڕێ ستالین ڕێك خست و، پۆلێکی دووروودرێژ، خەڵك هەر گوڵی بەدەستەوە بوو، دەهات لەبەردەم پەیکەری هاوڕێ سالین دایاندەنا و بە نیشانەی ڕێزگرتن و سوپاس لە باوکی گەلان، ئەم خەڵکە بە گوڵ و گریانەوە بە دەوری پەیکەرەکەدا دەسووڕانەوە. ئەو ناوە، پڕ لە گوڵ و تاجەگوڵینە کرابوو. پاشان ئەم خەڵکە، وابزانم تەواوی شاریش، لە گۆڕەپانی ناوەندی شاری فرونز بەرامبەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری قرقیزستان کۆبوونەوەو، دەگریان و شیوەنیان دەکرد. منیش لەگڵ ئەو خەڵکە بووم. خەڵکەکە لە یەك هەستدا، واتە لە مردنی ستالین، یەکی گرتبوو.

کە لە کێشکچیەتی ڕزگارم بوو، لەکاتێکا چاوەکانم تەڕبوو و، بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە، لەناکاو گوێم لە ژنێك بوو دەگریا و ڕووی لە پەیکەرەکەی ستالین بوو: ((میهرەبان، تۆ کەسوکارمانی، یوسیف ویساروڤیچ ئیتر ئێمە بێ تۆ چۆن بژین، کێ پێمان بڵێ چۆن بژین و چی بکەین ؟ دەنگی بەرزی پیاوێك هات

وتەکانی ئەو ژنەی بڕی، کە تەماشام کرد پیاوێکی خومارو لاواز کە پاڵتۆیەکی کۆن و کڵاوێکی بەسەرەوەیە، بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت: ستالین نییە حیزب هەیە، سەرم سوڕماو، هەست ئەکەم سەری خەڵکیش سوڕماوە. پیاوەکانی دەوروبەری ئەو پیاوە بەرەبەرە خۆیان دەکێشایەوەو بەبێ ئەوەی یەکێکیان شتێك بڵێ هەموویان دەوروپشتی کابرایان چۆڵ کرد و بەملاو بەولادا بڵاوەیان لێ کرد. ئەم وتانەی کابرا منی سەرەوخوار کردەوە، زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە وتی ستالین یەکێکەو یەك کەس مردووە، بەڵام حیزب ماوەتەوە.

لە ڕادیۆ گوێمان لە پەیمانی مالینکۆڤ گرت، کە وتەکانی وەك هاوڕێ ستالینی جاران بوو، بەڵام ناوەکانیان گۆڕابوو...

لە قەفقاس وەنەوشەیەك دەڕوێ بۆنی شتێکی ترە. ئەو نیشتمانەی کە وەنەوشەکانی لێ دەڕوێن لە منالییەوە لێیان سەندووم... مۆسکۆ ١٩٨٨.

.... دوای دالنی ڤۆستۆك (واتە ڕاگواستنی کۆریەکانی ئەو ناوچەیە لە ١٩٣٧دا-هەورامی) نۆرەی پاککردنەوەی قەفقاس هات. ئەم هەرێمە جوان و پڕ بەرەکەتە، دەبوایە لەوانەی کە "سەربار" یا "زیادە"ن و پێویست نین، پاك بکرێنەوە. ئەوەبوو کە لە کوردەکانەوە دەستیان پێکردو، سەرەتا ئۆتۆنۆمی‌ی کوردەکانیان هەڵوەشاندەوەو لەناوبرد. ئەمڕۆ ئیتر بەتەواوی ئەوە لەبیرکراوە کە کوردەکان لە هیچ شوێنێکەوە نەهاتوونەتە ناو خاکی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و جۆرجیا (گورجستان). کاتێك بەپێی پەیمانی ئاشتی تورکمانیان کە لەلایەن ڕووسیا و تورکیاوە بە هەوڵدانی گەریبایەدیڤ.ئا-گ بەسترا و پاشانیش سنوورەکان لەنێوان ڕووسیاو تورکیادا دیاری کران، بەشێکی کوردستانی دێرین و تورکیا بکەوێتە چوارچێوەی ئیمپڕاتۆریەتی ڕووسیاوە. نە کوردەکان و نە تورکە میسخیتینیەکان لەسەر خاکی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و جۆرجیا، ئەم سێ کۆمارە سۆڤیّتیەی قەفقاس، نەژیاون. بەشێك لە خاکی کوردستانی دێرین و پاشان تورکیایان داگیر کردو ساڵی ١٩٣٧ و ١٩٤٤ کوردو تورکەکان کە ئامادەی تواندنەوە نەبوون، دەرکران[٩٣] .

---

[٩٣] هـ.س، بەرگی ١، ل١٢.

ڕاگوێزانی کوردو تورکەکان بەزۆریو بە تاوانبارکردنیان و، بە شێوەیەکی نامرۆڤانەو بە دەستووری ڕەسمیی دەسەڵاتدارانی باڵای سۆڤێتی بەڕێوە چوو، بەبێ ئەوەی خەڵکەکە ئاگادار بکەنەوەو، بەبێ ئەوەی هەتا ئێستاش ڕوونی بکەنەوە لەبەرچی.

... کۆرياييەکان و کورد و ئەڵمان و قەرەچاییڤ و کالمیك و چیچنی و ئینگووشی و بالکار و تاتارەکانی کریم و یۆنانی و میسخیتینەکان و خیمشینەکان، کەوتنە بەر شاڵاوی تەنگ پێهەڵچنین و تواندنەوە، ئەویش بە شێوەیەکی سیستماتیك. واتە ئاخاڤتن و خوێندن بە زمانی زگماکی خۆیان لێ یاساغ کرا و، جگە لەوە، گۆرانیوتن و هەڵپەرکێ بە مۆسیقای خۆیان و لەبەرکردنی جلوبەرگی نەتەوەیی خۆیان و....لێ یاساغ کرا. وەرگرتنی پاسپۆرت بۆ منداڵەکانیان شتێکی پێویستی بژێوی بوو، بۆ ئەوەی بمێنن و بتوانن کاربکەن و داهاتووی منداڵەکانیان دابین ببێ و بخوێنن نانسیۆنالیستەیتی (نەتەوە)ی خۆیان بگۆڕن. ئەنجامی ئەم کردەوە نامرۆڤانەیە، بۆ دەسەڵاتداران و دانەرانی ئەم سیاسەتە بەرهەمدار بوو. ژمارەی ئەم گەلانە لە سەرژمێرییەکاندا کەم دەبووەوە و .... [٩٤]

بە هاتنە سەرکاری گەرباچۆڤ لە ١٩٨٥داو گۆڕینی کەشوهەوای سیاسی، بواری چارەسەرکردنی کێشەی کوردی ئەم وڵاتە-واتە سۆڤێت- لە سەردەمەکانی تر (سەردەمی بریژنیف و خروشچۆڤ و.....) زیاتر بوو. گەلی کورد کە بەزۆر لە نیشتمانەکەی خۆی دەرکرابوو، بەپێی ئەو بڕیار و دەستوور و پێزانینانەی کە پاش مردنی ستالین لەلایەن حیزب و دەوڵەت و پەرلەمان و.... سۆڤێتییەوە دەرچوبوو و بواری پێنەدرابوو بگەڕێتەوە، ناوی لەناو ئەو گەلانەدا بوو کە ناویان لە بڕیار و دەستوور و پێزانینەکاندا هاتبوو. ئاکادیمیك "ئاندرەی دیمیترڤیچ ساخارۆڤ" دۆست و پارێزەری کورد و تاقە مرۆڤێك بوو کە لەسەر هەڵەبجەی شەهید لە سۆڤێت وەجواب هات و، نامەشی لەم بارەیەوە بۆ سکرتێری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان نووسی و، وڵاتەکەی خۆشی لەم بارەیەوە بە تاوانبار دانا

---

[٩٤] هـ.س، بەرگی ١، ل١٤.

(چەند نامەی خۆی و خێزانی، واتە یلینا گیئورگیڤنا بونیر هەیە و، لە کوردستان بڵاوکراونەتەوە). لە کۆبوونەوەی پەرلەمانی سۆڤێت لە ١٩٨٩/١١/١٤دا سەبارەت بەو گەلانەی کە ڕژێمی ستالینی-بەلشەویکی سۆڤێت بەزۆر گواستبوونیەوە و تا ئەوکاتە بواری گەڕانەوە و دروستکردنەوەی کیانی خۆیان پێ نەدرابوو دەڵێت:

((... دەوڵەتەکەی ئێمە نە تەنیا جێگری قانوونی، بەڵکوو میراتگری ڕاستەقینەی ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرەی ستالینە کە ئەو هەموو تاوانەی کرد. ئێمە دەزانین بۆ وێنە دەوڵەتی ئەڵمانی فیدرال (ئەڵمانیای ڕۆژئاوا) ئەو بەرپرسییەی لەبارەی قەرەبووکردنەوەی زەرەر و زیانێکی ماددی کە ڕژێمی فاشیستی هیتلەر لە خەڵکی دابوو، بە ئەستۆگرت و، دەوڵەتی ئێمەش نابێ بەو چەشنە ئەرکە هەڵنەسێ و خۆی لابدات.....

بە پلەی یەکەم و گرنگتر، دەبێ دەوڵەتی سۆڤێتی بەبێ هیچ کەند و کۆسپێك گەڕانەوەی ئەو گەلانە مسۆگەر و دابین بکات، لەگەڵ دروستکردنەوەی ئەو شێوازی کیانە دەوڵەتیەی کە هەیانبووە و، نابێ ئێمە بیری لێ بکەینەوە. دەبێ دەست بەکار بین و هیچ بۆچوونێکی پراگماتیکی ناتوانێ پێشی ئێمە لەم بارەوە بگرێ. من لەوپەڕی باوەڕدام کە ئەوانەی ئێستا لە شوێنەکانیان دەژین، لەگەڵ گەڕاوەکاندا پێکەوە لە ئاشتیدا دەژین و، ئەگەر پێویستیش بێتو هەندێ لایەن بەرگری لەم کارەبکەن، دەبێ پاڵیان پێوە بنرێ.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لەوانەیە ڕێگەی تر هەبێ، بەڵام جێبەجێ نەکردنی ئەم ئەرك و قەرزە هەقخواز و عادیلانە و پێویستە، ئێمە مافمان نییە...)).

ئەو بڕیار و دەستوور و یاسایانەی کە سەبارەت بە گەڕانەوەی گەلانی زوڵم لێکراو و دوورخراوەو، هەروەها گەڕاندنەوەی تەواوی مافەکانیان کە هەر لە سەردەمی خرۆشچۆڤەوە تا گەرباچۆڤ لەم بارەیەوە دەرچووبوون بۆ هەموان بوو. جێبەجێکردنیشیان هەر لەسەرەوە تا خوارەوە حەتمی بوو و دەبوو وەك بڕیار و دەستوورەکان جێبەجێیان بکردایە. بۆ تەواوی کۆمارەکان و دامودەزگاکانی حیزبی و دەوڵەتی و..... حەتمی بوو، بەڵام بۆ هەندێکیان جێبەجێکرا و بۆ هەندێکیش نا.

٢- قەفقاس: گەلان لە قافڵە شەمەندەفەریەکاندا :

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە پەردەی لەسەر تاوانەکانی ڕژێمی ستالینی- سۆڤێتی بەرامبەر بە گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو، لەوانە گەلی کوردیش، لە سۆڤێت هەڵدایەوە، نیکولای فیدرۆڤیچ بوگایە کە دکتۆری زانستی مێژوو و پرۆفیسۆرە و بەرپرسی بەش و گرووپی لێکۆڵینەوەیە لە گەلە کەمایەتیەکانی سۆڤێت (ڕووسیا) لە پەیمانگای مێژووی ڕووسیای سەر بە ئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤێت (ڕووسیا) و ئەندامی پەیامنێری ئەکادیمیای سلاڤی و، ماوەیەك جێگری وەزیری کاروباری گەلانی ڕووسیا بووە. خاوەن بەرهەم و لێکۆڵینەوەیەکی زۆرە، لەوانە: ١- ی. ستالین، ل. بێریا: "ئەوانە دەبێ ڕابگوێزرێن"، مۆسکۆ، ١٩٩٢. ٢- کوردەکانی سۆڤێت بە هاوبەشی دوو کورد، ڕیواس و تاجەدینی برایڤ) مۆسکۆ ١٩٩٣.

٣- لە.ل. بێریاوە بۆ. ی. ستالین "بەپێی دەستوورەکانی ئێوە"، مۆسکۆ، ١٩٩٥.

٤-قەفقاس: گەلان لە قافڵە شەمەندەفەریەکاندا (ساڵی ٢٠تا ٦٠ی سەدەی بیستەم)، بە هاوبەشی عەسکەربەی موئایدوڤیچ گونوف، مۆسکۆ، ١٩٩٨.

لەم کتێبەدا ڕەخنە لە دەسەڵاتدارانی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت گیراوە کە ئەوانە بواری گەڕانەوەی ئەو گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوانەی سەردەمی ستالینیان نەداوە بۆ کۆمارەکانی خۆیان. سەرەڕای ئەوەی کە بەدەم و بە نووسراو و بەبێ ئیمزاکردنی بڕیارە هاوبەشەکانیان کە دەبێ لەم بارەیەوە هەنگاو بنێن، بەڵام تائێستا نەیاننناوە.

لەوانە ((پێکهاتن یا پەیمانی سەبارەت بە سەرلەنوێ دروستکردنەوەی کیانی ئەو گەلانەی کە بەزۆر ڕاگوێزراون" و ٧ کۆماری سۆڤێتی پێشوو ئیمزایان کردووە. ئەم پەیمانە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ لە پایتەختی قرقیزیا (بیشکیك) بەسترا. وەك بڕیارەکانی ڕابردووی سۆڤێت، لە کۆمارە نوێکانی سۆڤێت، واتە لەو شوێنانەی کە سەردەمی ستالین گەلانێکی زۆر ڕاگوێزرابوون، جێبەجێ ناکرێن. سەرباری ئیمزاکردنی زۆر پەیمان و پرۆتۆکۆڵی نێونەتەوەیی سەبارەت بە مافی مرۆڤ لەلایەن ئەم کۆمارە نوێیانەی سۆڤێتی پێشووەوە، هەنگاوێك بۆ

جێبەجێکردنیان هەڵنەگیراوە. نووسەر ئاماژە بە گەلێك بڕیاری سەرۆك کۆماری دەوڵەتان و پەرلەمانەکانی ئەم کۆمارانە داوەو ڕەخنەی لێ گرتوون. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژە بە هەندێ لەو سەرچاوانە دەکەین.

کۆمسیاری ناوخۆ (وەزیری ناوخۆ)ی کۆماری سۆسیالیستی جۆرجیا کارانادزە (قەرەنادزە) لە نامەی ١٩٤٤/٤/١٢دا بۆ بێریا.ل دەنووسێ: ((لەماوەی ئەم چەند ساڵەی دواییدا، هەندێ لە دانیشتوانی کورد و ئازەری کۆماری جۆرجیا کە لە کاری کەڵخۆز دوورەپەرێز کەوتوون و سەربەخۆ کاروباری خۆیان بەجێهێشتووە و هاتوونەتە تیبلیس (پایتەختی جۆرجیا) و بە مەیلی خۆیان لە دەوروبەری شار لە گەڕەکەکانی سابورتالو، گەرما-گالی، بەرازییەکانی لوتکین، مناتوپیسکی توپیك و دەوروبەری قەبرستانی کوتائیس دایان کوتاوە و نیشتەجێ بوون، بەشێکی زۆریان خەریکی کاری گشتی و کۆمەلایەتی بوون)).
(لە ترسا چوونەتە تیبلیس، بۆ ئەوەی ڕایان نەگوێزن بۆ سیبریا و کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و شوێنی تر، هەورامی).

هەموو ئەمانە، بوو بەهۆی ئالۆزیی ناوشار لەسەر پەسندکردنی بڕیاری وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت. ١٩٤٤/٣/٢٥ شەشسەد و هەشت بنەماڵە واتە ٣٢٤٥ کەسیان گواسترانەوە بۆ ناوچەکانی تسالکین، بورچانلین، قەرەیازی کۆماری جۆرجیا. تەنیا بنەماڵەکانی بەشدار و کەم ئەندامی زیان لێکەوتووی شەڕی گەورەی نیشتمانی و فەرمانبەرانی پەروەردە و قوتابیانی پەیمانگەکان کە بە هەموویانەوە ٣١بنەماڵە بوون، هێڵراونەتەوە)) [٩٥].

وتووێژی ڕۆژنامەی "ناروندی ئەبرازەوانی"ی جۆرجیا (١٩٨٩/٧/٣٠)، یەکێك لەو دوکومێنتانەی ئەو سەردەمەی هێناوەتەوە و، نووسەر دەڵێ: مانگی مایسی ١٩٤٤ چوار هەزارو نۆسەد و نۆ بنەماڵە (٢٥٥٠٠ کەس) لە ناوچەی ئاخال کەلاوە ٥٤٥ (٣٠ هەزار کەس) لە ناوچەی ئادیگەو، ٤٢٢٠ بنەماڵە، واتە ٢١٠٠٠ کەس لە ناوچەی ئاسپیندیز گوازرانەوە. لە ئەنجامدا بە هەموویەوە ١٢٨٦٠ بنەماڵە، واتە

---

[٩٥] بوگای.ن.ف، قەفقاز: گەلان لە قافڵەکاندا نێوان ساڵانی ٢٠ تا ٦٠ی سەدەی بیستەم، ل٢١٢.

٧٧٥٠٠ کەس، گوازرانەوە. هەروەها بڕیار بوو جارێ لەسەرەتادا دووسەد بنەماڵەی پەنابەریش بگوازرێنەوە[٩٦].

بێریا وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت لە ١٩٤٤/٧/٢٤دا داوای پەسندکردنی گواستنەوەی دانیشتوانی ناوچە سنوورنشینەکانی جۆرجیا لەگەڵ تورکیادا دەکات کە ١٦٧٠٠ بنەماڵەی کورد و تورك و خیمشین بوون و، بیانووش بۆ ئەمە باشترکردنی بارودۆخی پاراستنی سنوورەکان بووە. ئاشکرایە ستالینیش ئەم بڕیارە تاوانبارانەیەی پەسند کرد.

بەپێی بڕیاری بڕیاری ژمارە ٦٢٧٩ لە ١٩٤٤/٧/٣١دا، ژمارەی ئەو کوردانەی کە دەوو بەزۆر لە کۆماری جۆرجیا ڕابگوێزرێن، ٨٦٩٤ کەس بوو. هەروەها بڕیاریش درا کوردی کۆمارەکانی دراوسێ لەگەڵ جۆرجیادا بگوازرێنەوە[٩٧]. باراتە شڤیلی.ك لە وتاری خۆیدا لە ڕۆژنامەی "لیتراتوریيا گروزیا"دا ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٩/١١/٨، لەژێر ناوی "ئێمەی میسخی" شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی گێڕاوەتەوە و، وتوویە: ئەوانەی بەزۆر ڕاگوێزران، هەر ئەوانە بوون کە نێوانی ١٩٤١-١٩٤٤ کاتی دروستکردنی ئەو ڕێگە ئاسنەی ١٩٤٤، هەر بەو ڕێگەیەدا گواسترانەوە. واتە ڕێگەی ئاسنی بورژومی وال. ژمارەیەکی زۆر لەو ڕاگوێزاوانە کتێبەکانی "ستالین"یان وەك "مارکسیزم و کێشەی نەتەوەیی" لەگەڵ خۆیاندا برد[٩٨].

((ئەو ژنە کورد و تورك و خیمشینانەی کە مێردیان بە نەتەوەکانی تر کردبوو، ڕانەدەگوێزران. لەگەڵ ئەمەشدا جەخت لەسەر ئەوە کرابوو کە ئەوانەی بە هەر هۆ و شێوەیەك بێ کاتی گواستنەوە لە جێی خۆیان نابن، بەزۆر بگوازرێنەوە (دیپەرتاتسیا).

تاوانەکانی ستالین و ڕژێم و دارودەستەکەی، بێسنوورن و ئاسەواری تراژیدیای بەزۆر ڕاگواستنەوە، بۆ بنەماڵەیەکی زۆر لەو گەلانە، لە خودی

---

[٩٦] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[٩٧] هـ.س، ل٢١٣.

[٩٨] هـ.س، ل٢١٥.

تراژیدیاکه تراژیدیاتر بووه. هەزاران بنەماڵەیان لەبەرهەڵوەشاندووە. ژن لە مێرد یا مێرد لە ژن یا منالّیان لە باوك جیاکردوەتەوە. من بۆ خۆم گەلێك جار لە تەلەفزیۆن و چاپەمەنیەکانی سۆڤێت (ڕووسیا)دا و، تەنانەت لە زمانی زۆر کەسەوە، بیستوومە گەلێك ئافرەتی نەتەوەکانی تر مێردیان بە پیاوی گەلان (کە کوردیش دەگرێتەوە)ی بەر شالاّوی ڕاگواستن کەوتوو کردووە، لە ترسی گیانی خۆیان و کەس‌وکار و یاخود منالّیان، یا لەبەر نەگواستنەوەیان وازیان لە مێردەکانی خۆیان هێناوە و حاشایان لێکردووە، یا تەلاّقیان لێوەرگرتووە یا پێیان وەرگیراوە، هەم کاتی گواستنەوە و هەم بەتایبەت لە ڕێ‌وجێی نوێیان، بۆ ئەوەی لە جەهەنەمی مەنفا و تاراوگە ڕزگاریان بێ. سەیر ئەوەیە چەند جارێك کە تەلەفزیۆن بەرنامەی تایبەتیان لەسەر تاوانەکانی ستالین بلاّودەکردەوە، گوێم لە هەندێ ئافرەت و منالّەکانیان بووە کە بە هەمان باوەڕی فەرموودەکانی هاوڕێ ستالینەوە ئەو گەلانەیان بە جێی گومان و خائین و هاوهەستی ئەڵمانیای فاشی زانیوە، بۆیە بڕیاریان داوە لەبەر بەرژەوەندی وڵاتەکەیان لە مێردەکانی خۆیان جیاببنەوەو، ناو و ناسناو (لەقەب) و نەتەوەی منالّەکانی خۆیان گۆڕیوەو گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خۆیان یا بۆ شوێنێکی تر و مێردیان کردووەتەوە یا بێ مێرد ماونەتەوە. پاش مەرگی ستالین، بە تایبەت لە سەردەمی پیریسترویکا و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤێتدا، ئەم تاوانانە یەك لەدوای‌یەك ئاشکرا بوون و منالّەکانیان بەدوای باوك و گۆڕی باوکیاندا گەڕاون و ناوو ناسناوو نەتەوەی خۆیان ساغ کردوەتەوە. ئەم ڕژێمە نەفرەت لێکراوە کە ئالاّهەڵگری ئینتەرناسیۆنالیزم و دۆستایەتی و برایەتی‌ی گەلان بوو، بەم چەشنە نە تەنیا نەتەوەکانی ئەم وڵاتەی لەیەك نزیك نەکردوەتەوە، بەڵکوو کردوونی بە دوژمنی یەکتر. بە تێکدانی بنەماڵەکان و جیاکردنەوەیان لەیەك لەسەر پرنسیپی نەتەوەیی یا دینی یا شوێنی ژیان، مرۆڤەکان دابەش کراون و، دیاری کراوە ماف بۆ کێ ڕەواو بۆ کێ ناڕەوا بێ و هاووڵاتیان لە چەند پلەدا دابەش بن و لەکوێ بژین و لەگەڵ کێ بژین و کێیان خۆش بوێ و مێرد بە کێ بکەن و چۆن بژین و چ

ئیشوکارێك بکەن و چ یاسایەکی تایبەتیان بۆ دابنرێ. ئاسەواری ئەم سیاسەتە بێشەرمانەیەی ستالین، تەنانەت پاش دەیان ساڵ تێپەڕبوون بەسەریدا، بەتایبەت پاش هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤێت، هەر ماوەو، ڕووداوەکانی چیچانیا و قەفقاس و کۆمارەکانی دەوری بالتیك و.... وێنەی زیندووی ئەم ڕاستییەن.

بەگوێرەی مەنتیقی ستالین و داروەدەستەکەی، ئەگەر ژنە چیچنی یا کورد یا جوو یا بالکاریا... لەڕووی خۆشەویستییەوە مێردی بە جۆرجی یا ئەرمەنی یا ئازەری یا ڕووسێك کردبێ، چونکە مێردەکەیان لە ڕیزی گومان لێکراوو..... نین، مافی مانەوەیان هەیە. ئەی ئەو ئافرەتانەی کە دایك و باوك و خزم و کەسوکار و نەتەوەکەیان کەوتوونەتە بەر شالاوی بەکۆمەڵی گواستنەوەی ستالین، چییان لێ دەکرێ، چ هەست و هەڵوێستێکیان دەبێ، یا بە پێچەوانەوە کورد یا چیچیانێك یا.... کە ئافرەتێکی ڕووس و جۆرجی یا ئازەری و ئەرمەنی و.... یان هێناوە و لە ڕووی خۆشەویستییەوە بووە و کەم یا زۆر پێکەوە ژیاون و، کەم یا زۆریش منداڵیان لێ کەوتووەتەوە، بۆ دەبێ جیاببنەوە؟ ئەو جیابوونەوەیەش بەزۆر یا بە هۆی فریودان بووە، یا بارودۆخێکیان بۆ ڕەخساندوون کە جیا ببنەوە. ئەی تاوانی منداڵەکانیان چییە و سبەینێ چۆن وەڵامیان بدرێتەوە ؟ دیارە نوێنەری ئەو گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوانەی کە لە باری ڕەگەزی و دینی و نەتەوەیی و ڕەنگی پێست و زمان و کولتووری جیاوازەوە ژنیان لە نەتەوەکانی تر هێناوە، با بڵێین کوردێکی موسڵمان ژنێکی خاچپەرستی جۆرجی یا ڕووسی هێناوە، مانای ئەوەیە ئەم کوردە خۆشەویستی و مرۆڤایەتیی بەپێچەوانەی ئینتەرناسۆنالیزمەکەی ستالین و برایەتی و دۆستایەتی و پێکەوەژیان لە یەك وڵاتدا (یەکێتیی سۆڤێت) بەلاوە لە کێشەکانی تر گرنگترە. ئەو کە بنەماڵەیەکی ئەوتۆی لەگەڵ خێزانی پێك هێناوە، بیری لە ڕۆژێکی ئاوا نەکردوەتەوە کە بەو چەشنە تووشی کارەساتێکی ئەوتۆ بێ.

لایەنی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و بنەماڵەیی و..... ئەم تاوانانەی ستالین، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی جیا و تایبەت هەیە، ئێمە لێرە مەبەستمان شیکردنەوەیان نییە-هەورامی.

له١٩٤٤/١١/١٥دا، له برووسکەی ڕاپاڤ وەزیری پاراستنی کۆماری جۆرجیای سۆسیالیستیدا بۆ بێریای وەزیری پاراستنی یەکێتیی سۆڤێت ،سەبارەت به جێبەجێکردنی دەستوورەکەی، هاتووه:

ئۆپیراسیۆنەکه (عملیات) له بەرەبەیانی ١٩٤٤/١١/١٥دا دەستی پێکرد و بۆ سەعات ١٨ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ ٢٥٥٩١ کەس سواری سێ قافڵەی شەمەندەفەر کراون و، ئەوانی تر که ماون خەریکی کۆکردنەوەو ناردنیانین.

ڕۆژی ١٩٤٤/١١/١٧ تا سەعات ١٦ی ئێواره ٨١٣٢٤ کەسی تورك و کورد و خیمشین به ٢٥ قافڵەی شەمەندەفەر بەڕێ دەکرێن. لەگەڵ قافڵەی شەمەندەفەری ١٠٥١دا دوو فاگۆن قەرەچیشمان ناردووه، بارودۆخیان سامناك بوو: بێ پێڵاو و بێ تفاق و خواردەمەنی، بێ هیچ شتێك بۆ مانەوه و بژێوییان.

پاشان نووسەر ئاماژه بەوه دەکات که ئەوانه (کورد و تورك و خیمشین) له ٩ ناوچەی کۆماری جۆرجیا کۆکراونەتەوه و بەپێی ڕاپۆرتی کۆزنیتسۆڤ سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوه تایبەتەکانی وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت ٦٠٠٠٧ ئاژەڵی شاخدار و ٢٣٧٧٧ گای مێ و ١٨٢٠٥ گای نێر و ئاژەڵی شاخداری بچووك ٣٠٠٤٩ و ٣٧٤٠٤ پەز و، له ناوچەکانی ئاجار ١٧٦٦٣ پەز و باڵدارو مریشك و قاز و... ٢٨١٧ وەرگیراو تۆمار کرا. هەروەها لەوانه ٨٢٥٢ هەزار تەن گەنم و ٣٢٢٦ هەزار تەن گەنمەشامییان لێ وەرگیراوه.

١٩٤٤/١١/٢٨ بێریا ڕاپۆرتی جێبەجێکردنی تەواوی گواستنەوەی تورك و کورد و خیمشینەکان ئاڕاستەی ستالین و مالینکوڤ و مولەتوڤ دەکات و هۆی گواستنەوەیان (پەیوەندیی خزمایەتییان لەگەڵ دانیشتوانی تورکیادا) و هەروەها زانیاریی کۆچکردنیان بۆ ئەوێ و مەیلی بەشدارییان له بزووتنەوەکانی ڕاپەڕینداو به سیخوڕیکردن ناساندوونی (پاشان هەرچۆنێك بووه له سێ کۆماری کازاخستان و ئۆزبەکستان و قرقیزستان جێگیرکراون ).

....بۆ وێنه ئەوانەی که نێردراونه کۆماری ئۆزبەکستان، له ٧ هەرێم و ٤٣ ناوچه جێگیر کراون، که به هەموویەوه ٥٣١٦٣ کەس بوون، ١٠٨١٣ پیاو و ١٦١٢٧ ژن و ئەوانی تر منداڵ بوون[٩٩] .

---

[٩٩] هەمان سەرچاوه، ل٢١٦-٢١٧.

زۆر سەیرە ژمارەی ئافرەت (نەك ئافرەتی منداڵ) یەك و نیو کەرەت لە پیاو پترە. ئەمە دیارە زۆربەی پیاوەکان لە بەرەی شەڕ، یا ئۆردووگای کارە زۆرەملێیەکان بوون، یا لەسەر داخوازی خۆیان بۆ پاراستنی نیشتمان ڕۆیشتبوونە بەرەکانی شەڕ، یا لەپشت بەرەکانی شەڕەوە خەریکی کار بوون، ئەگینا ژمارەی نێر، بەپێی تەواوی سەرژمێرییەکان، لە مێ زیاتر بووە.

١٧٦٣ بنەماڵە (١٠٦١١ کەس)ی کورد و تورك و خیمشین تا ١٩٤٤/١١/٣٠ جێگیر دەکرێن. بەگشتی تا کۆتاییی ساڵی ١٩٤٤ بە هەموویەوە ٩٤٩٥٥ کەس گوازرانەوە بۆ کۆماری کازاخستان. گواستنەوەی ئەم گەلانە و گەلانی تر ساڵی ١٩٤٥یش هەر بەردەوام بووە.

بەپێی سەرژمێری وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت، ژمارەی مردووی ڕاگواستراوەکان تا مانگی ٧ی ١٩٤٨، واتە تورك و کورد و خیمشین، ١٤٩٨٥ کەس واتە ١١,٨٪ بووە. بە وتەی باراتشڤیلی ژمارەی مردوەکان (کە لە بەڵگەکاندا تۆمار نەکراون) ٣\١ی ڕاگوێزراوەکان بوون کە زیاتر لە ١٧ هەزاریان تەنیا منداڵ بوون[(١٠٠)].

ڕژێم سەرژمێری ڕاگوێزراوەکانی کورد و تورك و خیمشینی لە کۆماری جۆرجیاوە تا ئۆکتۆبەری ١٩٤٥ بە ٨٨٨٠٠ کەس داناوە. کەچی لە سەرژمێری ١٩٥٠دا، بە ٨١,٩٥٥ کەس دانراوە[(١٠١)].

لەباتی زیادکردن، پاش پێنج ساڵ ٧ هەزار و سەدوپەنجا و پێنج کەسیان کەم کردووە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لەوانەیە لە ماوەی ئەو ٥ ساڵەدا سێقاتی مردوەکان (کەمکراوەکان) مناڵ لەدایك بووبن، کەچی...؟ ئەمە جگە لەوەی بەپێی ڕاپۆرتەکان لە ١٩٤٥ بەولاوە، ڕاگواستنی ئەو گەلانە لە کۆماری جۆرجیاوە هەر بەردەوام بووە.

خاڵێکی گرنگ کە پێوەندیی بەو تاوانانەوە هەیە کە بۆ گەلانی سەرسنووری جۆرجیا و ئازەربایجان و ئەرمینیا بێبناغە و بەئاشکرا هەڵبەسترابوون. مەبەست

---

(١٠٠) ه.س، ل٢١٨-٢١٩.

(١٠١) ه. س، ل٢٢٠.

ئەوە بووە، گەلانی گومانلێکراوی هاوهەست و سیخوڕی دۆستانی هیتلەر، واتە ئێران و تورکیا، پێش ئەوەی ببنە هاوولاتی‌ی خۆیان (واتە ڕووسیا لە سەدەی ١٩هەمدا)، بەڵێنیان دراوەتێ کە ڕووسیا (پاشان سۆڤێت) لە تورك و فارس باشتر دەبێ بۆیان. ئەوە بوو هەرچۆنێك بوو کران بە هاوولاتی و بە نیشتمان و مرۆڤەوە خرانە خزمەتی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا و سۆڤێت. واباوە کە ولاتێك لەلایەن دەوڵەتێکی هاوسێ یا دەرەکییەوە دەکەوێتە مەترسییەوە، خەڵکی سەرسنوور چەکدار دەکرێن و، لەگەڵ هێزی لەشکری ئەو ولاتەدا پارێزگاری لە نیشتمانەکەیان دەکەن؛ چونکە ئەوان زیاتر شارەزای کون و قوژبنی ناوچەکەن و ئامادەی فیداکارین بۆ نیشتمان و ماڵ و گوند و بنەماڵەکەیان. کەچی لە سۆڤێت بە پێچەوانەوە بوو، کە شەڕیش دەستی پێ کرد، واباوە ژن و منالّ و پیر و پەککەوتوەکان بگوازرێنەوە بۆ پشت بەرە، نەك بە سەدان و هەزاران کیلۆمەتر و لە کەش و هەوایەکی تردا نیشتەجێ بکرێن. وا باوە بووە دەوڵەتەکە پێشتر شوێن و جێگا و کەرەستەی بۆ لێقەوماوان ئامادە کردووە و داوای لە هاونیشتمانان کردووە یارمەتی‌ی لێقەوماوان بدەن. کەچی لێرە بە پێچەوانەوە بووە. پرسیار ئەوەیە: بۆچی جۆرجی و ئەرمەنی و ئازەری‌ی سەرسنوورەکان نەگوێزرانەوە، خۆ پێکەوە دەژیان، یا بۆ ئەوان یاسایەکی تر هەبوو !

ئەم ڕژێمە تۆتالیتار و بێوێنەیە، پاش ئەوەی ئەو خەڵکانەی بەزۆر گوازتەوە و خەڵکی تری ناردە جێگایان، بە دانیشتوانی نوێی ڕاگەیاند، ئەگەر کەسێك یا کەسانێك گەڕانەوە، یا کەسێکی بێگانە لە خۆتان دیت، دەستبەجێ بیگرن یا ئاگاداری کاربەدەستان بکەن. هاتوچۆش بۆ ئەو ناوانە، چ بە ماشێن و چ شەمەندەفەر، لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی دەزگا سەرکوتکەرەکانی پاراستنی سۆڤێتی (ك. گ.ب.)دا بووە. ئەوانە دەبوو یەکەم کەس بەبێ پاسپۆرت سوار نەکەن و پاسپۆرتەکان بەباشی تەماشا بکرێن و ئەگەر مۆری "مافی سەفەرکردنی نییە"ی پێوەبێ، دەسبەجێ کاربەدەستان ئاگادار بکەنەوە. جگە لەوە دەبوو ئەوانە لیستی موسافیرەکان بدەن بە کاربەدەستانی پۆلیس و پاراستن. هەر بۆیە کاتی گواستنەوەو

له جێی بەزۆر جێگیرکردنیان، پاسپۆرت له زۆربەیان وەردەگرنەوە یا مۆری "مافی سەفەرنەکردن"ی لێ ئەدەن.

ژمارەیەکی زۆر لەو گەله بەزۆر ڕاگوێزراوانه که ڕادەکەن، له بەڵگەکاندا هاتووەو لێرە دووپاتی ناکەینەوە که چەندیان لەوێ گرتن (واته له شوێنی نوێ ڕاکردن)و چەندیان لەڕێ گرتن و کوشتن و چەندیان لەوێ (له نیشتمانیان) گرتن و کوشتن و دەوری ئەو دانیشتوه نوێیانه له گرتن و کوشتندا چی بووە.

ڕێگەی خۆشاردنەوە له شار و کۆمار و گوندێکی ئەم وڵاته که باڵی ڕەشی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ك. گ.ب. بوو لەپشت دیوارە ئاسنینەکانەوە، کاتی شەڕ بەبێ پاسپۆرت یا به پاسپۆرتی مۆری "مافی سەفەرکردنی نییە" دەبێ چەند سەخت و نالەبار بووبێ و ڕاکردنیش بۆ ئەودیوی سنوورەکان که به سەگ و سەرباز و مین چێنراوە، خۆگەیاندن بۆ ئەوێ به درێژایی سەدان و هەزاران کیلۆمەتر و لەناو ئەو هەموو پۆسته عەسکەری و کۆنترۆڵەدا دەبێ له توانای کێدا بووبێ. دەبێ چەند کەس لەم ڕاکردنانەدا گیرابن و کوژرابن ؟ نهێنییەکه دەبێ له سەرژمێری ونبوو و مردوو و ڕاکردوەکان بدۆزرێنەوە.

دەبێ چەند ئافرەتو چەند باوك و دایك و چەند منداڵ چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەوانەیان کردبێ ؟ چەند دەزگیران و ئەویندار چاوەڕێی خۆشەویستەکەیان کردبێ، چەند ژن و کچی لاو بەتایبەت لەناو کوردەکاندا به بێوەژنی و مێردنەکراو مابنەوە و بەڵێنی خۆشەویستی و داب و نەریتی کوردەواری پیری کردبن، وەك ژنەشەهید و پ.م و گیراو و هەڵهاتوو و ئەنفالکراوەکانی کوردستان، دەبێ چ ئاواز و بەسته و هۆنراوەیان بۆ هۆنیبنەوە و......... لەکێ بپرسین و چۆن تۆماریان بکەین، کێ خۆی بگەیەنێته لایان..... ئایا ئەوانیش وەك زۆر نهێنی ئەم دنیایه دەچنه گڵەوە، وەك مێژووی نەزانراوی گەلەکەمان نانووسرێنەوە. کێ بێ و کەی بێ سیمفۆنیایەکی نەتەوەیی ئەم کارەساتەی کورد داڕێژێ، پەیکەر و مۆزەیان بۆ دروست بکەن.

پرۆفیسۆر نیکۆلای فیئودرویچ بوگای و دکتۆری زانستی مێژوو عەسکەربەیی موئەیەدوڤیچ گونوڤ، له لێکۆڵینەوە بەنرخەکەیاندا که پشت به بەڵگه و

سەرچاوەکان دەبەستێ، دەنووسن: تا ساڵی ١٩٤٧ (٢٤٣٢٤ کەس)ی ڕاکردووی نەتەوە جۆراوجۆرەکان (لە تاراوگە-مەنفا) لەلایەن دامودەزگاکانی سۆڤیێتەوە گیران، ٩٩١٧ کەسیان گیران و ٢٠٦٢ کەسیان درانە دادگای تاوان[١٠٢]. جگە لەوە دەنووسن تەنیا بە تاوانی سیاسی لە ١٩٣٧دا، نزیکەی سێسەد و پەنجا هەزار کەس تیرباران کران[١٠٣].

بەپێی بەڵگە و دیکومێنتەکان، تا یەکی ئۆکتۆبەری ١٩٤٨، دوو ملیۆن و سەدوچوار هەزار و حەوتسەد و پەنجاویەك کەسی گەلانی سۆڤیێت، لە تاراوگە (مەنفی) ڕاگوێزراوی تایبەت بوون و، حەفتاوحەوت هەزار و پێنجسەد و چلویەك کەسی ڕاکردوو و، بیست هەزار و نۆسەد و پەنجاوپێنج کەس لە ڕاکردندا بوون. گەرچی ژمارەی ڕاکردووەکانی کورد بەتەواوی ڕوون نییە و بەجیا نەدراوە، بەڵام لەگەڵ نەتەوەکانی تورك و خیمشیندا، ئەو سێ گەلە پێکەوە نووسراون. سەرجەمی ئەو سێ گەلە لە تاراوگە ٨١٠٧٤ کەس و، سەرجەمی ڕاکردوەکانیان ٢٣١٠ و ژمارەی ئەوانەی کە لەڕاکردندا بوون بە ٣٦١ کەس نووسراون.

بەپێی لێکۆڵینەوەی زانستیانە و بە بەڵگەی ژمارەیەکی زۆری زانایانی سۆڤیێتی پێشوو (ڕووسیای ئەمڕۆ و کۆمارەکانی تری پێشووی سۆڤیێت)، جگە لە زیانی گیانی، ئەو زیانە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و... کە لە گەلانی ڕاگوێزراو بەتایبەت و لە ئابووریی وڵات (سۆڤیێت) بەگشتی کەوتووە، بێئەژمار و قەرەبوونەکراوە بوون.

پرۆسە ئابووریەکانی شوێنی نیشتەجێی پێشووی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو، ڕاگیراون، چ لە بواری پیشەسازی و چ کشتوکاڵی. کارگە و کارخانەکان بێ کرێکار و بێ کەرەستەی خاوی بەرهەمهێنان ماونەتەوە و باغ و کێڵگەکان بەبێ جووتیار و، ئاژەڵداری و سەڤخوز و کەڵخۆزەکانیش زۆریان وەستاون یا کەموکوڕییەکی

---

(١٠٢) هـ. س، ل٢٣٧. هەروەها بڕوانە: گەلانی سەرکوتکراوی ڕووسیا چێچنی و ئینگووشی، ل١٦٤-١٦٥.

(١٠٣) هـ. س، ل٢٢٧.

زۆریان بووه و، ئەو خەڵکەش کە نێردراونەتە جێیان یا نەزان بوون یا خۆیان لەو کارانە نەداوە یا بەشیان نەکردووەو و بەکاروبارەکان ڕانەگەیشتوون. خانووبەرە و گوندێکی زۆر کە لە شوێنە سەخت و چیاییەکان بوون، دوور لە ڕێگە و شارەکان، کەسیان تێ نەچوە و کەس ئاگای لێیان نەبوەو ڕووخاون.

لە باری کولتوورییشەوە، جگە لەو شوێنانەی کە ئاماژەمان پێ کردن، کتێب و ڕۆژنامە بە زمانی ئەو گەلانە لەچاپ نەدراوە و، بە زمانی ئەوانیش نە ڕادیۆ و نە تەلەفیزیۆن هەبوە. ڕووناکبیر و نووسەر و هونەرمەندی ئەم گەلانە زۆربەیان گیراون یا گوللەباران کراون ، یان ماوەی چالاکیی پێ نەدراوە و... ئاسەوار و مۆزەخانە، کتێبخانە، شانۆ و ئامرازی مۆسیقا و، بەگشتی ئەوەی کە هەیانبووە، لەدەستیان داوە و لەناو براوە.

جێی فێرکردن و پسپۆڕی ئەم کولتوورانە کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە نیشتمانەکەی خۆیان دوور بوون، پاش گەڕانەوەیان، لەبەر خراپیی باری ئابووری و کێشەکانی تر، ماوەیەکی زۆری پێ چووە تا کەم یا زۆر دەستیان بە زیندووکردنەوەی ئەم کولتوورە کردووە. زۆربەی ئەو گەلانە، پاش دە تا پانزە ساڵ، دوور لە نیشتمانی خۆیان ژیاون و ئینجا گەڕاونەتەوە. واتە لە ١٩٤٤دا بەزۆر کۆچیان پێکردوون و، پاش مەرگی ستالینی دیکتاتۆر دەستیان کردووە بە گەڕانەوە. بەڵام خۆ کوردەکە پێش ئەوان، واتە بۆ جاری یەکەم ١٩٣٧ دوورخرایەوە و، بۆ جاری دووهەمیش لەگەڵ زۆربەی ئەوانەدا لە ١٩٤٤دا کۆچی پێ کرا. لەلایەکی ترەوە، کوردە کلۆڵ و بێبەختەکە تائێستاش (ساڵی ٢٠٠٤)، پاش ٦٧ یا ٦٥ساڵ، نەیتوانیوە بگەڕێتەوە. دەبێ لەچاو ئەوانی تردا چیی لێ هاتبێ ! دەبێ چەند لەناو کولتووری زیاتر لە دە گەل و نەتەوەدا کە بەسەریاندا دابەش کراوە، شۆرابێتەوە یا توابێتەوە. دەبێ ئەم چەند وەچەیەی کە لەدایك بوون و گەورە بوون، لە تاراوگە چ کولتوورێکی خۆیان هەڵگرتبێ بۆ نەوەی یا نەوەکانی پاش خۆیان. ئیتر باسی ئەوەش ناکرێ کە تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ و شانۆ و ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی زمان، مێژوو، ئابوری، کولتوور، پەیمانگە و قوتابخانە و کتێبخانە و مۆزەخانە و ... هتدیان نەبوە و نییە.

ڕووناکبیر و زانایانی سۆڤێتی، ئەوانەی کە پسپۆڕی تایبەت بە بواری مێژوویی و ئابووری و سیاسی و کولتوورین، بەهۆی جۆراوجۆرەوە لە سەردەمی ستالیندا، نەك هەر بێدەنگ بوون و شتیان لەم بارەیەوە نەنووسیوە، بەڵکوو ئاویشیان کردووە بە دەستی ڕژێمەکەی ستالین و کردەوەکانیدا، یا پاکانەیان بۆ کردووە و، بگرە تائێستاش پاشماوەی ئەو بیروباوەڕە ماون و پارێزگاری لە سیاسەتی ستالین و پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت دەکەن، بە هی قۆناغی پاش ستالینەوە تا هاتنە سەرکاری گەرباچۆڤ. جاران ئەگەر دژی ئەو بۆچوونە ڕاستانەی ناحەزی سیستەمی سۆڤێتی و تاوانەکانی ئەم ڕژێمە ڕادەوەستان، ئەمڕۆ بەهۆی ئاشکراکردنی بەڵگەنامەکان و کتێب و وتار و سەدان بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفیزیۆنی کە کەسانی شاهید و زیانلێکەوتوو و بەزۆری ڕووناکبیر و کەسانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستین و ناسراون، شتەکان دەگێڕنەوە و، ناوێرن یاخود وەڵامێکیان بۆ ئەو هەموو فاکت و بەڵگە و ڕاستیانە نییە. ئەوانەی کە پلەوپایەیان لە ستایشی ستالین یا حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتداو، پارە و ماڵ و ماشێن و پشوودان و گەڕان بە وڵاتانی تریان لەلایەن حیزب و دەوڵەتەوە وەرگرتووە، ئەمڕۆ ئەو دەوڵەت و حیزبە نەماوە. ئەوانە ئەگەر دووربوون لە ڕاستیەکان، یا لەلایەن حیزبەوە پێیان ڕاسپێردرابوو کە وا بنووسن، یا سەر بە نەتەوەی باڵادەست و دەسەڵاتدار بوون، یا بەشداری ئەو هەموو تاوانە نامرۆڤایەتیە بوون، بەلای نەتەوە زۆرلێکراوەکانەوە زۆر گرنگ نەبوە و نییە، چونکە بەرهەمەکانیان لەم بوارەدا لەگەڵ کەوتنی ڕژێمەکەدا وەلانران. بەڵام داخ لەوەدایە کە چەند کوردێکی سۆڤێت، ئەوانەی بنەماڵەکانیان نەکەوتنە بەر شاڵاوی زوڵمی ستالینی و پلەوپایە و پارە و.... وەرگرتن، ئەمڕۆ پاش دەرکەوتنی ئەو هەموو بەڵگانە، بەپێچەوانەی ئەوەەو کە نووسیبوویان و بەدوورکەوتنەوە، هەوڵی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی خۆیان و هی خەڵکی تریان نەداوە؛ لێکۆڵینەوەیان لەم بارەیەوە نەکردووە و، تەنانەت دژی بۆچوونی خەڵکی تری کورد و ناکورد ڕاوەستاون. ئەوانە وەك بارودۆخی ژیانی خۆیان تەماشاو

باسی بارودۆخی کوردی سۆڤێتیان کردووه. سەیر ئەوەیە کە چاویشیان بە کوردێکی ئۆزبەکستانی یا کۆمارەکانی تر دەکەوێ، بە ڕووسی قسە دەکەن، چونکە بۆیان ئاسانترە و باشتریش لەیەکتر تێدەگەن. بیست سی ساڵی تر، ئەو زمانە کوردییە شڕ و سەقەتکراوەی کوردەکانی سۆڤێت کە زۆر زۆر کەوتبوە بەر کاریگەریی زمانی ڕووسی، پاش ڕووخانی سۆڤێت، دەبێ کوردانی ئازەربایجان یا کازاخستان و ڕووسیا و قرقیزستان و ئەمانی تر کە کەوتوونە بەر کاریگەریی زمانی ڕەسمیی ئەو کۆمارانە، سبەینێ چۆن لەیەکتر تێبگەن. زۆربەی کوردەکانی سۆڤێتی پێشوو، چ پێش و چ پاش ڕووخانی، لە کازاخستان و ڕووسیا و ئۆزبەکستان و قرقیزستان و ئەرمینیا و ئازەربایجان ژیاون و دەژین. ئەوانە سەردەمی سۆڤێت، نەك تەنیا پەیوەندییان پێکەوە نەبوە و نییە، ڕۆژنامە و گۆڤارێکی گشتییان نەبوە و نییە، کتێبی قوتابخانە و مامۆستای قوتابخانەیان نەبوە. دەبێ لە کام پێشکەوتن و کام ماف بدوێین کە زۆر لاپەڕەی کتێبی کوردناسەکانی سۆڤێت، بەتایبەت کوردە نووسەرەکان، تەرخانی ئەم درۆ و دەلەسانە کراون.

کۆماری ئەرمینیا، بۆ وێنە، باس کراوە گوایە کورد لەوێ هەمووشتێکی هەیە، بە پێچەوانەی کۆمارەکانی تری سۆڤێتەوە. باسی ئەو تەنگ پێهەڵچنینەی کوردیان پێش ١٩١٧ لەلایەن ئەرمەنەکانەوە نەکردووە. پاش ١٩١٧یش هەروا، چۆن زەویوزاری کوردەکانیان داگیرکردووە. باسی دەرکردنی کوردە موسڵمانەکانی ئەوێ نەکراوە لە ١٩٣٧ و ١٩٤٤داو دەرکردنی کورد لە ناگۆرنا قەرەباغ و دابەشکردنی کوردی موسڵمان و ئێزدی وەك دوو نەتەوەی جیاواز. باسی ئەوەش نەکراوە کە پاش مردنی ستالین کوردەکان تاکە تاکە گەڕاونەتەوە، گرتوویانن و بۆ دواوە نێردراونەتەوە. ئیتر باسی ئەو هەموو کتێب و وتارانەی نووسەرانی ئەرمەنی ناکەین کە چ بوختان و درۆ و دەلەسەیەکیان بۆ کورد هەڵبەستووە و، بەناحەق و بەبێ بەڵگە ناوی کوردیان زڕاندووە و چەند وەچەی ئەرمەنییان بەو کتێبانە پەروەردە کردووە.

یەکێك لە هاوڕێیانی نزیکی ستالین، واتە ئەو کەسەی کە ئاگاداری هەموو بڕیارەکانی کریملن و بەشدار و پەسندکەری سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤێت بووە و ماوەیەکی دوورودرێژ لە سەرکردایەتی‌ی حیزب و دەوڵەتی سۆڤێتدا بووە، ئاناستاس میکۆیان ١٨٩٥-١٩٧٨)، ئەرمەنی بووە. وەك ڕووسەکان دەڵێن لە ئیلیچەوە تا ئیلیچ بووە (واتە سەردەمی ڤلادیمیر ئیلیچ لینینەوە تا لئیونید ئیلیچ برژینڤەوە). سەردەمی یەکەم گواستنەوەی کوردان لە ١٩٣٧دا و گواستنەوەی دووهەم، جێگری سەرۆك وەزیرانی سۆڤێت (١٩٣٧-١٩٥٥) و ئەندامی کۆمیتەی بەرگری‌ی سۆڤێتی‌و، پاشان وەزیری بازرگانی و، لە ١٩٦٥-١٩٧٤ ئەندامی دەستەی سەکردایەتی‌ی پەرلەمانی سۆڤێت و، لە ١٩٢٣-١٩٧٦ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی‌ی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت و ئینجا کراوە بە ئەندامی پۆلیت بیرۆ. ئەم کابرایە کەسێك نەبوە بێ‌ئاگا لە مێژووی کورد و کارەساتەکانی سەر ئەم گەلە و کوردی کۆمارەکەی خۆی، واتە ئەرمینیا و، ئەو تراژیدیایەی کە خۆشی دەنگی لەسەر دابوو و بەسەر کوردی سۆڤێتدا هێنرا بەگشتی. ئەوپەڕی دەستی دەڕۆی و ئەیتوانی هەوڵی گەڕانەوەی کوردەکان بدات. گوایە کورد و ئەرمەن برای یەکن و گەلێك کارەساتیان پێکەوە لەلایەن دوژمنێکەوە بەسەردا هاتووە و زۆر تێکەڵ و هاوسێ‌ی یەکترن ولە ڕابردوودا شتی هاوبەشیان زۆرە.

کەچی سەرەڕای ئەوەی پاش مەرگی سەرۆکەکەی، واتە ستالین، ٢٣ ساڵی تر دەسەلاتی هەبوو، لە ١٩٥٦/١٢/١٦دا گەلاڵەیەك بە سەرپەرشتی ئەو بۆ گەڕانەوە و دروستکردنەوەی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوەکانی سەردەمی خۆی و ستالین ئامادە کرا. کەچی ناوی کورد لەم گەلاڵەیەدا نەهاتووە. باسی دروستکردنەوەی کوردستانی سوور هەر هیچ و، بەڵکو هەوڵی بۆ گەڕانەوەشیان نەداوە. ئەگەر ناوی کوردی لە ڕیزی گەلانی تردا بنووسیایە، بێ‌گومان کوردیش دەیتوانی وەك گەلانی تر مافە زەوتکراوەکەی بۆ بگەڕێتەوە. و ئەم کابرایە قەرەبووی گوناه و تاوانی خۆی و ڕژێمەکەیی دەکردەوە و دەبوە فاکتەرێکی مێژوویی بۆ دۆستایەتی‌ی نێوان گەلی ئەرمەن و کورد.

له مۆسکۆ دەستوورێکی تایبەت سەبارەت بە کورد نییە، گەرچی بۆ زۆربەی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو هەیە، بەڵکوو دەستوور یا بڕیارێکی گشتی هەیە ئاڕاستەی دەکەن. لەوێش، واتە لە ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربایجان، چونکە دەستوور و بڕیاری مۆسکۆ نییە، نەك تەنیا دەیکەن بە بیانوو و پاکانە بۆ خۆیان، بەڵکە دەیانگەڕێننەوە بۆ دواوە.

خۆ مرۆڤی وردبینی کورد دەبێ ئەو پرسیارە بکات: کە کورد لەو تەنگانە یا تراژیدیایەدا پێویستیی بە یارمەتی هەبوو، نەك بە هانایەوە نەچوون، بەڵکە دەستیشیان بە ڕووی گەڕاوەکان، ئەوانەی کە بە پارەی خۆیان گەڕابوونەوە، نا. ئەی چی لەو نووسراوانە بکەین کە نووسیویانە گەلی ئەرمەن باوەشی بۆ کورد ئاواڵە بووە و یارمەتیی داوە و پێکەوە ژیاون، وەك چۆن نووسراوەکانی تر سەبارەت بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر و کۆمەڵگەی سۆسیالیستی و دەوڵەتی سۆڤێتی فلان و فیسار شتی بۆ کورد کردووە و بەختەوەرترین کورد، کوردی سۆڤێتە! با دیکومێنت و بەڵگەکان لەگەڵ ئەم لێکۆڵینەوەیەدا وەڵامی ئەو شتانە بدەنەوە و خوێنەریش بۆ خۆی سەرپشکی هەڵوێستی خۆی بێ. بێگومان لە خۆی ئەپرسێ کە کوردی ئەوبەری ئاراس و ئەولای چیای ئاگری چۆن گەیشتوەتە کازاخستان و سیبریا و ئاسیای ناوەڕاست و کێ ناردنی؟! مرۆڤ هەندێ جار کە لەم شتانە ورد دەبێتەوە، گەلێك پرسیاری بۆ دێتەپێش.

دەستووری ستالین بۆ بەزۆر گواستنەوەی کورد و گەلانی تر لە ٢٤ سەعات یا لە چەند ڕۆژێکدا جێبەجێ کرا. کەچی دەستووری هەر ئەو دەوڵەتە زلهێزە بۆ گەڕاندنەوەی گەلان، گەلێك ساڵی پێ دەوێ و بە نیوەچڵی جێبەجێ دەکرێ و، بڕیارەکانیان گەلی کورد ناگرێتەوە هەتا ڕژێمەکە دەڕووخێ. شتی وا لەگەڵ مەنتیقدا ناگونجێ. تەنیا مەبەست سڕینەوەی قەوارە و هەبوونی کورد بووە لە ناوچەو نیشتمانی باوو باپیرانیان، بۆ تواندنەوە و لەناوبردنی ئەم گەلە. ئینجا چۆن و بۆچی پشتمان پێ بەستبوو، دەمانگوت دۆستمانە؟!

ڕژێمی سۆڤێتی، زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی کوردی لە شوێنی خۆیان (نیشتمان) دەرکرد و، ئەوانەش کە مابوون، زۆربەیان بە ئازەری و جۆرجی و بە ئەرمەنی کران، یا ناچاریان کردن یا ناچاربوون خۆیان بە کورد لەقەڵەم نەدەن. یا

ئێزدیەکانیان لە کورد جیاکردوەتەوە و بە نەتەوەیەکی جیاواز دایاننناون. پاش هاتنە سەر دەسەڵاتی بەلشەویکەکان و دابەشکردنی کورد بەسەر سێ کۆماری قەفقاسدا و دابەشکردنی کوردیش لەناو ئەم کۆمارانەدا بەسەر ناوچە و هەرێم و شارەکاندا، تەنیا لە کۆماری ئازەربایجان کیانێکی نیوەچڵیان بۆ دروست کردین، واتە کوردستانی سوور. ئەویش تەمەنی حەوت ساڵ بوو. پاشانیش دەربەدەر کران و بەسەر پێنج شەش کۆماری تردا دابەش و بەزۆر نیشتەجێ کران و، لەوێش بەسەر ناوچە و شار و بەڕێوەبەرایەتیی جیاجیادا دابەش کران؛ لەباتی ئەوەی سەرەتا کوردی دابەشکراوی سێ کۆماری ئازەربایجان و ئەرمینیا و جۆرجیا لەیەك نزیك بکەنەوە و بەڕێوەبەرایەتی و ناوەند و پەیمانگە و زانکۆ و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و ... هتدیان هەبێ و نوێنەریان لە دەزگەکانی دەوڵەتی و بەڕێوەبەرایەتی و حیزبیدا هەبێ. کورد بەپێی هەموو پێوانەکان دەبوو نوێنەرێکی لە پەرلەمانی سۆڤێت لە مەجلیسی نەتەوەکاندا هەبێ. ئیتر باسی دام و دەزگاکانی ئەو سێ کۆمارە ناکەم کە نەیانهێشتووە کوردێك بگاتە ئاستی بەرپرسی وەك ژەنەڕاڵ و دیپلۆمات یا وەزیر و شاردار یا مودیر ناحیە (بەخشدار)و دادستان و دادپەروەر و فڕۆکەوان و سەرۆکی کارخانە یا کارگە یا لە دامودەزگاکانی پەروەردە و لەشساغی و ......

پاش ئەو هەموو مافخوراویەش پەرژوبڵاویان کردنەوە. پرسیار ئەوەیە: دەبێ ئەم گەلە دابەشکراو و پەرژوبڵاو و بەزۆر ڕاگوێزراوە، بەبێ کیان و قەوارە و ناسنامە چۆن پێش بکەوێ و خۆی لە توانەوە ڕزگار بکات ؟!

**٣- كتێبی "کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراوی ڕووسیای فیدراڵ" ١٩٩٠-١٩٩٢، مۆسکۆ، ١٩٩٣**

ئەم کتێبە لە ٢٩٣ لاپەڕە و شەش بەش پێك هاتووە، مێژوویەکی کورتی ئەو گەلە سەرکوتکراوانە و شوێنی نیشتەجێ و ژمارە و زمان و کولتووریان، لەگەڵ کۆمەڵە بەڵگە و دیکومێنت و وتاری نوێنەرانی ئەو گەلانە و ڕێکخراوە سیاسیەکانیاندا و، وتار و هەڵسەنگاندنی زانایان و پسپۆڕ و کەسایەتیی سیاسی و کۆمەڵایەتی، پەرلەمانی، مافپەروەر و .... تیایە و بەڕێز ئیسماعیل ئیبراهیمۆڤیچ عەلییڤ کۆی کردوەتەوە. کتێبەکە زیاتر لەسەر ڕێکخستنی ئەم کۆنفیدراسیۆنە و پەیڕەو و پڕۆگرامی مەبەست و چالاکیەکانی ئەدویَ، کە بەداخەوە تەنیا نوێنەری کورد یاخود ڕێکخراو و هێزێکی سیاسی یا کۆمەڵایەتی چ کوردی سۆڤێت و چ (کوردی بەشەکانی تری تێدا وەك میوان) بەشدار نەبوون و، نوێنەر و دەستەی نوێنەرایەتیی تەواوی ئەو گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوانەی سەردەمی ستالین، جگە لە کورد، لە پێکهێنانی ئەو کۆنفرانسە و بەشداریدا وەك ئەندامی سەرۆکایەتیی ئەم ڕێکخراوە، توانیویانە بەهۆی نامەو بانگەواز، بەشداریکردنەوە لە کۆڕ و کۆنفرانسە نێودەوڵەتیەکانداو چاوکەوتنیان بە نوێنەرانی دەوڵەتان و پەرلەمان و ڕێکخراوە سیاسی-کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەکانی دنیا، بەتایبەت بە پەرلەمانی ئەورووپا و ڕێکخراوی نەتەوەیەککگرتوەکان و مافی مرۆڤ و.... پەیوەندی بگرن و دەنگی خۆیان بگەیەننە دنیا.

گرنگییەکی تری ئەم کتێبە، بەڵگە و بڕیار و بابەتی کۆنگرەکانی ئەم کۆنفیدراسیۆنەیە کە ئاڕاستەی کاربەدەستان و دەوڵەت و پەرلەمانی کۆماری ڕووسیای فیدراتیڤ و کۆمارەکانی تری پێشووی سۆڤێت و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی کراون، و داوای یارمەتییان بۆ گەڕاندنەوەی مافی زەوتکراوی ئەم گەلانە و میکانیزمی جێبەجێکردن و گەلێك پێشنیار و گەلاڵەیش لەم بارەیەوە دەنوێنێ. هەمان کات، ڕەخنەی خۆی ئاڕاستەی کاربەدەستانی سۆڤێتی پێشوو و کۆمارەکانی ئەمڕۆ کردووە کە بڕیار و بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ نەکردووە.

ئەم کتێبە بابەتی سێ کۆنگرەی (١٩٩٠-١٩٩٣) ئەم کۆنفیدراسیۆنەی تیایە. دەستەی نوێنەرایەتی‌ی ئەم کۆنفیدراسیۆنە سەردانی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوی ( لە مەنفا و شوێنی گەڕانەوەیان) کردووە و، لەنزیکەوە ئاشنای بارودۆخ و داواکاریەکانیان بوون و دیدار و پێشنیار و داواکاریەکانی خۆیان لەگەڵ کاربەدەستانی خۆجێیی و باڵای کۆمارەکانی سۆڤیێتی پێشوو کردووە. لەم کتێبەدا هاتووە:

((بۆ ئەوەی بیروڕای کۆمەڵگە لەو بۆچوونانەی سەردەمی ستالین کە بۆ هەندێ خەڵك هەڵبەسترابوون، وەك "گەلانی گومانلێکراو" "گەلانی خائین" و .... هتد بشۆردرێتەوە یا بڕووخێندرێ و نەمێنێ، دەبێ هەنگاو هەڵبگیرێ. گەرچی ئەم پیلانە گلاوە بەتەواوی سەری نەگرتووە، بەڵام هەر کارێکی قووڵی بە شێوەیەکی نێگەتیڤیانە کردوەتە سەر بیروڕای کۆمەڵگەی سۆڤیێتی‌و ئاسەواری خۆی سەبارەت بەم خەڵکانە بەجێهێشتووە و تائێستا بنبڕ نەکراوە. ئەوە وەك تاوانەکانی تری ستالین لەبیرناچن ل٢٦))

((خۆڕزگارکردنی ڕووسیا لەو تاوانە گەورەیەی کە بەرامبەر بە گەلانی کراوە، ئەرکێکی گەورەی سیاسی و ئەخلاقییە ل٢٨))

((لەناو ئەو کێشانەدا کە زانستی ڕووسیا لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکردوون ،کێشەی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوی ڕووسیایە. لە هەلومەرجی ڕژێمێکی تۆتالیتاریدا، بواری لێکۆڵینەوەی ئەم کێشەیە نەبوو ل٣٠))

((ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین: ساڵانی ٣٠-٤٠ی سەدەی بیستەم زیاتر لە شەست گرووپی دانیشتوانی سۆڤێت (واتە هی سەر بە نەتەوەو گەلانی تر) و ١٥ گەل بەتەواوی کەوتوونەتە بەر شاڵاوی کۆچ پێکردن، ل٣٥)).

((....بەڵام نەبوونی زانیارییەکی ڕێکوپێك و بەربڵاو لەلای کۆمەڵانی گەل سەبارەت بە چارەنووسی تراژیدیانەی ئەو گەلانەی کە بەزۆر ڕاگوێزاون و تائێستاش پێکەوە لەگەڵ یەکتردا دەژین، تا ئەمڕۆش لە هەندێ ڕووەوە بێباوەڕی و گومانلێکراوی و ڕواڵەتی تری نێگەتیڤیانەیان بەرامبەر دەنوێنن. بۆیە پێویستە

بۆ ئامادەکردنی بیروباوەڕێکی ڕاستەقینە لەناو کۆمەڵگەدا، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و زانستیانە لەسەر ئەم گەلە زۆرلێکراوانەدا بلاوبێتەوە، ل٦٤)).

بەڵگە و بڕیار و بابەتەکانی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراوی سۆڤێتی پێشوو لە سەردەمی ستالینداو، گەلاڵەی یاسای گەڕاندنەوە و قەرەبووکردنەوەی زیانەکانیان و... باشترین پسپۆری یاسایی و مێژوویی و نوێنەرانی ئەم گەلانە و پسپۆڕانی مافی مرۆڤ و یاسای نێونەتەوەیی ئامادەیان کردووە و، ئاڕاستەی کاربەدەستانی ڕووسیا و کۆمارەکانی تری سۆڤێتی پێشوو کراوە و داوای دروستکردنی کۆمیسیۆن یا کۆمیتەیەکی نوێنەرانی تەواوی گەلە زۆرلێکراوەکانی سۆڤێتی پێشوویان تێدا کراوە، تا پەیوەندی بە کاربەدەستانی کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشووەوە بکات بۆ گێڕانەوە مافەکانیان و، پردێك بێ لەنێوان ئەو گەلانە و کاربەدەستاندا.

لە بڕیارنامەی یەکەم کۆنگرەی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراوی ڕووسیای فیدراتیڤدا کە لە ١٨ خاڵ پێك هاتووە و یەکدەنگ ١٩٩١/٧/٣ بڕیار لەسەر خاڵەکان دراوە، خاڵی سێزدەهەمی دەڵێ:

((١٣- پشتیوانیکردن لە داخوازی خۆماڵیکردنی سەرو سامانی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، ئەو حیزبەی کە بەرپرسی جینۆسایدی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو بووە...، ل١٠٩)). دەکرێ بە پارە و سەرو سامانی ئەم حیزبە، بەشێك لە داخوازیەکانی ئەم گەلانە جێبەجێ بکرێن.

کۆنگرە، لە هەندێ بڕیاری جیاجیادا، داوای لە کاربەدەستانی ڕووسیای فیدراتیڤ کردووە ((ناوی شار و گوند و ڕووبار و چیاو شوێنەکانی تر کە گۆڕاون، ناوە کۆن و مێژووییەکانیان لەسەر دابنرێتەوە...، ل١١٦)).

وێڕای سوپاس بۆ بەشداران و ڕێکخەرانی ئەم کۆنفیدراسیۆنە، کە بەبێ نوێنەرانی کورد یا بەشداریی کوردێکی ئاساییش یا ناردنی پەیامێك بۆیان، کێشە و کارەساتی ئەوانیان خستوەتە بەردەم کۆڕ و کۆمەڵگەی یەکێتیی سۆڤێتی پێشوو و دنیا، تەنانەت کوردناسێکیش (مەبەست کوردناسی سۆڤێتی پێشوو چ کورد و چ ناکورد) بەشداریی ئەم کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی

تریان نەکردووە و، بگرە لە نووسینەکانی خۆیاندا کەڵکیان لەم کتێبانە وەرنەگرتووە، چونکە ئەوەی کە خۆیان نووسیویانە، بەدرۆ دەخرێتەوە و پێچەوانەی یەکن. پیاو و ئەندام و بەناو نوێنەرانی پارتە کوردیەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان، بەتایبەت کوردستانی باشوور، بە بیانووی ئەوەی کە ئەوان دەست وەرنادەنە کاروباری کوردی سۆڤێت، خۆیان لە کێشە هاوبەش و نەتەوایەتی و مرۆڤایەتیەکە لادا. کەچی نوێنەرانی کۆری و ئەڵمان و جو و یۆنان و... گەلانی تر لە دەرەوە هاتن و، ڕایانگەیاند نەتەوەکانیان لە سەردەمی ستالیندا زوڵم و زۆریان لێ کراوە و پێویستییان بە پشتگیریی ماددی و مەعنەوی هەیە. مەترسی و گێرە و کێشەش بۆ هیچ کوردێك نەدەهاتە پێش، چونکە ئەو تاوانە چەندین جار پاش نەمانی ستالین، لەلایەن پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤێتی و ڕووسی و کۆمارەکانی تری سۆڤێتەوە بە پیسترین شێوە شەرمەزار و ڕیسوا کراوە. لەلایەکی ترەوە، دەوڵەتە داڕزاوەکەی سۆڤێت نەماوە، تا مەترسی لەم بارەوە بکرێ. جگە لەوە، هەواڵی ئەم چەشنە کۆڕ و کۆبوونەوە یاخود کتێبانە بڵاو ناکەنەوەو هەوڵی وەرگێڕانیان نادەن، تا براکانیان لە بەشەکانی تری کوردستان ئاگاداری ئەو کارەساتانە نەبن کە بەسەر کوردەکانی سۆڤێتدا هاتوون.

لە ناوچەیەکی شاری مۆسکۆ دەژیام، قوتابخانەی کۆریەکانی لێ بوو. دوانیوەڕوان و ئێواران و هەموو ڕۆژانی شەممە و یەکشەممەیەك، قوتابیانی هەموو پۆلەکانی سەرەتایی و ناوەندیی تایبەت بە کۆریەکان بە زمانی زگماکی خۆیان دەیانخوێند. ئەو گەلەی کە وەك کورد دووجار تووشی ڕاگوێزان بووە و چەند وەچە بوو بواریان پێ نەدراوە گەشە بە کولتوور و زمان و کەلەپووری خۆی بدات. کاتێك لەم بارەیەوە پرسیارم کرد، وتیان لە مۆسکۆ چەند قوتابخانەی ئەوتۆمان هەیە، جگە لە ناوەند و داموودەزگای تر، گۆڤار و ڕۆژنامەیان هەیە. زۆر جاریش لەو ناوەدا ماشێنم بە ژمارەی دیپلۆماسی یا سەفارەتی کۆریاوە دەدی، کۆڕ و کۆبوونەوەی زۆریان ڕێك دەخست و گرووپی مۆسیقا و هەڵپەڕکێ و... یان

هەبوو و گەلانی تریش هەیانە. ژمارەی کورد لەچاو زۆربەیان زیاترە. ڕاستە لەلایەن دەوڵەتی کۆریا و بازرگان و خێرخوازەوە پشتیوانی دەکرێن، ئێمەی کورد دەوڵەت و باڵوێزمان نییە. دوو نوێنەری دوو حکومەتی کوردستان هەیە. توانای ماددی ئەوتۆمان نییە، بەڵام بەگوێرەی توانا -با کەمیش بێ- دەمانتوانی لەم بارەیەوە هەنگاوێك هەڵگرین و وەك چۆن کۆریەکان و چیچنیو ئینگووشی و بالکار و قەرەچایڤەکان و.... ساڵانە یادی کارەساتەکانیان دەکەنەوە و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕووسیاش هەمووی بڵاودەکەنەوە، ئێمەش وا بکەین. پەرلەمانی کۆماری ئەرمینیا لە ١٩٩٤/٥/٢٥ بڕیاری ژمارە ١-١٠٦٢ "سەبارەت بە پەسەندکردنی گەلاڵەی یاسایەك لەسەر ئەو کەسانەی (؟) کە بەزۆر ڕاگوێزراون"

١٩٩٤/٦/١٤ ئەم یاسایە، "سەبارەت بەو کەسانەی کە بەزۆر ڕاگوێزراون"، کە بارودۆخی ئەو کەسانە و چۆنیەتی جێبەجێکردنیی تێدا هاتووە، "تێرپێتڕووسیان"ی سەرۆك کۆماری ئەم دەوڵەتە ئیمزای کرد. هەروەها لەسەر بناغەی ئەم یاسایە، کۆماری ئەرمەنستان لە ١٩٩٤/١١/٢٩دا "چۆنیەتی دانی ناسنامەی تایبەت"ی دایە ئەو کەسانەی کە بەزۆر ڕاگوێزراو دەژمێردران یا بە کەس‌وکاریان[(١٠٤)].

ئەو چەشنە بڕیارانەش لەلایەن کۆمارەکانی تری سۆڤێتی پێشووەوە، بەتایبەت جۆرجیا و ئازەربایجان، دەرچووە. ئەویش زیاتر لەبەر دیموکراتخوازی و ڕەچاوکردنی مافی مرۆڤ، لەلایەن کۆمەڵگەی نێونەتەوەیییەوە، بەتایبەت ئەوروپا و ئەمریکا، کە هەندێ مەرجیان بۆ داناوە و یارمەتیدانیان بەو جۆرە ڕیفۆرمانەوە گرێداوە، لەبەر کێشەی (ناگۆرناقەرەباغ)ی نێوان ئازەری و ئەرمەنی و کێشەی ئابخازیا کە لەژێر دەسەڵات و چوارچێوەی کۆماری جۆرجیا دەرچووبوو......

ئەگەر بە وردی بڕوانینە ئەم بڕیارە، باسی تاکە کەس ئەکات نەك نەتەوە و گەلێك. جگە لەوەی کە کەسانی کوردی نەگرتوەتەوە و، کورد نەکەوتوەتە بەر ئەم

---

(١٠٤) بوگای ن.ف، گونوڤ. ئا.م، قەفقاز: گەلان لە قافڵە شەمەندەفەریەکاندا (ساڵانی ٢٠ تا ٦٠ی سەدەی بیستەم)، مۆسکۆ، ١٩٩٨، ل١٣.

یاسایە، تەنیا بۆ ئەرمەنیە دەرکراو و ڕاکردوەکان و ئەوانە بووە کە بەتاوانی جۆراوجۆر سزادراون.

کورد وەك هاوولاتییەکی ئەرمەنستان (یا ئازەربایجان و جۆرجیا) کە لە ١٩٣٧ و ١٩٤٤دا بەزۆر دەرکراوە و دەست بەسەر سەرو ماڵیدا گیراوە، بەڵگە بەدەستەوە نییە کە چەند شتی پاش خۆی بەجێهێشتووە و لای کێیە و بەکێ دراوە و داوا لەکێ بکات. زۆربەی هەرەزۆریان لەژیاندا نەماون و، منالْ و نەوەکانیشیان ناتوانن داوای بکەن و بگەڕێنەوە ئەو گوند و شارەی کە باووباپیران لێی ژیاون. گەرانتی ئەو دەوڵەتە یا گەرانتیەکی نێونەتەوەیی نییە، تەنانەت وەك تاکەکەس یا هاوولاتی ئەوێ بگەڕێنەوە. جگە لەوە، ئەمڕۆ ئەو پاسپۆرتەی کە هەیانە، هی کۆمارەکانی کازاخستان و ئۆزبەکستان و قرقیزستان و ڕووسیایە. زۆربەیان لەوێ لەدایك بوون و هاوولاتی ئەوێن، واتە بێگانەن و دەبێ لەکوێ لەدایك بوون بڕۆنەوە ئەوێ. ئەو تاوانەی کە ڕژێمی ستالین و ڕژێمەکانی تری سۆڤێتی کردوویانە، ئەوان لێی بەرپرس نین. کوردەکانی ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربایجان لەو سەردەمەدا زۆربەیان لە کەڵخۆز و سوڤخوەکاندا کاریان کردووە کە موڵکی دەوڵەت و بەناو موڵکی گشتی بووە. واتە وەك ڕووسەکان دەڵێن نە هی کەس بوو نە هی منیش بوو. ئەمڕۆ خەڵکی تر ئیشی لێ دەکەن یا دراوەتە دەستی یا فرۆشراوە بە کەرتی تایبەت و ناتوانی بیسەلمێنی کە تۆش لەوێ کارت کردووە و ڕێکت خستووە و ئاوەدانت کردوەتەوە. ئیتر لەم لاوە دەبرێن بۆ ئەولا و لەولاوە بۆ ئەولا، کەس بەرپرس نییە، چونکە دەوڵەتەکەیان لەسەر بنەمایەکی ڕەگەزپەرستانە و شۆڤێنیانە دامەزراوە، تۆ بە هیخۆیان نازانن و جێگای تۆ لە وڵاتەکەیاندا نابێتەوە. ئەوانەش کە خانووبەرە یا پارچە زەوییەکیان هەبوە و لە باووباپیرانیانەوە بۆیان بەجێمابوو، زۆربەیان تاپۆ نەکرا و، ئەگەر کرابن ئەم بەڵگانە لەلایەن دەسەلاتدارانی ئەوێوە لەناوبراون. ئێستا خەڵکی تریان لێ دەژین و بەناوی ئەوانەوە (هاوڕەگەزی) تاپۆ کراوە. جگە لەوە، ناوی گوند و شارەکانیشیان گۆڕیوە و ناوە کوردیەکان یا ناوە کۆنەکانیان سڕیوەتەوە.

لەلایەکی ترەوە، کاتی ڕاگوێزانیان لە ١٩٣٧و ١٩٤٤دا کاتێك هێزە سەرکوتکەرەکانی لەشکری و ئاسایشی سۆڤێت گەمارۆیان دان و ٢٤ سەعات بواری خۆکۆکردنەوەیان پێدان. خۆ بواری با بلێین هێنانی بەڵگە یا تەحویلدانی سەروسامانیان نەبوە و بۆشیان نەکردوون. لە زۆر گونددا فەرمانبەرانی کریملن سەرو سامانی گوندەکانیان پێکەوە نووسیوە، چەند ئاژەڵ و ئەسپ و گەنمو..... لێ بووە. بەڵام چەندی هی کێ بووە، نەیان نووسیوە. پاش ڕاگوێزانیشیان بواریان پێ نەداون لانی کەم بگەڕێنەوە بەدوای شتەکانیاندا، یا خانووبەرە و شتەکانیان بفرۆشن. خۆ وەك تورك و عەرەب و فارس تەنیا هەندێ ناوچەی کوردستانی نەکردووە بە تورك و عەرەب و فارس، یا زۆر ناوچەی کوردستانی وەك ئەوان چۆڵ نەکردووە و نەسووتاندووە.

وەك ڕژێمی بەعس، یاسای نهێنیی دەرنەکردووە کە کورد بۆی هەبێ شت بفرۆشێ و بۆی نەبێ شت بکڕێ، یا بەزۆر کورد ناچار بکرێ سەر و سامانی خۆی بفرۆشێ و بڕوات، یا پاش گۆڕینی ڕژێم و لێبوردنی گشتی و بەهۆی شۆڕشەوە بگەڕێتەوە جێو شوێنی باووباپیرانی.

لێرەدا باسی هەندێ لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە ناکەم کە کاتی خۆی نووسیویانە کوردەکان لەبەر کاری بێوچان و پڕ لە بەرهەم دامودەزگاکانی دەوڵەتی و حیزبی، بەتایبەت سەرۆکی کەڵخۆز و سەڤخوزەکان ڕێزلێنان و خەڵات و نیشانەی کاری سۆسیالیستی و.... بە ناوو وێنەوە داونەتێ. چەند دڵسۆزانە ئیشیان کردووە و چەندساڵی تەمەنیان لەپێناو ئابووری و ئاوەدانکردنەوە و پێشکەوتنی ئەم وڵاتەدا پێشکەش کردووە، هەمووی بەفیڕۆ چووە. لەباتی ئەوەی مووچەی خانەنشینی وەربگرن، بەزۆر ڕاگوێزراون و، هەبوە لە داخ و خەفەتدا لە ڕێ و تاراوگە مردووە و، هی واش هەبوە ماوەتەوە و، نە پێشینەی کاری پێشووی بۆ حیساب کراوە و، نە تەمەنی کە بەپێی یاسای کاری سۆسیالیستی و نێونەتەوەیی چیتر نابێ کاربکات لەبەرچاو گیراوە. بەزۆر کاربکەی و لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی پاسەوانەکاندا پلانی سۆشیالیستی پڕ بکەیتەوە، ئەگینا ناژی و نانت نادەنێ و ژن و منداڵت بە برسێتی دەمێننەوە. لە تاراوگە، یاسا و

چوارچێوەیەکی تایبەت بۆ گومانلێکراو و تاوانبارانی نیشتمان دانراوە. باسی ئۆردوگاکانی ئیجباری و ئامرازی کلاسیکی کارکردنیان و کاری سەختی وەك کارکردن لە کانگای خەڵووز و دروستکردنی ڕێگەی ئاسن لە بەفر و سەرماداو، خواردن و جیۆژیان و سەعاتەکانی کار و ناشتنی مردوەکان لە شوێنی کارکردن کە تەنانەت کەسوکاریشیانی لێ ئاگادار ناکرێتەوە و شوێن و ئەو ڕێگەوبانانەی کە دروستیان کردوون و ... پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت هەیە.

لەپاڵ ئەوەدا، کوردەکانی سۆڤێت بواری گەڕانەوەیان بۆ شوێنی باووباپیرانیان پێ نەدراوە و، لە چەند کۆماری سۆڤێتی پێشوودا بە زمانی ڕەسمیی ئەوێ، واتە جگە لە ڕووسی، بە ئۆزبەکی و قرقیزی و کازاخی و.... خوێندوویانە و، ئەگەر تا دوێنێ بوو زمانی ڕووسی زمانێکی سەرانسەری و فێربوونی حەتمی بوو، زمانێك بوو هەموو گەلانی سۆڤێت قسەیان پێدەکرد و، بەکورتی زمانی ئاخافتن و پەیوەندیگرتنی گەلانی سۆڤێتی جاران بوو، ئەمڕۆ -واتە پاش ڕووخانی سۆڤێت- ئەو زمانە باوێکی ئەوتۆی نەماوە و، بگرە لە هەندێ کۆماری سۆڤێتدا قوتابخانەکانی ڕووسی داخراون و زمانی ڕووسی زمانێکی ڕەسمی نییە، بەڵکوو خوێندن و زمانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە زمانی ڕەسمیی نەتەوەی بالادەست و دەسەلاتدارە و، چەند وەچەی کوردیش فێری ئەو زمانانە بوون. واتە کوردی ڕاگوێزراوی کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیا و جۆرجیا، ئەمڕۆ کە دەیان ساڵە لە کازاخستان یا لە ڕووسیا و قرقیزستان و ئۆزبەکستان دەژی یا لەوێ لەدایك بووە، ئیتر زمانی ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجی نازانێ. ئەمە هۆیەکی تری نەگەڕانەوەیانە. بەپێی یاسای نوێی کۆمارەکانی سۆڤێتیش، کەسانێك دەتوانن پاسپۆرت و ناسنامەی هاووڵاتیی ئەو کۆمارانە وەربگرن، کە ٥ ساڵی دوایی لەوێ ژیابن و زمانی ئەوێ بە ڕەسمی بزانن و شوێن و... هەبێ. واتە جگە لەو شتانەی کە پێشتر باس کران، ئەوە ڕەچاو ناکرێ کە بلێی باووباپیرانمان لێرە ژیاون و بەزۆر دەرکراون.

ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەی تایبەتی دەوێ. بەوپێیە، لە باری یاسایییەوە، کورد نەك تەنیا مافی نییە، بەڵکو سیستەمی یاساگوزاری ئەو کۆمارانە خۆیلەخۆیدا

سنووری بۆ گەڕانەوەیان داناوە. کوردەکان، تەنیا بە دەست تێوەردانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و گەرانتی ئەوان، دەتوانن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، چونکە هەتا ئەمڕۆش زەمینەی لەبرچاوگرتنی مافی مرۆڤ و دیموکراسی لەو ڕژێمانەدا بەدی ناکرێ و چاوەڕێش ناکرێ لە داهاتوویەکی نزیکدا لەم بارەیەوە هەنگاوێك هەڵگرن. بەڵگەو دیکومێنتێکی زۆر لەم بارەیەوە هەیە کە چۆن و کەی کوردەکان بەزۆر ڕاگوێزراون و لەکوێ جێگیر کراون و، خەڵکەکەش بۆ خۆی ماوەو ئاواتەخوازی گەڕانەوەن.

گرنگ ئەوەیە، بە پشتبەستن بە یاساکانی نێونەتەوەیی و مافی مرۆڤ،، ئەزموون لەم بارەیەوە (واتە گەڕاندنەوەی خەڵك بۆ نیشتمانی خۆیان) لە دنیادا زۆرەو، دنیای پێشکەوتووش دەتوانێ بە سەلماندن و بە مەرجی ئەوەی کە ئەو کۆمارانە ئەندامی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیین، بە یارمەتیی هەمەلایەنە بواری گەڕاندنەوەیان مسۆگەر بکات و، تەنانەت قەرەبووی زەرەرو زیانی ماددی و گیانیشیان بۆ بکرێتەوە. ئەمە پێویستی بە هەوڵ و تەقەلای کوردی سۆڤێت و کوردی بەشەکانی تری کوردستان و هێزو ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردو ڕێکخراوە مرۆڤایەتیەکان و پارێزەرانی مافی مرۆڤ و.... جیهانی هەیە کە ئەم تراژیدیایەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی بگەیەننە ئاستی ناوخۆو نێونەتەوەیی.

خاڵێکی بایەخدار کە پەیوەندیی بەم کێشەیەوە هەیە، ئەوەیە کە ئەمڕۆ کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان (لەسەر ناگورنا قەرەباغ و کێشەی ئاوارەکان و....) و کۆماری جۆرجیاش لەسەر ئابخازیا و ئەسەتین و چەند کێشەی تر خۆیان پەنایان بردووەتە بەر کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی (ڕێکخراوی UN و پەرلەمانی ئەورووپا و...) بۆ چارەسەر کردنیان و، بەبێ نێونجیکردنی ئەوانیش کێشەکانیان چارەسەر نابێ. دەکرێ کێشەی ڕەوای کوردی سۆڤێتیش لە چوارچێوەی ئەو کێشانەدا چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە. ئەمە کارێکی زۆر دژوارو بێ چارەسەر نییە. دەشێ فاکتەری مێژوویی‌و ئینسانیی کوردیش ببەسترێتەوە بە کێشەکانی تری ئەو کۆمارانەوە. واتە کێشەی ناگورنا قەرەباغ هەر کێشەی نێوان ئازەری و ئەرمەنی نییە، چونکە کوردستانی سوور لە

چوارچێوەی ناگورنا قەرەباغە و لەبەر بێ دەسەلاتی‌ی کوردو نەبوونی پشتیوانێك خۆیان لێ بێ‌دەنگ کردووە.

پێم وایە یەکێك لە فاکتەرە هەرە گرنگەکان کە کوردی سۆڤێت دەتوانێ هەمووکاتێك پشتی پێ ببەستێ، ئەو بڕیارو وتارە ڕەسمییانەی دامودەزگاکانی حیزبی‌و دەوڵەتی سۆڤێتن سەبارەت بە تاوانەکانی ڕژێمی ستالین کە خۆبەخۆ دان پێدانانن و، هەنگاونانە بۆ گەڕانەوەی بەزۆر ڕاگوێزراوەاکان بۆ شوێنی خۆیان و، هەروەها پەسندکردنی ئەم بڕیارانەیە لەلایەن دەوڵەت و پەرلەمانی کۆمارەکانی سۆڤێت‌و، بەتایبەت ئازەربایجان و ئەرمەنستان و جۆرجیاوە. لەلایەکی ترەوە، پاش ڕووخانی سۆڤێت و سەربەخۆبوونی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، هەم دەوڵەت و پەرلەمان و هەم سەرۆکەکانی ئەم دەوڵەتانە، دیسانەوە بەجیا یا پێکەوە (کۆبوونەوەی ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ لە بشیکیك) دانیان بەو تاوانانەدا ناو، بەڵێنی گێڕانەوەی ئەو گەلانەیان دا کە لە سەردەمی ستالیندا لە کۆمارەکانیان هەڵکەندران. واتە ئەمڕۆ دانانان بەو تاوانانەدا، ڕەهەندێکی نێونەوەییشی وەرگرتووە. ڕاستە بڕیاری هەندێ کۆمار، سەبارەت بە گەڕانەوەی کەسان یا دەستەو تاقم، نەك گەل و نەتەوەکان، لەئارادایەو، باسی پێکهێنانەوەی قەوارەی نەتەوەیی‌و دەوڵەتی بۆ ئەم گەلانە ناکرێ. بەڵام کە باسی گەڕانەوەی کەسان و گرووپ دەکرێ، با سەرەتا ئەوانە بگەڕێنەوە، پاشان و بەرەبەرە زەمینەو بواری مافی کولتووری و زمان و قوتابخانەو ... یان دەبێ، تا دەگاتە داوای دروستکردنەوەی قەوارە یا بەڕێوەبەرایەتی و ئۆتۆنۆمی. هەروەك باس کرا، کوردی بەشەکانی تری کوردستان، بەتایبەت هێزە سیاسیەکان‌و، ڕووناکبیران و کەسایەتیەکان، دەتوانن یاریدەدەرو ڕێنوێن و پاڵپشتی گەڕانەوەی کوردی سۆڤێتی بن. بۆ وێنە، کوردستانی باشوور ئەمڕۆ دەتوانن دەوری ڕاستەوخۆیان لە ئاستی دەوڵەتی لەگەڵ کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێتدا بۆ ڕەچاوکردنی مافی براکوردەکانیان هەبێ. هەروەك چۆن دەوڵەتانی ئەڵمان و کۆریا و یۆنان و ئیسرائیل... بە ئاشکرا کێشەی براکانی خۆیان، کە سەردەمی ستالین لەگەڵ کورددا بەزۆر ڕاگوێزرابوون، لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤێتی‌و پاشانیش حکوومەت و سەرۆك دەوڵەتانی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێتدا باس و تاووتوێ کردو خێری دایەوە.

١٩٢٣/٧/٧ بڕیاری پێکهێنانی ئۆتۆنۆمی کوردستان له چوارچێوەی ناگورناقەرەباغدا دراوە [١٠٥].

بڕیاری تەواو سەبارەت بە کێشەی دروستکردنی ئوکروگی (ناوچە)ی نەتەوەی کوردستان، کۆمیتەی ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی‌ی ئازەربایجان لە ١٩٣٠/٥/٢٥ دا"لەبارەی دروستکردنی زاکاتال و نوخین و کوردستانەوە" دەری‌کرد.

١٩٣٧/٧/١٧ کۆمیتەی ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی و شوورای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت بڕیاری ژمارە ٢٦٧-١١٢٧-١٠٣یان سەبارەت بە دروستکردنی پشتێنەی ئاسایش (پاراستن)ی سەرسنوورەکان (ناوچەی ئاسایش) دەرکرد. بۆیە ١٣٢٥ هاووڵاتی کورد لە ناوچە سەرسنووریەکانی ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە نێردرانە قووڵایی وڵات، ٨١٢ یان بۆ قرقیزستان و ٥١٣ یان بۆ کازاخستان. ئەمە بەپێ‌ی بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی چوارەمی وەزارەتی پارێزگاری‌ی یەکێتی‌ی سۆڤێت و بە ئیمزای "کوروچکین"ی سەرۆکی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە [١٠٦].

١٩٣٨/١/١٩ بڕیاری گواستنەوەی دووهەزار بنەماڵە (٦ هەزار کەس)ی ئێرانی لە ناوچە سەرسنووریەکانی ئازەربایجان لەگەڵ ئێراندا درا.

کوردستانسکی ئویزد (ناوچەی کوردستان) کە ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩ناوەندەکەی لاچین بوو، لە ١٩٢٩-١٩٣٠دا بووە کوردستانسکی ئوکروگ (ناوچەی کوردستان)و، لەجێ‌ی کوردستانێکی ئویزد، لە ناوچەکانی کەڵباجار، قوبالکی، قوتورلی، زەنگیلان و بەشێکی ناوچەی جەبرەئیل پێك هێنرا. بەم چەشنە، لە باری مێژووییەوە، کوردی سۆڤێت دوو جار ناسنامە یا قەوارەی نەتەوەیی-تریتوورییان بۆ پێك هێنراو دانی پێدانرا [١٠٧].

تەواوی ئەو کردەوانە بۆ ڕاگوێزانی زۆرەملی‌ی گەلان، نەك تەنیا لە باری ئایدۆلۆژی‌و سیاسییەوە لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی‌و حیزبی‌یەوە دەرچوون،

---

[١٠٥] قەفقاز: "گەلان لە قافڵەکاندا (ساڵانی نێوان ٢٠ تا ٦٠ی سەدەی بیستەم)، ل١٠٣.

[١٠٦] هەمان سەرچاوە، ل١٠٤.

[١٠٧] بابەتەکانی کولتووری کوردی پشت قەفقاز، ل٧٦.

بەڵکوو لە باری یاساییشەوە بە بڕیاری وەزارەتەکانی ناوخۆو شووڕای باڵای یەکێتیی سۆڤێتی (پەرلەمان) و دامودەزگاکانی سەر بە شووڕای وەزیران و وەزارەتەکانی ناوخۆو پارێزگاری، بەرگو ناوەڕۆکێکی یاسایییان پێ بەخشرا[١٠٨]. ئەگەر فەرمانی گواستنەوەی ئەو گەلانە لەلایەن ستالینەوە دەرچووەو وەزارەتەکانی ناوخۆو پارێزگاری و بەرگری و... جێبەجێیان کردووە، دەبوو شووڕای باڵای یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمان کە گوایا هەم نوێنەری ئەو گەلانەو هەم نوێنەری کۆمارەکان و ئۆتۆنۆمیەکانی تێدایە) بە دەرکردنی بڕیاری خۆی شەرعییەت بەو بڕیارە تاوانبارانەیە بدات. واتە دەبوو بەناوی گەلان و یاساوە پەسندو تاووتوێ بکرێن، یاخۆ کەس نەیوێراوە دژی ئەم فەرمان و دەستوورەی ستالین بوەستێتەوە یا ڕەخنە بگرێ و دەنگی بۆ نەدا. هەر ئەم پەرلەمانەی سۆڤێت کە گەورەترین دەسەڵاتی هەبوەو نوێنەری گەلان و یاسادانەر بووە، کە دەبوو بەبێ پەسندکردن یا بڕیاری ئەم دەزگا باڵایە هیچ نەکرێ، ئابڕووی سیستەمی پەرلەمانتاریی بردووەو هەموو یاساکانی سۆڤێت و نێونەتەوەیی و ئەخلاقی و مرۆڤایەتیی بە جۆرێکی بێوێنە لە دنیادا پێشێل کردووە (ئەمەش بابەتێکی تایبەتەو پێویستە بەجیا لەسەری بنووسرێ). زۆرجار پەرلەمانەکانی دنیا دژی بڕیار یا سیاسەتی دەوڵەت یا سەرۆك کۆمار یا سەرۆك وەزیر و هتد... ڕاوەستاون و، تەنانەت داوای لاچوون و دادگاییکردنیان کردووە، یا هەموویان دەنگیان نەداوە؛ یا پارت و هێزی سیاسیی ئۆپۆزیسیۆن لە پەرلەماندا هەبوون و کردوویانە بە هەراو دەنگیان نەداوە. کەچی پەرلەمانی سۆڤێت کە هەمووی حیزبی بووەو، حیزبیش واتە سەرۆك ستالین، دەستووری داوەو دەبوو پەسند بکرێ. خۆ تەنانەت نوێنەرانی ئەو گەلانەش لەم پەرلەمانەدا (کە کوردی تێدا نەبوە)، نەیانوێراوە بپرسن کە چۆن ئەو هەموو گەلانە تاوانبارن ؟

باسی ئەوەش نەکراوە، چی لە یاسای بنچینەیی بکرێ کە هاوڕێ ستالین و حیزب بەپێچەوانەیەوە دەجووڵێنەو، ئیرادەی پەرلەمان و نوێنەرانی گەلانی

---

[١٠٨] کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراو، ل٣٨.

سۆڤیێتیان خستوەتە ژێر پێ. سیستەمی شوورایی (بە ڕووسیەکەی سۆڤیێتی)، کە گوایا باشترین دەسەڵاتی کرێکارو زەحمەتکێش و هەموو گەلانی سۆڤیێتی و هەڵبژاردەی خەڵك و دەسەڵاتێکی گەلێری بوو و، لە باڵاترین شوورای باڵای یەکێتی‌ی سۆڤیێت (پەرلەمان)دا خۆی دەبینیەوە، ئەم چەشنە تاوانانەی پەسند کردووەو دەنگی پێداوەو ناوەڕۆکێکی یاسایی‌و گەلێری داوەتێ‌و بە چەپڵەلێدان و بژی سەرۆك ستالین و سڵاو بۆ پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤیێت کۆتایی بە کۆبوونەوەو بڕیارەکان هێناوە. هەر ئەم دیموکراتیترین پەرلەمانەی دنیا، تەنانەت نەیتوانیوە پێشنیار بکات ئەو خەڵکانە پاش تەواوبوونی شەڕ بگەڕێنەوە جێ‌وشوێنی خۆیان.

هەندێ جار کە مرۆڤ، بیر لەم تاوانانە دەکاتەوە، سەری سوڕدەمێنێ کە چۆن ئەم ڕژێمە لە کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا جێ‌ی کراوەتەوە؟ چۆن ئەوەندە تەمەنی درێژ بووە ؟ چۆن زووتر نەڕووخا ؟

لەلایەکی ترەوە، سەیر ئەوەیە هەر ئەم پەرلەمانەی سۆڤیێت، پاش مردنی ستالین، بەپێچەوانەی بڕیارەکانی چەند ساڵ لەوەوبەری خۆیەوە، سیاسەتی تاوانبارانەو دژی یاسایی ستالینی شەرمەزار کرد و داوای لێبوردن و بەڵێنی گەڕانەوەی ئەو گەلانەو مافە زەوتکراوەکانیان داو، یاسا و بڕیاری زۆری بۆ ئەو گەلانە دەرکرد؛ کەچی نیوەچڵ بوون و هەموو گەلەکانی نەگرتەوەو تائێستا جێبەجێ نەکراون و هەر لەسەر کاغەز ماونەوە. واتە هیچ ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لە ژیانی ئەو گەلانەدا کە نەگەڕانەوە، نەکراوە.

· شتێکی زۆر سەیرتر و دوور لە هەموو لۆژیکێك ئەوەیە، کە دەستەی سەرۆکایەتی‌ی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست (هەر ئەوانەی سەردەمی ستالین)، بەبێ ئەوەی پرس بە هیچ لایەنێك بکات و بەوردی لە کێشەکان بکۆڵێتەوە، بڕیاری دەرکردووە. بۆ وێنە، میکویان، ڤەرەشیلۆڤ، مالینکۆڤ، بریژنیڤ، بیلیایڤ بڕیارێکیان ئامادە کردووەو نێردراوە بۆ ئەندامانی تری سەرکردایەتی‌ی حیزب و دەوڵەت، تا لە داهاتوودا پەسندو دەنگی لەسەر بدرێ،

ئەویش سەبارەت بە هێشتنەوەی چیچنی و ئینگووشەکان لە کازاخستان و پێکهێنانی چەشنە ئۆتۆنۆمییەك بۆیان. واتە سەرکردایەتی ی ئەم حیزبە، کە یەکێك لەوانە ڕێبەری داهاتووی سۆڤێت واتە بریژنیڤ بووە، بەبێ ئەوەی پرس بە چیچنی و ئینگووشەکان و کۆماری میوان (کۆماری کازاخستان بە سەرکردایەتی و دانیشتووانی کۆمارەوە) بکات و، لە هەمووی گرنگتر، بەپێچەوانەی بڕیارو دەستوورەکانی پەرلەمان و حیزب و دەوڵەتی سۆڤێتی یەوە سەبارەت بە شەرمەزارکردنی سیاسەتی ستالین بەرامبەر بەو گەلانە و.... ئایا دەبوو ئەویش ١٣ ساڵ لە مردنی ستالین، واتە ١٩٥٦/١٢/٢٢[١٠٩]، بهێڵێ گەلێك لەسەر خاکی گەلێکی تر بەبێ پرسکردن بە هیچ لایەکیان بەزۆر جێگیر بکرێ ؟! ئایا گەلی کازاخ یا گەلی چیچنی و ئینگووشی دەیانوست لەوێ بمێننەوە ؟ ئەی نیشتمانەکەی خۆیان کە لێی دەرکراون، دەیانویست بگەڕێنەوە بۆی؟

سیاسەتی تاوانبارانەی ستالین بەرامبەر بەو گەلانە لە کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی ی سۆڤێتدا شەرمەزار کراوەو داوای لێبوردن لەو گەلانە کراوە و بەڵێنی ڕاستکردنەوەو گەڕانەوەی مافە لەدەستچووەکانیان و قەرەبووکردنی ئەو زیانەکان پێدراوە. بڕیار و دەستوورەکانی پاشتریش، جەختیان لەسەر گێڕانەوەی مافەکانی ئەو گەلانە کردووە. ئەمە هەموو شتێك دەگرێتەوە، لایەنی سیاسی و کولتووری و نەتەوەیی و تریتۆری و ... هتد. واتە ئەو گەلانە مافی گەڕانەوەو پێکهێنانەوەی قەوارەی خۆیان هەیە، بە واتای وەرگرتنەوەی ئەو مافانە کە لەدەستیان داون. بەڵام ئەوانە بۆچی ناهێڵن ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکرێن ؟ بۆچی کۆسپ و تەگەرە دەخەنە سەر ڕێگەی جێبەجێکردنیان؟

ئەم لایەنگرانەی ڕیبازی ستالین، یا با بڵێین لایەنگرانی ڕێبازی توندڕەو، کە هەر لە سەرکردایەتی ی حیزب و دەوڵەت و پەرلەمان و دەزگاکانی پارێزگاریدا ماونەتەوە، نایانەوێ خۆیان بەدەستەوە بدەن، یا واز لەو ڕێبازە بهێنن و، لە

---

[١٠٩] قەفقاز: گەلان لە قافڵەکاندا، ل٣٠٦-٣٠٧.

ئەنجامیشدا هەر سەردەکەون و درێژە بە تاوانەکانی ستالین ئەدەن و ناهێڵن ژمارەیەك لەو گەلانەو، لەوانە کورد، بگەڕێتەوە جێی باووباپیرانیان. ئەوانە بگرە لەژێر پەردەی ترو بەناوێکی ترەوە دەسەڵاتیش دەگرنەوە دەست. بۆ وێنە، بریژنیڤ کە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ سەرۆکی ئەم وڵاتە بوو، ئەو کەسە بوو کە نەیدەیست گەلان بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان) ؛ یا ملنیکوڤ و میکویان و ڤەرشیلوڤ و ... هتد، کە سەردەمی ستالین و خرۆشچوڤ و بیرژنیڤیش دەنگیان بە بڕیاری گواستنەوەی ئەو گەلانە دابوو.

بە بۆچوونی من، ئەگەر ئەو گەلانە بگەڕانایەتەوە جێی خۆیان و دیموکراتیەت لە سۆڤێتدا بەرقەرار بوایە، ئەو گەلانە داوای موحاکەمەکردنی ئەو تاوانبارانەیان دەکرد. کەواتە بۆ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ لە داهاتوودا ڕوونەدات و دەسەڵاتیان لەدەست دەرنەچێ، دەبێ نەهێڵن ئەو پرۆسەیە جێبەجێ بکرێ. لە لایەکی ترەوە، کەرامەتێ ئەو حیزب و دەوڵەتە دەشکاو، سەرەنجام لەوانەبوو ڕژێمەکە لەناوبچێ و، هەرواشی لێ هات و ڕووخانی ئەم ڕژێمە جێی شك و گومان نەبوو ! ڕووخاو و کەس پارێزگاریی لێ نەکردو، کەس بۆی نەهاتە سەر جادە. ئەوانەش کە ویستیان ئەم سیستەمە چاك بکەن و ئەم وڵاتە پێش بخەن، سەرنەکەوتن. کودەتای بریژنیڤ و هاوبیرەکانی بەسەر خرۆشچۆڤدا، یا ئەوانەی ویستیان کودەتا بکەن بەسەر گەرباچۆڤدا وێنەی زیندووی ئەم ڕاستییەن. بەڵام بۆ چارەڕەشیی گەلی کوردو چەند گەلی تر، ئەم سیستەمە نەگۆڕا، بەڵکوو ڕووخاو، بە ڕووخانەکەشی، تراژیدیای گەلی کوردو گەلە بێقەوارەو بێماف و پرژو بڵاوکراوەکانی زیاترو سەختتر کرد.

پاش ڕووخانیشی لایەنگرانی ئەو ڕژێمە تۆتالیتارو ستالینییە، کە پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیای فیدراڵ یەکێکە لەوانە، جاروبار بە وێنەی ستالین و سڵاوو بژی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتەوە، لە مەیدانەکانی مۆسکۆدا کۆدەبنەوە، وێنەی گەرباچۆڤ دەسووتێنن و هی خرۆشچۆڤ بەدەستەوە ناگرن و بە خراپە ناوی دەبەن. من مەبەستم پاکانەکردن بۆ خرۆشچۆڤ و گەرباچۆڤ نییە، لە

سەردەمی ئەوانیشدا گەلێك تاوان و كەموكوڕی هەبوەو، ئەوانیش هەر لەلایەن ئەو دەستەو تاقمەی بیروڕای كۆنەوەو بەناوی ئەوانەوە كراون. بەڵام هەرچۆنێك بێ خرۆشچۆڤ و گەرباچۆڤ و هاوبیرەكانیان ئەو تەلیسمە ڕەشەیان شكاندو، ویستیان سیمایەكی مرۆڤانەو دیموكراتیانە بەو سیستەمەی سۆڤێت بدەن و، ئاستی ژیانی گەلانی ئەم وڵاتە زۆر دەوڵەمەندو بڵند بكەنەوە.

ئەوانە سەدان هەزار زیندانی سیاسییان ئازاد كرد كە سیمبوڵی ئازایەتی گەلانی سۆڤێت بوون. زۆر جێی داخ و كەسەرە، پێش‌و پاش ڕووخانی ڕژێمی سۆڤێتی، ملیۆنەها ئەندامی ئەم حیزبە (كە هەمان كات بەرپرس‌و كاربەدەستی دەوڵەتی و ئەندامی پەرلەمانی ئەم وڵاتە بوون) لە خوارەوە هەتا ئاستی سەركردایەتی ڕەخنەو تاوانەكانی ئەم ڕژێمەیان ئاشكرا كردو، بە بەڵگەو لێكۆڵینەوەوە لەسەریان نووسین و بەداخیش نین كە ڕژێمەكەیان ڕووخا، بگرە گەلێك كەسایەتی‌و نووسەریش كە بۆ ئەوەی لە ڕابردوودا نووسیبوویان، وێڕای داوای لێبوردن لە كۆمەڵگەو خوێنەرانیان، ئەمڕۆ كتێبی نوێ و بەرهەمی تازەیان هەیە و ڕەخنە لە نووسینەكانی پێشووی خۆیان دەگرن. كەچی ئەوانەی خۆمان یا ئەوانەی لەسەر كورد شتیان نووسیوە، نەك تەنیا ئامادەی ئەم گۆڕانكارییە نین، بەڵكوو ئەگەر كەسانی تر لەم بارەیەوە بدوێن یا بنووسن دژی ڕادەوەستن. كارەساتی كوردی سۆڤێت دەبوو بابەتی دەیان كۆنگرەو كۆنفرانس و كتێب بوایە. بەڵام لێی بێ‌دەنگ بوون. وا باوە كە ڕووناكبیر و نووسەرو لێكۆڵەرو ڕێكخراوە سیاسیەكانی كوردستان، زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر ئەو پارچەیەی كوردستان دەنووسن یا چالاكی دەكەن كە پێوەی بەستراونەتەوە، كەچی كوردی سۆڤێت یا كوردناسی سۆڤێتی پێشوو و ڕووسیای ئەمڕۆ یا كۆمارەكانی تر خۆیان لەم كێشەیە نەداوە. خەڵكی ڕووسیاو یا كۆمارەكانی‌تر بداخ نین كە ڕژێمەكەیان كەوت و دەسكەوتی كەم یا زۆری هەبوو. ئەگەرچی قەوارەو دەوڵەت بۆ هەندێ گەل پێك هێنرایەوە، هێشتا ئەوانە دژی ڕووسیا ڕاوەستاون و بە قەرزداری دەزانن. كەچی كوردەكە نە قەوارەی بۆ پێك هێنراو نە هێشتیان لەسەر خاكی خۆی بژی !

دەڵێن ئەوی دەیچنی دەیدروویتەوە. پاش تێکچوونی یەکێتیی سۆڤێت، جگە لەو شەڕو کێشانەی کە لە ئەنجامی چارەسەر نەکردنی کێشەی نەتەوەییەوە لە کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوودا ڕوویان دا، ڕووس و زمان ڕووسەکانی ئەم کۆمارانە کە لە بیست ملیۆن زیاتر بوون، ژمارەیەکیان کە هەستیان بە مەترسی و پاشەڕۆژی خۆ کرد، بەرەبەرە ئەو کۆمارانەیان بەجێهێشت. ژمارەیەکیشیان لەبەر هۆی ئابووری، نەتەوەییو ئاینیو ... هتد و، هەندێکیشیان دەسەلاّتداران و هێزە ناسیۆنالیستەکان و خەڵکی ئاسایی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ناچاریان کردوون بگەڕێنەوەو، پێیان گوتوون بڕۆنەوە بۆ ماڵ و وڵاتی خۆتانو، لەسەر دیواری ماڵەکانیان نووسیوەو نامەیان بۆ ناردوون، یا لەسەر کارو چاپەمەنیەکان داوایان لێ کردوون بڕۆن، یا بەهۆی داخستنی قوتابخانە و چاپەمەنییەوە بە زمانی ڕووسیو ... هتد ناچاریان کردوون ئەو کۆمارانە جێبهێڵن. ئاشکرایە ئەوانیش نایانەوێ زمانی ئەو کۆمارانە فێربن و بدوێن و ئیش‌وکاری پێ ڕایی بکەن.

سەرەڕای بەستنی پەیمانی دووقۆڵی یەك یەکی ئەم کۆمارانە لەگەڵ مۆسکۆداو ڕەچاوکردنی هەندێ ئاکاری نێونەتەوەیی لەلایەن ئەم کۆمارانەوە لە بواری مافی مرۆڤ و دیموکراسیدا، ڕاکردنی ڕووس و ڕووسی زمان بەرەو ڕووسیا هەر بەردەوامە.ئیتر مۆسکۆ ئەو هێزو دەسەلاّتە نییە کە بە هەڕەشەو گەمارۆدانی ئابووریی ئەم کۆمارانە بتوانێ پێشی ئەم پرۆسەیە بگرێ (ئینجا کوردی لێقەوماوو بێدەسەلاّت و بێقەوارە و پشتیوان کە دەرکراوە بۆ کوێ بڕوات و کێ لەسەری وەجواب دێت). بۆ وێنە، کۆمارەکانی پری بالتیك لینڤ و لیتوانی و ئەستەنیا، نە تەنیا ئاشکراو ناڕاستەوخۆ پێیان گوتوون بڕۆنەوە بۆ ڕووسیاو قوتابخانەکانیان بەستوون، بەڵکوو پاسپۆرتیشیان پێنەداون و گوتوویانە ئەوانە بە نائاسایی و نایاسایی وەك داگیرکەر نێردراون بۆ ئەوێو سنووریان بۆ داناون لە چ ساڵێکەوە بۆ چ ساڵێك هاتبن، ئەویش بە مەرجێك فێری زمانی ئەو کۆمارانە بن، ئینجا پاسپۆرتیان پێ داون. ئەمە ڕواڵەتێکی درۆزنانەی چارەسەری کێشەی نەتەوەیی بوو لە سۆڤێت. هەڕەشەکانی ڕووسیاش لەم کۆمارانە بێکەڵکە، چونکە

ئەوانیش لە دەرەوە پشتیوانیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڕووس و ڕووس زمانانە لەگەڵ تورك و فارس و عەرەبی جێگیرکراو لە کوردستاندا بەراورد ناکرێن و، بەراوردکردنیان مەبەستی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە نییە. ئایا ڕووسێك کە لەو کۆمارانەو کۆمارەکانی تری سۆڤێت دەژی، یا عەرەب و تورك و فارسێك کە لە کوردستان دەژی، نابێ فێری زمانی ئەو گەلانە بێ، با زمانی قوتابخانەش هەر بە زمانی خۆی بێ ؟! واتە تاوانی ستالین و ڕژێمی سۆڤێتی کە کێشەکانیان چارەسەر نەکرد، نەك تەنیا زۆر گەل، بەڵکوو گەلی ڕووسیشی گرتەوەو، ئەوانیش بوون بە قوربانی پاشماوەی ئەم سیاسەتە.

هەر کەس شارەزای مێژووی سۆڤێت بێ‌و، تەنانەت ئەو کتێبانەی خوێندبێتەوە کە خودی نووسەرانی سۆڤێتی لەم بارەیەوە نووسیویانە، دەزانن کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست (قرقیزستان و ئۆزبەکستان و کازاخستان و..) لە هەموو بارێکەوە لەچاو کۆمارەکانی بەشی ئەورووپای سۆڤێت و، بگرە وڵاتانی جیهانی سێهەمیشدا دواکەوتوو بوون، بەتایبەت لە بواری ئابووری‌و سیاسی‌و کولتووری‌و کۆمەڵایەتی‌و، هەروەهاش پیشەسازی‌و خزمەتگوزاریەکانەوە. ئینجا گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو، زۆربەی هەرەزۆریان بۆ ناوچەو گوندو بیابانی چۆڵ‌و ڕووت و هەژاری ئەو کۆمارانە دوور خراونەتەوەو، گەلی کوردیش یەکێك لەو گەلانە بوو. جگە لە جیاکردنەوەیان لە دنیای دەورووپشت و دەرەوە، نەبوونی مۆڵەتی هاتوچۆکردن. ئەمە سەرەڕای ئەو بارودۆخە ناهەموارەی سەردەمی شەڕی جیهانی کە هەموو ئابووری‌ی وڵات بۆ شەڕ تەرخان کرابوو. برسیەتی نەك تەنیا لەو کۆمارانە، بەڵکو لە هەندێ هەرێمی بەشەکەی ئەورووپای سۆڤێتدا وای لە خەڵك کردووە کە سەگ‌و پشیلەو گژوگیا و... بخۆن و، ماوەیەکی زۆر (وەك لە ڕاپۆرتەکاندا هاتووە) خەڵك پەنایەکیان نەبوە و لە کون و چاڵ و قوژبندا ژیاون؛ پاشان ناچار بە گڵ خانووی سەدەکانی ناوەندیان دروست کردووەو، لەبەر چرادا و، هەواڵێکیش لە کارەباو تەلەفزیۆن.... نەبوە. وە نەبێ پێشتر شوێن‌و چادرو ئۆردووگایان بۆ ئامادەکردبن، یا لانی کەم نێردرابنە شارو ناوچە

ئاوەدانکراوەکان، بەتایبەت بۆ کۆمارە پێشکەوتوەکانی یەکێتی‌ی سۆڤێت کە لە باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و کولتووری‌و سیاسییەوە پێشکەوتووتر بوون. سەردەمی سۆڤێت، پاش هاتنە سەرکاری بەلشەویکەکان کاری تایبەت و ئازاد نەبوەو، مووچەی مانگانەی ئەو هەموو خەڵکەش هەر بۆ بژێویان بووەو، بواری پارەکۆکردنەوەیان بۆ ڕۆژی تەنگانە نەبوە، تا لەکاتی گواستنەوەیاندا توانیبێتیان شتومەکی پێویست بۆ خۆیان بکڕن، یا خانووی پێ بگرن (کە نەیانهێشتووە)، یا پێ‌ی دروست بکەن، یا جلوبەرگ‌و و پێداویستیەکانی ناو ماڵ و ژیانی پێ‌دابین بکەن.

زۆربەی ئەو ڕاگوێزراوانە، وەك لە سەرژمێریەکان و بەڵگەنامەکاندا هاتووە، منداڵ و ژن و بەساڵاچوو بوون‌و، پیاوو لاوەکانیان بۆ بەرەی شەڕ یان بۆ کارکردن بۆ بەرەکانی شەڕ (لە کارخانە و کشتوکاڵ و....) نێردراون، یا بە تاوانی جۆراوجۆر لە زیندان خراون.

زۆربەی دیل و کۆیلەکان لە نێرینە پێك هاتووە. بەڵام ژن و منداڵ و پەککەوتوو، شوێنی نالەبارو نامرۆڤانەیان هەبوەو ڕەفتاری خراپیان بەرامبەر پێڕەوی کراوە، ئەویش لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و بەناو لەسایەی سیستەمێکی سۆسیالیستیدا ! بۆچی ڕژێم هەر لەجێدا ئەم گەلانەی لەناونەبردووەو بۆ هەمیشە لەکۆڵ خۆی نەکردوونەتەوە ؟ گەلێك بۆچوون لەم بارەیەوە هەیە، لەوانە: ئەوە لە سەردەمی ڕژێمی ستالیندا بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی ئەو ناوچەو هەرێمانە بووە کە کاتی خۆی دانیشتوانیان لەناو براون (بە بەهانەی ژیانی هاوبەش و لەناوبردنی کولاك و دەرەبەگ و دەوڵەمەندو کەرتی تایبەت یا دژی شۆڕش بوونەوەو هتد).

هەندێك پێیان وایە: ڕژێم بەو چەشنە، بەپێ‌ی تیۆریەکانی خۆی، ویستوویەتی گەل یا نەتەوە یا کۆمەڵگەی سۆسیالیستی دروست بکات و، ئەوانی تێکەڵ کردووەو تا بەرە بەرە سنوورەکان نەهێڵێ و، ئەو گەلە کێوی‌و باوك‌سالارو بێ‌ناسنامەی چینایەتیانە تێکەڵی گەلانی تر بکرێن، تا پێش بکەون و، بەم جۆرە کێشەی نەتەوایەتییان چارەسەر بکرێ.

هەندێك دەڵێن: بێباوەڕی ڕژێمی ستالین بەرامبەر بەو گەلانەو مەترسیی ڕاپەڕین و جیابوونەوەیان و، لە سەردەمی شەڕی جیهانیی دووهەمیشدا لەبەر گومانلێکراوی یا هاوکاریکردنیان لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا و ناڕازیبوونیان لە سیستەمی سۆڤێت و... وای کرد کە بەو چەشنە لەگەڵیاندا بجووڵێتەوە. بە دەست پێکردنی شەڕ، هەلێك و بیانوویەك بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانە تاوانبارانەی ڕژێمی سۆڤێتی ڕەخسا (گەرچی پێش شەڕو پاش شەڕیش ئەم تاوانانەی هەر کردووە). من پێم وایە ئەم تاقیکردنەوەیە قۆناغی دووهەمی ئەزموونەکەی ڕژێمی سۆڤێتی بوو، چونکە ساڵی ١٩٣٧ و پێشتریش خەڵك و، لەوانە کوردی ساڵی١٩٤٤ بەزۆر ڕاگوازتووە. ئەگەر ڕژێمی ستالین تەمەنی درێژتر بوایە یا یا پاش مەرگی درێژە بە ڕێبازو سیاسەتەکەی بدرایە، ئەم تراژیدیایە چاوەڕێی گەلێك نەتەوەی تری دەکرد.

لەلایەکی ترەوە، کاتێك زۆربەی ئەم گەلانە بە کۆمەڵ ڕاگوێزران (١٩٤٤)، پێشڕەویی هێزەکانی ئەڵمانیای فاشی لە زۆربەی بەرەکانی شەڕدا ڕاگیرابوو، یا تێك شکابوون و ڕێرەو یا چارەنووسی شەڕ بە قازانجی هاوپەیمانان هەستی پێدەکرا.

**٤- کوردەکانی ئازەربایجان:**

**نووسینی بوکشپان.ئا باکۆ ١٩٣٢**

نامیلکەیەکی ٩٢ لاپەڕەیی‌و یاداشتەکانی نووسەرە لە ٣٦ ڕۆژی سەردان (٢ی ئۆگۆست- ٨ی سێپتامبەری ١٩٣١)ی ناوچەی (ئویزدی) کوردستانی ئازەربایجان (لاچین و کەلباجار) و ناوچەی نەخچەوان و لەلایەن بەشی زانیاری سەر بە وەزارەتی پەروەدەی ئازەربایجان و، هەروەها پەیمانگەی زانستی- توێژینەوەی دەوڵەتی ئازەربایجان (بەشی ڕۆژهەلات) بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی ئەو کێشە کولتوریانەی کە پەیوەندییان بە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانەوە هەیە سەردانێکی کورتی ناوچەکەی کردووە، کێشەکانی زمان و جیاوازی زاراوەکانی کوردی ئازەربایجانی‌و ئەرمەنستان و کێشەی ئاستی پەروەردەو بارهێنان مەبەستی سەرەکی گەشتەکەی بووە.

نووسەر هەر لە لاپەڕەی یەکەمی پێشەکی کتێبەکەیدا ڕەخنەی لە سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەتی ئەرمەنی گرتووە کە ناو یا نیشانەی دینیی کوردە ئێزدیەکانی لە بەڵگەو دیکومێنت و سەرژمێریە ڕەسمیەکانی ئەم وڵاتەدا بەجیا(وەك نەتەوە یا گەلێکی جیاواز-هەورامی) ناو بردووە. نووسەر هەرچەند گوتوویە: ماوەی گەشتەکەی کەم بووەو، سەردانی زۆر لە  ناوچە کوردنشینەکانی نەکردووە، زانیاریی زۆر گرنگی تۆمار کردووە؛ بە پشت بەستن بە هەندێ سەرچاوەی کۆن و بەڵگەو دیکومێنتی ئارشیڤەکان بۆ بواری مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و ... ڕوونکردنەوەی چاك و ساکار و زانستیانەی لەسەر کوردی سۆڤێت (کوردی پشت قەفقاس یا کوردستانی سوور) هێناوەتەوە. دەتوانین بڵێین: یەکەم نووسەری سۆڤێت یا ڕووس بووە کە بە ئاشکراو نەترسانە باسی هەبوونی بەشێکی کوردستانی لە چوارچێوەی سۆڤێت (ڕووسیای پێشوو)دا کردووەو، ڕەخنەی لە سیاسەتی چەوسێنەرانی ڕووسیای تیزاری‌و پاشان موساواتیەکانی ئازەربایجان و داشناکەکانی ئەرمەنستان و، تەنانەت سۆڤێتیش بەرامبەر بە گەلی کوردی وڵاتەکەیان گرتووە و، پەردەی لەسەر زۆر درۆو دەلەسەی کاربەدەستانی

سۆڤیێتی و چاپەمەنیەکان لەبارەی کوردی ئەم وڵاتەوە لاداوە. ئەم کتێبە بەرپەرچی زۆر بۆچوون و هەڵە دەداتەوەو، سیاسەتی شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستانەی تواندنەوەی گەلی کوردی لەلایەن (ئازەریو ئەرمەنی و...) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆو ڕوون کردووەتەوە. ئێمە لەم لێکۆڵینەوە یا بابەتەدا ئاماژە بەم سەرچاوە گرنگە دەکەین و، بەو هیوایەی بەجیا وەربگێڕدرێ و بکەوێتە بەردەستی خوێندەوارو لێکۆڵی کورد.

# نامەو ڕاپۆرتو بڕیارەکان

* بەشی ڕاگوێزراوانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت
هاوڕێ گرینبێرگ، شاری مۆسکۆ
یاداشتە ڕاپۆرت

پاییزی ١٩٣٧ هەزارو سەدو بیست‌ویەك بنەماڵەی کوردو ئەرمەن، لەپشت قەفقاسەوە بۆ کازاخستان ڕاگوێزراون. بەشێکی زۆری ئەو بنەماڵانە مرۆڤی کارکەریان نەبوەو، زۆربەیان منداڵی وردیان هەبوەو، لە منداڵی کەم تەمەن پێك هاتوون. خانووبەرەیەکی ئەوتۆیان نەبوەو، لە کون و قوژبندا ژیاون. شووڕای وەزیرانیش لەم بارەیەوە هیچ بەرنامەو پلانێکی بۆ ساڵی ١٩٣٨ پێشبینی نەکردووە و بەدەستەوە نەبوە.

لەبەرئەوە، ئەمانە لە بارودۆخێکی زۆر دژواردا، بەبێ هیچ داهاتوویەکی ڕوون لەسایەی سەری هەندێ لەوانە کە کارکەرو چالاك و زیندوو ماونەتەوە ژیاون. دیارە بەرپرسانی کەڵخۆز و دامودەزگاکان لە هەموو بارێکەوە خۆیان تێنەگەیاندوون. ئەوانە ناچار بوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کۆچ بکەن و داوای یارمەتی بکەن و ... هتد. بەشێك لەوانە تا ساڵی ١٩٣٩ توانیویانە سەربەخۆیانە لە کەڵخۆزەکانی ناوچەی ئالمائاتاو ناوچەکانی باشووری کازاخستان خۆیان بکەنەوەو، بەشێکی تریان نە سەقامگیربوون و نە دامەزراون.

من لەم بارەیەوە کێشەکەم خستە بەردەمی شووڕای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت سەبارەت بەوەی کە کێشەی ڕاگوێزراوانی کوردو ئەرمەن بۆ پلانی ساڵی ١٩٣٩ لەبەرچاو بگرن. تکاتان لێ دەکەم بڕیاری پێویست لەم بارەیەوە لەڕێگەی

شوورای وەزیرانی کازاخستانی سۆڤێتییەوە بدەن و، پارەو کەرەستەی پێویست بۆ ئەم ١١٢١ بنەماڵەیە دابین بکرێ؛ دەکرێ لەسەر حیسابی ئەو پارە و کەرەستەیەی کە بۆ کۆریەکان تەرخان کراون، وەربگیردرێ.

تێبینی: پێشەکی لیستی شوێنی نیشتەجێی ئەوانەتان بۆ دەنێرم.

سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی کۆماری سۆسیالیسی کازاخستان بەوەکالەت. لینینانتسی گەورەی دەزگای پاراستنی کازاخستان

گلادکۆڤ ١٩٣٨/١١/٩ ژمارە ٦٤٣٦١ [١١٠]

* لە وەزارەتی ناوخۆی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی کازاخستانەوە

ژمارە ١٠٣١٩ لە ١٩٣٨/٩/١٦

سەبارەت بە نامەی ژمارە ٤٣٨٤١ی ڕێکەوتی ١٩٣٨/٩/٥ لە وەزارەتی ناوخۆی کۆماری ئازەربایجانەوە، لیستی ئەو کەسانەتان بۆ دەنێرین کە لە ناوچە سەرسنووریەکانی ئازەربایجانەوە ڕاگوێزرابوون بۆ ئێستگەی شەمەندەفەری سیر-دارین لە باشووری کازاخستان و سەربەخۆ شوێنی ناوبراویان بەجێهێشتووەو گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆیان لە ئازەربایجان.

گایکۆڤیچ، سەرۆکی بەشی هەشتەمی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دەزگای پاراستی لیتینانتسی بچووک

سیرجنت بایکۆڤ،، پشکنێری بەشی هەشتەمی دەزگای پاراستن [١١١]

* بۆ سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوەکانی کازاخستان هاوڕێ ئابیشێڤ

ڕادەگەیەنین کە ٣ی ٦ی ئەمساڵ ١٩٣٨/٦/٣ قافڵەی واگۆنی شەمەندەفەری ڕاگوێزراوەکان گەیشتە ئێستگەی شەمەندەفەری سیر-دارین و دابەزێندران"

---

[١١٠] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٦٩٠، ئوپیس ١، دیلای ١٣، ل٨٨ (سەرچاوەی ناوبراو، ١٤٠).

[١١١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

هەموو کوردن و ١١٥ بنەماڵەن و بەسەر چوار کەڵخۆزی ناوچەی پاختا ئارالدا دابەش کراون و دامەزراون و دادەمەزرێن.

تا دروستکردنی خانووبەرەی نوێ، بەشێوەیەکی کاتی لە خانووبەرەی کەڵخۆزەکان دامەزێندراون. هەموو ئەو ١١٥ سەدوپانزە بنەماڵەیە، کە ساڵی ١٩٣٧ بۆ کازاخستان ڕاگوێزرابوون، بەشێکیان لە کائوچوك بروم خوز و بەشێکیشیان لە کەڵخۆزەکانی ناوچەی پاختا-ئورال دامەزرابوون؛ بەڵام سەربەخۆ بۆ شوێنی پێشووی خۆیان لە ئازەربایجانی سۆڤێتی گەڕاونەتەوە.

بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە لە سەرەوە باس کرا سەبارەت بەو ١١٥ بنەماڵەیەو هەروەها سەبارەت بە خانووبەرەو ئیش‌وکاریان، داوای بڕیار لە ئێوە دەکەین بۆ پلانی ساڵی ١٩٣٩.

سەرۆکی ڕاگوێزراوەکانی وەزارەتی ناوخۆی کۆماری کازاخستان دوخوڤیچ[١١٢]

* بۆ وەزارەتی ناوخۆی کۆماری سۆسیالیستی کازاخستان-شاری ئالمائاتا

لە وەزارەتی ناوخۆی کۆماری سۆسیالیستی ئازەربایجان شاری باکۆ-بەشی هەشتەمی بەڕێوەبەرایەتی‌ی وەزارەتی پاراستنی (ك. گ.ب.) سیپتامبری ١٩٣٨ ژمارە٤٣٨٤١

**کورتە ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنێك**

بەپێی فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی‌ی دەزگای پاراستن (ك. گ.ب.) KGB ی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت، ڕێکەوتی ١٩٣٧/١٢/٣ سەدو چل‌ویەك بنەماڵەی دانیشتووی ناوچەکانی سەرسنووری ئازەربایجان بە قافڵەی واگۆنی قەتار بۆ کازاخستان ڕاگوێزراون و، لە ئێستگەکانی شەمەندەفەری سیردەرو تاشکەنت دایانبەزاندوون. ژمارەیەك لە گەورەپیاوانی ئەم بنەماڵانە لە ١٩٣٧دا،

---

[١١٢] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل٧٣ (سەرچاوەی پێشوو، ١٣٩).

لەلایەن دەزگای پاراستنی وەزارەتی ناوخۆی ئازەربایجانەوە، وەك كەسانی چالاكی دژ بە شۆڕش تاوانبار كراون.

پەنجاوچوار بنەماڵە لەو ڕاگوێزراوانە، لە مانگەكانی ٦و ٧ی ١٩٣٧دا گەڕاونەتەوە دواوە. لە تەواوی ئەوانەی كە گەڕاونەتەوە پرسراوە: بۆچی گەڕاونەتەوە ؟ لە وەڵامدا گوتوویانە گوایا ئەوانە لەو شوێنەی كە بۆی ڕاگوێزرابوون لە كازاخستان، وەریان نەگرتوون و مۆڵەتیان نەداون لە هەركوێ پێیان خۆش بێ بتوانن بژین. هەر بۆیە ئەوانیش بڕیار ئەدەن بگەڕێنەوە جێو شوێنی پێشوویان، واتە بۆ ناوچە سەرسنووریەكانی ئازەربایجان.

هیچ بەڵگەو دیكۆمێنتێكیش سەبارەت بە مۆڵەتپێدان و گەڕانەوەو ناردنەوەیان لەلای هیچ بنەماڵەیەك نییە.

لیستی ئەو بنەماڵانەتان بۆ دەنێرین كە گەڕاونەتەوە. داواتان لێ دەكەین بە زووترین كات هۆی ئازادكردن یا بەرەڵاكردنی ئەوانەمان پێ ڕابگەیەنن.

لە وەزارەتی ناوخۆی كۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ئازەربایجان مایوری گەورەی دەزگای پاراستن ڕایف

سەرۆكی بەشی هەشتەمی بەڕێوەبەرایەتیی دەزگای پاراستن لیتینانت كوگان[113]

* لەڕێگەی پاسەوانی بەشی جێگیركراوەكانەوە

وەرگیراو لە برووسكەوە (تیلگرافەوە)

بۆ وەزارەتی ناوخۆی یەكێتیی سۆڤێت، بەشی جێگیركراوەكان

هاوڕێ ماسلۆڤ

كاروانی ژمارە ٥١٠٤٤ ڕێكەوتی ٦ی ١٩٣٨/١٢، كاتژمێری هەشت و بیست‌ویەك سەعاتی ئێوارە بەكاتی مۆسكۆ، گەیشتە ئێستگەی توركستان.

---

[113] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی كۆماری كازاخستان، فوندی ١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل٦٠(سەرچاوەی ناوبراو، ل١٣٧).

ئەم قافڵە واگۆنەی شەمەندەفەرە، لەوپەڕی دەردیسەر و نائارامیدا گەیشتەجێ. چۆنیەتی دامەزراندنی مرۆڤ و شتومەکەکانیان لەجێ، بەپێی دابەشکردن و دابەزاندنیان لە ئێستگەکان، بەڕێکوپێکی بەڕێوەنەچوو. تەواوی شتومەکەکانیان بەبێ نیشانەکردنێك خرانە ناو واگۆنی قیتارەکەوە. هەر بۆیە گەلێك شت ون بوو و ماوەیەکی زۆریشی پێچوو تا شتەکانی خۆیان بدۆزنەوەو، بوو بەهۆی ناڕەزایی گواستراوەکان. لەلایەکی ترەوە، بوو بە مایەی دواکەوتنی قیتارەکە. لە ڕێگە، حەوت کەس لە لە ڕاگوێزراوەکان مردن‌و، کاتی دابەزاندنیان و بەتاڵکردنی واگۆنی قیتارەکە، دوو منداڵی تر بە مردوویی دۆزراونەتەوە. شانزە منداڵیش بە نەخۆشیی سووریژەو هەشت کەسی گەورەش کە تووشی نەخۆشی مەلاریا بوون و زۆر پەرێشان بوون، لەناو ڕاگوێزراوەکاندا بوون.

گلادکۆڤ ٩/١٢/١٩٣٨ شاری ئالمائاتا بەشی ڕاگوێزراوەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت کۆماری کازاخستان [١١٤]

* لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێتەوە بۆ:

١-وەزیری ناوخۆی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ئازەربایجان مایور (سەرگورد)ی گەورە دەزگای پاراستنی (KGB) (ك. گ.ب.) هاوڕێ ئیمیلیانۆڤ شاری باکۆ.

٢-وەزیری ناوخۆی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی کازاخستان مایوری دەزگای پاراستنی(KGB) (ك. گ.ب.) هاوڕێ بورداکۆڤ شاری ئالمائاتا.

٣- وەزیری ناوخۆی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی قرقیزستان کاپیتانی دەزگای پاراستنی(KGB) (ك. گ.ب.) ئابوشینکو شاری فرونزە.

**ڕاگەیاندنێکی کورت**

پێشنیار دەکەم ئەو ئاوارانەی کە سەربەخۆ شوێنی ئیجباری (مەنفا)ی خۆیان بەجێهێشتووەو گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆیان، بەزۆرو تۆپزی

---

[١١٤] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١١، ل١٣(سەرچاوەی ناوبراو، ل١٣٦).

بیانگەڕێنینەوە شوێنی بەزۆر جێگیرکردنی پێشووی خۆیان. ئەمانە بریتین لە: پەنجاوچوار بنەماڵەی جێگیرکراوی تایبەتی کۆماری ئۆتۆنۆمی نەخچەوان و حەفتاودوو بنەماڵەی کوردی ناوچەی ئیڤلاخ (ئازەربایجان). واتە کوردەکان بۆ کۆماری قەرقیزستان بگەڕێنینەوەو جێگیرکراوە تایبەتەکانیش، واتە ئەوانەی نەخچەوان، بۆ کۆماری کازاخستان (ناوچەی پاختار ئارالی کازاخستان).

دەبێ چۆنیەتیو کاتی گواستنەوەیان، لە مانگی مارسدا و هەرجاری بە سێ تا چوار واگۆنی شەمەندەفەر بەپاسەوانەوە بگوازرێنەوە.

خەرجیی هێنانەوەیان لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێتەوە ئەدرێ.

وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت بێریا [١١٥]

کۆپیەی نێردرا بۆ:

-٣و٢ کۆپیی بۆ شوێنی دیاریکراو (مەبەست).

-٥ کۆپیی بۆ سکرتاریەتی وەزارەتی ناوخۆ.

-١ بۆ سکرتاریەتی بەشی سێهەم.

-١ بۆ سکرتاریەتی بەشی نۆهەم.

* ژمارە ٥٠٢٢٣٣/ ڕێکەوتی ١٩٣٩/٩/١٧

سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتیی ئاوارەکانی سەر بە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیی ڕێکخراوی هەرێمی حیزب لە ئالمائاتا هاوڕێ گریشاگین

داواکاری دوانزە بنەماڵەی کوردی ئاوارەمان بۆ هاتووە، ئەوانە لە کەڵخۆزی "تورك سیب"ی سەر بە ناوچەی (چوی) ئیش دەکەن. داواکەیان ئەوەیە کە یارمەتی بدرێن، تا ئەمساڵ خانوەکانیان تەواو بکەن. ئەوانە لەم داواکاریەشدا ڕادەگەیەنن کە بەڕێوەبەرایەتیی کەڵخۆزی "تورك سیب" هیچ چەشنە بایەخێك بە دروستکردنی خانوەکان نادات و، لەم بارەوە ئاوڕیشیان لێ نادەنەوە. ئەو

---

[١١٥] ئەرشیڤی ناەندی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای١٣، ل٦٢ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩).

پارەیەش کە بەڕێوەبەرایەتی‌ی کەڵخۆزی ناوبراو وەری‌گرتووە، بۆ مەبەستی تر خەرجیان کردووەو بەکاریان هێناوە. ڕێکخراوی ناوچەیشیان لەم بارەیەوە ئاگادار کردوەتەوە و، ئەوانیش هیچ ئاوڕێکیان لێ نەداونەتەوەو داواکاریەکەیان پشت گوێ خستووە.

لەم بارەیەوە داواتان لێ دەکەم بەڕێوەبەرایەتی‌ی کەڵخۆزی ناوبراو تاقی‌بکەنەوەو بزانن ئەو پارەیەی کە بۆ دروستکردنی خانووبەرە بۆ ئاوارەکان وەریانگرتووە، ئایا بۆ مەبەستێکی تر بەکاریان هێناوە؟ هەنگاو بۆ تەواوکردنی خانووەکان لەماوەی دیاریکراودا هەڵبگرن و، لەم بارەیەوە کەموکوڕیەکان نەهێڵن.

لەسەر ئەنجامی تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەکەتان و ئەو هەنگاوانەی کە لەم بارەیەوە هەڵیدەگرن بۆ مانگی دەی ساڵی ١٩٣٩، ئاگادارمان بکەنەوە.

جێگری بەڕێوەبەرایەتی‌ی ئاوارەکانی سەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی سۆڤێت یاکۆملیڤ

پشکنێری گەورە شیرشنیڤ[116]

* ژمارە ٥٠٣٢٩٢/ ڕێکەوتی ١٩٣٨/١٠/١٠

بۆ سەرۆکی بەشی جێگیرکراوەکانی سەر بە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی‌ی باشووری کازاخستان بەوەکالەت هاوڕێ دروگوڤ. شاری چیمکەنت

کۆپی بۆ بەشی ڕاگوێزراوانی سەر بە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی‌ی حیزبی هەرێمی ئالمائاتا هاوڕێ گریشاگین

لەگەڵ بابەتەکانی تردا، داخوازی "ڕەوشە عەلییێڤ"تان بۆ دەنێرم کە لە ئێستگەی (ئیس سیك)ی ناوچەی سێهەمی ئینبیك شی هەرێمی کازاخستان دەژی‌و، تکایە -وەك داوا دەکات- مۆڵەتی پێ‌بدەن بڕوات بەدوای بنەماڵەی برا مردوەکەیدا کە لە سێ کەس پێك هاتووەو لە کەڵخۆزی (بودین)ی گوندی

---

[116]ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کازاخستان، فوندی ١٢٠٨، ئوپیسی ١، دیلای ٤٨، ل٣٨ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨).

(ئوچباش)ی سەر بە ناوچەی شوورای (ساری سو) دەژین. داوای بڕیارو مۆڵەتی ئێوە لەم بارەیەوە دەکەین.

ئێمە لەلای خۆمانەوە پێمانوایە هاتنی ئەو بنەماڵەیە بۆ لای هاولاتی عەلییێڤ بە مەبەستی مانەوەیان، دەکرێ پەسند بکرێ. ئەویش بەو مەرجەی کە ئەم بنەماڵەیە لەڕاستیدا پێویستی بە یارمەتی خزمەکانی بێ.

جێگری سەرۆکی بەشی ئاوارەکانی سەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی کازاخستان یاکەڤلیڤ

پشکنێری گەورە شیرشنیڤ (١١٧)

* ژمارە ٥٠٢٢٧٩/ ڕێکەوتی ١٩٣٩/١٠/٧

بۆ سەرۆکی بەشی ئاوارەکانی سەر بە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیی ڕێکخراوی هەرێمی حیزبی ئالمائاتا هاوڕێ گریشاگین

ساڵی ١٩٣٧ لە کەلخۆزی "کورکی"ی ناوچەی (چوی) ئاوارە (بە زۆرەملێ دوورخراوەکان، هەورامی)دا، عوسمان ئاسانۆڤ ناو لە ئازەربایجانەوە گواستراوەتەوە بۆ ئێرەو، باوکی مامۆستا سادیق سادیقۆڤە کە لە کەلخۆزی (بونیاوا)ی سەر بە ناوچەی (ساریسو)ی باشووری کازاخستان دەژیو، ئەویش ڕاگوێزراوە.

بەشی ئاوارە یا ڕاگوێزراوانی سەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری سۆسیالیسی سۆڤێتی کازاخستان داوا دەکات تاقی بکەنەوە ئایا عوسمان ئاسانۆڤ لەم کەلخۆزەدا دەژی و، هەروەها بزانن ئایا پەیوەندی خزمایەتیی لەگەڵ سادیق سادیقۆڤدا هەیە؟ ئەگەر بەڕاستی باوکی سادیق سادیقۆڤە، مۆڵەت بە ئاسانۆڤ بدەن بێتە کەلخۆزی (بودین)ی ناوچەی (ساریسو) کە دەکەوێتە باشووری کازاخستانەوە.

---

(١١٧) ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٢٠٨، ئوپیسی ١، دیلای ٤٨، ل١٢٨(سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥).

لەگەڵ ئەمەیشدا داخوازی ناوبراوتان بۆ دەنێرم.

جێگری سەرۆکی بەشی پەنابەران (ڕاگوێزراوان)ی سەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی کازاخستان

**یاکەڤلۆڤ،** [(118)]

*** نهێنی**

**بڕیاری شوورای وەزیرانی دەوڵەتی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی کازاخستان**

**شاری ئالمائاتا ماڵی دەوڵەت ژمارە ٤٣ ڕێکەوتی ١٩٣٨/١٢/١**

سەبارەت بە ڕاگرتنی (دواخستنی) پارەی ئاوارەکانی کوردو ئەرمەن لەبری ئەو ئاژەڵەی کە داویانە بە دەوڵەت ... ئەوانە لە بارودۆخێکی ماددی یەکجار دژواردا دەژین و، هیچ پارە و کەرەستەیەکیان بۆ دروستکردنی خانوو و کڕینی تفاق و خواردەمەنی بۆ زستان نییە. داموەدەزگاکانی بەرپرسیش کە بڕیار بووە خانووبەرە بۆ ئەوانە دروست بکەن، هیچیان نەکردووەو، ئەو پەنابەرە کوردو ئەرمەنیانە لە ئەنجامدا بۆ ئەم زستانەی کە لەبەرە، بەبێ هیچ پەنایەك ماونەتەوە. بۆیە شوورای وەزیران بڕیاری دا:

١-ئەوانەی کە پارەی ئەوانیان ڕاگرتووەو خانووبەرە (پەناگە)یان بۆ دروست نەکردوون، دەبێ سزابدرێن.

٢-تا دەی مانگی ١٩٣٨/١٢ پێویستە چەندایەتی‌ی ئەو پارەیەی ئەوان ڕوون بکرێتەوەو، هەروەها پێشنیارەکانی لەم بارەیەوە سەبارەت بە دانی پارە بە خاوەنەکانیان، ئاڕاستەی شوورای وەزیرانی کازاخستان بکرێن.

٣-هەوڵ بدرێ جێ و پەنا بۆ ئەوانە دروست بکرێ.

٤-بەرپرسی‌ی جێبەجێکردنی ئەم کاروبارانە بخرێتە ئەستۆی لیتیناتی گەورەی دەزگاکانی پاراستنی هاوڕێ گلادکۆڤ.

---

[(118)] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٢٠٨، دیلای ٤٨، ل١٣٩ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٤).

جێگری سەرۆکی شوورای وەزیرانی کۆماری کازاخستان تاژێیڤ. ی جێگری کاروباری بەڕێوەبردنی شوورای وەزیرانی کازاخستان ساپارگالییڤ.م[119]

* نهێنی ژمارە ٨٧٢٨

بۆ وەزیری کاروباری ناوخۆی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ئازەربایجان مایووری گەورەی دەزگای پاراستن (ك. گ.ب.) (KGB) هاوڕێ رایف شاری باکۆ لەسەر ژمارەی ٤٣٨٤٤١

ڕێکەوتی ١٩٣٨/٩/٥

سەبارەت بە ٥٤ بنەماڵەکەی ناوچەی پاختا-ئارال (کازاخیستان)، کە سەربەخۆ ئەوێیان بەجێهێشتووە.

ڕادەگەیەنین کە:

ئەو پەنجاو چوار بنەماڵەیەی کە لە لیستەکەدا ناویان هاتووە، سەربەخۆ ئێرەیان بەجێهێشتووە. کەس بەوانەی نەگوتووە لەکوێ پێتان خۆشە بژین، بەڵکوو بەپێچەوانەوە پێیان گوتراوەو ڕووبەڕووش بەرپرسی ئەوەیان پێ ڕاگەیەندراوە کە لە ناوچەی (پاختا-ئارال)ی باشووری کازاخستاندا بژین.

هەر بۆیە ئەوانە هیچ بەڵگەو دیکومینتێکیان سەبارەت بە ئازادکردنیان نەدراوەتێ. داواتان لێ دەکەین ئەوانە بنێرنەوە بۆ دواوە (بۆ کازاخستان)، واتە بۆ شوێنی نیشتەجێی پێشوویان کە لەژێر دەسەڵاتدارێتیی سەرۆکی بەشی پاراستنی پاختا-ئوراله و بە ڕێگەی شەمەندەفەردا لە ئێستگەی (سیر-دارین)ی هێڵی ئاسنی (تاشکەنت)ەوە بیاننێرنەوە.

جێگری سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتیی دەزگای پاراستنی کازاخستان
لیتیناتی گەورەی دەزگای پاراستن نیزیولکو[120]

---

[119] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل٢٨ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١-١٢٣).

[120] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل٦٣ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣).

* کورتەی ڕاپۆرتێك سەبارەت بە ژمارەیەك لەو کوردانەی کە لە ۱۹۳۷دا دوورخراونەتەوە بۆ کازاخستان

"بۆ سەرلەشکر (ژەنەراڵ لیتینانت)ی دەزگای پاراستن (ك. گ.ب.) (KGB) هاوڕێ بیرنیر"

...... سەبارەت بەو کوردانەی کە لەم شوێنانەی خوارەوە جێگیرکراون، زانیاریمان بەم چەشنەیە:

۱- ناوچەی پاختای ئاراڵ

کوردەکان لە سێ کەلخۆز نیشتەجێکرابوون؛ بیست بنەماڵە لە کەڵخۆزی (مایاك)، شانزە بنەماڵە لە کەڵخۆزی (نوڤەی پون) (ڕێگەی نوێ) و حەڤدە بنەماڵەش لە کەڵخۆزی "کراسنی ئوکتوبر" (ئوکتوبری سوور)، واتە بەهەموویەوە پەنجاو سێ بنەماڵە. پاش سەردانمان بۆ ئەوێ، بۆمان دەرکەوت سێ کەڵخۆز تەنیا دوو بنەماڵەو ئەندامێکی بنەماڵەیەکی تری لێ ماون. جگە لەوە، لە مەڵبەندی ناوچەکەدا، واتە گوندی (مسلاڤیانکا)، سێ بنەماڵەی تر دەژین.

لە گەشتەکەمدا بۆ ناوچەی پاختا-ئاراڵ، بۆم دەرکەوت تا مانگی ٥ و ١٩٣٨/٦ شەستوحەوت بنەماڵەی کورد کە لە ناوچەی قیزیل-کوم (ی سەر بە چیمکورگان و چاریدەر)ەوە هاتبوون، ناویان نووسرابوو. بەڵام ئێستا لێرە نەماون و، بۆ کوێ ڕۆیشتوون، دیار نییە.

بەپێی ئەو لیستەی کە هەیە، ئەو کوردانەی کە لێرە جێگیرکراون، واتە لە ناوچەی (پاختا-ئاراڵ)، تەنیا لەو بنەماڵە کوردانەن کە هەمویان ژن و منداڵن. پیاوەکانیان (سەرپەرشت یا گەورەی ئەم بنەماڵانە) لەلایەن دامودەزگاکانی پاراستنەوە سەرنگوم کراون.

بەپێی ئەو بەڵگانەی کە هەن و، بە چاوپێکەوتنی خۆشم لەگەڵ بەرپرسانی ناوچەکەدا، بۆم دەرکەوت:

۱-ئەو بنەماڵە کوردانەی ئێرە کە هەموویان لە منداڵانی کەم تەمەن پێك هاتوون، بایەخێکی ئەوتۆیان وەك هێزێکی کارکەر نییەو، زۆر زۆر کەم کاریان کردووە.

٢-هیچ هەل‌ومەرجێکیان بۆ دروستکردنی خانووبەرەو ژیانیان پێك نەهێناوە، ئەوانە لە چادردا دەژین.

٣-هیچ هەنگاوێك بۆ ڕاگرتنی کوردەکان و، پێشگیری لە ڕۆیشتنیان هەڵنەگیراوە. بەڵکوو بەپێچەوانەوە، یارمەتیی ڕۆیشتنیان دراوە. هەقی گواستنەوە و پارەیان پێدراوە بۆ خەرجیی ڕێگەیان، تا بگەنە ئێستگەی شەمەندەفەری (چیمکورگان). تەنانەت ئەوانەی کە ڕۆیشتوون، پارەی فرۆشتنی ئاژەڵەکەی خۆیان (لە کەڵخۆزی مایاك) وەرنەگرتووە و، ڕۆیشتوون (پاشان ڕاپۆرتنووسەکە باسی ئەوە دەکات کە چەند کاریان کردووەو...، هەورامی).

## ٢-ناوچەی تالاس

لە کەڵخۆزی (باسکا-بولاق) نەوەت بنەماڵەی کورد هەن، هەموو لە کەڵخۆزێکی سەربەخۆدا پەکیان گرتووەو، لە ٣٦ خانوودا کە ئەمساڵ دروست کراون، دەژین. ئەم خانوانە لە دوو ژووری بچووك پێك هاتوون و، بەپەلە لە قوڕو تەپاڵەو سەرەکانیان (سەربان) لە قامیش دروست کراون و، بە زۆپا گەرم دەکرێن. بانەکانیان بە هیچ دانەپۆشراوەو سواخ نەدراوە و، مەترسیی هەمیشەیی ئاگرگرتنیان لێ دەکرێ و، هیچ شتێکیش (وەك کادان و جێ زەخیرەو ئاودەست، حەمام، ئاشپەزخانە- هەورامی) لە تەنیشت ئەم ماڵانە دروست نەکراوە. خزمەتگوزاریی کولتووری -ژیانی-کۆمەڵایەتی هەر نییە و، هیچ بەرهەم و شتومەکی (کاڵو خاوی) پیشەسازی و تفاق و خواردەمەنی ناگاتە ئێرە (لەبەرئەوەی کاسك بولا سەدو حەفتا کیلۆمەتر لە جەمبولەوە دوورە).

سەرەتای ساڵی ١٩٣٨ هەشتاوحەوت بنەماڵەی کورد دێنە ناوچەی تالاس و، پاشان سێ بنەماڵەی تریش دەگەنە لایان، واتە بەگشتی نەوەت بنەماڵەیە (پاشتر باسی کارو ئاژەڵەکانیان دەکات).

## ٣-ناوچەی سیڤێردلوڤ

بەپێی سەرژمێری کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیی حیزب لەم ناوچەدا، بیست‌وچوار بنەماڵەی کورد لە کەڵخۆزی (کراسنایازاریا) "شەفەقی سوور" نیشتەجێ کراوە، بەڵام پاش تاقیکردنەوە دەرکەوت هیچ کوردێك لێرە نەبوەو نییە.

٤-ناوچەی سوزاك

کوردەکانی ئێرە لە پێنج کەڵخۆزی ناوچەکەدا جێگیرکراون، بەڵام ژمارەی تەواویان دیار نییە. پاش ڕوونکردنەوە، دەرکەوت بە هەموویەوە ٩٤ بنەماڵەی کورد لە ناوچەی (سوزاکێ)ن، لەوانە ٤ بنەماڵەیان لە کەڵخۆزی (هاوڕێ ستالین) ناو و، ٦٣ (شەست و سێ) بنەماڵە لە کەڵخۆزی (هاوڕێ کالینین) ناون. ٥ بنەماڵە لە کەڵخۆزی یەکی ئایار (مای)، ١٥ بنەماڵە لە کەڵخۆزی (ژیکینشیك) و ٧ بنەماڵە لە (ئوش توبە).

بەگشتی، باری ماددی ژیانیان خراپە، کەس لێیان ناپرسێتەوە. بەم زووانە خانووبەرەکەیان تەواو دەبێ.

٥-ناوچی ساری سوئسیك

بەپێی سەرژمێری کۆمیتەی بەڕێوەبەری حیزبی لە کەڵخۆزی (ئوموژزاکوڤ)، ٨٦ بنەماڵەی لێ بووە. لەکاتی تاقیکردنەوەدا، هاوڕێ نیبروت بۆی دەرکەوتووە ٧٩ بنەماڵەی لێیە.

٦-ناوچەی چایان

بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کە هەن، شەست و چوار بنەماڵەی کوردلە کەڵخۆزەکانی (قیزیل جولدوس) جێگیر کراوە.

جێگری سەرۆکی بەشی ئاسایشی کازاخستان لیتینانت (ك. گ.ب.) KGB پیترۆڤ ١٩٣٨/١٢/١٤ ئالمائاتا [١٢١]

* بۆ سەرۆکی بەشی کاروباری ئاوارەکانی[١٢٢] سەر بە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی ئالمائاتا هاوڕێ گریشاگین

---

[١٢١] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل١٢،١١-١٦ (سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦-١٣٠).

لەگەڵ سەرجەمی داوای فەرمانبەرە ئاوارەکانی کەڵخۆزدا، داخوازی دوو هاووڵاتی کوردی ئەحمەد و محەمەدی ئاسانی ناوانتان کە لە سۆڤخوزی (گول تابان)ی شوورای گوندی (کوك ریك) ی سەر بە ناوچەی (چوی) ئیش دەکەن، بۆ دەنێرم، کە داوا دەکەن بگوازرێنەوە یا بڕۆن بۆ لای خزمەکانیان، کە لە کەڵخۆزی (کاس کابولاق)ی سەر بە ناوچەی (تالیس) دەژین. بەپێی داخوازی برایانی ئاسانی، هیچ زانیارییەك سەبارەت بە چۆنیەتی خزمایەتییان لەگەڵ ئەوانەدا باس نەکراوە.

ئێوە پێویستە ڕوونی بکەنەوە خزمایەتیی ئەوانە لەگەڵ دانیشتوانی خزمیاندا لەکەڵخۆزی ناوچەی (تالیس) چۆنە و لەجێدا ئەم پرسیارە چارەسەر بکەن و، ئەنجامی بڕیارەکەتان بە داواکارانی ناوبراو ڕابگەیەنن.

بەپێی ئەو داخوازیەیان، ئێمە گواستنەوەی خەڵك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە پێویست نازانین[١٢٣].

جێگری سەرۆکی بەشی کاروباری ئاوارەکانی سەر بە شوورای وەزیرانی کۆماری کازاخستان یاکوڤلیڤ

پشکنێر (ئینسپیکنەر)–ڕێکخەر ئابیکنیوڤ

شوێنی جێگیربوونی ڕاگوێزراوەکانی کوردو ئەرمەن لە کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی کازاخستان تا ١٩٣٨/١١/٥

---

[١٢٢] ئاوارەکان–مەبەست لەو گەلانەیە کە بەزۆر دوورخراونەتەوە. بەواتایەکی تر، دەتوانین بڵێین بەزۆر نیشتەجێکراوەکان یا هێنراوەکان یا بەزۆر جێگیرکراوەکان.

[١٢٣] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی ١٢٠٨، ئوپیسی ١، دیلای ٤٨، ل٨٨.

لە کتێبی کوردی کازاخستان (عەزیز زیا عەلییێڤ کازاخستان، ١٩٩٦، بە زمانی ڕووسی و کوردی، ل١١٥).

| خانووبەرە | بنەماڵە ئەرمەن | ژمارەی کورد | گشتی کەس | ژمارەی بنەماڵە | ناوچە و شوێن |
|---|---|---|---|---|---|
| دامەزراون، | ٤٦ | ٥٨ | ٤٧٧ | ١٠٤ | هەرێمی ئالمائاتا |
| زۆربەیان | – | ٦٤ | ٣٩٩ | ٦٤ | ناوچەی چوی |
| خانووبەرەیان نییە، | | | | | ناوچەی ئیل |
| زەوییان پێ | | | | | ناوچەی کراسناگورسی |
| نەدراوەو دیاریش | | | | ٥٥ | ناوچەی ئینبیکشی-کازاخسکی |
| نەکراوە. | – | ٣١ | ١٦٩ | ٣١ | سەڤخۆزی پلودونیوترسیتائیسسیاك |
| | ٤١ | ٨٠ | ٨٢٥ | ١٢١ | کائوچوك پرومخوز ژمارە ١٣ |
| | ٣٥ | – | ١٧٥ | ٣٥ | ناوچەی کاسکیلین کەڵخۆزی مۆلەتۆڤ |
| دامەزراون زۆربەیان | ١٢٢ | ٢٨٨ | ٢٣٢٣ | ٤١٠ | باشووری کازاخستان |
| خانووبەرەیان نییە | – | ٥٩ | ٣١٥ | ٥٩ | ناوچەی چایانوڤ |
| زەوییان پێ | – | ٦٧ | ٤٢٦ | ٦٧ | ناوچەی ساریَ سو |
| نەدراوەو دیاریش | – | ٨٦ | ٤٣٨ | ٨٦ | ناوچەی تالاس |
| نەکراوە | – | ١٤٠ | ٦١٨ | ١٤٠ | ناوچەی قیزل قوم |
| | – | ٩٤ | ٣٩٢ | ٩٤ | ناوچەی ناوچەی سوزاك |
| | – | ٢٩ | ١١٦ | ٢٩ | ناوچەی جەمبول |
| | – | ١٠١ | ٣٨٨ | ١٠١ | سەڤخۆزی ونیوترسیت (کاپلان بیگ) |
| | – | ١٣٥ | ٨٣٨ | ١٣٥ | کائوچوك پرومخوز ژمارە ١٢ پاختا-ئارال |
| ئەنجامەکان بەپێی هەرێم و ناوچەکان | – | ٧١١ | ٣٥٦٦ | ٧١١ | ئەنجامەکان بەپێی هەرێم و ناوچەکان |
| تێکرا | ١٢٢ | ٥٨٨٩ | ٩٩٩ | ١١٢١ | سەرجەم |

**پشکنێری بەشی ڕاگوێزراوەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی کۆماری کازاخستان ئیسیپوڤ**[١٢٤]

[١٢٤] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی کۆماری کازاخستان، فوندی١٤٩٠، ئوپیسی ١، دیلای ١٣، ل٩٠ (هەمان سەرچاوە، ل١٤٣).

* ئەوپەڕی نهێنی
دۆسیەی تایبەت
بڕیار
بۆ وەزیری ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت
ناوەڕۆك: گواستنەوەی تورك و کوردو خیمشین لە ناوچە سەرسنوورییەکانی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی جۆرجیا
ژمارە ٠٠١١٧٦ ڕێکەوتی ١٩٤٤/٨/٢٠ شاری مۆسکۆ

لە جێبەجێکردنی بڕیاری کۆمیتەی پارێزگاری دەوڵەتی (ژمارە /٦٢٧٩ زۆر زۆری نهێنی)دا سەبارەت بە ((گواستنەوەی تورك و کوردو خیمشین لە هێڵە سەرسنوورییەکانی کۆماری سۆسیالیستی جۆرجیا، واتە ناوچەکانی ئاخالتسیخ، ئادیگی، ئەسپیندز، ئاخالکەلاك و بەگدان))

فەرمانتان پێ دەدەم:

١- پێویستە، بۆ ڕێکخستنی ئەم فەرمانە، هەنگاو بۆ ئامادەکردن و جێبەجێکردنی ئەرکی گواستنەوەیان چواربەشی دەستوبردی چالاکی بەم شێوەیەی خوارەوە پێك بێن: ئ: بەشی ئاخالتسیخ، واتە لە چوارچێوەی ناوچەی (ئاخالتسیخ)دا، ب: ئاخالکەلاك، واتە لە چوارچێوەی ناوچەکانی (ئاخالکەلاك) و (بەگدان)دا. پ: بەشی (ئاسپینز)، واتە لە چوارچێوەی (ئاسپینز)دا، ت: ئاخالکەلاك، واتە لە چوارچێوەی ناوچەکانی ئاخالکەلاكو بەگدان.

٣- سەرۆکی ئەو بەشە چالاكو بەدەستوبردانەی (عملیات-ئوپیراتیڤی) و جێگرەکانیان دەستبەجێ ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن. وەزارەتی پاراستنی کۆماری سۆسیالیستی جۆرجیا کۆمسیاری پلە سێهەم "ڕانکی ٣" وەزیری پاراستن هاوڕێ ڕاپایڤ و کۆمسیاری ناوخۆ (وەزیری ناوخۆ)ی کۆماری جۆرجیا هاوڕێ کەرەنادز، پێویستە هەرکامیان پەنجا کەسی چالاك کە شارەزای بارودۆخی ناوچەکەن، بۆ ئامادەکردنی بەجێهێنانی ئەم ئەرکە تەرخان بکەن.

٤- چالاکیەکە (ئۆپیراسیۆن) دەبێ لە ماوەی دە ڕۆژدا، لە ١٥ تا ٢٥ی ١١ی ئەوساڵ، جێبەجێ بکرێن.

٥- بۆ مسۆگەرکردنی ئەم ئۆپێراسیۆنەو، بەهێزکردنی پاراستنی سنوورەکانی دەوڵەتی کۆماری جۆرجیا لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم ئۆپێراسیۆنەدا، بۆ گواستنەوەی ئەم هێزە لەشکریانەی خوارەوە تەرخان بکرێن: لە هێزەکانی وەزارەتی ناوخۆ، هەنگەکانی چل و دووسەدو هەشتاویەك و دووسەدو شەستوشەش و سێهەم هەنگی کراسنازنامینیو هەنگەکانی هەشت و دوو و، هەروەها یەکەکانی تایبەتی یەك و دووی لەشکری مۆسکۆی سەر بە وەزارەتی ناوخۆ، لەگەڵ ئەفسەرانی گەورەی پەیمانگەی لەشکری-تەکنیکی مۆسکۆو ساراتوڤ، ئورجونکیدزە، لینینگرادو خارکۆڤی سەر بە وەزارەتی ناوخۆو، تەواوی ئەندامانی قوتابخانەی سیاسیو خولی پەروەردەی بەشی ئۆپێراسیۆنی سوپای ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت کە ژمارەی هەموویان پەنجا هەزار کەسە، تەرخان دەکرێن.

٦- ژەنەراڵ پاکۆڤنیك ئاپول لۆڤی جێگری وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت، هاتنی ئەو هێزانە بۆ شوێنی دیاریکراو ساز بکات و، لەشکری دیاریکراو بۆ بەهێزکردنی پاراستنی سنوورەکان تا ٢٥ی ئۆکتۆبەری ئەو ساڵ و، هێزەکانی تر لە ٢٥ی ئۆکتۆبەر تا یەکی ١١/١ی ئەوساڵ مسۆگەر بکات.

٧- هاوڕێ چیرنیشۆڤی جێگری وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت کۆمسیاری ڕانگی دووی وەزارەتی پاراستنی یەکێتیی سۆڤێت (ك. گ.ب.) KGB بە ڕێککەوتن لەگەڵ ژەنەڕاڵ خورولیڤی فەرماندەی پشت بەرەدا، سوپای سوور نۆسەد ماشێنی (چەشنی ستودبیککێر بە شۆفێرەوە لە ناوچەکانی ناوبراودا کە دەبێ بەنزین (سووتەمەنییان بۆ دابین بکات و، لەکاتی دیاریکراودا کۆنترۆڵی کاروباری جێبەجێکردنی گواستنەوەی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی ئەو ناوچانە بکات.

بێریا. ئا. کۆمسیاری (وەزیری) ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت ژەنەراڵ کۆمسیاری دەزگای پاراستنی دەوڵەتی

*** بڕیاری کۆمیتەی بەرگری دەوڵەتی**
**١٩٤٤/٧/١٤**

به مەبەستی باشتر پاراستنی چۆنیەتیی سنوورەکانی دەوڵەتی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی جۆرجیا، کۆمیتەی بەرگری دەوڵەتی بڕیاری دا:

خاڵی ١- دانیشتوانی تورك و کورد و خیمشین له ناوچه سەرسنووریەکانی کۆماری جۆرجیا، واته ئاخالتسینخ ئادەیگین و ئاسپیندزەو بەگدانۆڤ، و کۆماری ئۆتۆنۆمی ئاجار که ژمارەیان ١٦,٧٠٠ شانزەهەزارو حەوتسەد بنەماڵەیه، واته هەشتاوشەش هەزار کەس، بگوازرێنەوە، چل هەزار کەسیان بۆ کازاخستان و سی هەزاریان بۆ ئۆزبەکستان و شانزەهەزاریان بۆ کۆماری قرقیزستان. گواستنەوەیان بخرێته ئەستۆی وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت. وەزارەتی ناوخۆی سۆڤێت "هاوڕێ بێریا" بەرپرسه که ئەم گواستنەوانه له مانگی یانزەی ١٩٤٤دا جێبەجێ بکرێ.

خاڵی ٢-بوار بدرێ هەر بنەماڵەیەك تا هەزار کیلۆگرام شتومەکی جۆراوجۆر، تفاق و خواردەمەنی لەگەڵ خۆیاندا بەرن.

خاڵی ٣- بۆ ڕێکخستنی وەرگرتنی شتومەك و تفاق و خواردمەنی، خانووبەرەو باغی میوەو کشتوکاڵ و سامانی تری بەجێهێڵراوی ئەو ڕاگوێزراوانەی ناوچەی سەرسنوور، کۆمیسیۆنێك به سەرکردایەتیی جێگری شوورای وەزیرانی کۆماری جۆرجیای سۆسیالیستی هاوڕێ خۆشتاریا پێك بێ.

خاڵی ٤- کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیا (بەلشەویك) و شوورای وەزیرانی کۆماری سۆسیالیستی کازاخستان "هاوڕێیان سکڤارتسۆڤ، و ئۆنداستینۆڤ،" و، له کۆماری قرقیزستان "هاوڕێیان ڤاگۆڤ، و کولاتۆڤ،" و، له ئۆزبەکستان "هاوڕێیان یوسوپۆڤ، و عەبدولرەحمانۆڤ،" لەگەڵ وەزارەتەکانی ناوخۆی ئەم کۆمارانەدا بەرپرس بکرێن که پێویسته لەجێدا هەنگاو بۆ وەرگرتنی ئەو ڕاگوێزراوانەو نیشتەجێکردنیان و شوێن و جێی هەمیشەییان بۆ دابین بکەن.

خاڵی ١١- ئیجازەو بوار به شوورای وەزیرانی کۆماری جۆرجیای سۆڤێتی بدرێ له ناوچه سەرسنووریەکانی خاڵی یەکەمدا، حەوت هەزار بنەماڵه تا سی

(٣٠) هەزار کەس، واتە لە کەڵخۆزیەکانی ناوچە کەم زەویەکانی کۆماری جۆرجیادا جێگیریان بکات. نیشتەجێکردن هەم تەواوی کەڵخۆزەکان و هەم دەستەی جیاجیا و بنەماڵەش دەگرێتەخۆ. شوێنەکانی جێگیرکردن لە هێڵە سەرسنووریەکاندا بە پەسندکردنی دەزگای بەرێوەبەرایەتی‌ی سوپای سنوورپارێزی وەزارەتی ناوخۆی کۆماری جۆرجیا دیاری‌دەکرێن.

خاڵی ١٣-A تەرخانکردنی سی (٣٠) ملیۆن ڕۆبڵ لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە بۆجێبەجێکردنی ئۆپێراسیۆنی (چالاکی) دەرکردن و گواستنەوەو نیشتەجێکردنی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان و، بۆ شوورای وەزیرانی جۆرجیای سۆسیالیستیش چوار ملیۆن ڕۆبڵ بۆ ئەو خەرجیانەی کە پەیوەندییان بە جێگیرکردنی خەڵکەوە هەیە لە ناوچە سەرسنووریەکاندا.

خاڵی ١٤- بەرپرسی بەڕیوەبەرایەتی‌ی دابینکردنی تفاق و خواردەمەنی (تەخنیکی) "هاوڕێ شیروکۆڤ" بۆ جێبەجێکردنی گواستنەوەیان لە مانگەکانی ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەری ١٩٤٤دا، کەرەستەی تایبەت و زیاد بۆ بەنزینی ماشێن دیاری بکرێ: وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت حەوتسەدو پەنجا تەن، شوورای وەزیرانی کازاخستان حەفتاوچوار تەن، شوورای وەزیرانی قرقیزستان ٣٥تەن، شوورای وەزیرانی ئۆزبەکستان حەفتا تەن و شوورای وەزیرانی کۆماری سەدتەن.

سەرۆکی کۆمیتەی بەرگری دەوڵەتی یەکێتی‌ی سۆڤێت

ستالین.ی[١٢٥]

* بۆ کۆمیتەی بەرگری دەوڵەتی

هاوڕێ ستالین.ی.ڤ،

بۆ شوورای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت

هاوڕێ مولەتوڤ،.ڤ،.م

بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی (بەلشەویك) یەکێتی‌ی سۆڤێت

---

[١٢٥]ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٠١، ئوپیسی ٢، دیلای ٦٦، ل١٩ (سەرچاوەی پێشوو).

**هاوڕێ مالینکوڤ،**
**١٩٤٤/١١/٢١**
**ژماره ١٢٨٢٦**

**بەپێی بڕیاری کۆمیتەی بەرگری دەوڵەت و وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت، ئۆپێراسیۆنی (چالاکی ڕاگوێزانی تورك و کوردو خیمشین لە ناوچە سەرسنوورییەکانی کۆماری سۆسیالیستی جێبەجێکراوە. بەشێکی زۆری دانیشتوانی ناوبراو کە پەیوەندییەکی خزمایەتییان لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە سەرسنوورییەکانی تورکیادا هەیەو قاچاخچییەتیش دەکەن و، مەیلی پەنابەرێتییان تێدایە بۆ داموودەزگا سیخوڕیەکانی تورکیا، سەرچاوەیەکی باشن بۆ بەکرێگرتن و دروستکردنی کەسانی سیخوڕو ناردن و پەرەپێدانی تاقمی چەتەو ڕێگری وڵاتەکەمان.**

**بۆیە پاش ئامادەکاری، گواستنەوەیان لە ٩/٢٠ –١٩٤٤/١١/١٥ بەڕێوەچووە. جگە لەوە، بۆ پشتگیری ئەو کەسانەی کە هەوڵی ڕۆیشتن و تێپەڕبوونیان داوە لە سەرسنوورەکان، پاراستنی سنوورەکان لەگەڵ تورکیادا بەهێز کرا. ئۆپێراسیۆنی گواستنەوەیان لە ناوچەکانی ئاخال کەلاك، ئاخالتسیخ، ئادەیگین، ئاسپیندز و بەگادانوڤ لە ١٥ تا ١٨ی مانگی نۆڤامبری ١٩٤٤ و لە ناوچەکانی کۆماری ئۆتۆنۆمی ئاجار لە ٢٢–٢٦ی نۆڤامبری ١٩٤٤ بەڕێوەچوو.**

**تەواوی ڕاگوێزراوەکان ٩١٠٩٥ (نەوەت‌ویەك هەزارو نەوەت‌وپێنج کەسە). تەواوی کاروانی (شەمەندەفەر)ی ڕاگوێزراوەکان، بەرەو شوێنی نوێی جێگیربوونیان لە ئۆزبەکستان و کازاخستان و قرقیزستان نێردران. ئۆپێراسیۆنی ڕاگوێزان بەڕێکوپێکی و، بەبێ هیچ ڕووداوێك بەڕێوەچوو. لەو ناوچە سەرسنوورییانەی کۆماری جۆرجیادا کە باس کران، حەوت هەزار بنەماڵەی جووتیار لە ناوچە کەم زەوییەکانی کۆماری جۆرجیاوە دەنێردرێنە جێگەیان و لەو شوێنانە نیشتەجێ دەکرێن (واتە لە شوێنی ڕاگوێزراوەکان).**

**هاوکات وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێتی هەنگاوی تایبەتی بۆ بەهێزکردنی چۆنیەتی پاراستنی ناوچە سەرسنوورییەکانی کۆماری جۆرجیای سۆڤێت لەگەڵ تورکیادا هەڵدەگرێ.**

وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت بێریا.

لە ١٩٤٤/١٢/٢ بێریا لە نامەیەکدا بۆ ستالین داوا دەکات کە[١٢٦] :

((لەبەر بەڕێوەبردن (جێبەجێکردن)ی سەرکەوتوانەی ئۆپیراسیۆنی ڕاگوێزان لە ناوچە سەرسنووریەکانی کۆماری جۆرجیاوە بۆ ناوچەکانی ئۆزبەکستان و کازاخستان و قرقیزیای سۆڤێتی کە ژمارەیان ٩١٠٩٥ کەسی تورك و کورد و خیمشین بوو، وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت داوا دەکات ئەو فەرمانبەرانەی وەزارەتی ناوخۆو دەزگای پاراستن و لەشکریانی سوپای سووری وەزارەتی ناوخۆ کە بە شێوەیەکی زۆر باش لە بەڕێوەبردنی ئۆپیراسیۆنەکەدا بەشداربوون، میدالیاکانی یەکێتیی سۆڤێتیان پێشکەش بکرێ. بەپێی لیستی ژمارەی ئەو کەسانەی کە پێشکەشیان کراوەو لە "دۆسیەی تایبەتی ستالیندا" پارێزراون، نیشانەی پلە شەڕی نیشتمانی بە ٢٥ کەس و پلە دووی هەمان نیشانە بە هەژدە کەس و نیشانەی "ئەستێرەی سوور" بە ٨٥ کەس و میدالی "لەخۆبردوویی" یا "ئازایەتی" بە ٦٧ کەس و میدالی "لەبەر خزمەتی جەنگی"بە ٢١٨ کەس دراوەو سەرجەم ٤١٣ کەس وەریگرتووە.

* شوورای وەزیرانی گەل

بڕیاری ژمارە ٣٥

مۆسکۆ-کریملین

١٩٤٥/١/٨

سەبارەت بە باری مافی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان

١-ڕاگوێزراوە تایبەتەکان کەڵك لە تەواوی ئەو مافانەی کە دانیشتوانی یەکێتیی سۆڤێت هەیانە، جگە لەو چوارچێوەیەی کە لەم بارەیەوە سنووری بۆ دانراوە، وەردەگرن.

٢-تەواوی ئەو ڕاگوێزراوانەی کە توانای کارکردنیان هەیە، بەرپرسن کە دەبێ خەریکی کاری کۆمەڵایەتی و بەسوود بن. بۆ ئەم مەبەستەش، شووراکانی نوێنەرانی

---

[١٢٦] ئەرشیفی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی، ئۆپیسی ٢، دیلای ٦٨، ل٥٤-٣١ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠- ١٨١).

خەڵك لەجێدا بە پێکهاتن لەگەڵ دامودەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆدا بەرپرسن کە بارودۆخی ئیش و کارکردنیان لە بوارەکانی کشتوکاڵ و دامودەزگاکانی پیشەسازیدا بۆ ڕێك بخەن، هەروەها لە ڕێکخراوو دامودەزگاکانی بیناکاری و سازکردن و کەڵخۆزو بوارە هەرەوەزیەکاندا کار بکەن.

بە لادانی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان لە دیسیپلینەکانی کار، بەپێی یاسا بەرپرسییان هەیە (سزا دەدرێن).

ڕاگوێزراوە تایبەتەکان مافی ئەوەیان نییە، بەبێ مۆڵەتی قوماندانی سەرکردایەتی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی وەزارەتی ناوخۆ، لە دەرەوەی ئەو ناوچەیەی کە تێیدا دەژین و فەرمانبەرداری سەرکردایەتی قوماندانی تایبەتی ئەو ناوچەیەیە، بڕۆنە دەرێ. لادان و چوونە دەرەوە، بە هەڵاتن دەژمێردرێ و، لە چوارچێوەی یاسای تاوانکاریدا بەرپرس دەبن.

٤-ڕاگوێزراوە تایبەتەکان، گەورەی ماڵەکان یا ئەندامەکانیان هەرچەشنە ئاڵوگۆڕێك کە لە ژیان و کاری بنەماڵەکەیاندا دەکرێ (لەدایکبوونی منداڵ و مەرگی ئەندامانی بنەماڵەو هەڵاتن و...)، دەبێ لەماوەی سێ ڕۆژدا قوماندانی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی لێ ئاگادار بکەنەوە.

٥-ڕاگوێزراوە تایبەتەکان، دەبێ لە چوارچێوەی ئەو یاساو داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەی کە لە شوێنی نیشتەجێیاندا هەن، ئەو سیستمە بەتەواوی ڕەچاو بکەن کە بۆیان دانراوە، گوێڕایەڵی تەواوی فەرمانەکانی قوماندانی تایبەتی سەر بە وەزارەتی ناوخۆش بن. لادان لە سیستمی کۆمەڵایەتی، لە شوێنی نیشتەجێبوونی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان، سزاکەی تا سەد ڕۆبڵ یا تا ٥ ڕۆژ ڕاگیرکردنە.

جێگری سەرۆکی شووڕای وەزیرانی یەکێتی سۆڤێت مولەتوڤ.ڤ.م

بەڕێوەبەرایەتی کاروباری شووڕای وەزیرانی یەکێتی سۆڤێت ئادایڤ.ی

* زۆر نهێنی

ژمارە ٠٠١٤٧٥/٢٧

ڕێکەوتی ١٩٤٨/١٢/٢٢

شاری مۆسکۆ

ژماره ١- به مەبەستی بەهێزکردنی سیستمی ڕاگوێزراوەکان لە دامودەزگاکانی باڵای یەکێتیی سۆڤێتدا لە سەردەمی شەڕی نیشتمانیدا ، چیچانیەکان و قەرەچایوەکان (کەرەچایڤەکان)، ئینگووش و بالکار، کالمیك، ئەڵمانی، تاتارەکانی کریم (قریم) و ... هتد (واتە کورد و تورك و میسختێن و... هەورامی) و، هەروەها لەبەرئەوەی کە لەکاتی گواستنەوەدا ماوەی مانەوەیان ( دوورخستنەوە یا نیشتەجێکردنیان) دیاری نەکراوە، بەپێی فەرمانی دەستەی باڵای سەرۆکایەتیی شوورای یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمانی سۆڤێت) لە ١٩٤٨/١١/٢٦دا، ((سەبارەت بەو کەسانەی کە لە شوێنی نیشتەجێیانەوە دوورخراونەتەوە بۆ ناوچە دوورو جیاجیاکانی یەکێتیی سۆڤێت، سزادانی تاوانکارییان، ئەگەر بێتوو هەڵبێن، بۆ هەمیشە یا بنەبڕە)) ؛ ((ئەو ڕاگوێزراوانەی سەرەوە کە بۆ ناوچە دوورو جیاجیاکانی یەکێتیی سۆڤێت نێردراون و ئێستە نیشتەجێکراون، فەرمان دراوە هەتاهەتایە لەوێ بمێننەوە، بەبێ ئەوەی مافی گەڕانەوەیان هەبێ بۆ شوێنی پێشووی خۆیان))، لەبەر سەربەخۆ ڕۆیشتن (هەڵاتن)یان لە شوێنی حەتمی جێگیربوونیان. تاوانکاران دەدرێنە دادگای تاوانکاریو، بۆ ماوەی بیست ساڵ بە کاری بێگاری کەمەرشکێن سزا دەدرێن.

هەر بەپێی ئەم بڕیارە، ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە دەستیان لە پەنادان و شاردنەوە یا یارمەتیدانی ڕاکردنی ڕاگوێزراوە لادەرەکاندا هەیە؛ هەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە مۆڵەتی گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکانیان بۆ شوێنی پێشووی خۆیان داوەو، دەدرێنە دادگای تاوانکاری و، ئەم تاوانبارانەش بە پێنج ساڵ زیندانی بێبەش لە ئازادی سزا دەدرێن.

ژمارە ٢- بەپێی بڕیاری شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت ژمارە ١٧٢٦-٤٣٦٣ زۆر زۆر نهێنی ڕێکەوتی ١٩٤٤/١١/٢٤ (سەبارەت بە ڕاگوێزراوەکان) بڕیاردراوە ئەو ڕاگوێزراوانەی کە ناویان لە سەرەوە هاتووەو سەرپێچی لە کاروباری کۆمەڵایەتی دەکەن، واتە هەوڵ ئەدەن ژیانی مشەخۆریی خۆیان درێژە پێ بدەن، ئەوانەش دەدرێن بە دادگای تاوانکاری. بەپێی خاڵی ١٢ی بڕیاری شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت ژمارە ٧٣٠-١٨٤١ نهێنی ڕێکەوتی

۱۹٤۸/٦/۳ (سەبارەت بە بەکارهێنان و جێبەجێکردنی بڕیاری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی‌ی شوورای بەرزی یەکێتی‌ی سۆڤێت (پەرلەمان) لە ڕێکەوتی ۱۹٤۸/٦/۲ لەبارەی ڕاگواستنی ئەوانەوە بۆ ناوچە دوورەکانی وڵات کە بە مەبەست خۆ لە کاروباری کۆمەڵایەتی ناگەیەنن و خۆیان لە چالاکی و کاری گشتی لائەدەن، ئەمە دەبێتە دیاردەیەکی دژی کۆمەڵگەو ژیانێکی مشەخۆرانە. سنووری سزادان بۆ ئەم تاوانانە دیاری کراوە، واتە دوورخستنەوەی تاوانبار بگۆڕدرێ بە ئۆردووگای پەروەردەو بۆ ماوەی ۸ ساڵ بخرێتە بەر کاری بێگاری.

ژمارە ۳- بڕیار دەدەین کە:

۱- تەواوی ڕاگوێزراوەکانی سەربەخۆ لە شوێنی نیشتەجێ‌ی ناچارییانەوە هەڵدێن، تاوانبارن و، لەکاتی ئاشکرابوونیاندا دەستبەجێ دەسگیریان بکەن و بدرێنە دادگای تاوانکاری.

۲- چیچانیەکان، قەرەچایڤەکان، ئینگوشیەکان، بالکارەکان، کالمیکەکان، ئەڵمانیەکان، تورکەکان، تاتارەکانی کریم، بولگارەکانی کریم، ئەرمەنیەکانی کریم، کوردەکان، خیمشینەکان، بەپێ‌ی خاڵی ۲ی فەرمانی دەستەی ڕێبەرایەتی‌ی شوورای باڵا (پەرلەمان)ی یەکێتی‌ی سۆڤێت لە ۱۹٤۸/۱۱/۲٦دا، لە شوێنی نیشتەجێ‌ی ناچارییان، دادگایی دەکرێن.

۳- ئەو کەسانەش کە هەڵاتوان لە شوێنی نیشتەجێ‌ی ناچارییانەوە دەشارنەوەو لە بەندی دووهەمدا هاتوون، یا یاریدەی هەڵاتنیان دەدەن، تاوانبارن. هەروەها تاوانی ئەوتۆ ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە مۆڵەتی ڕۆیشتن یا گەڕانەوە بۆ شوێنی پێشووی ڕاگوێزراوەکان ئەدەن و، پێویستە ئەوانیش دەسگیر بکرێن و بەپێ‌ی خاڵی ٤ی بڕیاری دەستەی سەرکردایەتی‌ی شوورای باڵای سۆڤێت (پەرلەمان) لە ۱۹٤۸/۱۱/۲٦دا، دادگایی بکرێن.

٤- ئەو ڕاگوێزراوانەی کە لە خاڵی ۲ی بڕیارەکەدا هاتوون و، هەروەها ئەو ڕاگوێزراوانەی کە بە تاوانی قین لەدڵی و سەرپێچیکردن لە کاروباری کۆمەڵایەتی بە هەشت ساڵ حوکم دراون، ئەگەر بێتو لە شوێنی نیشتەجێبوونیاندا خۆ لە

کارکردن بپارێزن و، درێژه به ژیانی مشه‌خۆری بده‌ن، ده‌ستگیر بکرێن و، به‌پێی خاڵی دووی به‌ندی تاوانکاری کۆماری فیدراڵی سۆسیالیستی ڕووسیا و به‌پێی به‌ندی تاوانکاری کۆماره‌کانی تری سۆڤێتی، بدرێنه دادگای تاوانکاری.

٥- ئه‌و ڕاگوێزراوانه‌ی که له خاڵی ٢ی بڕیاره‌که‌دا ناویان نه‌براوه و، به هه‌ڵاتن له شوێنی نیشته‌جێی ناچارییان تاوانبار کراون، به‌پێی ماده ٨٢ی به‌ندی تاوانکاریی کۆماری سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵ و، هه‌روه‌ها به‌پێی به‌ندی تاوانکاری کۆماره‌کانی تری سۆڤێت، دادگایی ده‌کرێن.

٦- لێکۆڵینه‌وه‌ی کاروباری ئه‌و که‌سانه‌ی که له شوێنی نیشته‌جێی ناچارییان هه‌ڵاتوون، یا ناردنه‌وه‌یان له‌ڕێگه‌ی دامودەزگاکانی وه‌زاره‌تی ناوخۆی یه‌کێتیی سۆڤێته‌وه مه‌نزڵ به مه‌نزڵ (ئێستگه به ئێستگه) له‌و شوێنه‌وه که گیراون، له ماوه‌ی ده ڕۆژدا بۆ شوێنی پێشوویان ده‌نێردرێنه‌وه.

٧- پاش لێکۆڵینه‌وه‌ی ته‌واوی دۆسیه‌ی هه‌ڵاتوان‌و، ئه‌وانه‌ش که خۆیان له ئیش‌وکاری گشتی ده‌دزنه‌وه، دۆسیه‌یان بۆ لێکۆڵینه‌وه ده‌نێردرێته کۆبوونه‌وه‌یه‌کی تایبه‌تی سه‌ر به وه‌زاره‌تی ناوخۆی سۆڤێت.

٨- دادگا چاودێرێکی به‌زه‌بر بۆ ته‌واو جێبه‌جێکردن و ڕێکوپێکی بڕیاری ده‌سته‌ی شوورای باڵای یه‌کێتیی سۆڤێت (په‌رله‌مان) له ١٩٤٨/١١/٢٦داو هه‌روه‌ها بڕیاری شوورای وه‌زیرانی یه‌کێتیی سۆڤێت ژماره ١٧٢٦-٤٣٦٣ ڕێکه‌وتی ١٩٤٨/١١/٢٤، داده‌نێ.

بڕیار (په‌خشنامه)ی وه‌زاره‌تی ناوخۆی یه‌کێتیی سۆڤێت و دادستانی گشتی یه‌کێتیی سۆڤێت ژماره ٣٢/٣٩، ١٩٤٧/٢/١٤ هه‌ڵوه‌شێندرێته‌وه.

وه‌زیری ناوخۆی یه‌کێتیی سۆڤێت

کروگلوڤ.س

دادگای گشتی یه‌کێتیی سۆڤێت

سافانوڤ.گ

* له شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێتیەوە
بۆ هاوڕێ مولەتۆڤ.ڤ.م
١٩٤٥/٦/٢٩

ئەو پارچە زەویانەی دەوروبەری ماڵ یا بێستانی تایبەتو ئاژەڵ کە هی ڕاگوێزراوەکانی باکووری قەفقاس، واتە کەلمیکەکان و کریم و جۆرجیان، هەروەك دانیشتوانی خۆجێیی ماڵیاتی بەرهەمی کشتوکاڵ و ماڵیاتی داهاتیان لێ وەردەگیرێ و، بەرپرسیشن کە بەرهەمی کشتوکاڵی ساڵانەی خۆیان بە دەوڵەت بدەن.

دانی ئەم جۆرە ماڵیاتانەو ئامادەکردنی بەرهەمی کشتوکاڵ و تەحویلدانی بە دەوڵەتیش، زۆر زەحمەتە. لەبەرئەوە بەرهەمێکی ئەوتۆیان نییە، ئەویش جگە لەوەی کە باری ماددیو ژیانی ئەو ڕاگوێزراوانە لە شوێنی زۆر دژوارو سەختدایە.

لەم بارەوە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت پێی وایە پێویستە ئەو ڕاگوێزراوانەی سەرەوە لە ١٩٤٥ و ١٩٤٦دا لە دانی ماڵیاتی کشتوکاڵ و ماڵیاتی داهات ئازاد بکرێن.

گەڵاڵەی بڕیاری شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت ئاڕاستە دەکرێ.

وەزیری ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت
بێریا.ئا
* بڕیاری ژمارە ١٩٢٧/ ڕێکەوتی ١٩٤٥/٦/٢٨
شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت
پێشنیارەکانی سەرەوەی پەسند کردووە (هەورامی)
جێگری سەرۆکی شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت ڤەزنەسینسکی.ن
بەڕێوەبەری کاروباری شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت چادایڤ.ی[١٢٧]

بەڵگەی زانیاری
لەدایکبوون و مردنی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان لە ساڵی ١٩٤٥دا

---

[١٢٧] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی ٥٤٤٦، ئوپیسی ٤٨، دیلای ٣٢٨٩، ل٥.

| ناوی یەکە تایبەتەکانی ڕاگوێزراو | لەدایکبوون | مردن | ناونووسی منداڵان (تاپۆی ژمارەی منداڵان، منداڵانی سەرژمێرکراو) |
|---|---|---|---|
| لە باکووری قەفقاس | ٢٢٣٠ | ٤٤٦٥٢ | ١٩٧٨ |
| ئەڵمانی خاوەن زەویەکان | ١٩١٤ | ٦٩٣٠ | ١٥٢٩ |
| (کولاك) | ١٦٩١ | ٨١٩٤ | – |
| لە جۆرجیا | ٥٩٩ | ٦٩٠٢ | ١٣٩ |
| لە کریم (قریم) | ١٠٩٩ | ١٥٩٩٧ | ٣٢ |
| کالمیکەکان | ٣٥١ | ٣٧٣٥ | ٢٩٢ |
| هاودەستەکانی ئەڵمان | ٦ | ١١٨ | ١ |
| لە کۆماری لیتڤیای سۆڤیتی | ٣ | ١٤٢ | – |
| هتد . | ١ | ٧٢ | – |
| کۆ | ٧٨٩٤ | ٨٦٧٤٢ | ٣٩٧١ |

بەپێی سەرژمێری بەشی یەکە تایبەتەکانی ڕاگوێزراوی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت

ساڵی ١٩٤٤ ژمارەی لەدایکبوان ١٧٧٩٥ ژمارەی مردوان ٤٤٣٩١ ناونووسی منالْ ١٤٠٦٢ کەس

ساڵی ١٩٤٧ ژمارەی لەدایکبوان ٢٠٨٤٩ ژمارەی مردوان ٣٩١٠٤ ناونووسی منالْ ٢٥٨٢٥ کەس

ساڵی ١٩٤٨ ژمارەی لەدایکبوان ٣٣٨٣٨ ژمارەی مردوان ١٦١٦٢ ناونووسی منالْ ٥٨٤٧٦ کەس

ساڵی ١٩٤٩ ژمارەی لەدایکبوان ٥٤١١٣ ژمارەی مردوان ٢٤٩٤٠ ناونووسی منالْ ٤٧٣٠١ کەس

ساڵی ١٩٥٠ ژمارەی لەدایکبوان ٦٢٠٠١ ژمارەی مردوان ٢٣٥١٤ ناونووسی منالْ ٥٤٤٧٣ کەس

به هەمووییەوە لە ساڵی ١٩٤٥ەوە تا ١٩٥٠

ژمارەی لەدایکبوان ١٩٦٦٢ کەس.

ژمارەی مردوان ٢٨٧٧٧٠ کەس.

ژمارەی ناونووسی منالّ ٢٠٤١٠٩ کەس.

* لە شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێتەوە

بۆ هاوڕێ میکویان.ئا.ی

١٩٤٥/١/١٣

بەپێی بڕیاری GOKO ژمارە ٦٢٧٩ تەواو نهێنی، ڕێکەوتی ١٩٤٤/٧/٣١، لە ناوچە سەرسنوورییەکانی کۆماری جۆرجیاوە ٩٢٣٧٤ کەس بۆ کۆماری ئۆزبەکستان و کازاخستان و قرقیزستانی سۆڤێتی ڕاگوێزراون.

کاتی ڕاگواستنیان ٨٢٥٢ تەن دانەوێڵەو ٣٩٤٨ تەن پەتاتەو سەوزەجات و ٤٥٣ تەن میوەو ٣١٢ تەن ئاژەڵی گەورەی شاخدار ٦٠٠٠٧ سەرو هی بچووک ٨٠٠٤٩ سەریان لێ وەرگیراوە.

بەشێکی زۆری ئەو ڕاگوێزراوانە بەبێ تفاق و خواردەمەنی دەگەنە شوێنی نیشتەجێبوونی نوێیان. بەم بۆنەیەوە، پێم وایە تا ئامادەبوونی بەرهەمیان و حیسابکردن لەگەڵیان، پێویستە لەباتی ئەو ئاژەڵ و دانەوێڵە و بەرهەم و شتومەکەی‌تر کە کاتی ڕاگوێزران لێیان وەرگیراوە، دەستبەجێ یارمەتی تفاق و خواردەمەنییان پێ بدرێ، ئەو دانەوێڵەیەی کە لە ١٥ی یەکەوە تا ١٥ی ئازاری ئەمساڵ وەرگیراوە، وەك ئاوانس (پێشەکی) بیاندرێتێ، واتە ١٦ کیلۆ ئاردو چوار کیلۆ دانەوێڵە بدرێتە هەر کەسێکو، سەرجەمی تائێستا دەکاتە ١٤٨٠تەن ئاردو ٣٧١ تەن دانەوێڵە.

گەڵاڵەی بڕیاری شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت ئاڕاستە دەکرێ، تکایە لێی بکۆڵنەوە

وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت بێریا-ئا [١٢٨]

---

[١٢٨]ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی ٥٤٤٦، ئوپیسی ٤٨، دیلای ٣٢١١، ل٣ (سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧).

* نهێنی

جێگری سەرۆکی شووراى وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت

هاوڕێ مولەتوڤ.ڤ.م

١٩٤٥/٣/٢٠

بڕیاری کۆمیتەی بەرگری دەوڵەتی سۆڤێت، ڕێکەوتی ١٩٤٤/٧/٣١ و ژمارەی تەواو نهێنی ٦٢٧٩، سەبارەت بە نیشتەجێکردنی خەڵك لە ناوچە سنووریەکانی جۆرجیای سۆڤێتیدا (واتە لەجێی ڕاگوێزراوەکان، هەورامی) چوار ملیۆن ڕۆبڵیان بۆ تەرخان کراوەو، ٦١١٠ بنەماڵە هەتا یەکی مارتی ١٩٤٥ لە ناوچە سنووریەکانی کۆماری جۆرجیای سۆڤێتی جێگیرو نیشتەجێ‌کراون.

گەرچی هێشتا تەواوی کارەکان کۆتایی پێ نەهاتووەو، ئەو کەرەستەیەی کە بۆ ئاواکردنەوە دیاری کراوە، هێشتا نیوەی بەدەست گەیشتووە.

شووراى وەزیرانی جۆرجیای سۆڤێتی داوای گەیاندنی کەرەسەکان دەکات.

جێگری سەرۆکی شووراى وەزیرانی کۆماری جۆرجیای سۆڤێتی

خوشتاریا-س[١٢٩]

* زۆر نهێنی

١٩٤٥/٤/٧

بۆ سەرۆکی دەستەی سەرکردایەتی‌ی شووراى باڵای یەکێتی‌ی سۆڤێت (پەرلەمان) هاوڕێ ڤەرەشیلوڤ.ك-ی[١٣٠]

کۆمیتەی ناوەندی ئۆزبەکستان پێی وایە کێشەی هەڵگرتن (لابردن)ی تەواوی سنووردانان بۆ هەندێ لە پلەکانی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان لەجێی خۆیدایە.

---

[١٢٩] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی ٥٣٣٦، ئوپیسی ٤٨، دیلای ٣٢٣٢، ل٢ (هـ. س، ل١٨٩).

[١٣٠] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی ٧٥٢٣، ئوپیسی ٨٥، دیلای ٣٥، ل١٩٥-١٩٦ (هـ. س، ل١٩٠).

لەڕاستیدا ژمارەیەکی زۆر ئەو پلانەی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان، پێویست نییە بەردەوام چاودێریی ئیدارییان بەسەرەوە بێ.

پێشنیاری لابردنی تەواوی ئەو سنووردانانە بۆ ڕاگوێزراوە تایبەتەکان، ئەم بەش و دەستانە دەگرێتەوە کە ئێمە پشتگیرییان دەکەین: ئەندام و پاڵێوراوەکانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، کومسومولەکان و بنەماڵەکانیان، بەشدارانی شەڕی نیشتمانیی گەورە (دووهەم شەڕی جیهانی) بە بنەماڵەکانیانەوە و، تەواوی بنەماڵەی شەهیدەکان (ئەوانەی قوربانیی پاراستنی نیشتمانی سۆڤێتی بوون)ی نیشتمان دەگرێتەوە. ئەو ژنانەش کە مێردیان بە ڕاگوێزراوە تایبەتەکان کردووە و ڕاگوێزراوی تایبەت نین، هەروەها بەساڵاچووەکان (ژن لە تەمەنی ٥٥ ساڵ زیاتر و، پیاو تەمەنی شەست ساڵ زیاترەوە) و کەمئەندامەکان و ئەو کەسانەی کە نەخۆشن و چارەسەری نەخۆشیەکەیان نییەو، منالی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان (بە هەموو بەش و پلەکانیانەوە) کە تەمەنیان نەگەیشتوەتە پانزە ساڵو، کولاکەکانی پێشوو، ئەوانەی نێوان ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣٣ی ناوچەکانی ڕاماڵینی کولاکەکان "هەرەوەزیەکان"و، ژنە ڕووس و ئۆکرائین و نەتەوەکانی تر کە ساڵی ١٩٤٤ لە کریمەوە ڕاگوێزران، دەگرێتەوە. یۆنانی و تورکو خیمشینو بولگار و ئەرمەنەکانیش دورخراونەتەوە، دەگرێتەوە (کوردیان تێدا نییە، هەورامی).

لە ئەنجامی جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەدا لە کۆماری ئۆزبەکستان، هەڵگرتنی سنوورەکانی سەر مافی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی ئەو بەشانەی سەرەوە، لە ١٩١٤٥٣ کەس نزیکەی ١٢٥٠٠٠ لێ گرتوەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە بە پێویستی دەزانین بەشەکانی تری ڕاگوێزراوەکان، بەتایبەت تاتارەکانی کریم کە ساڵی ١٩٤٤ ڕاگوێزراون بۆ ئۆزبەکستان و، لەبەرئەوەی کە هێشتا ژمارەیەکی زۆر لەناویاندا هەڵوێستێکی دوژمنانە دەنوێنن و تاوانی جینایی دەکەن، وەك خۆیان بهێڵرێنەوە.

بەم چەشنە، ساڵانی ١٩٥٢-١٩٥٣ لە تەواوی ئۆزبەکستاندا، ١١٨٨ کەس زیندانی هەیە، کە ١٠٢٠ یان تاتاری کریمن و بە تاوانی قورسی جینایی زیندانی کراون. ـمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئۆزبەکستان، چالاکیی سیاسی و پەروەردەکردن

لەناو ئەمانەدا بەڕێوە دەبات و ڕایاندەکێشێ بۆ بەشداریکردنی چالاکانە لە ژیانێکی کۆمەڵایەتی–سیاسیدا )).

* سەرکردایەتیی شووڕای باڵای یەکێتیی سۆڤێت

(سەبارەت بە هەڵگرتنی سنوورەکانی سەر ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی تاتارە کریمەکانو بالکارەکان و هاونیشتمانانی کوردو خیمشین و ئەندامانی بنەماڵەکانیان، کە لە سەردەمی شەڕی گەورەی نیشتمانیدا گواستراونەتەوە)

ژمارە١٣٦/١٤٢

١٩٥٦/٤/٢٨

بە لەبەرچاوگرتنی هێشتنەوەی سنوورەکانی سەر بواری مافی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی تاتارو بالکارو تورك و هاووڵاتیانی یەکێتیی سۆڤێت، کوردو خیمشین و ئەندامانی بنەماڵەکانیان کە لەنێوان ١٩٤٣–١٩٤٤دا لە جۆرجیای سۆڤێتیو کریمی باکووری قەفقاسەوە ڕاگوێزراون، لەمەولا پێویست ناکات هیچ سنوورێك بۆ ئەو مافانەیان دابنرێ. سەرکردایەتیی شووڕای باڵای یەکێتیی سۆڤێت بڕیاری دا:

١– لیستی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان هەڵبگیرێ و، چاودێریی ئیداری دامودەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆش بەسەر تاتارەکانی کریمو بالکارو تورکو هاونیشتمانی یەکێتیی سۆڤێت ،کوردو خیمشین و ئەندامانی بنەماڵەکانیانەوە کە سەردەمی شەڕی جیهانی دووهەم ڕاگوێزرابوون، نەمێنێ.

٢–ئەوەش دیاری بکرێ کە لابردن یا هەڵگرتنی سنووردانان لەسەر ئەو کەسانەی کە لە خاڵی یەکەمی ئەم بڕیارەدا هاتوون، بەو مانایەیە کە سەرو سامانی دەست بەسەرداگیراوی کاتی ڕاگواستنیان پێیان بدرێتەوە. جگە لەوە، ئەوانە مافی گەڕانەوەیان نییە بۆ ئەو شوێنانەی کە لێی دوورخراونەتەوە.

ڤەرەشیلوڤ.ك

پیگوڤ.ن

* جاڕنامە

شووراى باڵاى کۆمارە سۆسیالیستە یەکگرتوەکانى سۆڤێت

(سەبارەت بە داننان بە نایاسایىبوونى کردەوەى تاوانبارانەى دوورخستنەوەى گەلان کە کەوتنە بەر شاڵاوى بەزۆر دوورخستنەوەو دابینکردنى مافەکانیان).

ئەمڕۆ لە قۆناغى نوێکردنەوەى شۆڕشگێڕانەى کۆمەڵگەى سۆڤێتیدا، واتە کاتێك دەست بە پرۆسەى دیموکراتیزەکردن و پاکسازیى هەموو بوارەکانى ژیان لە گۆڕان و ئاوەژووکردنەوەى پرنسیپەکانى گشتى مرۆڤایەتى (هومانیزم) کراوە لە وڵاتدا، هەوڵدان بۆ زانینى تەواوى ڕاستیەکان لەسەر ڕابردوو توندتر دەبێ، بۆ ئەوەى لە داهاتوودا وانەیان لێ وەربگیرێ. بیرەوەرییەکى گەرمى تایبەت، ئێمە دەگەڕێنێتەوە بۆ ساڵانى تراژیدیاى ڕاگواستنى نایاسایى و سەربەخۆى ستالینى کە هەموو کۆمارەکانى سۆڤێتى و تێکڕاى گەلانى ئەم وڵاتەى گرتەوە.

گرتنى بەکۆمەڵ و ئازارکێشانى ئۆردووگاکان و، کلۆڵکردنى ژنان و، بەساڵاچوان و منداڵان لە ئۆردووگاکانى ڕاگوێزراوەکاندا، تائێستاش ئازارى ویژدانمان دەدەن و، جەخت لەسەر سووکایەتیکردن بە هەستى ئەخلاقیمان دەکەن. ئەمە نابێ فەرامۆش بکرێ. کردەوە دڕندانەکانى ڕژێمى ستالینى لە سەردەمى شەڕى جیهانى دووهەمدا، بریتییە لە بەزۆر ڕاگوێزانى بەکۆمەڵى بالکار، ئینگوشى و کالمیك و قەرەچایڤ و تاتارەکانى کریم و ئەڵمانى و تورك- مەسخیتین و چیچانیەکان. سیاسەتى بەزۆر گواستنەوە، کاریشى کردوەتە سەر چارەنووسى کۆرى و یۆنانى و کوردەکان و گەلانىتر.

شووراى باڵاى کۆمارە سۆسیالیستە یەکگرتوەکانى سۆڤێت، بەبێ هیچ پێش مەرج و بەربەستێك، سیاسەتى بەزۆر گواستنەوەى بەکۆمەڵى گەلان تاوانبار دەکات و، تاوانێکى قورسى دژ بە بنەماکانى مافى نێونەتەوەیى و سروشتى مرۆدۆستانەى سیستەمى سۆسیالیستییە. شووراى باڵاى کۆمارە سۆسیالیستە یەکگرتوەکانى سۆڤێت، بەڵێن دەدات کە چیتر بوار نەدات مافى مرۆڤ و شێوەکانى

مرۆدۆستی له ئاستی دەوڵەتیدا؟! له وڵاتی ئێمه خەوشدارو لەژێر پێ بنرێن.
شووراى باڵاى کۆماره سۆسیالیستەیەکگرتوەکانی یەکێتیی سۆڤێت، پێی وایه پێویسته بەپێی یاسادانانێکی لەبارو وەڵامدەرەوه هەنگاو بۆ گێڕانەوەی بێ چەندو چوونی مافی گەلانی سۆڤێتی دوچاری شاڵاوی بەزۆر ڕاگوێزان بنرێ.
شووراى باڵاى کۆماره سۆسیالیسته یەکگرتوەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ–کریملن ١٩٨٩/١١/١٤.

* ئەم گەڵاڵەنامەیە بڵاوبکرێتەوه

گەڵاڵەنامەی بڕیاری شووراى باڵاى یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمان)

(چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەی تایبەت به هاووڵاتیانی سۆڤێتی تورك و کوردو خیمشین و ئازەربایجانی که له جۆرجیای سۆڤێتی دەژیان و، ماددەی دووی ڕێکەوتی ١٩٥٦/٤/٢٨ی بڕیاری شووراى باڵاى یەکێتیی سۆڤێت و ماددەی دووی ١٩٥٧/١٠/٣١ی بڕیارنامەی شووراى باڵاى یەکێتیی سۆڤێت)

دەستەی باڵاى شووراى سەرکردایەتیی یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمان) بڕیاری دا:

١–ڕوون بکرێتەوه که هاووڵاتیانی تورك و خیمشین و ئازەربایجانی سۆڤێتیو بنەماڵەکانیان، که پێشتر له کۆماری ئۆتۆنۆمی ئاجارو ناوچەکانی ئاخالتسیخ و ئاخال کەلاك و ئەدەگێنو ئەسپیندزەو بەگدانی جۆرجیای سۆڤێتیدا ژیاون، وەك هەموو دانیشتوانو هاووڵاتی سۆڤێتی، له سەرانسەری ئەم وڵاتەدا مافی یەکسانیان هەیەو، بەپێی یاساکانی ئەمڕۆی وڵات، هەموو مافێکیان بۆ دامەزراندن لەسەر ئیشو سیستمی پاسپۆرت هەیه.

٢– ڕوون بکرێتەوه که هاووڵاتیانی نەتەوەی تورك و کوردو خیمشین و ئازەربایجانی که پێشتر له جۆرجیای سۆڤێتیو کۆمارەکانی تری سۆڤێتیدا ژیاون، دەتوانن به تەواوی ئەو مافانەوه که هاووڵاتیانی سۆڤێتی هەیانه، بەشداری له ژیانی کۆمەڵایەتی–سیاسیدا بکەن و، ژمارەیەکی زۆری ئەوانه لەبەر بەشداری له هەڵبژاردنی دامودەزگاکانی حیزبی و سەندیکاکانی وڵاتدا، نیشانەو میدالیان له کاردا پێ دراوەو، پلەی سەروەری و شانازییان هەیه.

فەرمان بە شووراى وەزيرانى كۆمارەكانى يەكێتىى سۆڤێت دراوە، واتە ئەو كۆمارانەى كە تائێستا ئەو هاولاَتيانەى لەسەرەوە ناويان هاتووە، لەمەولا يارمەتىو هاوكارييان لە بوارى گوزەران و ئيش‌وكار و كولتووردا بەپێى بەرژەوەندو تايبەتمەنديە نەتەوەيى‌يەكانيان بەردەوام دەبێ.

سەرۆكى شووراى بالاَى يەكێتىى سۆڤێت

سكرتاريەتى دەستەى بالاَى شووراى يەكێتىى سۆڤێت [131]

* لە بڕيارى دەستەى بالاَى شووراى يەكێتىى سۆڤێتى (پەرلەمان)

(سەبارەت بە گۆڕينى كردەوەى ياسادانەرەكان كە پەيوەندى بە جاڕنامەى شووراى بالاَى يەكێتىى سۆڤێتەوە لە ١٩٨٩/١١/١٤دا هەيە)

سەبارەت بە داننان بە تاوانى كردەوە ناياساييەكانى بەزۆر گواستنەوە بەرامبەر بەو گەلاَنەى كە بەزۆر ڕاگوێزران و گەڕاندنەوەى مافەكانيان

بەپێى جاڕنامەى شووراى بەرزى يەكێتىى سۆڤێت لە ١٩٨٩/١١/١٤دا (لەبارەى ناياسايى‌بوونى گواستنەوەى بەزۆر و تاوانكارانەوە بەرامبەر بەو گەلانەى كە كەوتوونەتە بەر شالاَوى بەزۆر ڕاگواستن و مسۆگەركردنى مافەكانيان) بە ڕەچاوكردنى بايەخى سياسىو كۆمەلاَيەتىى تەواو چارەسەركردنى هەموو كێشەكانى پەيوەنديدار بە گەڕاندنەوەى سەرجەمى مافەكانى ئەو گەلانە كە بەبێ بناغەو بەزۆر ڕاگوێزراون، شووراى بالاَى يەكێتىى سۆڤێتى بڕيارى دا:

١-ئەو ئەنجامدەرانەى دامودەزگاكانى بالاَى دەسەلاَتى دەولَەتى يەكێتىى سۆڤێت بگۆڕدرێن كە ببوون بە مايەى هەم كردەوەى دژى ياسايى و گواستنەوەى بەزۆرى هەندێ گەل لە جێوڕێى خۆيان و سنووردراكردنى مافەكانى هاوولاَتيانى ئەم گەلانەو، هەم بڕيارى ناياسايانەى هەلَوەشاندنەوەى هەندێ قەوارەى نەتەوەيى- دەولَەتىى ئەم گەلانە.

---

[131] ئەرشيڤى دەولَەتى ڕووسياى فيدرالَ، فوندى ٧٥٢٣، ئوپيسى ١٢١، ديلاى ٤٩، ل٢٧ (هـ. س، ل١٩١).

هەڵگرتنی مۆرەکانی (بۆ چاپەمەنیەکان) و بڕیارەکانی کۆمیتەی بەرگری پێشووی دەوڵەتی یەکێتی سۆڤێت لە دامودەزگاکانی یاسادانان. فەرمان بە کابینەی شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت دەدەین ئەو مۆرو بڕیارە نهێنیانەی دەوڵەتی سۆڤیێتی ئاشکرا بکات.

٢-هەڵوەشانەوەو لابردنی:

.... ماددەی ٢ی ڕێکەوتی ١٩٥٦/٤/٢٨ی دەستووری شوورای باڵای یەکێتیی سۆڤێت (سەبارەت بە هەڵگرتنی سنووردانان بۆ ئەو کەسانەی کە بەزۆر ڕاگوێزراون، واتە لەسەر تاتارەکانی کریمو، بالکار و تورك و تورك و کورد و خیمشین و ئازەربایجانیەکانی هاووڵاتیانی یەکێتیی سۆڤێت کە پێشتر لە کۆماری سۆسیالیستی جۆرجیا ژیاون و، هەروەها ماددەی دووهەمی دەستووری دەستەی باڵای شوورای یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمان) لە ١٩٥٧/١٠/٣١دا.

(بەڕێوەبەرایەتیی دەزگای شوورای باڵای یەکێتیی سۆڤێت، ١٩٦٨، ژمارە٢، ماددەی ١٨٨-ڕۆژنامەی ئیزڤیستیا ١٩٩١/٣/١٤).

بانگەوازێك بۆ سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان

(سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی سەرکوتکردنی گەلان لە یەکێتیی سۆڤێت وەك جینۆساید)

بەڕێز سەرۆکی گشتی:

لە ٩ی دیسەمبەری ١٩٤٨دا پەیماننامەی (سەبارەت بە ئاگادارکردنەوەو سزادانی تاوانی جینۆساید) لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە پەسند کراوە. ئەم پەیماننامەیەش لەلایەن دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێتەوە لە ١٩٥٤دا پەسند کراوە.

سەرکردایەتیی یەکێتی سۆڤێت، هەر لە سەرەتای ساڵەکانی ٣٠ـەوە، بە بیانووی جۆراوجۆرەوە ژمارەیەکی زۆر لە نەتەوەکانی ئەم وڵاتەی خستە بەر شاڵاوی سیاسەتی تەنگ پێهەڵچنین و زوڵموزۆر. هەندێ لەم گەلانە وەك بالکارو ئینگووشیو یۆنانیو قەرەچایڤو تاتارەکانی کریمو کۆریو ئەڵمانیەکانی سۆڤێتو چیچنیەکانو ئین گیرمانلاندی فینلەندیو تورکە میسخیتیەکانو کوردەکانو خیمشیەکان، بەکۆمەڵ لە

شوێنی دێرینی ژیانیان هەڵکەندران، لە هەرێمەکانی باکوور- ڕۆژهەڵاتی یەکێتیی سۆڤێتدا کە کەش‌وهەوایەکی ناسازگاریان هەیە، بە شێوەیەکی بەربڵاو جێگیرکران. زۆربەی سەرو سامانی نەتەوەیی ئەم گەلانە بەتاڵان براو، بەشێکیشی کەوتە دەستی دەوڵەت. لە شوێنی جێگیرکردنیان، ڕژێمێکی توندی پاسەوانی و پۆلیسییان بۆ دامەزراندن. بۆ وێنە، هاتوچۆی ئەم گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر یا لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی هاوسێ، بەبێ مۆڵەتی قوماندانی تایبەت، وەك هەوڵدانی هەڵاتن لەقەڵەم ئەدرا و سزاکەشی دوورخستنەوە بوو بۆ ئۆردووگاکانی کاری سەخت بۆ ماوەی بیست ساڵ.

لە ئەنجامی ئەم کردەوە بەربەریانەیەدا، نزیکەی نیوەی گەلانی ناوبراو لەناو چوون و، زیانێکی یەکجار زۆریان لێکەوت و، تەنیا نیوەی ئەم گەلانە توانییان بگەڕێنەوە بۆ شوێنی دێرینی ژیانیان.

دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت و ڕووسیا، هەندێ یاسای سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی ئەم گەلانەی دەرکرد، بەڵام هیچ یەك لەم یاسایانە جێبەجێ نەکران و ناکرێن.

کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بەرەو ڕووی نەك تەنیا پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بووەتەوە، بەڵکوو ڕووبەڕووی کۆمەڵە گەلێك بووەتەوە کە وێنەی نییەو جینۆسایدیان کردوون‌و، بەتەواوی لە خاڵی دووهەمی پەیماننامەی ناوبراودا جێی دەبێتەوە.

هێندەی بەستە بەو ڕاگەیاندنەی سەرەوەو، بە لەبەرچاوگرتنی هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت‌و ڕاگەیاندنی کۆماری ڕووسیاو کۆمارەکانی تری سۆڤێتی پێشوو وەك میراتگیری یاسایی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت، کۆنگرەی تایبەتی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراو داوا لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان دەکات:

-بەپێی ئەو پەیماننامە باسکراوەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەو کردەوەو سیاسەتەی کە بەرامبەر بە گەلانی ناوبراو کراوە، بە کردەوەیەکی جینۆساید بناسرێ و لەقەڵەم بدرێ.

-داوا لە دەوڵەتانی کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشووی ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان بکرێ، ئەوانیش سەرکوتکردنی نەتەوەیی ئەم گەلانە بە

کردەوەیەکی جینۆسایدانە، وەك لە چوارچێوەی پەیماننامەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هاتووە، بناسێنن و، لەم بارەوە بەرامبەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و گەلانی سەرکوتکراو بەرپرس بن.

– ئەو دەوڵەتانەی کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو کە مافی مرۆڤ و ئیتنۆسەکان پێشێل دەکەن، بە ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان وەرنەگیردرێن.

سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراوی ڕووسیای فیدراڵ

ئیسماعیل عەلییێڤ نالچیك ١٩٩٢/٢/١٤

**تێبینی:** تەنانەت هەندێ لە بەشدارانی کۆنگرەی نەتەوە سەرکوتکراوەکانی ڕووسیا پێشنیار دەکەن داوا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بکرێ گەمارۆ یا چوارچێوەیەك بەرامبەر بەو دەوڵەتانەی سۆڤێتی پێشوو کە مافی گەڕانەوە یا ڕەچاوکردنی مافی گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوەکان ناکەن، دابنرێ، هەورامی [١٣٢].

* بڕیاری ژمارە ٣٧٥ لە ١٩٦٨/٧/١٢دا وەزیری پاراستنی هێمنایەتی کۆمەڵگەی یەکێتیی سۆڤێت

فەرمان دەدەم کە:

١–تەواوی دامودەزگاکانی ئەم وەزارەتە، لە کۆمارو شارو ناوچەکانی سەرانسەری سۆڤێت، بواری کارکردن و کەڵك وەرگرتن لە پاسپۆرتی هاووڵاتیانی یەکێتیی سۆڤێت، تورك و کوردو خیمشین و ئازەربایجانیو، هەروەها ئەوانەی کە پێشتر لە کۆماری ئۆتۆنۆمی ئاجاری یەکێتیی سۆڤێت و ناوچەکانی ئاخالتسیخ و ئادەگی و ئاسپیندزو ئاخال کەلاك و بەگدانی سەر بە کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی جۆرجیا ژیاون، دابین بکات. هەروەها ئەو مافە، لەسەر بناغەیەکی گشتیو بەپێی یاساکانی ئەمڕۆ، بدرێتە بنەماڵەکانیان.

٢–جێبەجێکردنی خاڵی چواری وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت ژمارە ١٤٤، ١٩٥٦/٤/٢٩.

---

[١٣٢] کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراوی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، ل١٤٩–١٥٠.

ژەنەراڵ پالکۆڤنیك شلیاکوۆ وەزیری پاراستنی هێمنایەتی کۆمەڵگەی یەکێتی‌ی سۆڤێت[١٣٣]

دەسەڵاتدارانی خۆجێیی جۆرجیا، سەرەڕای ئەم فەرمانو بڕیارەو فەرمانەکانی تری دەزگاکانی هەرە بەرزی حیزبی‌و دەوڵەتی‌و پەرلەمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت، ناهێڵن ئەو نەتەوانە بگەڕێنەوە کە سەربەخۆ یا لەڕێگەی یاسایی‌یەوە دەگەڕێنەوەو، جێیان و کاریان نادەنێ‌و، ناهێڵن بگەڕێنەوە سەر گوندو خانووبەرەی خۆیان. ئەوانیش، بە ناردنی نامەو دەستەی نوێنەرایەتی، سکاڵای خۆیان دەبەنە مۆسکۆ. لەوێش سەرلەنوێ فەرمانو بڕیاری نوێ دەردەکەن، بەڵام یا جێبەجێ ناکرێن، یا نیوەچڵ جێبەجێ دەکرێن بۆ ئەم کەس‌و دەستەو ئەو کەس و دەستە، نەك بۆ نەتەوە یا دروستکردنی ئۆتۆنۆمی بۆیان.

(بزووتنەوەی گەڕانەوەی خەڵك بۆ سەر جێ‌وڕێی پێشووی خۆیان، نەدەوەستا. لە ١٩٦٤دا ئەم کێشەیە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە تاووتوێ کراو، گوایە هەموویان دامەزراون و لەم بارەوە گێژەو کێشەیەك نییە، بەڵام ئەم گوتنە دوور لەڕاستی بوو. بۆ سەلماندنی ئەمەش، لە سێپتەمبەری ١٩٥٧ و ١٩٦٧ لەلایەن خەڵکی تورك و ئازەربایجانەوە ٣,٥ هەزار نامەو داواکاری گەیشتە دەستی کاربەدەستان و وەڵامیان یەك شت بوو: (گەڕانەوەی بەکۆمەڵی خەڵك ... بگوترێ باش نییە، مەسلەحەت نییە).

هەموو کێشەو داواکاریەکان خرابوونە چوارچێوەی بڕیاری دەزگای حیزبی‌و، تییدا هاتووە ((چالاکی بەربڵاوی سیاسی لەناو هاوولاتیانی تورك و خیمشین و ئازەریدا بکرێ و بە ڕۆحێکی نیشتمانپەرستانەی سۆڤێتی و ئینتەرناسیۆنالیزم و دۆستایەتی‌ی گەلان و ... هتد پەروەردە بکرێن)) ١٩٦٨/٥/٣٠ شووورای باڵای یەکێتی‌ی سۆڤێت (پەرلەمان) بڕیاری دا مۆڵەت بەو خەڵکانە (ڕاگوێزراوەکان) بدرێ لە هەموو جێگایەکی ئەم وڵاتەدا بژین، بەڵام ئەم بڕیارە جێبەجێ نەکرا[١٣٤].

---

[١٣٣] قەفقاز، گەلان لە قافڵەکاندا، ل٣١٥.

[١٣٤] قەفقاز، گەلان لە قافڵەکاندا، ل٣١٤، ٣١٥.

* بڕیاری دەستەی باڵای شوورای یەکێتیی سۆڤێت (پەرلەمان)

سەبارەت بە هەڵوەشانەوەی کۆماری ئۆتۆنۆمی سۆسیالیستی سۆڤێتی چیچنی-ئینگووشی و چۆنیەتی دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتیی خاکەکەی

١٩٤٤/٣/٧ ژمارە ١١٨٠٣ مۆسکۆ-کریملن

سەبارەت بەوەی کە لە سەردەمی شەڕی نیشتمانیدا (شەڕی جیهانی دووهەم)، بەتایبەت کاتی هەڵس‌وکەوتی هێزە لەشکریەکانی ئەڵمانیای فاشی، ژمارەیەکی زۆر لە چیچنی- ئینگووشیەکان خیانەتیان بە نیشتمان کردووەو چوونەتە ڕیزی فاشیستە داگیرکەرەکان‌و، لەگەڵ ئەو دەستە خراپکارو سیخوڕانەی کە ئەڵمانیەکان لە پشت بەرەی شەڕەکانی سوپای سوورەوە دایانبەزاندوون، هاوکارییان کردووە و، بە فەرمانی ئەڵمانیەکان دەستەو باندی چەکدارانەیان دژی سوپای سۆڤێتی پێك هێناوە؛ هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە چیچنی‌و ئینگووشەکان ساڵانێکی زۆرە بەشداری کاری چەکدارانەی دژی دەسەڵاتی سۆڤێتیان کردووەو ساڵهایە ئەوانە هەڵس‌وکەوتی باش ناکەن و چەتەگەرانە پەلاماری کەڵخۆزەکانی ناوچەکانی خۆیان دەدەن‌و تاڵانی دەکەن و خەڵك دەکوژن" دەستەی باڵای شوورای یەکێتیی سۆڤێت لەم بارەوە بڕیار دەدات:

١-هەموو چیچنی‌و ئینگووشەکانی دانیشتووی کۆماری ئۆتۆنۆمی سۆڤێتی - سۆسیالیستی چیچنی- ئینگووشیاو، هەروەها ئەوانەیان کە لە ناوچەکانی دەوروبەرەی ئەم کۆمارەدا دەژین، بگوازرێنەوە بۆ ناوچەکانی تری یەکێتیی سۆڤێت و کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچنی-ئینگووشی هەڵبوەشێندرێتەوە.

شوورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت زەوییان لە شوێنی نوێی جێگیرکردنی ئەوانەدا دەداتێ و یارمەتی پێویستی دەوڵەتییان بۆ کارو شوێنی گوزەرانیان بۆ دابین دەکات.

٢-ناوچەی گرۆزنا، بە ناوەندی شاری گرۆزناوە، بخرێتە سەر هەرێمی ستاڤراپولی سەر بە کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراتیڤ (ناوی شارو شوێن و ناوچەکان بەدوورو درێژی نووسراوە).

٣-ناوچەو شارو شوێنەکانی تری کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچنی-ئینگووشی کە لە کۆماری ئۆتۆنۆمی داغستانەوە نزیکن، بخرێنە سەر ئەم کۆمارە ئۆتۆنۆمیەی دوایی (ناوی شوێنەکانیش بەدوورو درێژی نووسراوە).

٤-ئەو ناوچانەش کە لە کۆماری ئۆتۆنۆمی ئەسەتینیای باکوورەوە نزیکن، بخرێنە سەر ئەم کۆمارەی دوایی‌و کۆماری جۆرجیا (ناوی ناوچەو شوێنەکان زۆرە، هەورامی).

سەرۆکی پەرلەمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت کالینین.م

سکرتێری پەرلەمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت گورکین.ئا [١٣٥]

* شوباتی ١٩٤٤

بڕیاری شووڕای وەزیرانی یەکێتی‌ی سۆڤێت سەبارەت بە

(ناردن و جێگیرکردنی خەڵکی تر بۆ ئاوەدانکردنەوەو کەڵك وەرگرتن لە ژیان و مانەوەیان)

(وەك سیاسەتی بەعەرەبکردن یا بە تورککردنی کوردستان، هەورامی)

....لەبەر هەڵوەشانەوەی کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچنی-ئینگووشیای سۆڤێتی و دابەشکردنی ئەم کۆمارە بەسەر کۆمارو بەڕێوەبەریەکانی‌تر، شووڕای وەزیران بڕیار دەدات:

١- هەشت هەزار بنەماڵە تا ١٩٤٤/٤/١٥ بنێردرێن بۆ ئەو ناوچانەی کۆماری چیچنی-ئینگووشی پێشوو کە خراونەتە سەر هەرێمی ستاڤراپول.

٢-پێنج هەزار بنەماڵەش بنێردرێن بۆ ئەو ناوچانەی کۆماری چیچنی-ئینگووشی پێشوو کە خراونەتە سەر کۆماری ئۆتۆنۆمی داغستان.

٣-سێ هەزار بنەماڵەش بنێردرێن بۆ ئەو ناوچانەی کۆماری چیچنی-ئینگووشی پێشوو کە خراونەتە سەر کۆماری ئەسەتینی باکوور.

٤-پێنج سەد بنەماڵەش بنێردرێن بۆ ئەو ناوچانەی کۆماری چیچنی ئینگووشی پێشوو کە خراونەتە سەر کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی جۆرجیا [١٣٦]

---

[١٣٥] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦-٧٧.

جێگری سەرۆکی شووورای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت مولەتوڤ.م

(پاشانیش فەرمان درا پارەو ماشێن و... بۆ گواستنەوەو بردنی خەڵکیتر بۆ شوێنی چیچنی و ئینگووشەکان دابنرێ و، لەجێشدا ئەوەی کە پێویستە بیاندرێتێ، وەك تراکتۆرو ماشێن و ئێستگەی تەلەفۆن و.... هەروەها دەیان هەزار سەر ئاژەڵ و پەزو بزن و گاو ئەسپو.... کە هی خەڵکی چیچنی-ئینگووشی بوونو، کاتی ڕاگواستن دەستیان بەسەردا گیرابوو، درانە ئەو خەڵکە کە میوان بوون. لەڕاستیدا ستالین بۆ هەمیشە ئەوانی نارد بۆ ئەوێ ، جگە لەوانە، شتومەکیتر، ماڵ و خانووبەرەو تفاق و خواردەمەنی بەجێماویان درایێ، تەنانەت دانەوێڵەو پەتاتەو مریشكو.... لەبەر زۆری من وەرم نەگێڕا. ئەمانەم بۆیە هێنایەوە، چونکە کوردە کلۆڵەکەی سۆڤێتیش سێ جار ئەمەی بەسەردا هات (لەسەردەمی ستالیندا). لە بەڵگەکاندا هاتووە، ئەو خەڵکانە نێردرانە شوێنی چیچنی و ئینگووشەکان کە لە دەسەڵاتی فاشیەکان ڕزگار ببوون یا هەڵهاتبوون. بەڵام ڕاستیەکەی وانییە، لە بەشەکەی کوردستانی سووریش، ئازەریو ئەرمەنیو جۆرجییان ناردە شوێنیان، هەورامی)

* ڕاپۆرتی هەواڵەکان

لەلایەن پالکوڤنیك کالینینەوە بۆ کابولوڤ سەبارەت بە خۆبەدەستەوەدانی دواین بەشدارانی باندی چیبیرلوڤ بایساگوروڤ

لە گرۆزنەوە ١٩٤٤/٨/٨

سەرکردەی باند بایساگوروڤ بەیگ موراز لەدایکبووی ١٩٠٦ی گوندی دای سەر بە ناوچەی چیبیرلوڤە و چیچنییەو لە ١٩٤١دا ئەم باندە ڕێك خراوەو جێگری ناوبراو ئامزییەو چالاکانە بەشداریی لە ڕاپەڕینی دژی شۆڕشی ١٩٤١دا لە گوندی دای کردووە. دوای دەستگیرکردنی بادایڤ لە ١٩٤٤/٢دا، بایساگوروڤ دەبێتە سەرکردەی باندەکە. دووجار خۆی تەسلیم کردەوەو، دواین جار لە

(١٣٦) ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٧٨، ئۆپیسی ١، دیلای ٧٠٨، ل٦١-٦٣.

١٩٤٤دا خۆی له فیدراڵی شاردەوە... باندەکە بەتەواوی لەناوبرا ... تاوانەکانی باندی بادایڤ و پاشان بایساگوروڤ بەم چەشنەی خوارەوەن:

١-١٩٤٤/٨/٨ "مونالیڤ"ی سکرتێری کۆمیتەی وەزارەتی ناوخۆی ناوچەی چیبیرلوڤیان کوشت.

٢-ڕاپەڕینی دژی شۆڕش لە گوندی دای لە ٣١ی ئاوگوستی ١٩٤١دا تەواوی دامودەزگاکانی سۆڤێتیان لەناوبرد.

٣-کوشتنی سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتی ناوخۆی ئینگوشی بەناوی کالیسنیچینکاوە لە مانگی دوازدەی ١٩٤١دا.

٤-لە هێرشێکدا بۆ سەر گوندی شاروئاریپ لە ١٩٤١/٥/٣١دا بە پێش چاوی خەڵکەوەو بە ئازاردان ئەفسەرێك دەکوژن.

٥- باندەکە لە١٩٤٢/٤دا گەمارۆی دەستەی ئۆپیراسیۆنی وەزارەتی ناوخۆ دەدەن و، بەرپرسی سیاسی ئەم دەستەیە دەکوژن و، دوو سەربازیش بریندار دەکەن.

٦- کەڵخۆزی گوندی دای لە ١٩٤٢/٢٨/٧دا تاڵان دەکەن و، ئاژەڵی کەڵخۆزەکە بەتاڵان دەبەن.

٧-لە ١٩٤٢/١٢/٧ بەرامبەر بە دەستەی ئۆپیراسیۆنی وەزارەتی ناوخۆ بەرگری چەکدارانە دەکەن.

٨- "یاکوڤلیڤ"ی کاپیتانی دەزگای پاراستنی (ك.گ.ب) KGB لە١٩٤٣/٥/٧دا دەکوژن.

٩-یاریدەدەری دەستەی ئۆپیراسیۆنی وەزارەتی ناوخۆ، بەناوی شەمسەدینوڤەوە لە١٩٤٣/٥/٧دا دەکوژن.

١٠-لەلینیناتویکتەروڤ لە ١٩٤٤/٣/٦دا لە گوندی دای دەکوژن و، دوو سەربازیش بریندار دەکەن.

١١-ڕۆژی ١٩٤٤/٣/٢٥ لە گوندی ئینزئاکخ تەقە لە هێزەکانمان دەکەن و، سەربازێك بریندار دەکەن.

١٢-لە کۆتایی مانگی ٣ی ساڵی ١٩٤٤دا لەلای گوندی دای پێنج سەرباز دەکوژن[١٣٧].

* بۆ سەرۆکی شوورای باڵای یەکێتی‌ی سۆڤێت ڤەرەشیلۆڤ ک.ی

لە عەلییڤەوە ڤ.ئا (مەگدان"شوێنی زیندانیکردن- هەورامی"، فراگەرودتای یەکەم ژمارە ٢٧)

کورتکراوە:

من لە کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچانی-ئینگووشی لە ١٩٢٤ لەدایك بووم. باوکم ئەحمەد حاجی عەلییڤ کرێکارو پینەچیو بەشداریی شەڕی ناوخۆی کردووەو دژی گاردە سپیەکان لە شاری گرۆزنا برینداروکەم ئەندام بووە. دایکیشم کابانەو، هەردوکیان نەخوێندەوارن. من هەر لە پۆلی یەکەمەوە بە زمانی ڕووسی دەرسم خوێندووەو، لە سایەی پارتی کۆمۆنیستەوە من خوێندەوارم. کوڕی باوك و دایکێکم کە نەخوێندەوار بوون و، توانیم لە پەیمانگەیش بخوێنم. من چیچانیم، ئەو گەلە زۆر دواکەوتووە. جگە لە خوێندن، توانیم هۆشیاریو زانیاری خۆم پەرەپێ بدەم و، هەستم بە گەورەیی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کردو، لە ١٩٤٤دا بووم بە پالێوراوی ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت.

ڕێکخراوەکانی پیانێر (پێشڕەو) و کومسەمول و حیزب منیان پەروەردە کرد. من سکرتێری پاسەوانە پیانێرەکان و، پاشان ساڵی ١٩٤٢ سکرتێری کومسەمول بووم. لە مانگی ٨ـەوە تا ١٩٤٢/١٢/٢٥، بە داخوازی خۆم چوومە ڕیزی ئامادەبووانی پارێزگاری لە نیشتمان و، بەرپرسی بەشی پڕوپاگەندەو ئاژیتاسیۆنی ڕێکخراوی کەمسەمۆڵ بووم.

ساڵی ١٩٤٣ لە بەرەی شەڕ لەسەر ڕووباری دینیپر لە دەورووبەری شاری کیف، بانگ کرامە لای بەرپرسی کۆمیتەی حیزبی وەك جەنگاوەرێك کە لە بەرەکانی شەڕدا وەك نموونە خۆی نواندووە و، دوو جاریش خەڵاتی دەوڵەتیم پێدرا،

---

[١٣٧] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٠١، ئوپیسی ١، دیلای ٢١٩٦، ل٣٠٨-٣١١.

یەکێکیان نیشانەی شەڕی نیشتمانیو، ئەوی تریان ئەستێرەی سوور. لە مانگی ١٩٤٤/٥دا، دوای نەخۆشییەکی گران، لە نەخۆشخانەی شاری تولا کۆمیسیۆنی دوکتۆرەکان منیان لە ڕیزی "کەم ئەندام"ی پلە دوو داناو، هەر بەپێی ئەو بڕیارە پێشنیاریان کرد بۆ قوولایی بەشەکانی پشت بەرەکان ببرێم. بەڵام من زانیم کە نیشتمان لەم هەلومەرجەدا پێویستی بە هەموو مرۆڤێك هەیە، بۆیە بڕیارم دا هەر لە بەرەی پێشەوەی شەڕدا بمێنمەوە.

لە ١٩٤٤/٦/٢١ منیان بانگ کردە بەشی دژە سیخوڕی ئەوێ (سەرۆکی ئەم بەشە هاوڕێ پالکوڤنیك لیچما و جێگرەکەی هاوڕێ مابور کوزنیتسوڤ و لێکۆڵەرەوەی گەورە هاوڕێ کاپیتان سپیرین لەوێ بوون). لەوێ منیان بە تاوانی ئەوەی سەر بە نەتەوەی چیچانیم، گرتو، بەبێ دەرچوونی گرتنم داوایان لێ کردم چەکەکەم تەسلیم بکەمەوەو، دەرەجەو نیشانەکانم لە خۆم بکەمەوە. هاوڕێ کوزنیتسوڤ گوتی: پێویستە چاوەڕوان بی تا کێشەکە ڕوون بکرێتەوە.

لە پرۆتۆکۆڵی تاوانبارکردنەکەمدا هاتووە کە من دانم بە تاوانەکانی خۆمدا ناوە. بەڵێ من ناچارکرام مۆری بکەم و هاوڕێیان کوزنیتسوڤ و سپیرین ئەم تاوانەیان ئاراستە کردم. ئەوانە ئەمەیان چۆن کردو پێك هێنا ؟ نازانم سپیرین لەم بارەوە، وەك بەرپێکەوت نەبوو و لەپێشدا بیرۆ بڕیاری لەسەر دابوو، گوێی لە ڕوونکردنەوەو گوتەکانی من نەگرت و، چەند جارێکیش لەپێش چاوی من پرسیاری لە یەکێکیتر دەکرد. کاتێك ئەم مرۆڤە دوو جار ئامادە نەبوو دان بەو تاوانانەدا بنێ کە ئاراستەی کرابوون، کاپیتان فەرمانی بە قوماندان ڤولکوڤ، دا: "ئاگربارانی خیانەتکاری نیشتمان بکەن" (واتە گوللەبارانی بکەن، هەورامی). دەنگی تەقەی دەمانچە هات (تەقە لە کابرا کرا)و، تەقەی دووهەم لەلایەن ڤولکوڤەوە لەو مرۆڤ کرا کە کەوتبوو. بە منیشیان گوت بڕۆ و بردمیان بۆ سەر سەکۆکە (سەکۆی تیرباران). لە ١٩٤٤/٧/٢٢دا بەپێ بڕیاری دادگای نیزامی سوپای ستالینگراد، لەسەر ئەو دۆسیە دەستکردەی سپیرین ئامادەی کردبوو و، گوایە منیش دانم پێدا ناوە، تاوانبار کرام.

منیان زیندانی کردو، بەپەلە پێش تەواوبوونی وەخت ئازادیان کردم. ئەوە بۆ من هیچ گرنگ نەبوو و نییە، بەڵام من دوو کوڕم هەیە. من نامەوێ ئەم نەنگ و عارە کە من بە نووسین دانم پێدا ناوەو بە ئەستۆی خۆم گرتووە، بکەوێتە یا بخرێتە سەر کوڕەکانم یا بەوانەوە بنووسیٚ(١٣٨).

لە بیرەوەریەکانی قارەمانی کاری سۆسیالیستیو سەرۆکی کۆمەڵەی هونەرمەندانی یەکێتیی سۆڤێت "مەحموود ئیسامبایڤ"

((... ڕێکەوتی پێنجی هەموو مانگێك، من دەبوایە بچمە لای قوماندان (پۆلیس) و ئیمزا بکەم کە من لەجێدام و ڕام نەکردووە. ئەم چەشنە هێنان و بردنە، بۆ من سووکایەتی بوو. جارێکیان من ئەم دەربڕینەم بە قوماندان گوت، ناوبراو وەك بڕوانێتە شوێنێکی بەتاڵ، گوتی: ((ئەگەر بێتو نەیەن، ئێمە دەتنێرین بۆ ئەو شوێنەی کە گیاکەی بۆ لەوەڕاندنی گوێرەکە نەبێ...)). پالکوڤنیك پاسپۆرتەکەی لێ وەرگرتم و ڕۆیشت بۆ شوێنێك. پاش پێنج سەعاتیەك گەڕایەوەو، بە شێوەیەکی ناشیرین دایمەوە. منیش کە پاسپۆرتەکەم کردەوە، ئەو شوێنەی کە بۆ نیشانەی تایبەت دانرابوو، مۆرێکی ڕەشیان پێوە نابوو و، تێیدا نووسرابوو: (مەحمود ئیسامبایڤ بۆی هەیە لە چوارچێوەی شاری فرونزەدا بژی). وەك ئەمڕۆ بە باشی بیرم دێت، گەرم داهاتم و سوور بوومەوە. ئەم لاپەڕەیەم لە پاسپۆرتەکەم کردەوەو دامە دەستی قوماندان. بۆ ڕۆژی دوایی، منیان بانگ کردە وەزارەتی پاراستن و، ئەمجارە ئەفسەرێکی تر دەستی بە قسە کردو گوتی: تۆ دەزانی پاسپۆرتی سۆڤێتیت دڕاندووە؟... ئەی چۆن وەڵامی بدەمەوە؟ گوتم: ئەم پاسپۆرتە دەسەڵاتی سۆڤێتی بە منی داوە، ئەو دەسەڵاتەی کە باوکم بە چەك پارێزگاریی لێ کردووە. بوار نادەم مۆرێکی پیسی پێوە بێ.

پێم وانییە مایاکۆڤسکی شاعیر شانازی بە پاسپۆرتێکەوە بکات کە مۆرێکی وا پیسی پێوە بێ (مایاکۆڤسکی هەڵبەستێکی هەیە کە شانازیی تێدا بە پاسپۆرتی سۆڤێتییەوە دەکات، هەورامی). ٢٤ سەعات بەسەر ئەو دەمەتەقێیە تێنەپەڕی، وەك

---

(١٣٨) ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٧٥٢٣، ئوپیسی ٨٥، نهێنی دیلای ٢٨٣٦، ل٤-٥.

چۆن قوماندان بە منی گوت، ناردمیانە چیاکان، شوێنێك کە دارەکانی ئاو ئەیانبات. تەنیا پاش ساڵو نیوێك دۆستەکانم توانییان من بگەڕێننەوە بۆ فرۆنزەو، دووبارە لە تیئاتر دەست بەکار بکەمەوە. هەر کە ماوەی دوورخستەوەم لە ۱۹٥۷دا تەواو بوو، دەستبەجێ خەلاّتی پلەی ئارتسیتی گەلی کۆماری قرقیزستانیان پێ بەخشیم. ئەم گێرانەوەیە بەو مەبەستە نییە کە من خۆم هەڵکێشم و خزمەتی خۆم نیشان بدەم، بەڵکوو دەمەوێ جەخت لەسەر یاسایەك بکەم کە: گەلێك هیچ کات ناتوانێ هەمووی خائین بێ، لەبەرئەوەی هەر گەلێك ژمارەی کەم یا زۆر بێ، هەمیشە وەك یەك نین. بەڵام تاقمێکی سەرکێش کە لەسەر دەسەلاّتن و دەسەلاّتیان بەدەستەوەیە، توانای ئەوەیان هەیە خیانەت لە گەلێك بکەن و زۆر جاریش ئێمە ئەو شتەمان دیتووە ...))[139] .

بەشێك لە ڕاگەیاندنی ئیزما ئیلوۋ. .س.ش (خەڵکی شاری نازران)

((... من نامەم بۆ هاوڕێ ستالین نووسیوە کە مێژووی مرۆڤایەتی کردەوەیەکی وا دژی مرۆڤانەی بەرامبەر بە تەواوی گەلێك بەخۆیەوە نەبینیوە))[140] .

لە بیرەوەری سەربازێکی بەشداری شەڕی گەورەی نیشتمانی (دووەم شەڕی جیهانی)، سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی کەلخۆزی "کراسنی ساگوپ شی" لە ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی کۆماری ئۆتۆنۆمی چیچنی و ئینگووشی، گوندی دائوبەیکوۋ.

((چوار ساڵی تەواوی ئاگام لە کەس وکارم نەبوو. ساڵی ۱۹٤٦ منیان ناردە ناوچەی ئیڤانوڤاو، لەوێ میدالی "سەرکەوتن بەسەر ئەڵمان لە شەڕی گەورەی نیشتمانی ۱۹٤۱-۱۹٤٥دایان پێ بەخشیم". لە هەمووی گرنگتر، من بلیتی حیزبیم تائێستا پاراستووە؛ لە شەڕدا پێم بوو، لە دڵمەوە پارێزگاریم لێ کرد. من

---

[139] مەحموود ئاسامبایێف، گفتوگۆ لەگەڵ نەوەکانمدا، ڕۆژنامەی "گرۆزنسکی ڕابوچی"، ۱۹۸۹/۲/٤.

[140] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵی، فوندی ۹٤۷۹، ئوپیسی ۱، دیلای ۱۷۰، ل۲۹۳.

ئێستا لێرە لەڕێگەی دۆستێکمەوە، پاش یانزدەساڵ، چاوم بە دایکم کەوت و، دوای هەشت ساڵیش توانیم بگەڕێمەوە بۆ ساگوپ شی))[١٤١].

* لە یاداشتی وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت
دودوروف، ن.د ١٩٥٦/٦

((... چیچنی و ئینگووشەکان زۆربەی هەرەزۆریان لە کۆماری کازاخستانی سۆڤێتی (٣٥٥ هەزار) و لە کۆماری سۆڤێتی قرقیزستانی سۆڤێتی (٧٦,٩٨٦) جێگیرکراون. شوێنی پێشوویان (نیشتمانەکەیان، واتە کۆماری چیچنی- ئینگووشی، هەورامی) خەڵکی تری لێ دامەزراوەو نیشتەجێ کراوە. دروستکردنەوەو دامەزراندنەوەی ئۆتۆنۆمی بۆ چیچانیەکان و ئینگووشیەکان لە چوارچێوەی سنووری پێشوویاندا، کارێکی دژوارەو زەحمەتە جێبەجێ بکرێ، لەبەرئەوەی گەڕانەوەی چیچنی و ئینگووشیەکان بۆ جێوڕێی پێشوویان، بێ گومان کۆمەڵێ کێشەی ناخۆشی بەدواوە دەبێ. لەم بارەیەوە دەکرێو باشترە کێشەی دروستکردنی ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی بۆ چیچنی و ئینگووشیەکان لەناو خاکی کۆمارەکانی کازاخستان و قرقیزستان تاووتوێ بکرێ...))[١٤٢].

(دەسەڵاتدارانی ئەوێ لە نیشتمانە داگیرکراوەکەشیاندا دژی گەڕانەوەیان دەبن. ئەمە جگە لە مۆسکۆو هەزارو یەك بیانوو و ناردنی داواکاری، بەڵام سەرناگرێ، چونکە چیچنیەکان لەسەر گەڕانەوەیان سوور بوون، هەورامی)

* کۆمیتەی ناوەندی
پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت
١٩٥٦/٦/٣٠
ژمارە d/٨٢٤

---

[١٤١] ڕۆژنامەی "گروزنینسکی ڕابوچی"، ١٩٨٩/٣/٥.

[١٤٢] ئەرشیڤی دەوڵەتی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٧٩، ئوپیسی ١، دیلای ٩٢٥، ل١٢٧.

... زۆربەی هەرەزۆری چیچنی و ئینگووشەکانی دانیشتووی کۆمارەکانی کازاخستان و قرقیزستان لە کەڵخۆزو سەڤخوزەکانی کازاخستان و قرقیزستان لەسەرکار دامەزراون.

ماوەی دوانزە ساڵ ژیانیان لەوێ، لێهاتوویی‌و شارەزایی و پسپۆریی ئیش‌وکاریان وەرگرتووەو فێربوون. ژمارەیەکی زۆریان ماڵ و خانووبەرە و زەوی‌و باخچەیان هەیە، یا لە ماڵە گشتیەکاندا دەژین. بە پێویستی دەزانم ناوی ڕاگوێزراوی تایبەتیان لەسەر لاببرێ و، ئەو چوارچێوە سنووردارەکەیان‌و چاودێری‌و کۆنترۆڵکردنی دەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆو پاراستنیان لەسەر نەمێنێ و هەڵبگیرێ. ئەمەش بەو مانایە نییە کە بواری گەڕانەوەیان بدرێ بۆ شوێنی پێشووی خۆیان و، ئەو سامان و شتومەکەی کە کاتی گواستنەوەیان دەستیان بەسەردا گیراوە، پێیان بدرێتەوە.

گەلاڵەی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت لەسەر ئەم کێشەیە ئاڕاستە دەکرێ

وەزیری ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت دودوروف، ن.پ [١٤٣]

* بڕیاری شوورای باڵای یەکێتی‌ی سۆڤێت (پەرلەمان)

سەبارەت بە دروستکردنەوەی کۆماری ئۆتۆنۆمی سۆسیالیستی سۆڤێتی چیچنی‌و ئینگوشی

(هەڵوەشاندنەوەی هەرێمی گرۆزنی)

١٩٥٧/١/٩

ژمارە ٧٢١/٤ مۆسکۆ

بە مەبەستی پێکهێنانی هەلومەرجی پێویست بۆ گەشەپێدانی نەتەوایەتی گەلانی چیچنی‌و ئینگووشی کۆماری ئۆتۆنۆمی سۆڤێتی سۆسیالیستی چیچنی-ئینگوشی بە ناوەندەکەی (پایتەختەکەی)، واتە شاری گرۆزنی‌یەوە، دروست بکرێتەوە.

---

[١٤٣] ئەرشیڤی دەوڵەتی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٧٩، ئوپیسی ١، دیلای٤٨٠، ل٣٣٨-٣٣٩.

ئەو ناوچەو هەرێم و شارو گوندو خاکانەی کە کاتی گواستنەوەیان بەسەر کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکانی داغستان و ئەسیتای باکوور و هەرێمی ستاڤراپول و کۆماری جۆرجیادا دابەش کرابوون، بخرێنەوە سەر کۆماری ئۆتۆنۆمی سۆڤێتی- سۆسیالیستی چیچنی-ئینگووشیو، بە پەرلەمانی ئەم شوێنانە ڕابگەیەندرێ کە گەڕاندنەوەی ئەو شوێنانە لەلایەن خۆیانەوە پەسند بکرێ.

سەرۆکی شوورای باڵای کۆماری ڕووسیای فیدراڵی تاراسوڤ.م

سکرتێری سەرۆکی شوورای باڵای کۆماری ڕووسیای فیدراڵ زیمین.ی [144]

* ڕاپۆرتی سکرتاریەتی شوورای باڵای یەکێتیی سۆڤێت

نوێنەر گورکین.ئا.ف سەبارەت بە پەسندکردنی

بڕیارەکانی شوورای باڵای یەکێتیی سۆڤێت فێبرایری١٩٥٧

هاوڕێیانی نوێنەر: وەك دەزانن لە کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتدا هاتووە کە لە ڕابردوودا هەندێ کردەوەی ناپەسندی پێچەوانەی پرنسیپە بنچینەییەکانی سیاسەتی نەتەوەیی لینینی و دەوڵەتی سۆڤێتی ڕووی داوە. ئەم کردەوە ناپەسندانە لە ڕاگوێزانی بێبناغەو بەکۆمەڵی زۆر گەلدا ڕەنگی دابوەوەو کۆمەڵە چوارچێوەو سنوورێکیان لە شوێنی نوێیاندا بۆ دانابوون. بۆ وێنە، لە کۆتایی ١٩٤٣ و سەرەتای ١٩٤٤ چیچنیو ئینگووشیو کالمیك و قەرەچایڤەکانیان لە باکووری قەفقاسەوە بۆ کۆمارەکانی کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست ڕاگواستو ئۆتۆنۆمیە ناسیۆنالەکەی (قەوارەی نەتەوەیی) هەر کام لەوانەیان هەڵوەشاندەوە.

کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت و دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت، بەپێی بڕیارەکانی کۆنگرەی بیستەمی پارتیمان و بە سەرکردایەتیی ئەو، بە هەوڵدانێکی تایبەت جەختی لەسەر ئەوە کرد کە مافی یەکسانیو

---

[144] ئەرشیڤی ناوەندی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٣٥٢، ئوپیسی ٢، دیلای ٩، ل٤.

ئەرشیڤی شوورای باڵای یەکێتیی سۆڤێت، کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوەی گەلانی ڕاگوێزراو.

دۆستایەتی گەلان بناغەی پایەداریو هێزی لەبنەهاتووی سیستەمی دەوڵەتی سۆڤێتییەو، دەوڵەت هەنگاوی ناوە بۆ گێڕانەوەی ماف و سیماو شەرەفی ئەو گەلانەی کە بەزۆر ڕاگوێزانو، چاککردنەوەی ئەو ناهەقیەی کە بەرامبەریان کراوە. دەستەی سەرکردایەتی شووارای بالاّی یەکێتی‌ی سۆڤێت، بە لێکۆڵینەوەی کێشەی بارودۆخی گەلانی بالکارو چیچان و ئینگووشی و کالمیك و قەرەچایڤی، بە لەبەرچاوگرتنی مافی یاسایی هیواو داخوازەکانیان، بڕیاری دا ئەو ناڕەوایيو کارە ناپەسندانەی بەرامبەر بەم گەلانە کراوە، ناهەقی بوون. بڕیاردرا ئۆتۆنۆمیە ناسیۆنالەکەیان بۆ ڕێك بخرێتەوەو، بەم چەشنە بارودۆخێکی پێویست بۆ ئەم کارە برەخسێنرێ. واتە دەست بەکار بێ ب ڕێکخستنەوەی ئۆتۆنۆمیو قەوارەی نەتەوەیی بۆ هەر کام لەم گەلانە بۆ گەشەپێدانی هەمەلایەنی ئابووریو کولتووریيان. دەستەی سەرکردایەتی‌ی شووارای بالاّی یەکێتی‌ی سۆڤێت، ئەو بڕیارو فەرمانانەی گۆڕی کە کارێکیان کردبوو هاوولاّتیانی ئەم گەلانە نەتوانن بۆ جێوڕێ و نیشتمانی پێشووی خۆیان بگەڕێنەوە. بڕیاری ۱۹۵۷/۱/۹ی سەرکردایەتی‌ی شووارای بالاّی یەکێتی‌ی سۆڤێت داوا لە تەواوی داموودەزگاکانی دەوڵەتیو حیزبیو... کردووە کە لەم بارەیەوە هەوڵو یارمەتی پێویست بۆ گەڕانەوەی ئەو گەلانەو دروستکردنەوەی سەرلەنوێی ئۆتۆنۆمیەکانیان بدەن و ....

هاوڕێیانی نوێنەر:

بۆ پەسندکردنی بڕیارەکان سەبارەت بە گەڕانەوەو ڕێکخستنەوەی ئۆتۆنۆمیە ناسیۆنالەکان بۆ گەلانی ناوبراو، پێویستە بەپێی ئەم بڕیارانە ماددەی ۲۲ی یاسای بنچینەیی یەکێتی‌ی سۆڤێت گۆڕانکاریی تێدا بکرێ.

لە کۆبوونەوەی شووارای بالاّی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا، کۆبوونەوەی چوارەم، خولی شەشەم (٥-١٢، فێبرایەری ١٩٥٧)، ڕاپۆرتی کۆبوونەوەکە لەلایەن شووارای بالاّی یەکێتی‌ی سۆڤێتیەوە بلاّوکراوەتەوە ساڵی ١٩٥٧، ل٥٧٦-٥٧٩).

(پاشان بڕیاری تر سەبارەت بە ڕێکخستنی کۆمیتەو کۆمیسیۆنی تایبەت بۆ چاودێریو کۆنترۆڵ و جێبەجێکردنی فەرمانو بڕیارەکان دەدرێ. پارەو کەرەستە لە

هەموولایەکەوە بۆ گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان و، پاش گەڕانەوەشیان یارمەتییان دەدرێ. کەچی نە تەنیا لەم بارەیەوە بڕیارێك بۆ کورد نەدرا، بەڵکوو نەیانهێشت خۆیان لەسەر حیسابی خۆیان بگەڕێنەوە، چونکە کریملن بڕیاری بۆ کورد دەرنەکرد، تا کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیاو جۆرجیا ملکەچ و جێبەجێی بکەن و...، هەورامی).

لە ڕاپۆرتێکدا سەبارەت بە گەڕانەوەی چیچنیو ئینگووشی بۆ وڵاتی خۆیان، نووسراوە:

((لە بەهاری ١٩٥٧دا سەدوچل هەزار کەسی چیچنیو ئینگووشی گەڕانەوە بۆ کۆمارەکەی خۆیان و، هەندێ لەو گەلانەی داغستان و ئەسەتین کە هاوردەش بوون، گەڕانەوە بۆ کۆمارەکەی خۆیان –مەبەست ئەوانەی کە پاش ڕاگوێزانی چیچنیو ئینگووشیەکان نێردرابوونە جێیان و لە شوێنی ئەوان ژیابوون، هەورامی)) [١٤٥].

پاش نەمانی دیکتاتۆرەکەی کریملن، واتە ستالین و، لەسەرکار لابرانی هاوکارە تاوانبارەکانی لە ١٩٥٣دا، هەتا دەرچوونی فەرمانو بڕیارەکان سەبارەت بە ئازادی گەڕانەوەی ئەو گەلانە، ژمارەیەك لەوانە بەبێ ترس و چاوەڕوانکردن و بە ئیجازە دەگەڕێنەوە نیشتمانەکەی خۆیان. لەلایەکی ترەوە، بە نامەنووسین و ناردنی دەستەی نوێنەرایەتی خۆیان بۆ مۆسکۆ و داوای گەڕانەوە کردن، ڕژێمی سۆڤێت ناچارکرا ملکەچیان بێ. گەلان و نەتەوەی داگیرکەری وڵاتەکەشیان، واتە هاوردەکان، کە بەزۆر نێردرابوونە سەر خانووبەرە و سامانی ئەوان، بە نابەدڵی و بەبێ فەرمانی سەرەوە، ناچار کران یا هەڵبێن، یا ئەوێ بەجێبهێڵن و، ژمارەیەکیشیان هەر لەلایەن چیچنیو ئینگووشییەوە سێچوار ساڵیان بۆ گەڕانەوەیان دانابوو. بەڵام ئەوانە ڕۆژ بەڕۆژ و مانگ بە مانگ و ساڵ بە ساڵ زۆربەیان گەڕانەوە و...، هەورامی.

* ژمارەی ڕاگوێزراو و ڕاگوێزراوی تایبەت بەپێی سەرژمێری ١٩٤٩

... ژمارەی گشتی لە سەرانسەری سۆڤێتدا ٣,٣٣٢,٥٨٩ (سێ ملیۆن و سێسەد و سیودوو هەزار و پێنجسەد و هەشتاونۆ کەس) کە لەوانە تورك و کورد و خیمشین ژمارەیان ٩٤,٩٥٥ کەس دەبێ و ١٤,٨٩٥ کەسیان مردن [١٤٦].

---

[١٤٥] لە کتێبی: گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوی ڕووسیا– چیچنیو ئینگووشی، مۆسکۆ، ١٩٩٤، ل٢١٨.

[١٤٦] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٩٤٧٩، ئوپیسی ١، دیلای ٤٣٦، ل١٩–٢٠.

له ڕاپۆرتی سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت

پالکوڤنیك شییان ١٩٤٨/١١/١٥

سەبارەت بە خەبات دژی هەڵهاتن لە شوێنی دوورخستنەوەیان (منفی) تا ١٩٤٨/١٠/١

لە دوو ملیۆن و سەدوچوار هەزار و حەوتسەد و پەنجاویەك کەسی ڕاگوێزراوی تایبەت، حەفتاوحەوت هەزار و پێنجسەد و چلویەك کەس ٢,١٠٤,٧٥١ و بیست هەزار و نۆسەد و پەنجاوپێنج کەس ٢٠,٩٥٥ لە ڕاکردندا بوون. لەم ژمارەیە، دوو هەزار و سێسەد و دە کەس ڕایان کردووە و سێسەد وشەستویەك کەس لە ڕاکردندا بوون[١٤٧].

* بڕیاری شووڕای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێت

زۆر زۆر نهێنی

١٩٤٨/١١/٢٤

ژمارە٤٣٦٧-١٧٢

مۆسکۆ-کریملن

... ئەوانەی کە ڕایان کردووە و لە ڕاکردندا دەبن، بۆ هەمیشە مافی ئەوەیان نابێ بگەڕێنەوە جێ‌وڕێی پێشووی خۆیان.

... کردەوەی ئەوانە بە تاوان ئەژمێردرێ و، بۆ ئەم چەشنە تاوانانە بە بیست ساڵ کاری کەمەرشکێن سزا دەدرێن. ئەوانەش کە پەنا یا مۆڵەتی هەڵاتنیان دەدەن یا یارمەتییان دەدەن، بۆ پێنج ساڵ لە ئازادی بێبەش دەکرێن.

...چاودێرو کۆنترۆڵ بەسەریانەوە بەهێز بکرێ، بە چەشنێك کە هیچ ڕێگەیەك بۆ ڕاکردنیان نەبێ.

... وەزارەتی پاراستن (ك. گ.ب.) KGB هاوڕێ کروگلوڤ ڕابسپێرێ لەڕێگەی دامودەزگاکانی پاراستنیەوە لەوبارەیەوە کەڵك وەربگیرێ لە ئامرازەکانی

---

[١٤٧] هەمان سەرچاوە، فوندی ٩٤٠١، ئوپیسی ١، دیلای ٣١٤٤، ل٢٠.

گواستنەوەی وەك شەمەندەفەرو پاپۆڕو ڕێگەی دەریایی بۆ گرتن و بەدەستەوەدانیان.

ئەنجامەکان لە ماوەی مانگێکدا بە شووڕای وەزیران ڕابگەیەنن [١٤٨].

سەرۆکی شووڕای وەزیرانی یەکێتیی سۆڤێتی ستالین.ی.ڤ

* سەرژمێری مردوو و لەدایکبوو

وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت بێریا لە نامەیەکی نهێنیدا بۆ میکویان لە (١٩٤٥/٦/٩)دا، دەنووسێ لەبەرئەوەی تفاق و خواردەمەنی بۆ ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی نیشتەجێکراوی کازاخستانی سۆڤێتی بەش ناکات، شووڕای وەزیران و کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی (بەلشەویك)ی کۆماری کازاخستان داوای تفاق و خواردەمەنییان بۆ مانگی ٦و ١٩٤٥/٧ دەکات.

بەپێی زانیاریەکانی وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت، بارودۆخی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی کۆمارەکانی ئۆزبەکستان و قرقیزیاش زۆر دژوارەو، ٣٦٠,٠٠٠ (سێسەد و شەست هەزار کەس پێویستییان بە یارمەتی هەیە، واتە ٢٢٥,٠٠٠ لە کازاخستان و ٨٠,٠٠٠ لە کازاخستان و ٥٥,٠٠٠ هەزار لە قرقیزستانن.

بۆ دابینکردنی تفاق و خواردەمەنی، تا بەرهەمی نوێ (خەلەو خەرمان، دانەوێڵە) پەیدا دەبێ، پێویستە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت بۆ مانگی ٦و ٧ی ١٩٤٥ بۆ هەر یەکێك ١٥٠ گرام (سەدوپەنجا گرام) ئاردو دانەوێڵەو پەنجا گرام و ١٥ گرام خوێ و ١٥ گرام شەکر (تەنیا بۆ منداڵان)یان بۆ بنێرێ. سەرجەم، ٣٢٠٠ تەن ئاردو ١٠٠ تەن دانەوێڵە و ٥٠ تەن خوێ و ٢٥ تەن شەکر پێویستە.

گەڵاڵەی فەرمانی شووڕای وەزیرانی سۆڤێت پێشکەش دەکرێ

وەزیری ناوخۆی سۆڤێت بێریا [١٤٩]

ژمارەی ڕاگوێزراوەکانی کۆماری جۆرجیا تا ئۆکتۆبەری ١٩٤٨ نەوەت و پێنج هەزار و شەشسەد و شەست و نۆ کەس بووە، دوو هەزار هەشتسەد و حەفتاوسێ

[١٤٨] ئەرشیڤی شووڕای باڵای یەکێتیی سۆڤێت.

[١٤٩] ئەرشیڤی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ، فوندی ٥٤٤٦، ئۆپیسی ٤٨، دیلای ٣٢٥٧، ل٣-٤.

کەسی لەدایکبوو و پانزەهەزار و چوارسەد و سی‌ودوو کەسی مردوویان دەبێ[150] (واتە ژمارەی مردوەکان لە پێنج قاتی لەدایکبوەکان زیاترە).

بەپێی سەرژمێری ١٥ی/١٩٤٩/٧، لە هەشتایەك هەزار و پێجسەد و حەفتاوپێنج کەسی تورك و کوردو خیمشینی ڕاگوێزراو لە جۆرجیاوە، نۆزدە هەزارو چوارسەدو بیست‌ویەك کەسی پیاوو بیست‌وپێنج هەزار و سەدوحەوت کەسی ژن و ٢٦,٨٠٥ منالی تا تەمەنی ١٦سالْ دەبن[151].

لە سەرچاوەیەکی تردا، ژمارەی لەدایکبووان و مردووانی ڕاگوێزراوی جۆرجیا لە کۆماری کازاخستان لەنێوان ١٩٤٥–١٩٥٠دا، لەدایکبووان ٧,٨٤٣ کەس و، مردووان پانزە هەزار کەس و دووسەد و شەش کەسە.

لە هەمان سەرچاوەدا، هی سالی ١٩٤٥، ژمارەی ئەوانەی کە لە جۆرجیاوە گوازراونەتەوە بۆ کازاخستان، ٥٩٩ لەدایکبوو و ٦,٩٠٣ مردوو (کوردو تورك و خیمشین) بوون.

* بۆ وەزیری ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت هاوڕێ کروگلوڤ.س.ن

سەبارەت بە ئیش‌وکاری بەشی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت

نێوان مارتی ١٩٤٤ تا ١٩٤٦/١/١

ژمارەی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان لە ولاتدا، تا سەرەتای مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥، دوو ملیۆن و دووسەد و پەنجا هەزار کەسە، ٢,٢٥٠,٠٠٠، کە لەوانە:

ئەلمانی ٦٨٧,٣٠٠ کەس

چیچنی و ئینگووشی ٤٠٥,٩٠٠ کەس

تاتارەکانی کریم و یۆنانی و بولغار و ئەرمەن ١٩٠,٢٠٠ کەس

تورك و خیمشین و کورد ٨٨,٨٠٠ کەس

کالمیك٨٠,٣٠٠ کەس

---

[150] هەمان ئەرشیڤ، فوندی ٩٤٧٩، ئوپیسی ١، دیلای ٤٣٦، ل١٤.

[151] هەمان سەرچاوە، ل٦٧.

قەرەچایڤ ٦٠,١٠٠ کەس

بالکار ٣٣,١٠٠ کەس

لەگەڵ ئەمانەشدا، لەناو ڕاگوێزراوە تایبەتەکاندا، ٢٠,٨٠٠ ئائون تسوڤەکان (خەڵکی ئۆکرانیای سەر بە ئەڵمان و دژی سۆڤێت)و کوڵاکەکانی پێشوو ٦٠٨,٨٠٠ و هاوکارو یاریدەدەرەکانی ئەڵمانی فاشی ٩,٢٠٠ کەس بوون.

تەواوی ڕاگوێزراوە تایبەتەکان بەسەر شەش کۆماری سۆڤێتی و هەشت کۆماری ئۆتۆنۆمی و ٥ ناوچەی ئۆتۆنۆمی و ٢٧ هەرێمی یەکێتیی سۆڤێتدا دابەش کراون، کە ٨٦٦,٣٠٠یان لە کۆماری کازاخستان ١٨١,٨٠٠ لە کۆماری ئۆزبەکستان و ١١٢,٤٠٠ لە کۆماری قرقیزستان لە هەرێمی کراسنایار (ڕووسیا) ١٢٥,٦٠٠ هەرێمی ئالتای ٨٥,٨٠٠ هەرێمی کیمیروڤا ٩٧,٢٠٠ و هەرێم تامبوڤ، ٩٢,٤٠٠ هەرێمی سیڤیر لوڤسکی ٨٩,٢٠٠ هەرێمی مولەتوڤ ٨٤,٣٠٠.

سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێت کوزنیتسوڤ.م [١٥٢]

* هەندێ زانیاری تر

بەپێی زانیارییەك کە لە ١٩٥٥دا دراوە، دەگوترێ لەناو ڕاگوێزراوەکاندا ساڵی ١٩٤٩، ٤,٣٥٨ کەس ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت (بەلشەویك) و ١٣٠٨ کەس کاندید (پاڵێوراو) و ١١,٦٧٥ ئەندامی کومسەمولن، ٩,٠٠٠ خوێندنی باڵایان هەیەو، ٦٦,٠٠٠ خوێندنی ناوەندی. هاوکات دەرکەوتووە کە زیاتر لە ٣٥٢,٠٠٠ کەس نەخوێندەوارن‌و، زۆربەیان لەو ڕاگوێزراوانەن کە لە جۆرجیاوە گوێزراونەتەوە، واتە لە تورك و کوردو خیمشین و، ئێرانیەکان و، لە باکووری قەفقاسیش چیچنی‌و ئینگووشی و قەرەچایڤ بالکارو کالمیکن.

---

[١٥٢] گەلانی سەرکوتکراوی ڕووسیا (چیچنی‌و ئینگووشەکان): دوکیومێنت و فاکت و کۆمینتارەکان، مۆسکۆ، ١٩٩٤، کۆمیتەی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ سەبارەت بە کاروباری فیدراسیا و ناسیۆنالی بەڕێوەبەرایەتی کێشەکانی گەلانی سەرکوتکراو- فوندی گەلان و هاووڵاتیان، ل١٤٩، ١٥٠.

لەناو ڕاگوێزراوە تایبەتەکاندا ٥٧,٠٠٠ هەزار کەس هەن کە پێشتر لەناو سوپای سۆڤێتدا خزمەتیان کردووەو، شەش هەزاریان ئەفسەرو زیاتر لە ٢٠,٠٠٠ دەرەجەدارن کە زۆربەیان کاتی شەڕی جیهانیی دووهەمیش خزمەتیان کردووە (لە جێگایەکی تردا ژمارەی کورد کە بەشداری شەڕیان کردووە، تەنیا ئەوانەی کازاخستان ١٤١ کەس کە ٤ ئەفسەرو ١٥ دەرەجەدارو ئەوانەی تریان سەربازن. هی کوردی ئاسیای ناوەڕاست و ئەرمینیا و ئازەربایجان.....نییە).

لەناو ڕاگوێزراوەکانی کازاخستاندا ٧٤٩ کەس و لە ئۆزبەکستان ٦٣٥ کەم ئەندام و بێکەس‌و بێسەرپەرشت هەن.. ژمارەی منالّی بێکەس‌و هەتیو هەزار کەسە کە کاتی گواستنەوە دایك و باوکی خۆیان لەدەست داوەو تائێستاش لە باخچەی منداڵان دانەمەزراون [١٥٣].

ژمارەی گشتی ئەو ڕاگوێزراوانەی کە لە کۆماری جۆرجیاوە بۆ کۆماری کازاخستان نێردراون و ئێستا لەم کۆمارەدا نیشتەجێن، تا نیوەی ساڵانی پەنجا ٨٨,٥٠١ کەس‌و ٩,٠١٣ کەسیان کورد بووە (٢٤٠٣ یان ژن و ٢٦٢٩ پیاوو ٣٩٨١ منالّن) [١٥٤].

ڕاپۆرتێکی زۆریش لەسەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (لەبەر نەخواردن و کاری سەخت و گۆڕینی کەش‌وهەواو..) و نەبوونی داوودەرمان و خۆکوژی‌و کەم ئەندامان و بریندااران و قارەمان و وەرگری میدالیا و نیشانەکانی سۆڤێت، هەروەها کرێکارێکی زۆریش لەناویاندا هەڵدەبژێرن بۆ ئەو شوێن و شارو ناوچە دوورانەی یەکێتیی سۆڤێت، بەتایبەت سیبریاو، بۆ ئەوێیان دەبەن.

* لە ڕاپۆرتی وەزیری ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێتی ژینراڵی دەزگای پاراستنی (ك.گ.ب) KGB بێریا.ل

بۆ هاوڕێ ستالین سەرۆکی کۆمیتەی بەرگری یەکێتیی سۆڤێت ١٩٤٤/٢/٢٣

ئەمڕۆ ٢٣ی شوباتی (١٩٤٤/٢/٢٣) بەیانی زوو دەست بە گواستنەوەی چیچنی‌و ئینگووشەکان کراو، ئۆپیراسیۆنەکان بە شێوەیەکی ئاسایی

---

[١٥٣] هەمان سەرچاوە، فوندی ٩٤٧٩، ئوپیسی ١، دیلای ٦٧٠، ل٢٤٣.

[١٥٤] هەمان سەرچاوە.

بەڕێوەچوون. شتێکی ئەوتۆ یا ڕووداوێکی گرنگ نەقەوماو، تەنیا شەش ڕووداوی هەوڵدان بۆ بەرەنگاربوونەوە لەلایەن هەندێ کەسەوە ڕوویدا، کە ئەویش پێشی لێ گیراو چەکیش بەرامبەریان بەکارهێنراو، ٨٤٢ کەس لەم بارەیەوە گیران و، لە کاتژمێری ١١ی بەیانیدا نەوەدوچوار هەزارو حەوتسەدو چل‌ویەك (٩٤,٧٤١) کەس، واتە زیاتر لە ٢٠٪ی ئەو کەسانەی کە دەبێ بگوازرێنەوە، کۆکرانەوەو ٢٠,٠٣٠ کەسیان سواری شەمەندەفەر کران [١٥٥].

* بۆ سەرۆکی کۆمیتەی بەرگری یەکێتی‌ی سۆڤێتی هاوڕێ ستالین ١٩٤٤/٢/٢٤

سەبارەت بە ڕاگوێزانی چیچنی‌و ئینگووشیەکان لە ١٩٤٤/٢/٢٤دا بەم چەشنەی خوارەوە ڕاپۆرتتان ئاڕاستە دەکەم. بە هەموویەوە ٣٣٣,٧٣٩ (سێسەد و سی هەزار و حەوتسەد و سی‌ونۆ کەس) کۆکرانەوە، ١٧٦,٩٥٠ یان بە شەمەندەفەر نێردران. دەکرێ بڵێم، ڕۆژی ١٩٤٤/٢/٢٣ لە تەواوی ناوچەکانی چیچنی‌و ئینگووشیدا بەفرێکی زۆر باری. بۆیە هەندێ دژواریمان بۆ هاتە پێش، بەتایبەت لە ناوچە شاخاویەکاندا. بێریا [١٥٦]

* بۆ سەرۆکی ك. پ. ی. س هاوڕێ ستالین ١٩٤٤/٢/٢٦

ئۆپێراسیۆنی ڕاگوێزانی چیچنی‌و ئینگووشەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە دەچێ. ئێوارەی ١٩٤٤/٢/٢٥ (٣٢٤,٦٧٤) کەس سواری شەمەندەفەر کران، کە لە ٨٦ قافڵەی شەمەندەفەر پێك هاتبوو و، نێردران بەرەو شوێنی مەبەست.

بێریا [١٥٧]

* لە ڕاپۆرتی سەرۆکی بەشی ئۆپێراسیۆنەکانی ڕاگوێزانی چیچنی‌و ئینگووشی

١٩٤٤/٢/٢٣

---

[١٥٥] لە کتێبی گەلانی ڕاگوێزراوی ڕووسیا...، ل٤٩ (وەرگیراوە لە سەرچاوەکانی ئەرشیڤ).
[١٥٦] هەمان سەرچاوە، ل٤٩.
[١٥٧] هـ. س، ل٥٠.

ئەو ئۆپیراسیۆنەی کە لە کاتژمێری ٢٤,٠٠ی ١٩٤٤/٢/٢٢دا دەستی پێکردبوو، لە کاتژمێری ٢,٣٠ شەوی ٢٣-١٩٤٤/٢/٢٤ کۆتایی پێ هات. لە ئەنجامدا ٣٣ کەسمان گرت، هەڵهاتن نەبوو و، چەك نەبوو، و تەنیا ٣ خەنجەر گیراوە.

* بۆ کۆمیتەی پارێزگاری یەکێتی‌ی سۆڤێت هاوڕێ ستالین ١٩٤٤/٢/٢٤

سەبارەت بە ئەنجامی ئۆپیراسیۆنەکان، واتە ڕاگوێزانی چیچنی‌و ئینگووشیەکان کە ٢/٢٣ دەستی پێکرد، لە زۆربەی ناوچەکاندا کۆتایی پێهاتووە، جگە لە ناوچە شاخاویەکان. تا ١٩٤٤/٢/٢٩ بە هەموویەوە ٤٧٨,٤٧٩ کەس کۆو بە شەمەندەفەر بەڕێ کراون، کە ٩١,٢٥٠ کەسیان ئینگووشی و ئەوانی تر چیچنین و، تێکڕا سەدوهەشتا قافڵەی شەمەندەفەر بوون،، کە ١٥٩ قافڵەیان نێردراوە بۆ شوێنی نوێ و دیاریکراو[١٥٨].

وەزیری ناوخۆ بێریا

* لە ڕاپۆرتێکی تری بێریادا لە ١٩٤٤/٣/١دا بۆ ستالین، هاتووە کە تا ١٩٤٤/٢/٢٩ (٤٧٨,٤٧٩) کەسی چیچنی‌و ئینگووشییان گرتووەو ڕەوانەی شوێنی دیاریکراو کراون. هەندێ شوێنی شاخاوی هەیە کە لەبەر بەفرو نەبوونی ڕێگە دوو ڕۆژ ماوەی دەوێ، تا ئەوانەش بگرین و ژمارەیان ٦ هەزار کەسە. لەکاتی ئۆپیراسیۆنی کۆکردنەوەو ڕاگوێزانی چیچنی‌و ئینگووشیەکاندا، ٢,٠١٦ کەسی دژی سۆڤێتمان گرت و، بە هەموویەوە ٢٠,٠٧٢ چەك و چەقۆ و خەنجەر و شمشێر و ... مان پێگرتوون.

لە ڕاپۆرتی بێریادا بۆ ستالین، ٧ی مارتی ١٩٤٤، بۆ گواستنەوەی چیچنی‌و ئینگووشیەکان سەرجەم (هێزی وەزارەتی ناوخۆو ك. گ.ب.و...) سەد هەزار ئەفسەرو لەشکری بەشداری ئەم ئۆپیراسیۆنەیان کرد، زۆربەیان پێشتر لە ڕاگوێزانی قەرەچایڤ و کالمیکەکاندا بەشدارییان کردووەو، بڕیار وایە دواتریش لە ڕاگواستنی بالکارەکاندا بەشداری بکەن[١٥٩].

---

[١٥٨] سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.

[١٥٩] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

* بۆ وەزیری ناوخۆی یەکێتی‌ی سۆڤێت

بۆ جێگری وەزیری پاراستن هاوڕێ کەبولوڤ ١٤ی مارتی ١٩٤٤

ڕاپۆرت سەبارەت بە:

بەڕێوەبردن و گواستنەوەی چیچنی و ئینگووشی و بالکارەکان

بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی هاوڕێ بێریا، بەشی گواستنەوەی وەزارەتەکانی ناوخۆو پاراستن و بەڕێوەبەرایەتی دامودەزگای شەمەندەفەر، هەوڵمان دا بە کورتترین ماوە ٥٢١,٢٤٧ لەوانە لە ١٩٤ قافڵەی شەمەندەفەردا بگوازینەوە بۆ شوێنی دیاریکراو.

بەپێی ئەو ئەزموونەی کە ئێمە لە گواستنەوەو بەڕێکردنی قەرەچایڤ و کالمیکەکاندا هەمانبوو، توانیمان لە گواستنەوەی چیچنی‌و ئینگووشی‌و بالکارەکاندا، شەمەندەفەرو واگۆنی کەمتر بەکاربێنین. بەپێی بەرنامەی داڕێژراو دەبوایە ئێمە ٢٧٢ شەمەندەفەر، واتە لە ١٥٢٠٧ واگۆندا ئەوانەمان بگواستایەتەوە، هەر ٥٦ واگۆن لە یەك قافڵە یا شەمەندەفەردا بێ. بەڵام ئێمە ١٢٥٢٥ واگۆن، یا بە ١٩٤ قافڵەی شەمەندەفەر کە هەرکامیان ٦٥ واگۆنیان پێوە بوو، کارەکانمان ڕایی کرد. واتە ئێمە ٢٦٥٢ واگۆن، یا ٤١ قافڵە (هەر قافڵەی شەمەندەفەرێك ٦٥ واگۆن)مان کەم کردەوە یا دەستمان پێوەگرت.ك

ئێمە واگۆنی تایبەتمان بۆ شتومەك‌و تفاق و خواردەمەنی لابردو، هەموویان شتی خۆیان لەگەڵ خۆیان بردە ناو واگۆنەکان ...

سەرۆکی بەشی سێهەمی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی پاراستنی (ك.گ.ب.) KGB سۆڤێت

میلیشتین [١٦٠]

(جێبەجێکەرانی فەرمانی سەرکردەکانی‌سۆڤێت لەڕادەبەدەر بێ‌بەزەیی‌و فاشی بوون. جێبەجێکەرانی ئەو فەرمانانە، وەك لە ڕاپۆرتی سەرەوەدا دەبینرێ، نامرۆڤانەتر بووە لەوەی کە سەرکردە جەلادەکانیان پێیان گوتوون و پلانیان بۆ

---

[١٦٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧،٥٨.

داناون‌و، وەك ئاژەڵ بەشتومەكەوە سواری شەمەندەفەریان كردوون. لە باری ئابوورییەوە یارمەتی ئەو ڕژێمەیان داوە، تا بۆ خۆیان میدال و نیشانەو پارەی زۆرتر وەربگرن، زۆرتر بدزن‌و، زووتر فریای ڕاوڕووت و گرتنی گەلانی تر بكەون. هەندێ جار كە بیردەكەمەوە، دەڵێم ڕژێمی ستالین دەیتوانی ئەوانە بكوژێ ون بۆی ئاسانتر بوو و كەسیش نەیدەزانی‌و، ئەم بەڵگانەشیان دەسووتاند. بەڵام دیار بوو پێویستی بە هێزی كاری كۆیلەكان بووەو، بەرەبەرە لەوێ مردوون‌و تواونەتەوەو سیاسەتی سۆڤێتی زاسیا (بەسۆڤێت كردنی ئەو گەلانە) ئاسانتر بووە. شوێنی چۆڵ‌و وێران زۆربوو، دەبوو ئەوان ئاوەدانی بكەنەوە. وڵاتی ئەو گەلانەش دەوڵەمەندو جوان بووە، دەبوو بدرایە بەو گەلانەی كە ڕێبەری پرۆلیتاریای جیهان و گەلانی ئازادیخواز لەپێشدا بۆی دیاری كردبوون و...، هەورامی).

* بڕیاری شووراى باڵای یەكێتیی سۆڤێت ١٩٨٩/١١/١٤

سەبارەت بە پێزانینی ئەو كردەوە نایاسایی‌و تاوانبارانەی كە بەرامبەر بە گەلانی دوچاری شاڵاوی بەزۆر ڕاگواستن كراون‌و دابینكردنی مافەكانیان.

..........

گۆڕینی تەواوی ئەو فەرمان‌و بڕیارانەی دام‌ودەزگا باڵاكانی دەسەڵاتی دەوڵەتی سۆڤێتی كە بوون بە بناغەی بەزۆر ڕاگوێزانی نایاسایی هەندێ گەل و نەتەوە لە جێ‌وڕێی هەمیشەییان و، سنووردارکردنی مافە مەدەنیەكان (وەك هاووڵاتی) و، هەڵوەشاندنەوەی پێكهاتە (قەوارە)ی نەتەوەیی‌و دەوڵەتی ئەم گەلانە (ڕۆژنامەی ئیزڤیستیا ١٩٩١/٣/١٤).

*یاسای كۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی ڕووسیای فیدراڵی

سەبارەت بە گەڕاندنەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو

گێڕانەوەی ماف‌و ژیانی ئەو نەتەوەو گەلانەی ڕووسیای فیدراڵ یا گرووپی ئەتنیكی دەگرێتەوە كە لە ئاستی دەوڵەتیدا سیاسەتی بەدناوكردن و جینۆسایدیان بەرامبەر كراوەو، بەزۆر ڕاگوێزراون‌و قەوارەی دەوڵەتی نەتەوەییان هەڵوەشاندوونەتەوەو، لە شوێنی دوورخستنەوەشیاندا ڕژێمێكی تیرۆركارو زوڵم و زۆریان بەسەردا سەپاندوون.

جگە لە یارمەتی ئەو زەرەروزیانەی کە لێیان کەوتووە، قۆناغ بە قۆناغ قەرەبوو دەکرێنەوە... ئەو ماوەیەی کە ئەوانە لە تاراوگە(مەنفا)دا بوون، پێشینەی خزمەتیان سێ‌قات بۆ دەژمێردرێ‌و مووچەی خانەنشینیشیان بۆ زیاد دەکرێ.

لە بواری کولتووریشەوە، کۆمەڵە هەنگاوێك بۆ گەڕانەوەو زیندووکردنەوەو گەشەپێدانی کولتووریشیان هەڵدەگیرێ و، ناوی کۆن‌و مێژوویی ئەو شوێنانە (شارو گوند)ی کە گۆڕدراون لێیان دەنرێتەوە.

(سەرۆکی شووڕای باڵای کۆماری سۆڤێتی-سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵی یلتسین.ب-ن مۆسکۆ ١٩٩١/٤/٢٦

* سەبارەت بە هەندێ کێشە کە پەیوەندییان بە گێڕانەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراوو سەرکوتکراوەوە هەیە.

٢٦ی ئاپریلی ١٩٩١ شووڕای باڵا (پەرلەمان)ی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی فیدراڵی ڕووسیا یاسایەکی "سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو" و بڕیاری "جێبەجێکردنی یاسای کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵی سەبارەت بە ر گێڕانەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو" دەرکرد. لەم یاسایەدا، بەڕوونی مانای گەلە سەرکوتکراوەکان دیاری کراوە و، مافی ئەوانە سەبارەت بە پێکهێنانەوەی قەوارەی نەتەوەیی-دەوڵەتی‌و یەکپارچەیی خاکیان کە تا بەزۆر ڕاگواستنەوەیان هەیان بووەو، گەڕاندنەوەی ناوە کۆن و مێژووییەکانی شوێن و جێگاکان کە دوای بەزۆر ڕاگواستنەوەیان گۆڕیویانن‌و، قەرەبووکردنەوەی ئەو زەرەرو زیانانەی کە دەوڵەت لێی داون. هاوکات ئەم یاسایە بەرژەوەندی مافی ئەو هاووڵاتیانەی کە ئێستا لەناو خاکی ئەو گەلە سەرکوتکراوانەدا دەژین، واتە هاوردەکان، مسۆگەر دەکات‌و، لە هەر چەشنە پێشێلکردنێکی مافەکانیان دەیانپارێزێ. بۆ جێبەجێکردنی گەڕاندنەوەی یەکپارچەیی خاك (تریتۆریا)، ئەگەر پێویست بێ، قۆناغی گواستنەوەی بۆ دیاری دەکرێ. بڕیاری قۆناغی گواستنەوەو دیاریکردنەوەی سنوورەکان لەلایەن شووڕای باڵا (پەرلەمان)ی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵیەوە دەدرێ.

پێویستە یاساکە پەسند بکرێ، چونکە ڕاستییەکی مێژوویی ساغ و ڕوون دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە بۆچوونی ئێمە، کاتی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە بەپێی پێشبینییەکی قووڵ و هەڵسەنگاندنی ورد، لەوانەیە نەك تەنیا لەناو خاکی ڕووسیای فیدراڵدا، بەڵکوو لە دەرەوەی ئەم وڵاتەشدا ئاسەوارێکی جیددیی بەدواوە بێ.

ئەوەتا ئەمڕۆ نامەیەکی زۆرمان لە دانیشتوانی وڵاتی ئەو گەلانەوە کە بەزۆر دەکراون و زۆربەیان بەبێ ئیرادەی خۆیان لەوێ گیرساونەتەوە یا جێگیربوون، بە دەست گەیشتووە. خەڵك پەرۆشی پەرەسەندنی ئەو ڕووداوانەن کە پەیوەندییان بە ئەگەری چاوخشاندنەوە بە گۆڕینی سنوورەکانی نێوان کۆمارو هەرێم و ناوچەکان و شوێنەکانی نیشتەجێبووندا هەیە.

گرنگیو گەرمی کێشەی ئەو ناوچانەی کە لە باری دیمۆگرافییەوە گۆڕاون و پێشتر لە چوارچێوەی خاك و قەوارەی تردا و سەر بە پێکهاتەی دەوڵەتی-نەتەوەیی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو بوون، هەروا دەمێنێتەوە کە چارەنووسیان چی بێ. بەتایبەت ئاڵۆزی کێشەی نێوان کۆماری ئۆتۆنۆمی ئەسەتینیای باکوورو کۆماری چیچنیو ئینگووشی، لەناو خودی ئەم کۆمارەشدا لەنێوان چیچنیو ئینگووشەکاندا هەیە. مانگی یازدەی ساڵی ١٩٥٧، سەبارەت بە دروستکردنەوەی کۆماری چیچنیو ئینگوشی، کۆماری ئۆتۆنۆمی ئەسەتینیای باکوور ٥ ناوچەی پێشتر دابڕاوی کۆماری چیچنی-ئینگووشیی خرابوە چوارچێوەی کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکەیەوە. ئەم کۆمارەی دوایی چوار ناوچەی بۆ کۆماری چیچنی-ئینگوشی گەڕاندوەتەوە. لە چوارچێوەی کۆماری ئەسەتینیای باکووردا، تەنیا ئەو زەویانەی دەوروبەری شارو هەندێ پارچە زەوی تری بچووك ماون کە ئینگووشیەکان داوای دەکەنەوە. لە هەمان کاتیدا، بە فەرمانی دەستەی سەرکردایەتیی شوورای باڵا (پەرلەمان)ی کۆماری ڕووسیای فیدراڵی لە ١٩٥٧دا، ناوچەکانی کارگالین و شیلکۆڤ و نائورلسیکی کە پێشتر خرابوونە سەر هەرێمی ستاڤراپول، درانەوە بە کۆماری چیچنی-ئینگووشی. ڕاگەیاندنی کۆماری

قەرەچایڤ لە ١٩٩٠/١١/١٧دا لە کۆنگرەی نوێنەرانی گەلدا، هەموو ئاستەکانی شەش ناوچەی (پێشتر تا ١٩٤٣ سەر بە کۆماری ئۆتۆنۆمی هەرێمی قەرەچایڤ) لەلایەن دانیشتوانیەوە بە یەك چاو تەماشای ناکرێ. ناوچەکانی زیلینچوکسکی و ئوروپسك زۆربەی دانیشتوانی قەزاقن، داوای ئەو ناوچانە دەکەن کە تێیدا دەژین، وا کە بخرێنە سەر هەرێمی ستاڤراپول یا کراسنادار. زیاتر لە چل هەزار قەرەچایڤی لەو ناوچانەدا کە دانیشتوانی چەرکەسن، دەژین.

ئاکینتسەکان (کە گرووپێکی ئیتنیکی چیچنین) لە داغستان، داوا دەکەن ناوچەی ئاخوڤسکی (ئێستا ناوی نوڤالاکسکی‌یە) کە پێشان ناوی جوگرافیایی ئاکینی و تا ڕاگواستنەوەیان هەر ئەم ناوەی هەبوو، پێك بهێنرێتەوە. داوای ئازادکردنی خانووبەرەو حەوشەو بەرماڵەکانیان دەکەن. بەڵام ئەمڕۆ لاکتسیەکان و ئاوارتسیەکان، کە بەبێ ئیرادەی خۆیان نێردراون یا جێگیرکراون، لەوێ دەژین.

لە کۆماری کالمیك کۆمیسیۆنێك پێك هاتووە، لەوانەیە ناوچەکانی نەریمانوڤسکی و لیمانوڤسکی کە ئێستا لە چوارچێوەی ناوچەی (ئاستراخان)دان، بخرێنەوە سەری، چونکە پێشتر لە چوارچێوەی ئەم کۆمارانەدا بوون. گەرچی ئەمڕۆ دانیشتوانی کالمیکی ئەم ناوچانە لەسەدا دوو تا یازدەی ئەم ناوچانە پێك دەهێنن.

بەپێی ئەو یاسایەی شوورای باڵا (پەرلەمان)ی کۆماری سۆڤیێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵی کە سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی سیاسی قەزاقەکان دەرچووە، لەم بارەیەوە لەوانەیە ئەوانیش داوای گێڕانەوەی مافی خاکەکەی (تریتۆریا) و پێکهێنانەوەی هەرێم و ناوچەکانی قەزاقی بکەن.

لە تشرینی دووەم (نۆڤامبر)ی ١٩٩٠دا کۆنگرەی قەزاق و نەگایەکان بەستراو، تێیدا داوای گۆڕینی فەرمانی ژمارە ٧٢١/٤ی ١٩٥٧/١/٩ی دەستەی سەرکردایەتی شوورای باڵای ڕووسیای فیدراڵی دەکەن. ئەم گۆڕینە ئەو بەشە دەگرێتەوە کە دەشتی نەگایی دەبێ دابەش بکرێ و بخرێتەوە سەر داغستان و چیچنی-ئینگووشی و ناوچەی ستاڤراپول. تا ١٩٥٧ بەشێکی زۆری دەشتی

نەگایی لە چوارچێوەی ناوچەی ستاڤراپولدا بوو، و لە سەردەمی قەیسەری (تیزاری)دا بە ناوچەی نەگاسیکی ناوی دەرکردبوو. قەزاقەکانی ناوچەی تیرو نەگایەکان، داوای پێکهێنانەوەی یەکپارچەیی خاکی دەشتی نەگایی و، دامەزراندنەوەی کۆمارێك لەم ناوچەیەو لە چوارچێوەی کۆماری فیدراڵی ڕووسیادا دەکەن. ئەمەش پێداچوونەوە یا گۆڕینی سنوورەکان هەم لە ناوخۆی کۆماری ڕووسیای فیدراڵیو هەم لە گشت یەکێتیی سۆڤێتی بەدواوە دەبێ.

ئەگەر ئێستا ناوچەکانی دەوروبەری شار لە کۆماری ئەستینیای باکوور، بوونەتە "هۆی کێشەو ناکۆکی"ی نێوان ئەسەتینیەکان و ئینگووشیەکان، بەوپەڕی دڵنیاییشەوە دەتوانین پێشبینی بکەین کە داوای گەڕانەوە یا پێکهێنانەوەی بەڕێوەبەرایەتیو تریتۆری ناوچەی قەزاقی دەکەن. کەواتە گەڕاندنەوەی ناوچەکانی دەوروبەری شار بۆ قەزاقەکانی بەدواوە دەبێ. هەروەهایش ناوچەکانیتر کە دانیشتوانیان لە ١٩١٨دا بەزۆر دوورخرانەتەوە. بۆ وێنە، ڕووداوە تراژیدیەکانی ئێستگەی ترویتسکی (ئێستا پێنج هەزار قەزاق و هەزارو پێنجسەد کەسی ئینگووشیی لێ دەژی) و ناوچەی سوژنیسکی سەر بە کۆماری چیچنی-ئینگووشی، جارێکیتر نیشایان دا کە شەڕو کێشەی نێوان قەزاقەکان و گەلانی باکووری قەفقاس لەوانەیە پەرە بستێنێ. ئەمەش زیاتر ئەو بیرو بۆچوونانە لەنێوان ئەم گەلانە پەرە دەستێنێ کە بە ناڕەوایی ئەم خاکەیان لە سەردەمی قەیسەردا داگیرکراوە. کێشەی "قەزاقەکان" لە دەرەوەی چوارچێوەی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵدایە و، لەوانەیە کۆمارەکانی سۆڤێتی سۆسیالیستی ئۆکرائینیاو کازاخستان و قرقیزستانیش بگرێتەوە، چونکە بەشێکی خاکی هەرێمی لەشکری قەزاقەکانی دۆن خراوەتە سەر ئۆکرائینیا و، خاکی قەزاقەکانی کازاخستان، واتە ئۆرال و سیبریو سیمیریچنی، کەوتوەتە ناو چوارچێوەی کازاخستان. ئەوەتا ئێستا بزووتنەوەی ژیانەوەو گەڕانەوەی قەزاقەکانی ئۆرال و ئەم ناوچەو هەرێمانە خستنەوە سەر کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، لە هەرێمەکانی ئۆرال و گوریڤسکی کازاخستان، بەهێز دەبێ.

مانگی ١١ی ساڵی ١٩٩٠ کۆنگرەی قەزاقەکانی دۆن لە شاری ڕەستوف بەڕێوەچوو. یەکێتی کۆمەڵایەتی-سیاسی قەزاقەکانی هەرێمی لەشکری دۆن، وەك ڕێکخراوێکی سەربەخۆو ئازاد دروست بوو. داواکاری ژمارەیەکی زۆر لە یەکێتی قەزاقەکانی لەشکری هەرێمی دون "سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی مەدەنیو سیاسی قەزاقەکان" کە هەڵوێستی دانیشتوانی دۆنی تێدا بەرامبەر بە سیاسەتی "لەناوبردنی قەزاقەکان" یا "لەناوبردنی جوتیاران"و کردەوەکانی لەوەوبەری دژی قەزاق، دەربڕدراوە. بۆ وێنە، کێشەی لەناوبردنی ئاسەواری گۆڕینی شوێنی پێشووی هەرێمی لەشکری دۆن و داننانی شوورای باڵا (پەرلەمان)ی یەکێتیی سۆڤێت بەم تریتۆریە (خاکە)دا کە دەکەوێتە چوارچێوەی ڕووسیاو ئۆکرائینیاو نیشتەجێی مێژوویی ژیانی قەزاقەکانی دۆن بووە. هەرێمەکە، بە شوێنی دێرینی دانیشتوانی، واتە قەزاق و ناقەزاکەکان، بەبێ هیچ کڕینێکی سەرلەنوێ ڕادەگەیەنرێ. هەروەها بڕیار دراوە گاردی (هێزی لەشکری) میللی قەزاقی سنووڕپارێزو هێزی تری قەزاقی دابمەزرێندرێو، باڵادەستی بزووتنەوەی قەزاقی لەچاو هەر ڕێکخراوێکی سیاسی تریشدا ڕاگەیەنرا.

لە کۆنگری گەلی بوریاتدا، کێشەی یەکخستنەوە یا یەکگرتنەوەی سێ ئۆتۆنۆمی بوریاتی (کۆماری بوریاتی سۆڤێتی سۆسیالیستی، ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئاگینسکی و بوریاتسکی سەر بە هەرێمی چیتا و، ناوچە ئۆتۆنۆمیەکانی ئوست-ئوردنیسکی و بوریاتسکی سەر بە هەرێمی ئێرکوتسك) خرایە بەر باس و تاوتوێکردن.

بەپێی ناوەڕۆکی یاسا، دەبێ ئۆتۆنۆمی ئەڵمانیەکانی پاڤولژی (سەر ڕووباری ڤۆڵگا) پێك بهێنرێتەوە. ئەم بڕیارە لەلایەن دانیشتوانی ڤولگاگرادو، بەتایبەت هەرێمی ساراتوڤەوە، بە خراپی وەرگیرا کە لەوانەبوو ببێتە هۆی هەم دژواربوونی هاتنی ئەڵمانیەکانی ناوچەکانی تری یەکێتیی سۆڤێت بۆ پاڤولژیو، هەم ئەگەری پێکهێنانەوەی ئۆتۆنۆمی بۆ ئەڵمانیەکانی یەکێتیی سۆڤێت بخاتە بەر پرسیارو مەترسی بۆ پێکهێنانەوەی بخوڵقێنێ.

کاتی چاوپێکەوتنەکەی سەرۆك کۆماری یەکێتیی سۆڤێت لەگەڵ نوێنەرانی ئەڵمانیەکانی یەکێتیی سۆڤێتدا لە ١٩٩١/٥/٧دا، پێکهێنانەوەی دەوڵەت بۆ ئەڵمانیەکان لە پاڤولژی دەستنیشان کرا، ئەویش تەنیا لە بارودۆخێکی لەباردا بهێنرێتە دی کە بەرژەوەندی گەلانی دانیشتووی دێرینی ئەو هەرێمەی تێدا لەپێش چاو بگیرێ‌و، کێشەکە قۆناغ بە قۆناغ چارەسەر بکرێ، کە هەر بە تێخوێندنەوەی پێکهاتەی هەل‌ومەرجی سیاسی‌و ئابووری جێبەجێ دەبێ. بەڵام ئەمە ئەوەش ناگەیەنێ کە ڕێگە لە پێکهێنانەوەی قەوارەی نەتەوەیی بگیرێ لەو شوێنانەدا کە پێکەوە دەژین.

بیروڕای گشتی ئەو کێشەیە بەجۆرێك باس دەکەن، کە کاتی جێبەجێ کردنی یاسا، بەوردی بیر لە هەموو میکانیزمێکی پاراستنی خەڵکانی ئەمڕۆی سەر خاکی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو بکرێتەوە. هەڵسەنگاندن و بۆچوونی خاڵی دەی ئەم یاسایە لەلایەن خەڵکەوە، یەکدەست دەرنەبڕاوە یا وەك یەك نییە، بەتایبەت کە لەم خاڵەدا گوتراوە: هاووڵاتیانی بەزۆر ڕاگوێزراو کاتی مانەوەیان لە تاراوگە (شوێنی بەزۆر نیشتەجێکردن) بە خزمەتی سێ قات بۆ حیساب دەکرێ.

ئەو کێشە یا پرسیارە دێتە ئاراوە کە بۆچی ئەم یاسایە کەس یا خەڵکێکی زۆرتر ناگرێتەوە ؟ بۆ وێنە، ئەوانەی کە براون یا نێردراون بۆ سیبری، بەتایبەت کاتی بەکۆمەڵکردنی جووتیاران و لەناوبردنی کەرتی تایبەتی جووتیاران یا بەدەوڵەتی‌کردنیان جووتیارو وەرزێرو ئەوانەی کە نێوان ١٩٣٧-١٩٣٨و ساڵەکانی تر بەزۆر ڕاگوێزرانەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ئاڵۆزی‌و دژواریانەی کە کاتی جێبەجێکردنی ئەم یاسایەی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی ڕووسیای فیدراڵ "سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو" لەم بارەیەوە دێتە پێش، پێویستە ڕێکخراوی کۆمۆنیستەکانی کۆمارو هەرێم و ناوچەو شارو گوندەکانی پارتی کۆمۆنیستی کۆماری ڕووسیای فیدراڵی دەست بەکاربن. لەم بارەیەوە پێویستە:

١- کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی کۆماری ڕووسیای فیدراڵی ڕابسپێردرێ کە:

ئەو بارودۆخەی لەم بارەیەوە هاتوەتە پێش، تاووتوێ و لێکۆڵینەوەوی لەسەر بکرێ و، لە هەموو شوێنێکدا لەگەڵ ڕێکخراوەکانی خۆجێیی حیزب و دامودەزگاکانی زانستیدا "شوێنە گەرمەکان" (شوێنی ئاڵۆزیو کێشە) دیاری بکەن؛ واتە ئەو شوێنانەی کە لەوانەیە کێشە و پێکدادانیان لەسەر خاك و ... هتد تێدا دروست ببێ. دەبێ، بەپێی یاسای ناوبراو، پێشنیاری کۆنکریتی سەبارەت بە گەڕاندنەوەی مافی ئەم یا ئەو گەلە بەزۆر ڕاگوێزراوانە و پاراستنی بەرژەوەندەکانی ئەو هاووڵاتیانەی کە تائێستا لە خاك یا وڵاتی پێشووی ئەو گەلانەدا دەژین، لەڕێگەی نوێنەرانی کۆمۆنیستی پەرلەمانی ڕووسیاوە ئاڕاستە بکرێ.

کۆبوونەوە لەگەڵ سکرتێری کۆمیتەکانی حیزبی کۆمار و هەرێم و ناوچەکانی حیزبی کۆمۆنیستی کۆماری ڕووسیای فیدراڵدا، لە شاری ڕەستوڤ، بۆ گۆڕینەوەی بیروڕا و دانان یا کارکردن لەسەر هەڵویستێکی یەکگرتوو لەم کۆمیتانەدا تایبەت بە ئاڵۆزبوونی پەیوەندی نێوان گەلان و چالاك بوونی بزووتنەوەی قەزاقەکان بکرێ. نامەی تایبەت و یاخود چەشنە ڕێنوێنییەك کە پێشنیارەکانی خۆیانی تێدا سەبارەت بە کاروباری جێبەجێکردنی ئەم یاسایە، واتە " گێڕانەوەی مافی گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو"، بدەنە کۆمیتەکانی حیزبی.

٢- کۆمیتەکانی حیزبی لە کۆمار و هەرێم و ناوچە و شارەکانی کۆماری ڕووسیای فیدراڵدا، لەو شوێنانەی کە گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو دەژین، دەبێ چالاکی ڕوونکردنەوە لەناویاندا بنوێنن، تاکوو خەڵك بێئارامی لە خۆنیشان نەدەن و بڕیاری بێ بیرکردنەوە (نەکێشراو و هەڵنەسەگێنراو) بدەن. بۆ کارکردن لەسەر پێشنیاری لەبار بۆ ئەم کێشانە، دەکرێ نوێنەرانی گەل لە پەرلەمان لە هەموو ئاستەکاندا، بەساڵاچوو و گەورەکانو بەشدارانی شەڕی جیهانی دووهەم (پێش خزمەتانی شەڕ) و خزمەتکارانی کارو نوێنەرانی هونەر و ڕووناکبیریو زانست و دین ڕابکێشێرێن و، کۆمیسیۆنێکی هاوبەش و چارەسەرکەریان لێ دروست بکرێ. پێش هەمووشتێك پشت بەو خاڵانەی ئەم یاسایە ببەسترێ کە بواری چارەسەرکردنی شێوازی سیاسی کێشەی خاك (تریتۆر) دەدەن.

٣- چاپەمەنیەکانی ناوەندی خۆجێیی حیزبی ڕابسپێردریٚ کە لە بڵاوکراوەکانیاندا بۆچوونێکی لەبار و گونجاو سەبارەت بە جێبەجێکردنی ئەم یاسایە بنوێنن و داوای دیالۆگێکی خولقێنەر و کارساز و خۆڕاگری لە خەڵك بکەن و، جیاخوازی (ئیکتریمیزم) و سەربەخۆیی شەرمەزار بکەن.

بەشی سیاسەتی نەتەوەیی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت [١٦١].

[١٦١] ئەرشیڤی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، فوندی ٨٠، پاپکای ٥، دۆسیەی ٢١.

# بیرەوەریەکانی ڕاگواستن

* مودار عوسمان

کۆچ پێکردن

لە بیرەوەریەکانی ڕاگوێزراوی تایبەتی گوندی (ئینتیل)ی ناوچەی ئاخالتیسفی کۆماری جورجیا، گۆڤاری"لیتراتورنی قرقیزستان"، ١٩٨٢، ل١٠٦-٩٦.

بەیانی زووی ڕۆژی ١٩٤٤/١١/١٥ لە گوندەکەمان (ئینتیل)، لە ناوچەی ئاخالتسیخی جورجیا، کە دەیان کیلۆمیتر لە سنووری سۆڤێت و تورکیاوە دوورە، هێزەکانی سنوورپاریزی یەکێتیی سۆڤێت بەئامادەبوونێکی تەواوەو هەڵیانکوتایە سەرمان. هەتائیستا هاوارەکانیان لە گوێمدا ئەزرنگێنەوە. خەڵکەکە دەیانوت: (ئەڵمانیەکان هاتن، ئەڵمانی). لە ماڵ بۆ سەرکولانان وەدەرکەوتین. ژنان لەسەر و سنگی خۆیان دەدا. بەسالاچوان هاواریان دەکرد و منالانیش دەگریان ... قافڵەی ماشێنە باریەکانی سەربازیش کە سەریان داخرابوو، گەیشتە ناو گوند. سەربازی چەکدار وەدەرکەوتن، پێیان گوتین هەمووتان بە زووترین کات دەگوازینەوە و نیو ساعەتیان بوار دا کە خۆمان ئامادەبکەین. گوایە ئەڵمانەکان نزیک بوونەتەوەو، دەبێ پەلە بکەن، تا هەمووتان ڕزگار بکەین. لە ئیستگەی شەمەندەفەری بورژومی، شەمەندەفەری باری چاوەڕێی دەکردین، شەمەندەفەریك بوو پێیدەڵێن واگونی گوێلکەکان. ئەو واگۆنانەی کە عادەتەن بەرازیان بۆ کوشتارگەکان پێ دەگواستەوە، بێ پەنجەرەو بێدەرگا بوون.

کاتێکیش ئێمە لە سنوورەکانی باشووری جۆرجیاوە گەیشتینە ئیستگەی بیلێن ژار لە ئازەربایجان، لەوێ بۆ جاری یەکەم قیژاندیان بەسەر ئەوانەدا کە

سەرپێچییان لە فەرمانە سامناکە قەدەغەکان کردو گوتیان: ((لە واگۆنەکان مەینەدەرێ، لەجێی خۆتان مەجوولێن)). پاسەوانەکانی قەتارەکە تەقەیان لە کوڕە مێرمنداڵەکان کرد، ئەوانەی کە زۆربەی سەرنشین (موسافیر)ـە کۆڵنەدەرو خۆڕاگرەکەی قەتارەکەی ئێمەیان پێك هێنابوو.

خەڵکمان لێ مرد... بۆ ئەوەی کەس‌وکار مردوویان تەسلیمی خاکی غەریبی نەکرێ، بەفر زەویی داپۆشیبوو، ڕەشایی بەدەورەوە نەبوو. خەڵك، لە زۆر واگۆندا، لاشەی مردوەکانی لەژێر فەردەو بارەکاندا شاردەوە. بەڵام سەربازەکان زوو هەستیان بەم بەزمەو فێڵە ساکارە کردو کەوتنە پشکنینی واگۆنەکان و لاشەی مردوەکانیان لە کەس‌وکاریان سەند (ئەو مردوانەی کە هێشتا هەندیك گەرمایی ژیانیان پێوە مابوو و سارد نەبوونەوە). وەك فەرماندەکانیان فەرمانیان پێ دابوون، لاشەکانیان لێ دەسەندنەوەو دەیانکردن بەژێر بەفرەوە (لەناو بەفردا دەیاننناشتن، هەورامی). ئێمەی موسافیری سامناکی ئەم شەمەندەفەرە یا ئەوانەی کە بەزیندوویی ماینەوە، گەیەندراینە فرونزەو، لەوێشەوە بەپێ ئێمەیان گەیاندە ئالا ئەرگی خواروو. ئەمە کۆتایی ئەو گەشت‌وگوزارە دووروودرێژەو سەرەتای چارەنووسێکی نوێ بوو. مانگی دیسامبری ١٩٤٤ سەهوڵبەندانێکی ڕووت بوو بە کۆسپی ڕێبەردەم اگوێزراوە تایبەتەکان، تا نەتوانن قوڕبگرنەوەو خشت دروست بکەن و پەنایەکی پێ دروست بکەن. ئەوانەیش کە توانای ئەم ئیشەیان نەبوو، چاڵ و کونیان لەناو خاکدا بۆ خۆیان دەکردەوە. ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەو ناوە، بەئاشکرا هەستی خۆیان بەرامبەرمان دەرئەبری و، بەدزیەوە جلوبەرگی کۆن و کولێرەی تازەیان پێئەداین. پەتاتەو کەلەرمیان لەگەڵدا بەش دەکردین. جارێکیان کە لەخەو هەستام، لەپێش دەرگای پەناگاکەماندا (نە خانوو نە کونە، بە ڕووسیەکەی ژێر زەمینی پێ دەڵێن، هەورامی) کۆمەڵێك جلوبەرگم بینی زۆر کۆن بوو. بەڵام دەکرا لەبەریان بکەین .... پایزی ١٩٤٥ بوو، باوکم لە بەرەی شەڕ گەڕایەوە. هاتبووە لای فەرماندەی پاسەوانەکان (قوماندان)، تا ناوی لە لیستی ڕاگوێزراوە تایبەتەکاندا بنووسێ. ئەویش (قوماندان) تەماشای میداڵ و

نیشانەکانی سەر سنگی باوکم دەکات و، وەك کوولەکە وشك ڕادەوەستێ و دەڵێ: ((تۆ تەماشا بکە، چی ڕوو دەدا ! چەند میداڵ و نیشانەیان کردووە بە بەر دوژمنی گەلدا ! ئێستا ئیتر کارمان لەگەڵدا (ئەندامانی دەزگای پاراستنی سۆڤێت، هەورامی) بکە.

* لە بیرەوەریەکاندا

نادر کەریم (ڕۆژنامەی "سەیوز"، ژمارە ٣٨،ساڵی ١٩٩٠)

لە وێنەی من و لە چۆنیەتی ژیانی من و لە بیۆگرافی و بەسەرهاتی مندا، دەکرێ چارەنووسی تەواوی بەزۆر ڕاگوێزراوەکان ببینی. ((ئێمە لە گوندی کیکاچی‌ی سەر بە ناوچەی نەخچەوان (ئەو سەردەمە ناوی ناوچەی ستالین بوو) بووین. باوکم، کاتێك من تەمەنم چوار ساڵ بوو، لە ١٩٣٦دا کۆچی دوایی کرد. دایکم نۆماڵی بۆ مایەوەو، پاش ساڵێك تراژیدیایەکی تر چاوەڕێی کردین. ڕۆژێکیان کە لە خەو هەستام، دەبینم ماڵ و گوندەکەمان هەمووی گەمارۆ دراوە. بیریم دێ سەربازەکان هەموو چەکیان پێبوو، سەرو نێزەیشیان پێوە بوو. ئەوانە لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکردو، گەورەکانی گوندیش دەگریان. پاشان زانیم سەربازەکان چییان گوتبوو: دەتوانن ئەوەی کە زۆر زۆر پێویستتانە، کۆی بکەنەوە. دەتانبەین بۆ شوێنێك. ٢٤ سەعات (شەوو ڕۆژێك) بوارتان هەیە خۆتان ئامادەبکەن. ئەی مانگاکان، ماڵەکەو ...؟ گوتیان: شتەکانیتر ئێوە کە پاشان گەڕانەوە، دەیانبەن. برا گەورەکەم و خوشکم بەپەلە دەستیان بە کۆکردنەوەی شتومەك کردو، ئەوەی کە دەکرا هەڵیبگرین بە پێخەف پێچایان. ڕۆژی دوایی، ئێمەیان سواری ماشێنی باری کردو، بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەر برد.

واگۆنەکانیان هێنا، ئەو واگۆنانەی کە بۆ گواستنەوەی بارو ئاژەڵ بوون. فەرمانیان دا هەموو بچینە ناو واگۆنەکانەوەو سوار بین. مانگ و نیوێك تا دوان بەڕێوە بووین. پاشان زانیمان ئێمەیان هێناوە بۆ شاری جەمبولی کازاخستان. لەوێش، ئێمەیان سواری ماشێنی باری کرد. ئێمەو چەند ماڵێکی خەڵکی گوندەکەمان براین بۆ بیابانێکی ڕووت، بەڵام کانییەکی لێ بوو. لێیان پرسین:

ڕەشماڵ و چادرتان پێیە؟ گوتمان: هەیە. گوتیان: جارێ تێیاندا بژین، پاشان بە پارەی خۆتان ماڵتان بۆ دروست دەکەین. جگە لەوە، پاشانیش بۆمان دەرکەوت خزم و کەس‌وکاری گوندەکەمان بەسەر شوێنی جیاجیاو پەراگەندەدا دابەش کراون.

بەم جۆرە ئێمە بووین بە کۆچەرو ڕاگوێزراو. بە کورتی بڵێم: زیندان بوو. زەمان تێپەڕی‌و ئێمە خانوومان لە خشتی کاڵ دروست کرد. شوکری خودا، سەرئەنجام ئێمە توانیمان لە جێگایەك بحەوێینەوە. لە نەخشەی هەرێمی (جمبول)دا، گوندی نوێ، واتە گوندەکانی بۆودینوڤاو کەسك– بالەك، پەیدا بوون. بۆمان دەرکەوت هەموو خەم و پەژارەکان بەدواوەن و، دەکرا لەگەڵیاندا بژین و هەڵکەین. بەڵام ناکرێ و، تراژیدیایەکی تر چاوەڕێی دەکردین. هەر ئەو شەوە پیاوە سەرکوتگەرەکانی وەزارەتی (ن.ك.ڤ.د) پاراستن، هەموومان هەڵدەسێنن و پرسیار دەکەن: کێ گەورەی ماڵە؟ برا گەورەکەم "عەبدوڵڵا" کە تازە گەیشتبوە تەمەنی بیست‌ودوو ساڵی، خۆی هەر تازە ژنی هێنابوو، گوتی: من گەورەی ماڵم. گوتیان: لەگەڵمان وەرە. تەواو و، تائێستاش ئێمە نازانین چیی بەسەر هات. هەر ئەو شەوە، تەواوی بنەماڵەکانی گوندەکەمان گەورەکانی خۆیان لەدەست دا. ئێمە بووین بە ڕاگوێزراوی تایبەت. بۆمان نەبوو بۆ جێگەیەك بڕۆیین، بێ ئەوەی مافی خوێندنمان لە قوتابخانەو پەروەردەکردندا هەبێ. بە کورتی بڵێم: زیندان بوو، بەڵام بەبێ گەمارۆی پەرژینی تەلی دڕکاوی. دوای ساڵێك، قوتابخانە لە گوندەکەمان کرایەوە، قوتابخانەی ناوەندی. هەموو منداڵەکانیان ناچار دەکرد بچن بۆ خوێندن. ئاشکرایە ئێمە پێمان خۆش بوو کە ناچارمان دەکەن ئەلفوبێ بخوێنین. ئەی کێ ببێتە مامۆستا ؟ ئەو سەردەمانە لەناو کازاخەکاندا مامۆستا بەشی نەدەکرد. ئەی کەواتە چی لە کوردە ڕاگوێزراوە تایبەتەکان بکرێ ؟ مامۆستایان لەناو کوردەکاندا دیاری کرد، ئەو کوردانەی کە خوێندنی زۆر کەمیان تەواو کردبوو. لەبیرم دێ، کەریم عەلییێڤیان کردە سەرۆکی قوتابخانە. ناوبراو پەیمانگەی پەروەردەیی (تەکنیکی–تیخنیکوم)ی ئیرەڤانی تەواو کردبوو. برا گەورەکەی منیش "ئەنوەر" کە کەمێکی مابوو ئەو پەیمانگەیە تەواو بکات، کردیانە مامۆستا.

بەڵام ئەوەی کە زۆر سەیر بوو، دەبوایە خوێندنەکە بە زمانی کازاخی بێ. ئاشکرایە لەوکاتەدا کوردەکان ئەم زمانەیان نەدەزانی، سەرەڕای سوپاسی هەموو کوردان بۆ گەلی کازاخ کە لە کاتە سەختەکاندا ئێمەیان وەرگرت و بە هانامانەوە هاتن و ئەوەی دەیانتوانی یارمەتییان داین. بەڵام لە گوندەکەی ئێمەدا تەنانەت یەك کازاخیشی لێ نەبوو، تا بگاتە ئاستی مامۆستایی کازاخی و، کتێبی وانەی قوتابییش بە زمانی کازاخی، وەك مامۆستایانی کورد کۆن و تەمەنێکیان بەسەر بردبوو. مەگەر خودا بزانیت چۆن بوون ! بەڵام هەرچۆنێك بوو من قوتابخانەم بە سەرکەوتوویی تەواو کردو، بە باشی فێری زمانی کازاخی بووم و، بگرە شیعریشم بە زمانی کازاخی دەنووسی.

دوای تەواوکردنی پۆلی دەهەم، چوومە لای قوماندان و، پێم گوت: دەمەوێ لە پەیمانگەیەك درێژە بە خوێندن بدەم. لە وەڵامدا گوتی: کامە پەیمانگە ؟ بڵێ سوپاس بۆ ئەو دە ساڵەو لە گوندەکەی خۆتان کار بکە.

ئەودەمە من نامەیەکم بۆ ستالین نووسی، ئاخر لەبەر ئەوەی هەموو هیواو بیرو هۆشێکمان بەم ناوەوە گرێدابوو. بۆم نووسی دەمەوێ بخوێنمو، یاسای بنچینەیی (دەستوور)ی یەکێتیی سۆڤێتیش ئەم مافە دەدات.

دوای چەند مانگێك، قوماندان منی بانگ کردە لای خۆی، گوتی: نامەت نووسیوە بۆ ستالین ؟ ئەوەتا وەڵامەکەی. ئێوە دەتوانن لە قوتابخانەی پەروەردە بەرزەکان بخوێنن، بەڵام نەك لە پایتەختەکاندا، شارێکی هەرێمی هەڵبژێرە کە پەیمانگەی لێ بێ. ئێمە ئەوکاتە دەتوانین مۆڵەتت بدەینێو بچی بۆ ئەوێ. ئەو سەردەمە لە تەواوی کازاخستاندا، واتە لە چوارچێوەی ئەم کۆمارەدا، لەو شوێنەی کە دەمتوانی بخوێنم، تەنیا لە (قیزل ئوردە)و (چیمکەنت) پەیمانگەی ئەوتۆی لێ بوو. قیزل ئوردە پایتەختی پێشووی کازاخستان بووەو، ساڵی ١٩٣٧ پەیمانگەی پەروەردەیی قیزل ئوردە ڕشتەی کۆلیجی کیمیا- بایۆلۆژیای تێدا بوو، کە کەم یا زۆر بە دڵی من بوو. ساڵێك پاش تەواوکردنی قوتابخانە، هەتا من نامەم نووسیو وەڵامم وەرگرتەوە، ساڵێکم لەدەست چوو. بەڵام ساڵی ١٩٤٩

بڕیارم دا تاقیکردنەوەکانم بدەم. بۆ ئەمەیش سەرەتا پێویست بوو لە پەیمانگەوە مۆڵەتو بانگ بکرێی و، مۆڵەتی قوماندانیش بۆ ڕۆیشتن بۆ قیزل ئوردە وەربگرم. لە پەیمانگەوە بانگ کرام، بەڵام لە سەرەوەختدا فریای تاقیکردنەوەکان نەکەوتم، ئەویش لەبەرئەوەی کە مۆڵەتەکەی قوماندانم لە کۆتایی مانگی ئۆگەستدا بەدەست گەیشت.

سوپاس وا هەڵکەوت و وا دەرکەوت کە سەرۆکی پەیمانگەکەیش جەنابی "لێ"، ئەویش وەك من لە ڕاگوێزراوە کۆریەکان بوو. دەبوایە تاقیکردنەوەکانم بەبێ نمرەی سی بن، تا پارەی مانگانەی قوتابیان (ستیپیندی) وەربگرم و بتوانم ژیانی قوتابێتیی خۆمی پێ دابین بکەم. تاقیکردنەوەکانم بە سەرکەوتوویی دا و، لە خۆشیاندا هەڵبەستێکم بەناوی "ئاواتی من، پەیمانگە"وە بە زمانی کازاخی نووسیو، دام بە ڕۆژنامەی خۆجێیی. ئەوەم بەلاوە سەیر بوو کە لە یەکی مانگی سێپتامبردا (ڕۆژی خوێندن) ئەم هەڵبەستە لە ڕۆژنامەکەدا بلاوکرایەوە.

منیان بانگ کردە کۆڕی شاعیرە لاوەکانی پەیمانگە، کە سەرۆکی ئەم کۆڕە "نەسرەدین سیر عەلییێڤ" بوو، لەسەر هەڵبەستی شاعیری ئەدەبی کلاسیکی کازاخستان "عەسکەر توکماگەمبەیتوڤ،" دەدوا.

بەم چەشنە من بووم بە قوتابی، بەڵام نەك وەك هەموان. زستان بەسەرچوو، هەموو بۆ پشوودانی زستان خۆیان ئامادە دەکرد. چوومە لای قوماندان، گوتم دەمەوێ سەردانی کەس‌وکارم بکەم و بڕۆمەوە بۆ ماڵ. گوتی نا نابێ، دەبوایە داوەتو داخوازی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوەت سێ مانگ بەر لە پشوودان بنووسیبایە. هەموو قوتابیەکان سەفەریان کردبوو، هەر من نەبێ کە لە بەشی خانەی قوتابیاندا مابوومەوە. لێیان دەپرسیم بۆچی نەڕۆیشتوویتەوە بۆ لای دایکت، شەرم ناکەی ؟ لەڕاستیدا شەرمم دەکرد. گەرچی من ڕاگوێزراوی تایبەتی کورد بووم، وەڵامم بۆ هەڵدەبەستن.

کە خوێندنی پەیمانگەکەم تەواو کرد، ویستم درێژە بە خوێندنی باڵا (ئەسپیرانتورە) بدەم و، گوایە لەم بارەیەشەوە هیچ کەندو کۆسپێك نییە. بەڵام

دیسانەوە یاساغکردنی ڕۆیشتن بۆ پایتەخت بووە کۆسپ. بووم بە مامۆستاو ڕۆیشتم مامۆستایی گوندی (چولەکتا)، کە ئێستا شاری کارتاید، بکەم. ئەمە ساڵی ١٩٥٣ بوو. ساڵی ١٩٥٦، دیسانەوە هەوای درێژەپێدان بە خوێندن کەوتە سەرم. ئەم هیوایەشم هاوکاتی یەکێك لە وتارەکانی خرۆشچۆڤ بوو کە پێشنیارو داوای کرد هەر تاوان و ناوێك بە مامۆستایانی "ڕاگوێزراوی تایبەت"ـەوە لکێندراون، هەڵبگیرێن. گوتی: ((ئێمە باوەڕ بە پەروەردەی ئەو نەوە تازە پێگەیشتوە دەکەین. ئایا دەتوانین ئەوانە لە سەرەتاییترین مافیان بێبەش بکەین ؟! سەرەڕای ئەوەیش، مامۆستای یۆنانی و قەرەچایڤی لە قوتابخانەکەی ئێمە هەبوون و، ئێمە هەموومان مافی ئەوەمان نەبوو ڕێوجێی خۆمان دیاری بکەین.

ئێمە لە ساڵێکدا پاسپۆرتەکانمان گۆڕی، ئەو پاسپۆرتانەی کە مۆری نەفرەتکراوی "بێمافی سەفەرکردن"یان پێوە بوو. ساڵی خوێندن تەواو بوو، ڕۆیشتم بۆ مۆسکۆ، زەحمەت نەبوو. سەرئەنجام توانیم ببمە (خوێندنی دکتۆرا) پەیمانگەی پەروەردەیی مۆسکۆ بەناوی لینینەوە. پێشوەخت بەرگریم لە بڕوانامەکەم کردو، ئەرکی سەرۆکی بەشی کیمیای پەیمانگەی پەروەردەیی خاباروڤسکیان پێدام و، ناردمیان بۆ ئەوێ. خاباروڤسك، پراکتیکی ڕاستەقینەی زانستی پێشکەش کردم. لەوێ توانیم نامەی دوکتۆراکەم بنووسم و، بووم بە پرۆفیسۆرو تاقە پرۆفیسۆری ئەو سەردەمەی هەرێمی (دالنی وەستوك). بە کورتی، بڕیارم دا لەوێ بمێنمەوەو کاربکەم، بەڵام هاووڵاتیانم کە زانییان کوردێکی وا هەیەو دوکتۆری زانستی کیمیایە و ناسناوی نادیروڤە، ئامۆژگاریو داوایان لێ کردم نزیکیان ببمەوەو بگەڕێمەوە بۆ کازاخستان. حەوت ساڵ سەرۆکی بەشی تەکنولۆجیای کیمیا لەسەر بەرهەمهێنانی نەوت و، جێگری کاروباری زانستی پەیمانگای کیمیا– تەکنولۆگیای کازاخستان بووم لە چیمکەنت. کاتێك کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی کازاخستان بانگی کردم و، سەرۆکی ئاکادیمیای زانستی (کۆڕی زانیاری) ئەو سەردەمەی کۆماری کازاخستان بە ناوی کونایڤ.ئا.م پێشنیاری پێ کردم ببمە سەرۆکی پەیمانگەی ئاکادیمی لە گوریڤ. منیان بە ئاکادیمیك هەڵبژاردو، بووم بە خاوەنی خەڵاتی دەوڵەتی. هەمووی بە سەرکەوتووییو

زۆر باش دەچوە پێشەوە. کارم زۆر دەکردو، زۆریش پێش کەوتم، زیاتر لەوەی چاوەڕێ یا گومانم دەکرد. بە دڵسۆزیو پاکی کارەکانم جێبەجێ دەکردو، هێندە ماندووبوونی جەستەییو مەعنەویم کێشابوو، پێویست بوو وازبێنم. قۆناغی دووهەمی سەرکوتکردن (بەزۆر دوورخستنەوە)ی ژیانی من، ڕێك دوای پەنجا ساڵ بەسەر تراژیدیای یەکەمدا، واتە لە (٩٨٦-٩٨٧)دا دەستی پێکرد بە ناوی پیرسیترۆیکاوە، واتە- نەفرەت و مردن بۆ "زاناکانی سەردەمی وەستان یا کەساسی" (مەبەست سەردەمی برژینێڤە کە ناویان لێنابوو سەردەمی سستیو پووکانەوە "زاستوی"، هەورامی). واتە دەستیان بە "ڕەخنەگرتن" لە من کرد، هەروەك ساڵی ١٩٣٧ و تەنیا جیاوازییەك کە لەنێوانیاندا هەبوو، ئەوەیە کە ئێستا من لە تەواوی شتەکان تێدەگەم و، دەمتوانی بەپێی توانا لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم. تێگەیشتم لەبەرئەوەی من تاقە کوردێکی ناو تەواوی ئاکادیمیەکانی ئاکادیمیای زاستی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤێتی کازاخستان بووم و، خاڵی بێهێزی منیش کورد بوو، بۆیە بە ئاسانی دەکەوتمە بەر تانەو تەشەر، بە ئاسانیش زیانم پێ دەگەیەنرا. لە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی کۆماری سۆڤێتی سۆسیالیستی کازاخستان، ناچاریان کردم داخوازی دەست کێشانەوە وەك زانای گەورە لە سکرتاریەتی دەستەی باڵای سەرکردایەتی ئاکادیمیای زانستی کۆماری کازاخستان بنووسم و ئیمزای بکەم. ئەویش (بە داخوازیو ئارەزووی خۆم) بینووسم. هەوڵی زۆریان دا لە پارتی دەرم بکەن و دۆسیەی تاوانکاریم بۆ دروست بکەن و، ئەو بەرهەمە زانستیانەی کە من لە چاپخانە بۆ بڵاوکردنەوە دامنابوون، لایان بەرن و نەهێڵن بڵاو ببنەوە. پرۆسەی بەدناوکردنم دەستی پێکرد. هێزو کاتێکی زۆر پێویست بوون، تا ئەو هەموو هێرش و تاوانانە تێك بشکێنم. بەپێی ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی وردو ئەو کردەوە نایاساییانەی کە بەرامبەر بە منیان کرد، بڕیارێکی تایبەت لەلایەن بیرۆی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمرنیستی کازاخستانو دادستانی ئەم کۆمارەوە درا. بەڵام لەم بارەیەوە دەبێ بگوترێ، لەبەر ئەوەی تا ئەو ناهەقیو سەرکوتکردنانە لە ژیانی کۆمەڵگەکەی ئێمەدا هەبن، بە هەر شێوەیەك بووە ئەو کەسانە وەلادەنرێن کە بۆ هەندێك بێکەڵك و خراپن و کەس نییە پارێزگارییان لێ بکات.

ئەمە پەیوەندیو هەڵوێستێکی گشتی بوو بەرامبەر بە کوردەکان، کە شایستەی ئەو هەموو ناهەقیو سووکایەتی پێکردنە نییە. بارودۆخی هاوخێڵ و نەتەوەکانم ئەمڕۆ خراپترە لە ساڵانی ١٩٣٧ و ١٩٤٤، واتە لە سەردەمی بەزۆر ڕاگواستنیان. لەبەر شەڕو کێشەی نێوان نەتەوەکان لە کۆمارەکانی ئۆزبەکستان و قرقیزستان و ئازەربایجان و ئەرمەنستان، کوردەکانی ئەم کۆمارانە ناچار بوون ئەوێ، واتە شوێنی ژیانیان، بەجێ بهێڵن و، بۆ کارو خانووبەرەو نیشتەجێ بوون، سەرگەردانی سەرانسەری ئەم وڵاتە بوون (هێشتا سۆڤێت نەڕووخابوو، هەورامی). ئاوارەی کورد، تەنیا لە ڕووسیا بە دەیان هەزا کەس مەزەندە دەکرێن. ١٩٣٧، سەرەڕای ئەو هەموو سووکایەتی پێکردنە، کارو شوێن بۆ "تایبەتەکان"، بەڵام بۆ "ڕاگوێزراوەکان" دانرابوو. بەڵام ئێستا نە کار و نە شوێنی نیشتەجێبوون، واتە (سووڕانەوەو وێڵ و سەرگەردان وەك لات و لووتی بێ خانووبەرە).

بڕیاری کۆنگرەی نوێنەرانی گەل (پەرلەمانی سۆڤێت، هەورامی) سەبارەت بە جێبەجێکردنی تەواوی مافەکانی ناو یاسای بنچینەیی، بۆ گەلانی بەزۆر ڕاگوێزراو جێبەجێ نەکرا. هەموان ئاماژە بە بارودۆخی دژواری وڵات دەکەن (کە بۆ جێبەجێ ناکرێن، هەورامی). بەڵام ئەی بۆ ئەم بڕیارە درا، ئەگەر بواری جێبەجێکردن نەبوو ؟!

کوردی ئەو وڵاتە هەزاران ساڵە تەنیا لە چەند کاتێکی سنووردارو کەمدا هەستی بە دەوڵەتی خۆی کردووە، واتە مەبەستم کوردستانی سوورە کە ساڵانی ٢٠ بیست لە چوارچێوەی ئازەربایجانی سۆڤێتدا دامەزرا. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لە هەرکوێ بێ پەناگایەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

* لە بیرەوەریەکانی ئەنوەر نادیرۆڤ،
بیست ساڵ لە ڕاگوێزانێکی دوانەدا (مەنفای دوانە)
هەرێمی چیمکەنت، ساڵی ١٩٩٠

بۆ ئەوەی داهاتوو ببینین، پێویستە بە باشی ئاگاداری ڕابردوو بین. من دەمەوێ باسی ئەو زوڵم و زۆرە بکەم کە دژی گەلی کوردمان کراوەو، وەك شایەتحاڵو زیان لێکەوتوویەك باسی بکەم.

ناوەندی مانگی ١٩٣٧/١١، من ئەو دەمە لە پەیمانگەی تیخنیکومی کوردی ئیرەڤان دەمخوێند. پیاوەکانی وەزارەتی ناوخۆ (ن.ك.ڤ.د) لە خەو هەڵیانساندم و، گوتیان لەگەڵیان بڕۆم. بۆ بەیانی، منیان برد بۆ ئێستگەی شەمەندەفەری ئاراز دایان لە کۆماری ئۆتۆنۆمی نەخچەوانی سۆڤێت، واتە ئەو شوێنەی کە تەواوی کوردەکانی ئەو ناوچەیەیان بە شتومەکەوە بۆ گواستبوەوە. دەوروبەرەکەی هەمووی بە سەرباز گەمارۆ درابوو.

دوای چەند ڕۆژێك، ناردنی قافڵەکانیان دەستی پێکرد. هەر قافڵەیەك لە سەد تا سەدوبیست بنەماڵە پێك هاتبوو و، بە شەمەندەفەری بارکێشیش دەیانبردن. فەرمانیان دا ئاژەڵی بچووك بهێڵنەوەو، ئاژەڵی گەورەی شاخدار و ئەسپەکانیان هەر لەگەڵ مرۆڤەکان پێکەوە کردە ناو فارگۆنەکان.

هیچ کام لە کوردەکان نەیاندەزانی بۆ کوێو لەبەرچی دەیانگوازنەوە. ئەو خەڵکە کە لە کەش‌وهەوای نەرمی دۆڵەکانی چیای ئاگری (ئارارات)دا ژیابوون، جلوبەرگی پێویست و گەرمیان پێ نەبوو. لە ڕێ، نەك تەنیا لە سەرماندا، بەڵکوو لە برسیەتیشدا، تووشی سەرماو نەخۆشی بوون. تەنیا لە چەند ئێستگەیەکدا سەربازەکان دەیانهێشت هەندێ خواردنی بە هەڵکەوت بکڕن. گەورەکان بەتایبەت شتیان نەدەخواردو نەدەخواردەوە، بۆ ئەوەی پێویستیان بە چوونە سەر پێشاو نەبێ، کە کونێك بوو لە ناوەندی فارگۆنەکەدا دروست کرابوو.

بۆ ئەوەی هێزو وزەی خۆمان ڕاگرین، بە ڕۆژو بە شەو ڕاکشابووین. هەستمان کرد بەرەو باکوورمان دەبەن. بۆ کوێ ؟! تەنیا بۆچونێك بوو کە هەمانبوو. ژمارەیەکمان بەرگەی ئەو هەموو گوشارە دەروونیو جەستەییەیان نەدەگرت و دەمردن.

١٩٣٧/١٢/١٢، قافڵەی شەمەندەفەرەکەی ئێمە گەیشتە شاری میرزویان، کە پاشتر ناویان گۆڕی بە جەمبول. بەفر تا ئەژنۆ باریبوو و، پلەی گەرمایش ٤٢-٤٥ ژێر سفر بوو. لەوێشەوە، ئێمەیان سواری ماشێنی باری سەرئاواڵە کردو بەرەو ناوچەی (ساری سو)ی شوێنێکی بێ ڕێگە بەڕێیان کردین کە دەکەوێتە دووسەد کیلۆمتری شاری میرزویانەوە. لەوێش، هەر دووسێ بنەماڵەیەکیان بەسەر

کەڵخۆزەکانی ناوچەدا دابەش کرد. خەڵکەکە هەمووی پێکەوە تووشی نەخۆشی بوو. خزمەتی دەرمانی پزیشکی نەبوو و، دەیان کەس مردن.

لە من مانگی ٢ی ١٩٣٨دا، بۆ درێژەدان بە خوێندن، گەڕامەوە بۆ ئێرەڤان. بەڵام پەیمانگەی تیخنیکومی پەروەردەیی کوردی، ماوەیەکی کورتی بەر لە گەیشتنم، منی خستبوو. لەوێ، لە ئەرمینیا پارەی ڕۆیشتنیان دامێ بۆ گوندەکەمان، واتە سوداروك (ی سەر بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەخچەوانی سۆڤێتی) کە خوشکەکەمی لێ دەژیا. لە یەکەم شەودا، پیاوەکانی پاراستن منیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ بەشی وەزارەتی ناوخۆی ناوچەی ئیلیچیڤسکی (ناوچەی ستالینی پێشوو) لە نوراشێن. دادگا، لەبەرئەوەی هێشتا باڵغ نەبووم و بڕیاری گرتنی منی دابوو، تەمەنم لەو سەردەمەدا شانزە ساڵ بوو، بەڕێیان کردم. دوای چوار پێنج ڕۆژ منیان خستە ناو شەمەندەفەرو، بۆ دواوە بۆ ناوچەی (ساری سو) بەڕێیان کردم. لەوێش منیان بانگ کردە لای قوماندان و، لەبەر سەربەخۆ ڕۆیشتنم، دەستیان بە ئازارو ئەشکەنجەم کرد. دیار بوو پاشان وازیان لێ هێنام، لەبەر ئەوەی باڵغ نەبووم و، داوای بەڵگە (ناسنامە)ی لەدایکبوونیان "میتریك" لێ کردم. ئەو دەم من زمانی ڕووسیم بە خراپی دەزانی، وەڵامم دانەوە کە دەزانم "میتر" چییە، بەڵام نازانم وشەی "میتریکا" چییە. ئیتر سمێڵ و ڕیشی من دەرهاتبوو، ئەوانیش تەمەنی منیان بردەوە بۆ دواوە و ساڵی لەدایکبوونمیان کردە ١٩١٧، واتە شەش ساڵیان خستە سەر تەمەنم.

مانگی مای ١٩٣٨، تەواوی کوردەکانی "قافڵەکەمان"یان لە گوندە چیاییەکەی بیرکوت (ئێستا ناوی شاری ژاناتاسە) کۆکردەوە و، لەوێش کەڵخۆزی کوردییان بەناوی "بودینوڤ"وە بۆ دامەزراندین.

من لە ماوەی دووسێ مانگدا فێری زمانی کازاخی ببووم و، تاکە پروپاگەندەکەری نێوان کوردەکان بووم لە هەڵمەتی چالاکیەکانی پێش هەڵبژاردنی شوورای باڵا (پەرلەمان)ی کۆماری سۆڤێتی-سۆسیالیستی کازاخستاندا کە مانگی ١٩٣٨/٧ بەڕێوە چوو.

ده پانزه ڕۆژ بۆ هەڵبژاردنەکە مابوو، ئەو کاتە لە یەك شەودا لە کەڵخۆزەکەی ئێمە چل پیاوی کوردیان، لەوانە برایەکی بیستودوو ساڵەی من بەناوی "عەبدوڵڵا"وە، برد. بنەماڵەی ئێمە کە لە دە منالْ پێك هاتبوو، بەبێ بەخێوکەر مایەوە. باوکم ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کرد، تا ئەودەمە باوکم چەند جار خرابوە زیندانەوە و، مامە "یەحیا"میان لە هاوینی ١٩٣٧دا برد و، چیتر نەگەڕایەوە.

پاشان زانیم کۆمیتەی ناوچەی حیزب و کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە منیان کردبوە ئاژیتاتۆر. من لە لیستەکەدا ژمارە چل‌ویەك بووم. بۆم دەرکەوت بۆچی شەش ساڵ تەمەنی منیان گەورە کرد. بەو چەشنە زیندوو مامەوەو، چل پیاوەکەیش بەبێ شوێنەوار ون بوون. هەر دوو کەس لە سێ کەسی کەڵخۆزەکەمان هەتیو مایەوە.

لە ١٩٤٢دا، من وەك سەرۆکی قوتابخانەی گوند بووم. لە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە، گوێیان لە ڕاپۆرتی ئیش‌وکارەکانی من دەگرت و ،جێی ڕەزامەندییان بوو. بەڵام سەرۆکی بەشی وەزارەتی ناوخۆی ناوچە کورەکبایڤ، دژم بوو، دەیگوت: ((ئەوە کوڕی گورگە و ئێوە بڕوای پێ دەکەن)) و ((دەبێ دەربکرێو، بەڵگەیشتان لەسەر تاوانەکانی نیشان دەدەم)). داوایان لێ کردم بڕۆمە دەرێ. لە ڕاڕەوەکەدا، پۆلیس بە دەستبەندەوە وەستابوون و چاوەڕێیان دەکردم.

شەش مانگ لە زیندان بووم. بۆیان دەرکەوت کورەکبایڤ هیچ بەڵگەیەکی سەبارەت بە تاوانەکانی من پێ نییە. بەڵام سەرەڕای ئەوە منیان هەر ئازاد نەکرد و، لە ئاپریلی ١٩٤٣دا بە تاوانی (کەمتەرخەمی یا هاوبەشی‌نەکردن لە ئیش‌وکاردا، واتە شکاندنی شووشەی پەنجەرەکانی قوتابخانە و قەڵش پێبردنی کاش‌یەکان و ...) بە شەش ساڵ زیندان سزا درام. بەڵام هاوگوندەکانم پشتیان گرتم و، پارێزگارییان لێ کردم. دوای چەند مانگێك دەستەی سەرۆکایەتی‌ی دادگای هەرێم، تەواوی تاوانەکانی لەسەر هەڵگرتم و ئازادیان کردم وا کە لەژێر چاودێریدا بم.

دوای مانگێك- مانگ و نیوێك، هەر ئەو ساڵە بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی وەزارەتی ناوخۆ دەستی بە چالاکییەك کرد، واتە بە شەو گەمارۆی کەڵخۆزەکەی ئێمەی دا و پەنجا کەسی لە پیاوە کوردەکان گرت، منیش لەناویاندا بووم. تەنیا من وەك سەرکردەی باند، دەستیان بەسەر هەموو شتومەکی ماڵەوەدا گرتم و بردیان. بگرە پێخەف و ئاژەڵەکەیشمان براو، تەنیا پێخەفی دایکم و براکەم کە ڕاکشابوون و قسەیان لەگەڵدا نەکردن، نەبرا. لە بنکەی پولیس، مۆری پەنجەی ئێمەی پیاوەکانیان گرت، بۆ ئەوەی بینێرن بۆ شوێنێك، تا پاشان من، بەپێ ی ماددەی ٥٩ی یاسای جینایی، وەك "سەرکردەی باند" تاوانبار بکەن. ساڵی ١٩٣٨ بیرم کردەوە و، بە خۆم گوت: دەبێ شتێك بکەم. هەر بیرم دەکردەوە. تا بە شەو لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس ڕامکرد. وتم دەبێ خۆم بگەیەنمە کاربەدەستانی باڵا. بە دوای منیشدا شەش حەوت کەسێکی تر ڕایانکرد. تەواوی هێزی زیندووی ناوچەی میرزویانیان بۆ گرتنی ئێمە ئامادە و بەرێ کردبوو. ئێمە دەترساین تەنانەت بجووڵێینەوە، خۆمان شاردبوەوە. هیچ نەبوو بیخۆین و، لەبەر تینوێتی گیانمان هاتبوە سەر لێومان و، ئەوە لە ڕۆژە گەرمەکانی مانگی هەشتدا بوو. تاقەتمان لێ بڕا و چووین تا ئاو بدۆزینەوە.

دیار بوو یەکسەر هەستیان بە ئێمە کردبوو. بۆ ئێوارە، گەمارۆیان داین و هاواریان دەکرد (خۆ تان بەدەستەوە بدەن). ئێمەیش بەملا و ئەولادا ڕامانکرد. بە تفەنگ و چەکی ئۆتۆماتیك کەوتنە تەقەکردن لێمان. بوتەیەکی (نە دار یا کۆتەلە، نە گیایە، نزمە وەك گەون) کوێستانی و پەڵەهەورێکی ڕەش و بارانی کاتی ئێوارە، ئێمەیان ڕزگار کرد. کاتێك ڕامان دەکرد، جلەکانی بەرمان فڕێ دەدا. تەواوی شەو لەبەر ڕێژنەی بارانو سەرمادا دەلەرزاین. بۆ ڕۆژی سێهەم کۆبووینەوەو، بۆمان دەرکەوت کوژراو بریندارمان نییە. ماوەی دە تا دوانزە ڕۆژ، بەر لەوە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتی ناوخۆی هەرێم "تورتسیانوڤ" لە هیچ و خۆڕاییو بە ڕۆژی ڕووناك مەموداوودڤی حەفتا ساڵەی کوشتبوو و شانی عیسا مەحموودوڤی بریندار کردبوو. لەو جۆرە وێنانە گەلێك زۆرە.

شەو هاوڕێکانم بڕیاریان دا خۆیان بەدەستەوە بدەن. منیش ئەوانم بە خائین داناو، بە تەنیایی بەرەو ناوەندی هەرێم ڕێگەم گرتەبەر. کە بەناو بوتەکاندا دەڕۆیشتم، بەڕێگەوە گەیشتمە سەوزاییەك. دەبینم شتێك بەرامبەرم دادەگیرسێ. وامزانی شوانەو ئاگری کردوەتەوە. گوتم ئێستا دەچمە لای، لەوانەیە شتێکم بدەنێ‌و بیخۆم. لەناکاو داگیرسانەکە نەما. ماندوو و سەرمام بووم و، چیتر نەمدەتوانی بڕۆم، هێزم لێ بڕابوو. نزیکی بەرەبەیانی بوومەوە، کەوتمە بیری دۆزینەوەی شوێنێك، خۆمی تێدا بشارمەوەو لە با ڕزگارم بێ. چاڵێکی قووڵم دۆزییەوەو چوومە ناوی. کەمێك گەرم داهاتم. پاشان خەوم لێ کەوت. نیوەڕۆ لە خەو هەستام. شتێك لەلامەوە خشەخشی هات، دەبینم مارێکە، ترسام و دەستبەجێ ترسەکەم ڕەوییەوە. بە خۆمم گوت: باشترە مار پێوەم بدات، نەك بکەومە بەر دەستی پیاوەکانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆ (پاراستن). بەڵام ڕزگارم بوو.

کاتێك ڕۆژ بەرز بووەوە، گەرما گوشاری بۆ هێنام و لە چاڵەکە هاتمە دەرێ. گەڕام بەدوای ئاودا. مارەکەیش هاتە دەرێ. کاتێك تەماشام کرد، پێم وابوو لەناو گۆڕێکی تێکدراودا خۆم شاردوەتەوە. مووی هەموو لەشم وەك مێخ ڕاست بوونەوەو، بە پەلە دوورکەوتمەوە. لەناکاودا وا هەستم کرد خەڵك بەرەو لای من دێن. نەدەکرا خۆم بشارمەوەو، بۆ ڕاکردنیش درەنگ بوو، بوار نەبوو. ئەوەبوو گەڕامەوە بۆ گۆڕە ترسناکەکەم و، تاقە ڕێگە یا بەختی پاراستنی من بوو. ئەوانەی کە دوام کەوتبوون، نزیك بوونەوە. بەڵام لەناو گۆڕەکەدا هەستم کرد ڕۆیشتن و لەو ناوە نەمان. یەکەم جار بوو لەماوەی چەند مانگێکدا لەدڵەوە پێ‌بکەنم.

گومانم لەوەدا نەبوو کە لە هەموو شوێنێك بەدوامدا دەگەڕێن. بۆم دەرکەوت و لەوباوەڕەشدا بووم کە زەحمەتە بە زیندوویی بگەمە ناوەندی هەرێم. بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ ماڵ و خواحافیزی لە دایکم بکەم. کە گەڕامەوە بۆ ماڵ، دەبینم ماڵ لەگەمارۆدایە. بەڵام پێشی چوونە ناو ماڵەوەیان لێ نەگرتم. دایکم باوەشی پێدا کردم و گوتی: ((چیتر بەرت نادەم و ناهێڵم بڕۆی. بەیانی تەسلیمت دەکەم. با هەموو کەس لۆمەم بکەن کە کوڕەکەی خۆمم گرتووەو تەسلیمی پیاوەکانی

حکوومەتم کردووە. گومانیشم نییە کە ئەمە تاقە ڕێگەو بەختی ڕزگاریی تۆیەو هەمیشەیش وەك ساڵی ١٩٣٨ نابێ. ئەوانەی کە دوای تۆ کەوتوون، دەیانەوێ بتگرن. ئەوانیش دایك و منداڵیان هەیەو، تێدەگەن ئیتر تۆ ئەو کەسە نیت کە وا تێت گەیشتوون. دەبینی دەوروبەری ماڵەکە گیراوە، بەڵام نایەنە ژوورێ)). دایکم دەپاڕایەوەو، ئامۆژگاری دەکردم خۆم بە دەستەوە بدەم و، دەیگوت: ((دەی بمکوژە، بەڵام بەرت نادەم)). لەناو خەم و پەژارەیەکی زۆردا ڕۆژم کردەوەو، دایکم پەرۆشەو، هێشتا من بڕیاری خۆمم نەداوە. بۆ بەیانی، لەگەڵ دایکمدا ڕۆیشتم و خۆم بەدەستەوە دا.

ئێمە کە چەند کەسێك بووین، کۆیان کردینەوە. جەختمان لەسەر ئەوە کرد کە هەر دەبێ دەستبەجێ بماننێرن بۆ ناوەندی هەرێم. پاسەوانەکانمان بە سواری ئەسپ و، ئێمەیش بەپێ کەوتینەڕێ. لە ڕێ بڕیاردرا ڕێگەکە کورت بکەینەوەو بە ڕێگەی سەرەکیدا نەڕۆین، بە تینکسوی (دۆڵی شێت یا دۆڵی شێتان- بە زمانی کازاخی)دا ڕۆیشتین. بۆ ئەوەی ئێمە ڕانەکەین، دوو دوو بەیەکیانەوە بەستین (ئێمە شەش کەس بووین)، گەورەیان بە بچووکەوە دەبەست. لەڕێگە ناچاریان دەکردین پشت لەیەکتر بکەین و دەستیان وەك خاچ بەیەکەوە دەبەستین. لە شوێن و ڕێگە ناخۆشەکەدا، بەناو کەندو کۆسپ و هەورازو نشێودا، ئازارێکی زۆرمان بینی. کاتێك یەکێك لە ئێمەی پرسی ((ئێوە کە موسڵمانن، بۆچی وا ئازارمان ئەدەن ؟)). وەڵامەکەی کورت بوو: ((ئێوەش موسڵمانن، بۆچی ئابڕووی هەرێم و تەواوی کۆمارەکەتان بردووە ؟!)).

بۆ ڕۆژی دووهەم، ئێمەیان تەسلیمی زیندانی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی وەزارەتی ناوخۆ کرد. کاتێك دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەو پرسیارکردن، لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بووم. بەڵام ئەم خۆشحاڵییەم ئاشکرا نەکرد، تا لێپرسینەوەکە کۆتایی پێ هات. تەواوی ئەو تاوانانەی کە بۆ منیان هەڵبەستبوو وەك باندیت و چەتە، دانم بە هەموویاندا نا. گوتم: ڕاست دەڵێن و، سەرئەنجام بۆ

خۆشیان سوپاسیان کردم کە دانم بە تاوانەکاندا ناوەو ،منیش لەدڵەوە سوپاسی ئەوانم کرد.

من لە ژوورێکی زینداندا لەگەڵ سەرکردەیەکی بە تەواوی مانا باندیت و دزدا بەناوی "تکاچینکا"وە بووم، باندەکەی لە حەفتاویەك کەس پێك هاتبوو، ئەوی ویستبوویان و لەدەستیان هاتبوو کردبوویان. هەمان کات ئەندامانی باندەکەی من لە ژووری جیاجیای زیندانەکە بوون. تکاچینکا هەموو ڕۆژێ باسی دەکرد چیی کردووە. لێکۆڵەرەوە هەموو کردەوەکانی) ئەوی لەسەر باندەکەی من دەنووسی و، منیش دانم پێدا دەنا. تکاچینکا هەموو ڕۆژێ لە زیندان شتی وەردەگرت و بۆی دەهات، منیش هەر هیچم وەرنەدەگرت و، ئەو منی بەخێو دەکرد.

کوڕەکانی ئێمە کە لە ژوورەکانی تەنیشت بوون، دەیانگوت: بێگومان تۆ شێت بووی کە دانت ناوە بەو تاوان و کردەوانەدا کە نەتکردوون. کاتێك بۆ لێپرسینەوە و ڕووبەڕووکردنەوە بانگیان کردین، بە کوردی بە کوڕەکانم وت ((هەرچییەك دەڵێم، ئێوە بڵێن ڕاستە)).

پێش ئەوەی لێپرسینەوەکە کۆتایی پێ بێ، یەکێك لە خزمەکانم خۆی پێ ڕانەگیراو لە ڕووبەڕووکردنەوەکەدا گوتی: ((ئەو کابرایە لەوانەیە شێت بووبێ، چۆن ئەو هەموو تاوانەی کردووە، لە کاتێکدا لەم وەختەدا لە زیندان بووە ؟!)). ئینجا بەڕێوەبەرایەتی هەرێم تێگەیشت بەم شێوەیە ئابڕووی چووەو، ئەو درۆو دەلەسە نوێیەی کە بۆ منیان هەڵبەستووە، ئیتر بێکەڵك و بەسەر چووە. جگە لەوە، منیان بە تاوانی هەڵاتن لە زیندان لەگەڵ برادەرانی تری گوایە ئەندامی "باند"ەکەی مندا تاوانبار کرد و، ناردینیان بۆ دادگای هەرێم. لەوێ، دەستەی سەرۆکایەتی دادگای هەرێمو دادستان تەواوی ئەو تاوانانەی کە بۆ منیان هەڵبەستبوو، لایانبردو، ڕایانگەیاند ((ئەو مرۆڤەتان لە هیچ و خۆڕایی گرتووەو دەستتان بەسەر سەرو سامانیدا گرتووە. هەتا ئەم کاتەیش کە ئەو مرۆڤەتان بە شەش ساڵ زیندان تاوانبار کردبوو، هەر بەخوتوخۆڕایی بووە. دادگا بڕیاری ئازادکردنی من و تەواوی سامان و ئاژەڵی دەست بەسەردا گیراوی دا. کۆتایی

مانگی چواری ١٩٤٤ منیان ئازاد کرد، لەگەڵ نیوەی ئەو سامانەداو، نیوەکەی تری (نەدۆزرایەوە). ڕۆژی دووهەم، منیان کردە سەرۆکی قوتابخانەی (ناتەواوی) ناوەندی قەرەئویکس کە دەکەوێتە پانزە کیلۆمەتری کەڵخۆزی کوردی. قوماندان لە یەکی مانگی ١٩٤٤/٩دا منی نارد بۆ ئابلون و، لەوێش بەبێ ئارەزوو و پرسیار وەك بڕیار درابوو منیان کردبوو بە مامۆستای فیزیك و ماتماتیکی گوندی بوستاندیك کە دەکەوێتە دۆڵی چوێ‌و سەدوهەشتا کیلۆمەتر لە کەڵخۆزی کوردییەوە دوور بوو.

منیش یەکسەر گەڕامەوە بۆ ناوچە، لەبەرئەوەی ماوەی ئەو مۆڵەتەی کە قوماندان بۆی دانابووم، تەواو دەبوو. چوومە لای سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی پارتی ناوچەو، گوتم: ئاخر من شەش حەوت ساڵ خوێندنی سەرەتایی‌و دەورێکیش قوتابخانەی پەروەردەییم هەیە، بۆیە ناتوانم دەرس بە پۆلی ٨-١٠ بڵێمەوە. سکرتێری یەکەم عومەروۆ بە هەست و تێگەیشتنەوە گوێی بۆ گرتم و، یەکسەر گوتی: ((ئێستا بڕۆ بۆ ئەوێ و، لەگەڵ پۆلەکانی ٦و ٧دا خەریك بە. دوای بیست تا بیست‌وپێنج ڕۆژ وەرەوە بۆ لام، من تا ئەودەمە هەوڵی گۆڕینی بڕیارەکە ئەدەم)).

ڕۆیشتم بۆ ئەوێ و، وانەم بە پۆلەکانی ٥ و ٦و ٧ دەگوتەوە. مامۆستایانی ئەوێ پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردم‌و، سەرۆکی قوتابخانەی بایبولۆ، خانووی خۆی دامێ. لە ماوەی دە پازدە ڕۆژدا توانیم پەیوەندییەکی گەرم لەگەڵ مامۆستایان و لاوەکانی ئێدا ببەستم و، لە تەواوی ژیانمدا چەشنە پەیوەندییەکی باشی ئەوتۆم لەگەڵ خەڵکدا نەدیبوو. کاتێك دەبوو بڕۆم بۆ کۆمیتەی ناوچە، دۆستە نوێکانم نەیانهێشت. ئەودەم ماشێن نەبوو تا بە ماشێن بڕۆم و، دۆستانیش شەو و ڕۆژ بەدەورمەوە بوون‌و بواری ڕۆیشتن‌و تەنانەت هەڵاتنیشیان پێ نەدەدام. لەم کارە دەستەجەمعییەدا، مامۆستا شون سماخانول کە پاشان بوو بە یەکێك لە نووسەرە ناودارەکانی کازاخستان، کاری دەکرد. گوتەکانی دایکمم بیرهاتنەوە: ((ئەگەر لە ژیانی خۆش دەربچی، بەرەوڕووی ژیانێکی خراپ

دەبیتەوە. لە ژیانی خراپیش دەربچی، بەرەورووی ژیانێکی باش دەبیتەوە)).
بڕیارم دا بۆ ساڵێکی‌تری خوێندن لەوێ بمێنمەوە و، وانەم تەنیا بە پۆلەکانی ٥-٧ دەگوت. سەرکردایەتی قوتابخانە زۆر لێم ڕازی بوو و، لە فوندی ئینترنات (ڕێکخراوی پەروەردەو یارمەتیدان)ـەوە تفاق و خواردەمەنییان لەڕێگەی ناوچەوە دەنارد بۆ بنەماڵەکەم لە شاری قەرەتوو.

پۆلەکانی ٨ تا ١٠، لەبەر نەبوونی مامۆستای فیزیك و ماتماتیك، کاتی گوتنەوەی ئەم وانانە لە کۆڵانان دەسووڕانەوەو منیان بە پرسیار بێزار کردبوو. هەموو جارێ دەیانپرسی: ئاگای، کەی وانەمان دەڵێیتەوە؟. لەبەر ڕێزی فراوانم بۆ خەڵکی ئەو ناوچەیە، نەمدەوێرا بە مناڵەکان بڵێم من ناتوانم وانەیان پێ بڵێمەوە. بیرم کردەوە چۆن لەم بارەوە یارمەتییان بدەم.

نازانم چ هێزێك بوو پاڵی بە منەوە دەنا، شەوان نەخەوم و لەبەر چرا (لامپای)ی نەوتیدا خەریکی خوێندنی فیزیاو ماتماتیك بم. گەرچی تا ئەودەمە تەنانەت نەشمدەزانی نیشانەی ڕادیکال چییە. لە ماوەی دوو تا سێ مانگدا توانیم ئەوی پەیوەندیی بە بەرنامەی قوتابخانەو وانەی فیزیاو ماتماتیکی مناڵەکانەوە هەیە، لێی تێبگەم و، هەموو پرسیارەکانم سەرڕاست و ڕوون کردەوەو دەستم بە گوتنەوەی فیزیاو ماتماتیکی پۆلی ٨ و ٩ کردو، کۆتایی ساڵیش توانیم بەسەر ئەم ماددانەی پۆلی دەیشدا زاڵ بم.

وەك هەموو خەڵك لە بارودۆخێکی دژواردا دەژیام. بۆ وێنە، سابوون نەبوو. بۆ شۆردنی پۆشاکی ژێرەوە، عادەتەن دەچوومە سەر زیخ و لم و، لەوێ ئاگرم دەکردەوەو جلەکانم بەسەر کڵپەی ئاگرەکەدا ئەتەکاند، تا ئەسپێیان پێوە نەهێڵم و ڕزگارم بێ لەدەستیان.

دامودەزگاکانی پاراستن (قوماندانتوریا)، هەمووکاتێك بەدوامەوە بوون و کۆنترۆڵیان دەکردم. لە ١٩٤٧دا منیان گواستەوە بۆ قوتابخانەیەکی ناوەندی بەناوی قوتابخانەی کروپسکایا (ژنی لینین)ەوە.

جارێکیان من تێکستی کۆنترۆڵی وەزارەتی پەروەردەم دەخوێندەوە، هەڵەیەکم تێدا بینیو ڕاستم کردەوە. ئەوە بەبێ مۆڵەت یا پەسندکردنی کاربەدەستانی سەرەوە بوو. ئەم خۆسەرییەی من بەدی کرابوو و پێی زانرابوو و لەسەریان نووسیبووم. منیان بۆ ڕوونکردنەوە بانگ کردە قوماندانتورە، گوتیان: ((تۆ کە گوتبووت ئاستی خوێندنت ئەوەندە نییە، بە چ حەقێك ئیجازە بەخۆت دەدەی تێکستی کۆنترۆڵ بگۆڕی ؟)). کاتێك وەزارەتی پەروەردە دانی بەوەدا نا کە من ڕاستم، دەستیان بە لێپرسینەوەی من کرد و گوتیان: ((بۆچی ئاستی خوێندنی خۆت لە ئێمە دەشاریتەوە ؟! تۆ کام قوتابخانەی بەرزت تەواو کردووە؟)). زۆرجار هاتبوونە ماڵێو نووسراوەکانی منیان تاقی کردبوەوە. ماڵیان پشکنیمو یادداشت و تێبینیو بەگشتی ئەوی بە نووسراو هەمبوو، تەنانەت ناو کتێبەکانیشیان تەماشا کرد، ناو کتێبەکانی پۆلی ٨-١٠ی قوتابخانەو ئەو شوێنانەی کە تێبینیو نیشانەم کردبوون. لە هاوسێکانمو هاوکارەکانمیان دەپرسی لەبارەی منەوە، ڕاستی ئاستی خوێندنی منیان بۆ دەرکەوتبوو.

سەرەتای ١٩٤٨، لە ناوەندی ناوچە دۆستێکم بە ناوی کالیبکوڤەوە کە جێگری سەرۆکی کەڵخۆز بوو، چاوی پێم کەوت. پەلە بوو، دەیویست بگەڕێتەوە بۆ کەڵخۆز، بۆ ئەوەی کاروباری ئەوێ بۆ هاتنی کۆمیسیۆنێکی پشکنێر ئامادە بکات. ناوبراو هێندە پەشۆکاو و ترسابوو، بەپەلە خەریکی ڕاگرتنی گواستنەوە بوو، تا زووتر خۆی بگەیەنێتەوە ئەوێ. منیش بە گاڵتە گوتم: ((جیاوازییەك لەنێوان ئێوە وەك بەڕێوەبەرایەتی کەڵخۆزو مشکەکاندا هەیە. مشکەکان کە پشیلە دەبینن هەڵدێنو خۆ قوتاردەکەن. بەڵام ئێوە بەپێچەوانەوە بە پیری کۆمیسیۆنەوە دەچن و، هەوڵ ئەدەن تا بۆتان بکرێ کۆمیسیۆنەکە تێر بکەن تا ئێوە قووت نەدات)). زۆر پێکەنین و جیابووینەوە.

مانگی مارتی ١٩٦٨ بە بڕیاری دادگای ناوچە ژوورەکەیان بە وردی پشکنیم. ئەودەم هێشتا ژنم نەهێنابوو. لە ژووری بەشی خانەی قوتابیاندا (ئینتیرنات) لەگەڵ خوشکێکی سێزدەساڵەو ٦-٧ کەسی قوتابیی پۆلی ٩-١٠ لەگەڵمدا

دەژیاین. دوای پشکنینێکی زۆر، ئەوانە دوو چەقۆو خەنجەرێکی بچووکیان لەناو پێخەفدا دۆزییەوە. منداڵەکان یەکسەر گوتبوویان هی ئێمەیەو، دوای خوێندن بە ڕێگەی قەرەتوودا دەگەڕێینەوە بۆ ماڵ. ئەم چەقۆو خەنجەرەمان بۆ تەنگانەی ڕێگە پێویستە.

قوماندان بەرۆکی منی گرت، گوتی: ئەمە ژووری تۆیە، واتە خەنجەرەکەیش هی تۆیە.

منداڵەکان لە گوتەکانی پێشووی خۆیان، کە خەنجەرو چەقۆکان هی ئەوانە، پاشگەز بوونەوە. پاش ڕۆژێك منیان دووبارە گرتەوە. هەتا من لە زیندان بووم، ئەو جێگا و شوێنانەی کە منیان لێ ببووم، لەوانە ماڵەکەمان لای دایکم لە شاری قەرەتوو، پشکنیبوویان. کەس نەیدەزانی ئەوانە چییان پێویستە؟ بەدوای چیدا دەگەڕان ؟

ساڵی ١٩٨٧ چون سماخانول لە (ئالمائاتا) هەندێ شتی لەسەر ئەو گرتنە بۆ گێڕامەوەو، گوتی: ئەو دەم ئەوانە بەدوای خەنجەردا نەدەگەڕان، بەڵکوو بەدوای شیعرەکانتدا دەگەڕان، ئەو شیعرە دژی سۆڤێتانەی کە سەبارەت بە جیاوازی نێوان بەڕێوەبەرایەتی کەڵخۆز و مشکەکان نووسیوتە. سەد جار پرسیاریان لێ کردووین. بەڵام نەیانتوانی یەك نیشانە یا بەڵگە لەم بارەوە دژی تۆ بدۆزنەوە. ئەوە بوو بیانوویان بەم چەقۆیانەوە گرت.

مانگی ١٩٤٨/٧ دادگا بڕیاری ئازادکردنی دام و، نامەیان پێدام کە مافی ئەوەم هەبوو لە خوێندنگە بەرزەکاندا بخوێنم. هەر لەو ساڵەدا چوومە پەیمانگەی پەروەردەیی ئالمائاتا (بەشی بەڕێوەبردنی نووسینگە) و، ساڵی ١٩٥٧ خوێندنی پەیمانگەکەم تەواو کرد. درەنگ تەواوم کرد، لەبەر ئەوەی لە مەنفای دوانەدا بووم؛ هەر دووسێ ساڵ جارێك دەیانگرتم یا شوێنی کارەکەمیان دەگۆڕیو، لە شوێنی نیشتەجێی کوردەکان دووریان دەخستمەوە و، نەدەبوو بەبێ مۆڵەتی قوماندان حەوت کیلۆمەتر زیاتر لە شوێنی ژیانم دووربکەومەوە. هەندێ جار مۆڵەتیان دەدا بڕۆم بۆ خوێندن و، هەندێ جاریش دووسێ ساڵ نەیاندەدا. بۆیە

منیش له خوێندن دابڕام و دەرەنگ تەواوم کرد. هەر ساڵی ١٩٥٨ پێیان ڕاگەیاندین چاودێری پۆلیسخانەمان بەسەرەوە نەماوە. ١٩٥٨یش، لە تەمەنی ٣٢ساڵیدا، بووم بە خاوەنی مافی هاووڵاتی سۆڤێت، واتە پاسپۆرتی پاکم وەرگرت. بەڵام تائێستا تێنەگەیشتمو نازانم لەبەر کام گوناح و تاوان گەلەکەمو منیشیان تێوە پێچا؟ لەبەرچیو بۆچی ناهێڵن لەسەر خاکی باوو باپیران بژین؟

* عەزیز عەلییێڤ
ئالمائاتا ١٩٩١
کوا نیشتمان؟ پارێزگاریمان لە چی کرد؟
سەرباز لە بەرەی شەڕ گەڕایەوە.
لە سەنگەر، لەسەر تەختی نەخۆشخانە، لە هێرشە سەختەکاندا، لە وڕێنە گەرمەکاندا، هەمیشە ماڵی باوکم و گوندەکەمان و کەس‌وکارمم دەدی، لە هێرشی فاشیستەکان پاراستمان.
بەڵام ئەوەتا گەڕانەوەکەم لە بەرەی شەڕ بە خۆشییەوە وەرنەگیرا.
تەنانەت نەیانهێشت عەریف (استوار) زیا عەلییێڤ بچێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی؛ ئەو شوێنەی کەلێی لەدایکو گەورە بووە، ئەو شوێنەی کە ماڵەکەی لێ بوو، ئەو ماڵەی کە باوکی باپیری دروستی کردبوو.
دیارە کاتێك "دوژمن ماڵەکەتانی سووتاندبێ و بنەماڵەکەتی هەموو کوشتبێ"، هەر ئەو دوژمنانە، بەڵام لێرە دوژمنەکانی خۆمان، ئەرێ ئەوانەی خۆمان ماڵەکەی باوکمیان ڕووخاندووەو تاڵان کردووەو کەس‌وکارەکەمیان بۆ شوێنێی نادیار دەرکردووە.

"بۆ نیشتمان" (لەپێناوی نیشتماندا) "بۆ ستالین"، لەگەڵ ئەوانی تردا کاتی هێرشبردن بۆ سەر فاشیستەکان، هاواری دەکردو ئەم دروشمانەی دەگوتەوە. بەڵام دەرکەوت ئەوو بنەماڵەکەی نیشتمانیان نییە، بردوویانە، (زەوت کراوە) (لێیان سەندراوەتەوە). بە پەڕەی کاغەزێك کە بە ناوی ستالینەوە ئیمزا کراوە، پێنج برای "عەلییێڤ" لە یەك بنەماڵە، ساڵی ١٩٤١ ڕۆیشتوون بۆ بەرەی شەڕ.

مورادخان‌و بەهجەت‌و شەوکەت‌و ئاتاباش کوژران. ئەو، واتە زیا، زیندوو ماوەتەوە. دوو برا گەورەکەی ژنیان هێنابوو و، دوو برا بچووکەکەی هێشتا فریا نەکەوتبوون. زیا بە داخە کە نەکوژراوەو تەنیا بریندار بووە. بۆچی ؟

کە ڕۆیشتبوو بۆ بەرەی شەڕ، دایك و ژنەکەی و منداڵە یەك ساڵەکەی و خوشکە خۆشەویستە بچووکەکەیی بەجێ هێشتبوو، هەموویان مردن، لە برسێتی و سەرمادا مردن. کاتێك بەزۆر بە واگۆنە باربەرە تەختەییەکان بۆ دوورایییەکی نادیار ڕاگوێزرانەوە، بەڵێ مردن.

بەڵام ئەی بۆچی عەریف زیا عەلییێڤ بە تەنیا زیندوو مایەوە؟

ئەمڕۆ عەریف زیا باتیرخانوڤیچ عەلییێڤ لەبیریەتی چۆن لە ستالینگرادەوە گەیشتە بەرلین‌و، نیشانەکانی پلەیەك‌و دووی ئەستێرەی سووری شەڕی نیشتمانی (شەڕی جیهانیی دووهەم) و پانزە میدالی تری پیشان دەدات و، بۆ هەرکامێکیشیان قارەمانییەکی نواندووە. ئازارەکەت نەنیشتوەتەوە؟

نا، ساڵ بە ساڵ پڕ ئازارتر دەبێ.

ئایا دەشێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە ٣٠٪ی پیاوەکانی کورد لە یەك کاتژمێری مانگی ساردی ١٩٤٤/١١دا لە نیشتمانیان دابڕێن‌و، پاشان لەناو واگۆنی باری و کوناودەریان بنێن و لە ڕێگە بمرن ؟! ئەمە جگە لەوانەی کە لە بەرەی شەڕ نەگەڕانەوەو یەك هەزار کەس نین (هەزاران کەس). بەڵام کێ ئەوانەی لەبیرە، قارەمانێتییان و خزمەتەکانیان لەپێناوی وڵاتدا؟!

ناکرێ ئەوەیش لەبیر بکەی‌و لەبیریش ناچێ، کاتێك لە شوێنی نوێی نیشتەجێکردنیان، لە دەوروبەری ئالمائاتا، کوردەکان لە بەهاردا ناچار دەبن لە برساندا گیا بخۆن و، چۆن بەو زستانە سەختە کە پلەی گەرمای هەواپێوی تێدا دەگاتە چلی خوار سفر، لە سەرمادا دەژین! کوردەکان هەر بەبیریشیاندا نەهاتووە کە لەوانەیە سەرمایەکی ئەوتۆ هەبێ. ڕووت، برسی، بێ‌پەناو خانوو، لە تەویلەی ئەسپاندا خۆیان لوول داوەو لە ئەمبارەکاندا ژیاون و پەڕۆ شڕەیان بەدەست و لاقی خۆوە پێچاوە. ئەم بیرەوەریانە سامناکن. کە ئەو زستانە سامناکەیان وەبیر دێتەوە کازاخەکان یارمەتییان داون، دەیانگوت سوپاسیان دەکەین.

هاوتوێژەکانم سێ کەس بوون، واتە زیا باتیرخانوڤیچ عەلییڤی خانەخوێ و هاوسێکەی (پێشتر و ئێستایش هاوسێن) ئازیل خان موستەفایوڤیچ موستەفاییڤ و ئایدان سەلو ئوغلی عەلییڤ. ئەوانە سیان بوون، بەڵام یەك چارەنووسیان هەبوو، چارەنووسێکی تراژیدیانە! جیاوازیەکەی تەنیا لە وردەکاریەکاندایە.

بۆ وێنە، موستەفاییڤ لە ساڵی ١٩٤١ـەوە شەڕی کردووە. لە بەرەی کورس لاقی بریندار بووە و، دوای دوو مانگ هەستاوەتەوە. لە دەوروبەری خارکوڤ، لەلای ئێستگەی لیخاچوڤ، دیسانەوە بریندار بووە. ئەم دەستی چەپی بریندار بووە، دیسانەوە براوە بۆ نەخۆشخانە. ئەمجارە شەش مانگ لەوێ بووە. پاشان هێنراوە بۆ ماڵەوە بۆ تیماری برینەکەی و، چووە بۆ گوندەکەی ئاخکید، بێئەندازە دڵخۆش بووە. چاوەڕێی سەرکەوتن و کۆتایی شەڕی نەکردووە و بڕیاری ژنهێنانی داوە و کچێکی جۆرجیی بە ناوی "ماریا"وە هێناوە. پایزی ١٩٤٤ پشووەدانەکەی تەواو بووە و، خۆی ئامادە کردووە بۆ گەڕانەوە بۆ بەرەکانی شەڕ، بەڵام نەك بۆ ئەوێ. بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراوو دوور لە خەیاڵ، سەرباز لەسەر جادەو ناو کۆڵانەکان دەرکەوتوون. ((هەر بەو تفەنگەی کە شەڕمان دەکرد، هەر بەویش ئێمەیان ڕاگواست)). خەمبارە کە ئەو شتانەی دێتەوە یادو دەیانگێڕێتەوە.

کەس‌وکاری ژنە گەنجەکەی، واتە ماریا، داوایان لێ کردبوو بمێنێتەوە، بەڵام ماریا هەر لەسەر بیروباوەڕی توندی خۆی ڕاوەستابوو و گوتبووی: ((مێردەکەم بۆ هەرکوێ دەبەن، منیش دەچم، ئەو دەمرێت منیش دەمرم)).

هەموان شت لەسەر ژنی دیسەمبەریەکان دەزانن و، هەڵبەست و داستانیان بۆ نووسراوە. بەڵام لەسەر ئەمانە، واتە لەسەر دایکەکانمان، ئەو دایکانەی کە بۆیان نەبوو خۆشەویستی بکەن‌و پێیان ڕەوا نەبینرا مێرد بە نوێنەری ئەو گەلە بکەن کە دەوڵەت فڕێی داون و عەیبداری کردوون، مارەکردنەکەیان لەڕێگەی دامودەزگاکانی هەمان دەوڵەتەوە کراوە. بەڵام ئەو دایکانە وازیان لە مێردەکانی خۆیان نەهێناو، بەریان نەدان و لەگەڵیاندا ڕۆیشتن و، لەگەڵ هەموو خەم و ئازارەکانیاندا بەشدار بوون. کێ بێ گۆرانی شیاویان بۆ بڵێ.

پاش ٣٨ ساڵ، ماریا چاوی بە دایك و باوكی كەوتەوە. ئەگەرچی ئەوكاتە (ساڵی ١٩٤٤) كاتێك ئەوانیان برد دیارنەبوو بۆ كوێیان دەبەن. هیوایان نەمابوو كە جارێكی تر یەكتر ببیننەوە. لەرێگە یەك لەدوای یەك دەمردن و، لاشەكانیان لە لێژاییەكانەوە وەك زبڵ لە واگۆنەكانەوە فڕێ دەدران. عەریف ئەو شتانەی بیر دێتەوەو باسیان دەكات. تێ ناگەم چۆن دوای ئەو شتانە بە زیندوویی ماوەتەوەو شێت نەبوە! لەڕاستیدا هەندێ كەس شێت بوون. ماریا ترساوە بمرێ‌و وەك شتێكی ناپێویست، ئەویش لە هەورازێك فڕێ بدەنە خوارێ. مردن ئاسان بوو، ئاسانتر لە تینوێتی؛ كاتێك زمان وشك دەبێ و دەمت وەك بیرە ئاوێكی وشكی لێ دێ، یا كە برسی دەبووی. كاتێك پێش چاوەكانت ڕەش دەبوو، لاقەكانت هێزیان تێدا نەمابوو و دەبوون بە سەربار، یا كە لە هێرشی سەرمادا بۆ ناو واگۆنەكان، ئیتر هەست بە لاشەو ڕۆح و گیانی خۆت ناكەی. كەسێكیش نەبوو هاواری بۆ بكەی‌و هانای یارمەتی بۆ بەری، یا بە هانای هاوارەكانتەوە بێ. پاسەوانەكانیش خۆیان تێ نەدەگەیاندی، تەنیا ئەوەیان لە ئێمە دەخوڕی: ((وس بە، گوللەیەكت پێوە دەنێم)). تفەنگەكەیان بەرەو ڕوو دەگرتی‌و، پەنجەیان لەسەر ماشەكەی دادەنا.

ئایدان عەلییێڤ پەلاسێكی كردەوەو تەواوی میدال و نیشانەكانی ڕژاندە سەر مێزێك "قارەمانێتی" و"لەبەر خزمەتە جەنگاوەریەكان" و نیشانەی "شانازی"شی داناو، لەسەر كورتەكەی، نیشانەی گاردی (عەسكەری) و نیشانی "شەڕی نیشتمانی"ی پێوە بوون . لە ١٩٤١ـەوە شەڕی كردووە. دوای سەركەوتن دەینێرن بۆ ئاوەدانكردنەوەی شاری ستالینگراد، كە ناوی "باوكی گەلان"ی پێوەیە یا پێوە نراوە، واتە باوكی گەلەكەی ئایدان عەلییێڤ، باوكی هەموو كوردان كە بە "شێوەی باوكانە" لە ماڵەكەی خۆی لە چیاكان هەڵیانكەندوون و نێردراون بۆ بیابانێكی وشك و قاقڕ. ئایدان هەموو كەس‌وكاری خۆی، ئەوانەی كە تاسەی كردبوون، لەدەست داوە. پاشان داوای لە سەربازێكی ڕووس كردووە یارمەتی بدات‌و سۆراخی دۆزینەوەی باوك و دایك و خوشك‌و برای بۆ بكات. سەریان بەكۆیدا نەكردووەو كێ نەماوە نەچنەلای و نامەی بۆ نەنووسن. سەرئەنجام، لە كۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەی ئاپینسكەوە وەڵامی

درایەوە: داوا لە بیرۆی ڕاگوێزراوەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاغیستان کراوە، لەم بارەوە وەڵام بدەنەوە. ئایدان نامەکە دەخوێنێتەوەو ئەو ٢٢٥ ڕۆژە دۆزەخیانەی"زەوی بچووك"ی بیردێتەوە کە لە دەوروبەری (کییێف) و (ژیتومیر)و لە (کارپات) بەسەختی بریندار دەبێ. ئەم کەم ئەندامەی شەڕی جیهانیی دووهەم (شەڕی گەورەی نیشتمانی )، لەناو بەفرێکی زۆردا دەکەوێ و، پێی وادەبێ خوێنەکەی ناوەستێ و لابووەتەوە، بەڵام نەیتوانیوە باوەڕ بە بەوە بکات کە هەموو بنەماڵەکەی دەگوازنەوە بۆ مەنفا. بە هیچ شێوەیەك و لەبەر هیچ هۆیەك، نەیزانیبوو خەم وکارەسات هاتوون یەخەگیری کوردان بوون. سەرئەنجام خەمی نەبڕایەوە، ئاخر ئەم سەربازە کوردە چیایی‌یەی گوندی ئاخچیا، لەبەر میدال و نیشانەو خەلات نەچوە بەگژ دوژمندا.

پاشان گەلێك جار بیریان دەهاتەوە کە لە بەرەی شەڕدا بارودۆخیان لەگەڵ هی کەس‌وکاریاندا کە لە پشتەوەی بەرەکانی شەڕدا بوون، باشترو ئاسانتر نییەو بەراوردیش نەدەکرا. پاشان لە شوێنی جێگیرکردنی نوێیاندا، هەر خەم و پەژارەی ئەو هەموو بێمافی و سووکایەتییەیان دەخوارد. کارکردن لە بەرەبەیانەوە تا شەوو برسێتییەکی نەبڕاوە و بێپایان! دووپووت ئارد لەباتی هەمووی و بۆ هەموان. ئەمەو جگە لەوەی کە ئەگەر لە گوندەوە بچیتە سەر ڕێگەی بەرەو شارو، بە هەڵکەوت یا بتەوێ بڕۆی بۆ شار، دەتگرن و خۆت لە زیندان دەبینیتەوە. ئەگەر هەوڵی ڕۆیشتن بۆ ناوەندی ناوچەکە لە کەللەت بدات و بڕۆی، بیست و پێنج ساڵ زیندانت بە تێهەڵدانەوە بۆ دەبڕنەوە.

جارێکیان ئایدان لە بیری دەچێ و دەچێتە بازاڕی سەوزە بۆ کڕینی هێلەك (بێژنگ)، ئەویش بۆ شتێکی وا بچووك. ڕایدەگرن، چونکە ڕواڵەت و دیمەنی ئاشکرای دەکەن و پێوەی دیاردەبن. مانگ و نیوێك زیندانی دەکەن و، ئێستا دەڵێت بەختی بووە کە ٢٥ ساڵیان حوکم نەداوە. دیارە فەرمانبەران داوایان کردووە ئەوانەی لە کارکردن ڕایان نەکردووە، زەوییان کێڵاوەو تۆویان چاندووە و جۆگەیان هەڵبەستووە. ئازیل خان ئاغا نەیتوانیوە بە دەستە چەپە بریندارەکەی خاکەنازەکە لەسەر زەوی (کێڵگە) ڕابگرێ و بە شانیەوەی بەستووە. ئەمەیە زیرەکی و ئازایەتی و غیرەتی سەربازی ناتەواوی

دەستەچەپە بریندارەکەی. ئێستایش دیارە لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا ناسنامەی کەمئەندامیەکەی شەڕی مەزنی نیشتمانیان لێ سەندوەتەوە. هەروا بردوویانە و بەس و، دەڵێ: بێ ڕوونکردنەوە و بێ هیچ بنچینەیەك، بێ ئەوەی کۆمیسیۆنی پزیشکی بڕیاربدات یا ئاگادار بێ. ئەوانە لەگەڵ ئەو زوڵم و زۆرە ڕاهاتوون. بەڵام قەیناکا هەرئەوەندە بتوانێ بەسەر پێوە ڕاوەستێ و منداڵەکانی گەورە بکات و نەوەکانیشی ببینێ، ئەوانەی کە نەمردوون و لەو شاڵاوە دڕندانەیە ڕزگاریان بووە و نەکەوتوونەتە بەری و بە کوێری چاوی ئەو زۆردارانە زیندوو ماونەتەوە و دەمێننەوە.

کە گوێم لەو بەساڵاچوانە گرت، سەرم سوڕما لەو دڵ و ڕۆحە بەهێزەیان، کە ئەو بەسەرهاتانەیان دەگێڕایەوەو باسی ڕابردووی ڕەش و تاڵ و پێکەنیناویشیان دەکرد. ئایدان ئاغا باسی دەکرد، لە "زەوی بچووك" فێری ئەوە دەبن تەقەمەنی بە کەر بگوازنەوە و کەرەکانیش چەمووش و نافەرمان دەبن. زۆرجار ئەوانە بەوپەڕی هێزیانەوە زەڕاندوویانەو دەرکەوتوون و خۆیان ئاشکرا کردووە. فەرماندەی هێزەکانیش لە دوورەوە فەرمانی داوە کەرەکان لابەرن، ئەگینا دوژمن لەوانەیە وا بیربکەنەوە کە ئەو دەنگە ناخۆش و زەڕەزەڕە هی سەربازەکانمانە.

"گولیستان"ی ژنی زیبا ئاغا کە تا باسی کەرەکان بێدەنگ دانیشتبوو، هاتە ناو باسەکەوە، وتی کاسەی سەبری هەموان لێوڕێژ بووە و، تائێستایش هەر لەو بارودۆخە ناخۆشەدان و دیارە هەر درێژەی دەبێ. بوار نادەن بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان و، ئەگەر وای دابنێین بوار دەدەن، خانووبەرە و سامانەکەمان نەماوە و دەستمان ناکەوێتەوە.

"باشە،ماڵەکانیان ڕووخاندووە و ئاژەڵ و چوار پێکانیان بردووە، کار لەوەدا نییە چەند و چۆن بوو. بەڵام ئەوانە بۆچی گۆڕی باووباپیرانمانیان هەڵقەندووە و ئاسەوارەکانمانیان لەسەر ئەرز لابردووە و شوێنەواریان نەهێشتووە؟ بە بلدۆزەر گۆڕستانەکانیان یەکسان کردین و، لە جێی ئەم گۆڕستانە کە ئێسکی باووباپیر و پێشینیانمانی تێدا بووە، نەخۆشخانەیان دروست کردووە. چۆن دەوێرن لەوێ تیماری خۆیان بکەن یا تیماریان بکەن؟

بەڵێ لە هیچ شوێنێکی دنیادا ئەو شتە نابینی!

بە درێژایی مێژوو تائێستا مرۆڤایەتی و کۆمەڵگە پارێزگاریی گۆڕی پێشینانی خۆیان دەکەن، بەڵام لای ئێمە.... تابووت و کێل و گڵکۆیان دەرهێناوە و، شوێنەوار و یادگاریەکانیان لەگەڵ خاکدا یەکسان کردووە و، گوندەکانمان کە یادگاری ئێمە و وڵاتەکەمان بوون، لەناویان بردوون. ئازلیخان ئاغا لەکاتی ماڵئاواییدا بە دڵێکی پڕەوە وتی:

جوولەکەکان کاتێك لەلایەن لاشخورەکانەوە دەردەکرێن، پەنا بۆ کون و ئەشکەوتەکان دەبەن. بەڵام ئەی ئێمە پەنا بۆ کوێ بەرین و بۆ کوێ ڕابکەین و چ پەناگەیەك بدۆزینەوە؟

زۆر سەخت و خەماوییە کە گوێت لەم وتانە دەبێ، هەر تەنیا بیر لە بەسالاچوەکان دەکەیتەوە، بەڵکوو بیر لە منداڵەکان و نەوەکانی خۆت دەکەیەوە، بیر لەو نەوە تازە پێگەیشتوەی کورد کە شوێنێکیان لە وڵاتەکەی خۆیاندا نییە. خاکەکەیان (نیشتمانەکەیان) لێ زەوت کردوون و بردوویانە و، دواین شتیشیان لێ دەسێننەوە، واتە زمانو هەستی نەتەوەییو ئەو مافەی کە دەیانەوێ لەگەڵ گەلانی تردا یەکسان بن. لەبەرچی چارەنووسی کوردان وا هەڵگەڕایەوە؟ گوناحی ئێمە بەرامبەر بە خەڵك چی بوو؟ کەی کۆتایی بەو هەموو پەیوەندیە نامرۆڤانە بێدادانە دێ بەرامبەرمان؟ کەی بیر لە ئێمە دەکەنەوە، یا بیریان دێتەوە کە ئێمەش مافی ئەوەمان هەیە ژیانێکی بەڕێز و شایستەمان هەبێ؟

پرسیار و پرسیار.

چەند ساڵە ئێمە چاوەڕێی ئاوڕدانەوەو وەڵام و بانگەوازیان لێ دەکەین؟ هەموو گەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و، ئەم تایبەتمەندییە بریتییە لە کولتووری ئەو گەلە. دەبێ پاێزگاری لە زمانی زگماکی خۆی بکات، مۆسیقای خۆی، هاوبەشی نەتەوەیی خۆی (وەك یەکبوونی)، هەموو ئەو جیاوازیانەی کە گەلێك لەوی تر جیادەکاتەوە، هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هەمەچەشنی و ڕەنگاوڕەنگی و جوانی دنیا، ئەو دنیایەی کە ئێمە تێیدا دەژین.

* سڤیریدوڤ. گ. کەسایەتیەکی مۆسیقی-کۆمەڵایەتی سۆڤێتی

(کتێبی ئەمە ئاوابوو، بەرگی ۱، ل١٢٥)

خاتوو سڤیتلانا لە پێشەکی کتێبەکەیدا (ل١٤) دەنووسێ: ((... ئەو مرۆڤانەی کە لە تاراوگەکان بە هانای لێقەوماوەکانەوە دەچوون، زۆر کەم بوون. هەموو کەسێکیش ئەو بوێرییەی نەبوو یارمەتییان بدات، لەبەرئەوەی ژیانی خۆیان دەکەوتە مەترسییەوە....)).

پاشان لە لاپەڕە (١٥)دا سەبارەت بەو گۆرانی و سروودەی کە لە سەردەمی سۆڤێتیدا باو و هەمووکەس ئەم ئاوازەی دەزانی بەناوی (ئادرەسی ئێمە نە ماڵ و نە جادەکانە، بەڵکوو یەکێتی‌ی سۆڤێتە...). دەڵێ گۆرانییەکی "تاڵ بوو" و، ئەم گۆرانیە ماڵەکان و خاوەن ماڵو نیشتمان و...ی لەناو دەبرد".

"تاقیکردنەوەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی نوێ "گەلێکی نوێی سۆسیالیستی" (یا کۆمەڵگەی سۆسیالیستی، هەورامی) لەڕێگەی بەزۆر گواستنەوەی خەڵك و تێکەڵکردنی گەلانی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە، تائێستاش هەر بەردەوامە. ئەو سیاسەتەی کە ستالین بناغەی دانا... ه.س، ل١٧".

هیوادارم ڕۆژێك دابێ ئەم بەرهەمە بەنرخ و بەکەڵکە لەگەڵ بەرهەمەکانی تردا بە کوردیەکەی بکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد، ئەم خانمە بەڕێز و ئازایە یەکەم کەس بووە خۆی گەیاندوەتە لای کوردە ڕاگوێزراوەکان و گەلانی تر و بیرەوەری و لێدوانەکانی لەو کتێبەکەدا تۆمارکردووە.

دەبوایە یەکێکی وەك خاتوو بونێر (ی ژنی ساخارۆڤ) و خاتوو شڤیتلانا عەلیێڤ و پرۆفیسۆر بوگای، بانگ بکردابانە کوردستان و کۆڕ و سیمسینار و بەرنامەی تەلەفیزیۆنییان بۆ ساز بکرایە. دەبوو سەریان لێ بدرایەو، ناوی جادە و گۆڕەپان یا شوێنی شایانیان بە ناوەوە بکرایە.

* سەلاحەدین قاسیموڤ

کوردەکان

کوردەکان یا کرمانجەکان، یەکێك لە گەلانی دێرینی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن. ئەوانە شوێنەوارێکی بەرچاویان لە مێژوودا بەجێهێشتووە و، بەشداریەکی زۆریان لە گەشەپێدانی ڕۆحی گەلانی تورکیا و ئێران و هەندێ لە وڵاتی عەرەبیدا کردووە. لە سەدەی دوانزەدا سەلاحەدینی ئەیووبی کورد سوپاسالاری ئەفسانەیی و دامەزرێنی بنەماڵەی دەسەڵاتداری بەناوبانگی ئەیووبی لە سووریا، پێشڕەوی خاچ هەڵگرەکانی بۆ ڕۆژهەڵات ڕاگرت. ئەو کوردانەی کە نێوان سەدەکانی ١٤-١٩ لە خاکی ئەمڕۆی کوردستاندا نیشتەجێ کرابوون و لە چل هۆزی کورد پێك هاتبوون، بەڕواڵەت و بەناو دەکەونە ناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و شای ئێران. بەڵام هەوڵدانی هاوسێ بەهێزەکان بۆ سەربەخۆیی و ئازادی ئەم گەلە و هەوڵی تواندنەوەیان لەناو فارس و تورکدا، دەبێتە هۆی ڕاپەڕینە یەك لەدوای یەکەکانی ئەم گەلە کە گەلێك شەڕی خوێناویی بەدواوە بووە.

... کوردەکان گەرچی ئەمڕۆ بەناو خاوەن مافێکی یەکسانن لەگەڵ گەلانی دەسەڵاتداری ئێران و تورکیا و عیراق و سووریادا، بەڵام هەندێکیان نەك هەر گەلی کورد وەك گەلێکی جیاواز و سەربەخۆ ناناسن، بەڵکوو بە هەموو شێوەیەك ئەوانیان خستوەتە بەر شالاوی تەنگ پێهەڵچنین و، هەوڵ ئەدەن بەڕێگەی عەسکەری دەستیان پێ لە بیری دیاریکرنی چارەنووسی خۆیان هەڵگرن و، ئەم بیرۆکەیەیان نەهێڵن.

سەبارەت بەوەی کە کورد چۆن لەناو خاکی وڵاتەکەمان (یەکێتیی سۆڤێت)دا سەری هەڵهێناوە؟ ئەویش نەك بە ژمارەیەکی کەم، ئەمڕۆ بەپێی سەرژمێری ڕەسمی نزیکەی سەدوپەنجا هەزار کورد لە یەکێتیی سۆڤێت هەن. بەڵام بەپێی سەرچاوە نارەسمییەکان ،زیاتر لە دوو تا چوارقاتی ئەم ژمارەیەن و، لە تەواوی ئەم وڵاتەدا پەرژ و بڵاو کراونەتەوە. بەلام زۆربەی کوردەکان، واتە نزیکەی سەدوبیست هەزاریان، ئەمڕۆ لە کۆماری کازاخستانن و، تەنیا دەهەزار کەسیان لە کۆماری قرقیزستان دەژین. سەدەی نۆزدەهەم، دوای شەڕی ڕووس-ئێران،

بەشێکی نیشتمانی مێژوویی کوردان، واتە کوردستان، بەپێی پەیمانەکانی ئاشتیی گولستان لە ١٨١٣دا و پەیمانی تورکمانچای لە ١٨٢٨دا، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا. بەم چەشنە کوردەکانیش لێرە گیرساونەوە (دەرکەوتوون، سەریان هەڵهێناوە). واتە نەگیرساونەتەوە، لەبەرئەوەی ئەوانە لە هیچ شوێنێکی ترەوە نەهاتوونەتە ئێرە، یا کۆچباری ئێرە نەبوون، بەڵکوو لە نیشتمان و سەر خاکی دێرینی خۆیاندا ژیاون، واتە لەناو سنووری ئیداریەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و جۆرجیا.

لە ساڵەکانی یەکەمی دەسەڵاتداریەتی سۆڤێتیدا، شووراى وەزیرانی ئازەربایجان، بە فەرمانی خودی لینین، گەڵاڵەیەکی سەبارەت بە دروستکردنی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان کە ناوەندەکەی لاچین (قەرەباغ) بێ، خستە بەردەم کۆمیتەی جێبەجێکەری ناوەندی ئەو کۆمارە. ئەوەبوو لە چوارچێوەی ئەم ئۆتۆنۆمیەدا کە ساڵی ١٩٢٣ پێك هات، ئەم ناوچانە کە زۆربەی دانیشتوانیان کورد بوون، واتە شەش ناوچەی قەرەقشلاق کەڵباجار، قوتورلو، کورد حاجی (گاجی)، موورادخانلی (کە ئەمڕۆ کراونەتە ٤ ناوچە: واتە کەڵباجار، لاچین، قوباتلی و زەنگیلان) دەگرێتەوە. یەکەم سەرۆکی دەوڵەتی کوردستانی سۆڤێتی گوسەی گاجویڤ "حوسێن حاجییێڤ" بوو.

ساڵی ١٩٢١، کاتێك لینین لە برسێتیی ناو کوردستان ئاگادار بووەوە، فەرمانی دا ئەوپەڕی یارمەتی بدرێتە ئەو کوردە لێقەوماوانە. ناوەندی ساڵەکانی ٢٠، قوتابخانەکان لەم کۆمارە ساوایەدا بە زمانی کوردی کرانەوە و، پەیمانگەی پەروەردەیی (تیخنیکوم)ی کوردی لە شاری شوْش کرایەوە و، ڕۆژنامە و کتێبی کوردی دەرچوون و، بەرنامەی ڕادیۆیی بە ڕێکوپێکی و بەبێ وەستان بە زمانی کوردی بڵاو کرایەوە. وەك وەڵامدانەوە یا چاولێکردنی دروستبوونی هەرێمێکی نەتەوەیی کوردی لە ئازەربایجان، ئەو ناوچانەی ئەرمەنستان و جۆرجیا و تورکمانستانیش کە دانیشتوانی کوردی پێکەوە دەژیان، قوتابخانەی کوردی کرایەوە و ڕۆژنامە دەرچوو و، تەنانەت لە (ئیرەڤان)یش تیئاتیری (شانۆ)ی نەتەوەیی کوردی پێك هێنرا.

نێوان ١٩٢٦-١٩٣٦، دەکرێ بە قۆناغێکی زێڕین لە پێکهێنانی کولتووری نەتەوەی کورد بژمێردرێ: ئەو سەردەمە ڕووناکبیرانمان سەریان هەڵهێنا. نابێ ئەوەیش لەبیربکرێ کە کوردەکان سەرکەوتنێکی مەزنیان لە دروستکردنی ژیانێکی نوێ و بەختەوەرتردا بەدەست هێنا. خەباتی کوردەکانی دەرەوەیش پەرەیسەند و گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە یەکێتیی سۆڤێت دۆستی گەلی کوردە و، هەر ئەوە کە وێنەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی نیشان ئەدات. (جگە لەوەیش کاتێك سالی ١٩٤١ سوپای سور چووە ناو خاکی ئێران، کوردەکان یارمەتییەکی زۆری پێشڕەوی و جموجۆڵی سوپای سووریان دا. بۆ نموونە، چاوساغو و ڕێنوێنیان لەگەڵ خستن و هاوکاریی چەککردنی هێزەکانی ژاندارمیری و سوپای ئێرانیان کردن کە دەیانویست بەرامبەریان بوەستنەوە).

سکرتێری بیرۆی ئاسیای ناوەڕاست، زیلینسکی کە ئەنجامی یەکەم قۆناغی دروستکردنی سۆسیالیزمی هەڵسەنگاند، لە تریبونی کۆنگرەی چواردەی حیزبدا وتی: ((... لە ولاتانی دەوروپشتمانەوە و لە دەوروبەری هیندستانەوە کە بە هەزاران فەرسەخ لە ئێمەوە دوورن، چ بە تاك و چ بە بنەماڵە و هۆز و خێڵ و نەتەوەکانی ڕۆژهەلات دێنەلامان. ئێمە گرووپێکی زۆری بەلووچ و کورد و جامیسی و هەزارە و بەربەر هاتوونەتە لامان. ئەوانەیش کە دەیانەوێ یا لە بارودۆخی پێچەوانەی ئیرادەی خۆیان کە تێی کەوتوون، یا لە چەوسانەوە ڕزگاریان ببێ، هەوڵی هاتن بۆ لای ئێمە دەدەن، یا دەیانەوێ ڕێگەی چارەسەری کێشەی نەتەوەیی خۆیان لای ئێمە بدۆزنەوە ...)).

بەلام زۆری پێ نەچوو لە سیاسەتی دەوڵەتی ناوەندی ئاڵوگۆڕێکی بناغەیی ڕووی دا و، گەلی کورد وەك ژمارەیەکی زۆر لە نەتەوەکانی تر کەوتە بەر شالاوی ساڵە بێڕەحم و ڕەشەکەی ١٩٣٧. ئەم بەدبەختییە، بۆ ناوچە ئۆتۆنۆمیەکەی کورد، زۆر زووتر دەستی پێکرد. دوای مردنی لینین، کاروباری ڕووناکبیری لەناو کوردەکاندا کەم کرایەوە، قوتابخانەکانیان داخست، دەرچوونی ڕۆژنامەکانیان ڕاگرت و، سالانی ٣٠ بەکارهێنان و باوی وشەی "کورد" نەمان، ژمارەی

دانیشتوانیان زۆر کەم کرایەوە. ١٩٣٧ ژمارەیەکی زۆری کۆمەنیستەکان و فەرمانبەرانی سۆڤێتی و حیزبی و ڕووناکبیرانی کورد گیران و قوتابخانە کوردیەکانیان بەست و چیتر ڕۆژنامەکان و کتێبە کوردیەکان دەرنەچوون.... منالە کوردەکان کە بەبێ قوتابخانەی خۆ مابوونەوە، چوونە قوتابخانەکانی ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجی. بەلام وا هاتە پێش کە ئەمەیش زۆر نەخایاند. گوایە لەبەر نەزانینی زمانی تەواوی ئەو هاوردانە (ڕێبوار و میوان یا هاتوو) و فریانەکەوتنی خوێندن لە قوتابخانەکان دەردەکران. ئەوەبوو ژمارەی نەخوێندەواران بەرەو زیادبوون چوو، ئەویش لەو کاتەدا کە تازە بووژانەوەی کولتووری گەلی کورد دەستی پێ کردبوو.

بەلام ئەمە هەرە خراپەکەی نەبوو. سالانی ١٩٣٧-١٩٣٨ دەستیان بەزۆر ڕاگوێزانی کوردەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان کرد. ڕاگواستنەوەکە بەم شێوە بوو: هەر سێ‌چوار مالێك لە گوندێك کۆ دەکرانەوە و پاشان تێکەلیان دەکردن و دەیاننارن.

بەم چەشنە یا بە شێوەیەکی تر ئۆتۆنۆمی کوردەکانیان لەناوبرد. بەمەیش وازیان نەهێنا، سکرتێری ئەو دەمەی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان باقیروف دەستی بە ترساندنیان کرد: ئەگەر ئێوە دەتانەوێ وەك هاوهۆز و خێلەکانتان لە کۆماری ئەرمەنستان و کۆماری ئۆتۆنۆمی نەخجەوان بەزۆر ڕابگوێزرێن، پێویستە بۆ هەمیشە وشەی "کورد" لەبیربکەن. ئەودەم خەلکیش دەستی بە خۆنووسین بە ئازەربایجانی کرد، گەرچی نووسراوەی پاسپۆرتەکان نەیاندەتوانی نە نەتەوەیی بوونی کورد و نە زمانەکەیان بگۆڕن، بەلام ئەگەر لە ئازەربایجان کورد بەڕەسمی بوونی نییە، واتە کێشەی کوردیش نییەو نابێ باسی ئۆتۆنۆمی گەلێکی وا بکرێ؟

ئەگەر سەردەمی دروستبوونی ئۆتۆنۆمی کوردستان، چل و هەشت هەزار کورد لەوێ ژیاون، بەپێی سەرژمێری ١٩٧٩ یەك کورد لەوێ نەدەژیا. بەپێی بەراوردی خەلك، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە کە زیادبوونی سروشتی ژمارەی

کوردەکان، واتە بنەماڵە کوردەکان زۆر منداڵن، لانی کەم دەبوو ژمارەی کوردان نزیکەی سێسەد هەزار کەس بێ. لە باری فیزیکییەوە ئەم ژمارەیە، واتە ئەوەندە کەسی کورد هەیە. بەڵام لە باری قانوونی، یا بە واتایەکی تر ڕەسمییەوە، بە ناوی گەلێکی تر لەقەڵەم دراون‌و توێندراونەتەوە. سەرژمێری کوردەکانی تورکمانستانیش کە لە ناوچە سەرسنوورییەکانی ئەم وڵاتەدا لەگەڵ ئێراندا دەژین، هەر بەو چەشنەیە. بەپێی سەرژمێری ١٩٢٦، کۆمارەکانی پشت قەفقاس و تورکمانستان زیاتر لە ٣٠٠ (سێسەد) هەزار کەسیان تێدا ژیاوە. بەڵام دوای دە ساڵ لە سەرژمێرییەکانی دواییدا بەهۆی زوڵم و زۆر و بەزۆر ڕاگوێزان و دەرکردن و لەناوبردنی ڕووناکبیرانی کورد و بەستنی قوتابخانەکان و ڕۆژنامەکان و ناچارکردن یا بەزۆر و نائارەزوومەندانە گۆڕینی ناسنامەوە، کوردەکان لە ڕیزی "نەتەوەکانی تر"دا نووسران. ئەمڕۆ بە سەدان کورد لەناو ئازەربایجانی و ئەرمەن و جۆرجی و تورکمانەکاندا و ... هتد دەبینرێتەوە.

کوردەکانی قرقیزستان لە ناوچەی ئوش، بەتایبەت لە شاری کوک-یانگاك و هەندێ گوندی دۆڵەکانی تالاس و چوین، دەژین. من زۆرجار دەچمە لای هاونیشتمانە کوردەکانم و بە بیستن و لەخۆمەوە ئەم شتانە نالێم و ئاگاداری هەموو باری ژیانیانم. ماوەیەك لەمەوبەر لە جەلال ئاباد گرووپێکی فۆلکلۆری دروست بوو، کوڕ و کچی لادێی کورد بەشدارییان تێدا کردووە. بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ تەنیا لە ڕێوڕەسمە فەرمییەکاندا بەشداری و بەرنامە پێشکەش دەکەن. لە کۆماری دراوسێدا، واتە کازاخستان، بارودۆخەکە زیاتر مایەی دڵخۆشییە. لە هەرێمی جەمبول، کاتی بەڕێوەچوونی فیستیڤاڵی بەرهەمەکانی گەلیری، کوردەکان زۆر بە جوانی خواردەمەنی (چێشتخانە)ی کوردی و وێنە دەستکردە دێرینەکان و گۆرانی و ڕێوڕەسمە کوردیەکانیان پێشان دام.

ئەمڕۆ لە وڵاتەکەماندا، بەتایبەت لە قرقیزستان، ڕووناکبیرێکی زۆری کورد سەریان هەڵهێناوە، کە فەرمانبەری زانستی‌و سەرکردەی دامودەزگاکانی پیشەسازی لەناویاندان.

دەبێ دانیش بەو ڕاستیەدا بنرێ کە ئاستی کولتووری و خوێندەواری کوردەکان زۆر زۆر لە خوارەوەیە و، ئەویش گوناحی خودی کوردەکان نییە. دەسەلاتدارانی ئێمە هیچ بەرژەوەندیان لە گەشەپێدانی کولتوور و پاراستنی و ژیان و تایبەتمەندی ئەم گەلەدا نییە بەپێی پێویستی هاوچەرخ. بەدبەختی و خۆشبەختی ئەم گەلە ئەوەیە کە زۆربەیان خەریکی ئاژەڵدارین و، وەك پەنجا، سەد، سێسەد ساڵ لەمەوبەر چۆن ژیاون، ئێستایش وادەژین. واتە لە چیاکان و دوور لە ڕێگەوبانەکان، لە خانووبەرە کوێر و قوڕاویەکان، لەوشوێنانەی کە بە گوێدرێژ (کەر) ئاوی خواردن ئەگوازنەوە دەژین و، لە هەموو شوێنێكو بارودۆخێکی ناگونجاو و دوور لە تەندروستیدا دەژین. ئێواران کەڵك لە چرا فانۆسیە نەوتیەکان وەردەگرن کە باویان نەماوە، ئەگەر نەوتیشیان نەبێ سوود لە بڵێسەی ئاگر دەبینن. خواردن لەسەر ئاگر دروست دەکەن. بۆچوونێکی ناڕوونیان لەسەر ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن هەیە. بنەماڵەکان وەك کۆن زۆر منداڵن و هیچ ئاگاداری و چاودێرییەکیان بەسەرەوە نییە، ئەویش زیاتر لەبەر ئەو ئیش‌وکارە سەختانەی کە دایك و باوکیان پێوەیان خەریکن. منداڵەکان (زیاتر کچەکان) بۆ ماوەیەکی زۆر نانێردرێنە قوتابخانە. ئەو کوڕانەش کە دەنێردرێنە ئینیرنانت (قوتابخانەی شەوو ڕۆژ) بە باشی ناخوێنن: لەبەرئەوە دایك و باوکیان بۆ خۆیان نەخوێندەوارن و ئاشکرایە ناتوانن بەگوێرەی پێویست هیچ یارمەتی پێشکەوتنی مناڵەکانیان بدەن. ئەو کوڕە مناڵە کوردانەی کە لە بنەماڵەی ئاژەڵدارەکانن، زۆربەیان دوو ساڵ لە یەك پۆلدا دەمێننەوە و سەرئەنجام دەرسەکەیان تەواو ناکەن و دەگەڕێنەوە ماڵێ. هیچ هەوڵدانێکیان بۆ خوێندن لێ بەدی ناکرێ. باوك و دایکەکانیان لەو باوەڕ و هەڵوێستەدان کە ئەگەر "باووباپیران بەبێ خوێندن ژیاون ئێمەیش دەژین".

لە سێبەری ئەو چەشنە ژیانەدا– گەلی کورد، تایبەتمەندیەکانی نەتەوەیی خۆی بەبێ گۆڕانکاری پاراستووە. ئەو کەوتوەتە چوارچێوە یا جەنگەڵی چڕی خێڵەکەی خۆی و هەموو کەلەپوورو نەریت و باو و بیروڕاکەی خۆی ڕادەگرێ و

پارێزگاریی دەکات و لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەکاری دێنێ. بەڵام ئەو چەشنە وێنەیەی ژیان، واتە بەبێ گەشەپێدانێکی ئاسایی، گەلەکەی بەرەو دواوە برد. سەرئەنجام ئەگەر بواری هەوڵدانی بەبێ ئاڵوگۆڕ و پێویستیەکانی هاوچەرخ نەدرێ، بەرەو مردنی دەبات. من پێم وایە بێلایەن بوون یاخود گوێنەدان بە چارەنووسی گەلی کورد و کولتوورەکەی، بە تاوان دەژمێردرێ.

سکاڵا و داخوازی کوردەکان زۆرجار گوێیان نادرێتێ: هاوهۆزەکانم (هاووڵاتیەکانم) کە زۆر ناخۆشە باسیان لێوە بکرێ، بە چەشنە ژیانێکی ئەوتۆ ڕایان هێناون و هۆگریان کردوون، دەکرێ بڵێم هیچ چەشنە بیرێك لە سەربەخۆبوونی ئەو گەلە کە پێویستی بە گەشەپێدان و بووژانەوەی کولتوورەکەی هەیە، نەکراوەتەوە.

یادداشتەکانی من بەرەو کۆتایی دەچن. نیگەران و خەمی ئەوەم نییە کە کەسێکیش ئەم یادداشتە خەمبارە تەواوکراوانەی منی بەدڵ نەبێ. بەڵام کفریشە ئەگەر باس و گێڕانەوەی سەر ژیانی ئەمڕۆی کوردەکان بکرێ بە تەپڵی دەسکەوتەکان، شادی و هاندانێك بۆ داهاتوو. مەیلی کوردەکان خۆیان بۆ گۆڕینی ژیانی خۆیان کەمە- پێویستە دەوڵەت یارمەتییەکی زۆر بەپەلەیان بداتێ. ئەمڕۆ گەلێك کێشەی جیدی لە وڵاتەکەماندا هەن، یەکێکیان کێشەی بووژانەوەی نەتەوەیی-کولتووری گەلی بەتوانا و زۆر زوڵم لێکراوی کوردە (ل٩٥-١٠٠).

# نامەکانی نێردراون
# بۆ سەرکردایەتیی سۆڤێت و ڕووسیای فیدراڵ

١- نامەکان لەلایەن کۆمەڵە یا ڕێکخراوێکی کوردی سۆڤێتەوە "یەکبوون" ئاڕاستە کراون. ڕێکخراوەکە بە ڕەسمی لە وەزارەتی دادی سۆڤێتدا وەرگیراوەو مۆرکراوە. سەرەڕای کەموکوڕی و ڕەخنە کە هەندێك دەڵێن نوێنەری کوردی هەموو کۆمارەکانی سۆڤێتی تێدا نەبوە، بەڵام خواست و داواکانی بۆ وەرگرتنەوەی مافی گەلی کورد لە سۆڤێت و گەڕانەوە و دروستکردنەوەی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی و ...، خواستی ڕەوای هەموو کوردێکی ئەم وڵاتە بووە.

٢-یەکبوون بەزۆری لەلایەن کوردی ئۆتۆنۆمی کوردستانەوە (واتە کوردستانی سوور یا کوردی ئازەربایجان) ڕێك خراوە و، هەر ئەوانیش پێویست بوو دەستپێشخەری ئەم ئەرکە بن، چونکە کورد لە چوارچێوەی ئەو کۆمارەدا خاوەن ناسنامە و چەشنە قەوارەیەك بووە و بەپێی فاکتی مێژوویی، واتە دروستبوونی کوردستانی سوور لە ١٩٢٣دا و یاساکانی سۆڤێت و یاسای نێونەتەوەیی، ئەوان زیاتر بۆیان هەیە داوای مافی زەوتکراوی خۆیان بکەن. یانی بەڵگەی حاشانەکراویان بەدەستەوە هەیەو، بێگومان ئەم دەستپێشخەریەی کۆمەڵەی یەکبوونیش لەلایەن کوردی تەواوی کۆمارەکانی سۆڤێتەوە پشتیوانیی لێ کراوەو، ئەگەر هەمووشیان نوێنەریان لە یەکبووندا نەبووبێ، دەستەی نوێنەرایەتی کوردی سۆڤێتدا کە یەکبوون ڕێکی خستووە، نوێنەری کوردی دەرەوەی کۆماری ئازەربایجانی تێدا بووە.

٣- نامەکانی یەکبوون کە ئاماژە بە نووسینی نامە و ناردنی دەستەی نوێنەرایەتی تر لە سەردەمی خروشچۆڤ و بریژنیڤ و گەرباچۆڤدا دەکات، گرنگیی تر بەم نامانە و خواستە ڕەواکانی کوردی سۆڤێت دەدەن و، تەنانەت ناوی ئەو بەرپرسانەیش دەبەن کە دەستەی نوێنەرایەتی کورد لەگەڵیاندا دانیشتوون و، باسی کێشەکەی خۆیان و، گرنگتر لەوە باسی بیرهێنانەوەی جێبەجێنەکردنی بەڵێنی کاربەدەستانی سۆڤێت لە قۆناغ و سەردەمە جۆراوجۆرەکانی سۆڤێتدا دەکەن. واتە هەموویان تاوانبارن کە کێشەی کوردیان چارەسەر نەکرد و گەیاندیانە ئەو قۆناغە دژوار و پڕ لە تراژیدیانەی پاش ڕووخانی سۆڤێت. بەرپرسییەکە دەکەوێتە سەر شانی کاربەدەستانی سۆڤێت و، گەلی کورد هەر چاوەڕێی هەواڵێکی دڵخۆشکەر لە مۆسکۆ یا کریملینەوە بووە. کەچی؟

٤- نامەکانی یەکبوون باس لەوە دەکەن کە سەردەمی سۆڤێت بە ئاشکرا و ڕاشکاوی نەیانوێراوە لەڕێگەی ڕێکخراوی سیاسی یا کۆمەڵایەتی یا کولتووری یا بە ڕێگەی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و خۆپێشاندان و مانگرتن و ... هتد لە کێشەکەیان بدوێن، چونکە سیستەمەکەیان سیستەمێکی دیکتاتۆر و لە هەموو چەشنە ئازادیەکی دەربڕین دوور بووە. ڕاستیەکەشی وایە، چونکە ئەگەر مافی مرۆڤ و بەرابەری گەلان و مافی چارەنووس ڕەچاو کرابایە، گەلی کورد لە سۆڤێت تووشی ئەو هەموو جینۆسایدە نەدەبوو. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ئازادییەکی یا دیموکراسییەکی نیسبیشی هەبوایە، کورد بە نووسین و خۆپێشاندان و، بگرە بە یاخیبوونیش، گوشارێکی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی دەخستە سەر دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی و لە مێژبوو کێشەکەی چارەسەر کرابوو.

٥- ئەو ڕاستیە تاڵەیش دەبێ بگوترێ، بەتایبەت ئەوانەی لە سۆڤێت خوێندبێتیان دەزانن، کە لە کتێبی قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندندا لە کورد نەدەدوان و لێیان نەدەنووسی، چونکە کورد قەوارە و ناسنامەیەکی نەبوو تا باسی بکەن. کۆمەڵانی گەلانی سۆڤێتی گەلی کوردیان بەلاوە ناسراو و ئاشنا نەبوو. نووسەری ئەم کتێبەیش، زۆرجار بگرە لەناو کۆڕ و

کۆمەڵی ڕووناکبیر و زانکۆ و مامۆستا و ... ئەو ڕاستییەی بۆ دەرکەوتووە کە ژمارەیەکی زۆر کەمیان ناوی کوردیان لە دەرەوەی سۆڤیێت بەرگوێ کەوتبوو. بۆیە نووسەری نامەکەیش ڕاست دەڵێ: کۆمەلانی خەڵکی ئەم ولاتە بە خۆپێشاندان و ڕێپێوانی مۆسکۆ زانییان کورد هەیە.

٦- نووسەرانی نامەکان ژیرانە و بێپەردە لە تاوانی ڕژێمەکانی سۆڤیێت بەرامبەر بە کوردی سۆڤیێت، بگرە دژی کوردی دەرەوەیش دەدوێ، کە گەلی کوردی سۆڤیێت و گەلانی بچووکی تریش لەناو بردووە یا دەرخواردی نەتەوە زۆر و بالادەست و خاوەن کیانەکانی کردوون، چ سەردەمی سۆڤیێت و چ پاش هەڵوەشانەوەی.

٧-لە یەکێك لە نامەکانیشدا باسی پێکهێنانی کۆمیسیۆنێك بۆ لێکۆڵینەوەی کێشەی کورد و بارودۆخی کوردەکانی سۆڤیێت لەلایەن کاربەدەستانی ئەم ولاتەوە دەکرێ، کە دەبوایە لە پێشەوەی هەموویان سەردانی کوردە بەزۆر ڕاگوێزراوەکانی کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست بکات. کەچی دیارە بەهۆی هەندێ ناحەز و دوژمنی کوردەوە، لە ئاستی سەرکردایەتی‌ی سۆڤیێتدا بە هاوکاری هەندێ، یا بەڕاشکاوی بڵێین جاش و نیشتمانفرۆشی کورد، سەردانی کوردی ئێزدییان لە ئەرمینیا کردووە، یا پرسیاریان لێ کردوون‌و بەپێچەوانە وەلامیان داوەتەوە. گەرچی کوردی ئێزدی لە سیاسەتی دەسەلاتدارانی ئەرمەنیدا، هەمیشە وەك نەتەوەیەکی جیاواز لە کورد، لەقەڵەم دراون. گوایە ئەوان کەموکوڕییەکیان نییە و خاوەنی هەموو ماف و ئازادیەکن و ڕەخنە و گلەییشیان نییە. ئەگەرچی سەردەمی سۆڤیێت و پاش هەڵوەشانەوەیشی، ژمارەیەك لەو کوردە ئێزدیە نیشتمانپەروەر و دڵسۆزانە کە لەپێناوی ئازادی گەلەکەیان و مافی کورددا، بەبێ جیاوازی نێوان کوردی ئێزدی و موسڵمان، خەباتیان کردووە، گیران یا بەزۆر دەرکران. نووسەرانی نامەکە باسی دروستکردنەوەی ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چوارچێوەی ئازەربایجان و گەڕانەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکان بۆ ئەوێ دەکەن. کەواتە کۆمیسیۆنەکە دەبێ سەر لەوان و ئازەربایجان بدەن و پرس بە پاشماوەی کوردەکانی کوردستانی سوور و ئەوانەی کە لەو کۆمارەوە بۆ

کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست ڕاگوێزراون، بکەن و، فەرمان بە کاربەدەستانی ئازەربایجان بدەن لەم بارەوە هەنگاو هەڵبگرن و بڕیار دەربکەن، نەك لە سەرەتادا بنێردرێن بۆ ئەرمینیا. واتە ئەم کارەی کۆمیسیۆنەکە، جگە لە تەنگەتیلکەکردن و ئاوەژووکردنی کێشەکە و نەویستنی چارەسەرکردنی، مەبەستێکی تری نەبوە، ئەگینا بەو شێوەیە هەڵس وکەوتی نەدەکرد.

٨- پرسیارێکی تر کە پەیوەندیی بەم نامە یا نامانەوە هەیە، ئەوەیە کە ئەم دەوڵەتە بەهێز و گەورە و خاوەن دەسەڵاتە، چۆن هێشتوویەتی ئەو هەموو کوردە (بەناو هاووڵاتییە) لە ئۆزبەکستان و قرقیزستان یا ئەرمەنستان دەربکەن ؟ بۆچی پێشیان نەگرتووە، یا سزای ئەو کەسانەیان نەداوە کە بەم کارە بێشەرم و تاوانبارانەیان لێ‌وەشاوەتەوە ؟ یاخود دەسەڵاتدارانی ئەم کۆمارانە چۆن وێراون، نەك لە ترسی مۆسکۆ، بەڵکوو لە باری مرۆڤایەتی و ئەخلاقییەوە، دەست بەم تاوانانە بکەن ؟ خۆ سەرکردەکانیان ئەندامی سەرکردایەتی‌ی پارتی کۆمۆنیست و پەروەردەی قوتابخانەی برایەتی و ئینترناسیۆنالیزم و یەکسانی و ... بوون. ئەگەر بڵێین دەسەڵاتدارانی ئەو سێ کۆمارە بەبێ پرس و ئاگاداری مۆسکۆ ئەم تاوانانەیان کردبێ یا پێشیان نەگرتبێ، خۆ ئەوەتا دەستەی نوێنەرایەتی کورد بە نامە و بەدەم هاواری ئەم گەلەیان پێ گەیاندوون، بۆچی پێشیان نەگرتوون یا چارەسەرێکی بنەڕەتییان بۆ کێشەی کورد نەدۆزیوەتەوە ؟

٩-لە نامەکاندا باسی ئەوە دەکرێ کە دەسەڵاتدارانی سۆڤێت، نە تەنیا هیچیان بۆ بووژانەوە و پێشکەوتنی کورد لە بواری زمان و کولتوور و... دا نەکردووە، بەڵکوو ئەوەیش کە هەیانبووە لەدەستیان داوە و، لەبەر نەبوونی ناسنامە و قەوارە و پرژوبڵاوییان لەناو گەلانی تردا تواندوویاننەتەوە.

١٠- خاڵێکی تر کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ، وەڵامی کاربەدەستانی سۆڤێت بە کوردەکانی سۆڤێتە، کە دەبێ جارێ لەبەر شەڕی ئێران و عیراق بوەستن. پێش ئەویش زۆرجار دەیانگوت با کێشەی فەلەستین چارەسەر ببێ، ئینجا نۆرەی کێشەی کورد دێت. ئەم وتانە، جگە لە هەڵخەڵەتاندن و بێ مانایی و بێ ناوەڕۆکی، شتێکی تر نین و، پەیوەندییان بە کێشەکەوە نییە.

شەڕی ئێران و عیراق چ پەیوەندییەکی بە کێشەیەکی ناوخۆی یەکێتیی سۆڤێتەوە هەیە، یا کێشەی فەلەستین ؟ ئەی ئەگەر هاتوو ئەم کێشانە چارەسەر نەکران، یاخود دواکەوتن، سبەینێ کێشەیەکی تر بێتە پێشەوە، دیسانەوە کورد فریو نادەن و نالێن جارێ بوەستن و...؟

دروستکردنەوەی ئۆتۆنۆمی کورد لە ئازەربایجان، بە بڕیار یا فەرمانێکی مۆسکۆ، بێ قڕە و کێشە جێبەجێ دەکرا. جگە لەوە، کورد لەوێ شەڕێکی نەکردووە، تا ئاژاوەیەك دروست ببێ. کۆمیسیۆنێك بەناو بۆ چارەسەری کێشەی کوردی سۆڤێت دروست کراوە و دەسەلات و بەرپرسی و ئازادیی پێ دراوە، خۆ سەرۆك کۆماری سۆڤێت و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست یا دەوڵەتی سۆڤێتی، خۆیان بەم کێشەیەوە سەرگەرم نەکردووە، تا بڵێن کات و بواریان نییە! ئەمە لەگەڵ هیچ لۆژیکێکدا ناگونجێ.

١١- لە نامەیەکدا هاتووە دەسەلاتدارانی ئازەربایجان لە ئازەربایجان بە کوردەکانیان وتووە: ڕووسەکان خاك یا وڵاتەکەی ئێوەیان داگیرکردووە، بڕۆنە لای ئەوان. لەڕاستیشدا هەروایە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە ڕووسیا قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاستی داگیرکرد و بەشێکی کوردستان کەوتە سەر خاکی ئەم ئیمپراتۆریە، پاش هاتنە سەر کاری بەلشەویکەکان، دابەشیان کرد بەسەر کۆمارەکانی قەفقاسداو، پاشان کۆمارێکی ئۆتۆنۆمییان لە بەشێکیدا دروست کرد. ئینجا هەڵیانوەشاندەوە و، زۆربەی دانیشتوانی گواسترانەوە. کەواتە کورد دەبێ یەخەی ڕووسیا یا مۆسکۆ بگرێ، چونکە بڕیارەکە ئەوان داویانە. ئەوان بەرپرسن و، دەسەلاتدارانی ئازەربایجان یا ئەرمینیا ناتوانن لە قسەی مۆسکۆ دەرچن.

کورد کە بە فریودان یا بەزۆر یا لەسەر داخوازی خۆی کەوتوەتە سەر خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا (ئەودەم دەسەلاتی ئەرمەنی یا ئازەری لە ناوچەکەدا و ناسنامە و قەوارەی نەتەوەییشیان نەبوە)، واتە کورد سەروکاری لەگەڵ ڕووسیا و دەوڵەتی ڕووسیا و کاربەدەستانی ڕووسیادا هەبوە و، پاشانیش دەوڵەتی ڕووسیا کە کۆمار و قەوارەی بۆ ژمارەیەکی زۆر لەو گەلانە دروست کرد و، بۆ

کورد هیچ و، خاکی کورد خرایە ناو چوارچێوەی ئەو کۆمارانە، بەبێ ئەوەی گەرانتی مافیان بکات.

واتە ڕاستەوخۆ چارەنووسی گەلی کورد لە دەستی مۆسکۆدا بووە و مۆسکۆ بەرپرسی ئەو هەموو تاوان و مەرگەساتانەیە کە بەسەر گەلی کورددا هێنراون. مۆسکۆ فەرمانی هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور و ڕاگوێزانی کوردی داوە، نەك باکۆ و ئیرەڤان و تبلیس. مۆسکۆ تاوانی گواستنەوەی کوردەکانی هەڵبەستووە. مۆسکۆ فەرمانی چۆنیەتی ڕاگوێزان و شوێنی تاراوگەی بۆ دیاری کردوون. مۆسکۆ ڕێی گەڕانەوەی نەداون. هەروایش بووە، کاتێك کوردەکان پاش مردنی ستالین گەڕانەوە، چونکە بەڵگە و بڕیارێکی مۆسکۆیان پێ نەبوو، بۆ دواوە نێردرانەوە.

١٢- کوردە ئاوارە و بێدەرەتانەکانی سۆڤێت، بەهۆی شەڕی نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە لەسەر ناگورناقەرەباغ و، لەبەر هۆی ئابووری و سیاسی، پاش تێکچوونی سۆڤێت پەنایان بۆ کۆماری ڕووسیا برد. دەیانزانی دەسەڵاتدارانی سۆڤێت و ڕووسیا هیچیان بۆ ناکەن و داوا دەکەن لە ناوچەیەکی ڕووسیادا شوێنیان بۆ دیاری بکرێ و چەشنە ئۆتۆنۆمی یا بەڕێوەبردنێکیان بدرێتێ، تا لەوێ بە ئارامی پێکەوە بژین و کاربکەن و قوتابخانە و ... ی خۆیان هەبێ و لە فەوتان و توانەوە و سووکایەتی پێکردن و ڕاکردن لەم شارەوە بۆ ئەو شار ڕزگاریان ببێ. بەڵام ئەم داخوازەشیان جێبەجێ نەکرا. داوای مافی نیشتەجێبوونیان کرد، نەیاندانێ، تا بتوانن بە پرژوبڵاوی بێ وەك مرۆڤ بژین و کاربکەن و منالی خۆیان بنێرنە قوتابخانە و نەخۆشیان بتوانێ بچێتە خەستەخانە. ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانە خانووبەرەی خۆیان فرۆشتووە و لە ڕووسیا خانووبەرەیان کڕیوە. ئەمانیش دەیان پەڵپ و بیانوویان پێ گرتوون. جگە لەوە، بە ئاشکرا پێیان گوتوون: هەر دەبێ بڕۆن و ئێرە بەجێبهێڵن.

ڕووسیا یا هەر کۆمارێکی تر ئامادە نابێ ئەو هەموو کوردە لە شوێنێك کۆبکاتەوە یا شوێنێکیان بدەنێ، دەترسن سبەینێ داوای قەوارە و کیانی خۆیان

بکەن. کەواتە باشترە هەر پرژوبلاو بن و تەنگیان پێهەڵبچنرێ، تا باشتر و ئاسانتر بتوێنەوە. ڕووسیا سەردەمێك کە قەفقاسی داگیرکرد، پەنای بۆ کوردەکان دەبرد، بەڵێنی پێ ئەدان، چونکە ئەو سەردەمە پێویستی پێیان هەبوو. بەڵام ئێستا ئەو شتانە لەبیرکراون و باس ناکرێن. لەپاڵ ئەوەدا، ڕووسیا وەك میراتگری یەکێتیی سۆڤێت، کە دەیان پەیمان و یاسای لەم بارەیەوە دەرکردووە، جێبەجێیان ناکات، بەتایبەت بەرامبەر بەو گەلانەی سۆڤێتی پێشوو کە خاوەنی کیان و قەوارە نین و، لەهەموولایەکەوە تەنگیان پێ هەڵدەچنن. ئەوانیش ناچار پەنایان بۆ ڕووسیا هێناوە.

ئەمانە ئازار و برینی بێوڵاتین.

١٣- گرنگی نامەکان بۆ کاربەدەستانی یەکێتیی سۆڤێت، لەوەدایە کە ئاماژە بە نامە و داخواز و دەستەکانی نوێنەرایەتی کورد لە سەردەمی خرۆشچۆڤ و بریژنیڤ و هەتا گەرباچۆڤ و یلتسیندا دەکەن. جگە لە ناوی دەستەکانی نوێنەرایەتی کورد، ئاماژەیش بەوە دەکەن کە جارێکیان شەشسەد ئیمزا و جارێکیشیان نۆ هەزار و پێنج کەس ئیمزایان کردووە. ئەگەر ئەمەی دواییمان لەپێش چاو بگرین، ئەو نۆهەزار و پێنج ئیمزایە، لانی کەم ئەوەندەیش بنەماڵەن؛ یاخود هەر ئیمزایەك چەند بنەماڵەی خزم یا هاوخێڵ و هۆزی پێوە بەستراوە. ئەوەندە ئیمزا کەم نییە. ئەی ئەگەر خۆپیشاندان یا مانگرتنیان کردبایە، لە دنیادا دەنگی ئەدایەوەو سۆڤێتی دەهەژاند و، ڕژێمی سۆڤێت، بەتایبەت لە سەردەمی گەرباچۆڤدا، ناچار دەبوو هەنگاوێك هەڵگرێ. لەلایەکی ترەوە، گرنگی ئەم نامە و ئیمزایانە، لەوەدایە کە نوێنەری کوردی هەموو کۆمارەکانی تێدا بووە و، ئیمزاکانیش لە دانیشتوانی کوردی هەموو کۆمارەکانی سۆڤێت کۆکراوەتەوە، واتە کوردە دەربەدەرەکان پشتیوانییان لەو دەستەی نوێنەرانەی کورد کردووە، ئەگینا ئیمزایان نەدەکرد. واتە خواستی هەر پێنج یا شەش کەسی نوێنەری کورد نەبوە. بەڵام بۆچی کاربەدەستانی سۆڤێت هەنگاوێکیان لەم بارەوە نەناوە؟ جێی پرسیارە. ئایا ئەمە ئەنجامی داخوازی ئاشتیانەی کورد بوو؟ ئایا کوردیان بە

بەڵێن و درۆ و دەلەسە فریونەدرا؟ پێم وایە کاربەدەستانی ڕژێم کەڵکیان لە نیاز و هەڵویستی پاك و ئاشتیانە و یاسایانەی کورد وەرگرت. کورد ئەگەر بە شێوەیەکی تر هەڵس‌وکەوتی کردبایە، چارەنووسیان بەشێوەیەکی تر دەبوو و هەر شتێکیان بۆ دەکرا. بۆ وێنە، مانگرتن بەرامبەر بە کریملین یا شوورای وەزیران یا هەر شوێنێکی تر لە مۆسکۆ، ڕۆژنامەوان و کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی وڵاتانی دەرەوە و بەتەواوی دنیا و کۆڕ و کۆمەڵگەی جیهانیان تێدەگەیاند، بەتایبەت لە سەردەمی گەرباچۆڤدا کە مەترسییەك نەبوو.

خاڵێکی گرنگ ئەوەیە کە ئەو نامانە لە سەردەمی گەرباچۆڤدا لەلایەن کوردەکانەوە نووسران و کۆپیەکانیشی نێردرانە پەرلەمانی سۆڤێت و لای سەرۆك کۆمارەکانی سۆڤێت و پەرلەمانەکەیان. بەڵام ئەوانیش یەکێکیان بە هانای کوردەوە نەهات و، یەکێك لەوانە مێژوویەکی بۆ خۆی دروست نەکرد تا کێشەی کورد بخاتە بەر باس و، لە چوارچێوەی مافی مرۆڤ و ئەو ئینتەرناسیۆنالیزم و مافی چارەنووس و سۆسیالیزم و.....ەدا کە لە قوتابخانە و پەروەردەدا فێری ببوون، لەسەر کوردە هاوولاتیەکانیان وەجواب بێن. ئیتر باسی حەیدەر عەلییێڤی سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانی بە ڕەچەڵەك کورد یا "نیازوڤ"ی (تورکمان باشی)ی سەرۆك کۆماری تورکمانستان کە نیوەی کوردە ناکرێ، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە سەردەمی سۆڤێت و پاش ڕووخانیدا هەڵمێکی نە تەنیا کوردانە بەڵکو مرۆڤانەیشیان لێ هەڵنەستا. یا سەرۆك کۆماری ئەرمەنستان کە سەر بە پارتی داشناك سوتون بوو، ئەو هەموو هەرا و هۆریا و درۆ و دەلەسانەی لەوەوبەری ئەم پارتە سەبارەت بە برایەتی کورد و ئەرمەن و هاوکاریکردنی یەکتریان لە خەباتدا، هەمووی بە پێچەوانە دەرچوو. خاڵێکی تر کە لەم نامانەدا خۆی دەنوێنێ، ئەوەیە کە بەرپەرچدەرەوەی ئەو نووسەرانەیە کەوا باسی بەهەشتی بەرینی کوردی سۆڤێتیان کردووە.

دەبێ وەڵامی ئەوانە و پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، پاش دیتنی ئەم هەموو بەڵگەیە چی بێ؟ ئایا ئامادەن پێداچوونەوەیەك بە بۆچوونەکانیاندا

بکەنەوە و، داوای لێبووردن لە گەلی کورد بکەن کە ئەو هەموو درۆ و دەلەسەیەیان بۆ کورد و ناکورد کردووە و خەڵکیان لەسەر سۆڤێتخوازی بە کوشت داوە؟

ئەم کارەساتەی کە بەسەر گەلی کوردی سۆڤێتیدا هاتووە، قۆناغ بە قۆناغ و یەك لەدوای یەك بووە، ئەویش لە سیستەمێکی بەناو سۆسیالیستیدا و بڕانەوەی بۆ نەبوە. لێرەدا چارەنووسی گەلێك، نەك کەسانێك، لەئارادایە. لێبوردن و پاکانەی بۆ ناکرێ. پەرلەمانی کام دەوڵەتی داگیرکەری کوردستان، وەك پەرلەمانی ئازەربایجانی سۆڤێتی بە سەرۆکایەتی هاوڕێ ئەسکەندەرۆڤ ،هێندە بێشەرم و ڕەگەزپەرست بووە کە حاشای لە بوونی کورد کردووە لە وڵاتەکەیدا؟! دەسەڵاتدارانی تورك بەو ڕەگەزپەرستیەی خۆیانەوە، کورد بە هاووڵاتی یا تورکی کێوی ناودەبەن و، دەڵێن هەن و هەموو مافێکیان هەیە. فارسیش هەروا دەڵێن، ڕەسەنترین نەتەوەی ئێران کوردن، کەچی هیچ مافێکیان پێ ڕەوا نەبینراوە. لە سۆڤێتیش، لەو کۆمارەدا کە کوردستانی سووری تێدا دامەزرا، سەرۆکی پەرلەمانەکەی بوونی کورد و کێشەکەیی حاشای لێ کرد. ئەگەر یاسا لەم وڵاتەدا هەبوایە، دەبوو نە تەنیا لەسەر کار لابرایە، بەڵکوو وەك تاوانباریش سزا درابایە. دەکرا وتەکانی ناوبراو بە ئاپارتاید و ڕاسیزم لەقەڵەم درابایە. بۆچی مۆسکۆ چاوی لەو هەڵوێستە پۆشیوە؟ پرسیارێکە و، بێ وەڵام.

١٤- ڕژێمی سۆڤێتی کە ئامادە نابێ مافە زەوتکراوەکانی گەلی کوردی سۆڤێت بگەڕێنێتەوە و کوردەکان هەست دەکەن نامۆن بەم دەسەڵاتە، پێشنیار دەکەن (دەپارێنەوە) لە ناوچەیەکی هەر کۆمارێك بێ کۆیان بکەنەوە، لەو شوێنانەدا کە چۆڵن و کەسیان تێدا نییە، تا خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بن کە قازانجی هەم بۆ دەوڵەت و هەم بۆ کوردیش هەیە. داوای بە ئیجارگرتنی زەویوزار لە دەوڵەت دەکەن، تا لەدەست کاربەدەستانی کۆمار و ناوچەکانی تری سۆڤێت، کە هیچ مافێکیان پێ ڕەوا نابینن، ڕزگاریان بێ‌و چیتر سووکایەتییان پێ نەکەن.

ڕژێمی سۆڤێتی بەمەیش ڕازی نابێ. گەرچی ئەم داخوازەی دەستەی نوێنەرایەتی کورد هەڵەیەکی مێژوویی و پاشەکشەیە، بگرە تێکدانی چارەسەری

کێشەی کوردە، چونکە کورد تەنیا لە نیشتمانەکەی خۆیدا، واتە بە گەڕانەوە بۆ جێوڕێی باووباپیرانی کە بە سەدان ساڵ لەوێدا ژیاوە، دەتوانێ بحەوێتەوە و گەرانتی مانەوەی هەبێ‌و قەوارەی خۆی دامەزرێنێتەوە. لەناو هیچ کۆمار یا وڵاتێکی ترداو سەر خاکی بێگانە، کەس یا هیچ نەتەوەیەك ناهێڵێ قەوارەیەك دامەزرێنن.

ئەم داخوازەی کوردەکان بایەخی کێشەکە و جیددی بوونی چارەسەری کەم ئەکاتەوەو، کورد تەنیا بەو بەڵگە و دیکومێنتە مێژووییانەی کە هەینی، دەتوانێ داوای گەڕانەوە یا قەوارە و مافەکانی خۆی بکات. لەلایەکەوە، ئەم جۆرە داخوازە مەبەستێکە، لەمێژە کاربەدەستانی ڕەگەزپەرستی ئازەری و ئەرمەنی و جۆرجی هەوڵی بۆ دەدەن. بۆیە کوردیان لەوێ دەرکرد، بۆ ئەوەی چیتر نەگەڕێنەوە و بتوێنەوە و پرژوبڵاو بن و، بە تێپەڕبوونی زەمان بواری گەڕانەوەیان نەبێ. لەلایەکی ترەوە، مانەوەی کورد لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی، تەنانەت ئەگەر هەمووشی لە کۆمارەکانی سۆڤیێت کۆبکرێتەوە و لە چوارچێوەی کۆمارێکدا بێ، بەپێی ئەو ئەزموونە تاڵ و ناخۆشەی کە کوردی سۆڤیێت بەتایبەت لەم بارەوە هەیانبووە، دانیشتوانی ئەو کۆمارە یا نەتەوەی دەسەڵاتدار بتەوێ و نەتەوێ بە بێگانە و بە داگیرکەر و بە میوانێکی بانگ نەکراو و بگرە بە چاوێکی سووکیشەوە تێی دەڕوانێ، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ داوای بەجێهێشتن و ڕۆیشتن لە وڵاتەکەی دەکات. ئەگەر کورد زمانی ڕەسمی ئەو کۆمارە وەربگرێ و نەتەوەو ناو و ناسناوی خۆشی بگۆڕێ، دیارە و جێگای ناکرێتەوە. بەتایبەت کورد لەناو کازاخ و ئۆزبەك و قرقیز و ڕووسدا، لە هەموو بارێکەوە دیارە. واتە لە باری ئانترۆپۆلۆژی و فسیۆلۆجی و بە دەموچاو و بەژن و باڵا و... یەوە دیارە و، بە ئاسانی لە کازاخ و ئۆزبەك و... جیا دەکرێتەوە. ئیتر باسی کەش‌وهەوای ئەوێ ناکەم کە زۆر لەگەڵ کوردستاندا جیاوازە، لەکاتێکدا کوردی ئازەربایجان و ئەرمەنستان زۆر زۆر کەم لە ئەرمەنی و ئازەری جیا دەکرێنەوە و، ئەوە تەنیا لەکاتی قسەکردندا دەردەکەوێ.

لەلایەکی ترەوە، کوردی سۆڤێت جگە لە مۆسکۆ یا دەوڵەتی ڕووسیا شوێنێکی تر نەبوە پەنای بۆ بەرێ. ئەگەر سەردەمی سۆڤێت پەنای بۆ کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی وەك UN و پەرلەمانی ئەورووپا و ... بردبایە، ئەمە بە تاوان دەژمێردرا و کفر و ئابڕووچوونی ئەم دەوڵەتە بوو کە کێشەیەکی ئەوتۆی هەیە و ئەو ڕژێمە وای بەسەر گەلی کورددا هێناوە. بێگومان مەرگیش چاوەڕێی نووسەرانی نامە یا دەستەی نوێنەرایەتی کوردی سۆڤێتی دەکرد.

١٥- لە نامەی یەکەمی کۆمەڵەی "یەکبوون"دا بۆ گەرباچۆڤی سەرۆکی دەوڵەتی سۆڤێت هاتووە: ئەمەیش ڕاستیەکی مێژوویی‌یە و حاشای لێ ناکرێ کە ستالین و بێریا بە دوورخستنەوەی کوردەکانی قەفقاس تۆڵەی خۆیان لە کورد سەندوەتەوە. پێش ئەوەی هەرێمی پشت قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە داگیر بکرێ، سەر بە دەوڵەتی پاشایەتی ئێران بوو. گوایە زۆربەی سوپای ئەو سەردەمەی ئێران کورد بوون و، پێشتریش کاتی داگیرکردنی جۆرجیا لەلایەن ئێرانەوە فەرماندەی سوپای ئێران کورد و زاوای شای ئێران بووە (مێردی خوشکی شاه عەبباس).

بەڵام تۆڵەسەندنەوە لە گەلێك بەو چەشنە و لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و ژێر سێبەری سۆسیالیزمدا، نە تەنیا بە تاوان، بەڵکوو بە جینۆسایدیش دەژمێردرێ، چونکە کورد وەك دەوڵەت جۆرجیای داگیر نەکردووە. واتە کورد دەوڵەتی نەبوە و، سوپای ئێرانیش هەمووی کورد نەبوە، بەڵکوو گەلانی قەفقاسیشی جگە لە نەتەوەکانی ئێران تێدا بووە. جگە لەوە، ئەم ڕووداوە نزیکەی دوو سەدە بەر لە تۆڵەسەندنەوەکە ڕووی داوە. ئەوە دەوڵەتی ئێران بووە کە فەرمانی داگیرکردنی جۆرجیای داوە. گەلی کوردیش وەك نەتەوە لەگەڵ گەلی جۆرجی و نەتەوەکانی تردا ژێر چەپۆکی پاشایەتی ئێران و تورکیا بووە. کاتێك ئەم تاوانانەی ستالین ڕوویان دا کە گەلی کوردی تورکیا و ئێران لەژێر دەسەڵاتی تورك و فارسدا دەیناڵاند. ئەمەیش درۆیەکی ئاشکرای پشتیوانی سۆڤێت لە گەلانی چەوساوە (بەتایبەت کورد) بووە.

پێش دوورخستنەوەی کوردەکان لەلایەن ستالینەوە و، هەروەها پێش ئەوەی هیتلەر بێتە سەر کار و شەڕی جیهانی دووهەم لەئارادا بێ (کاتی شەڕی جیهانی دووهەم، گوایە

کورد لەوانە بووە لەگەڵ ئێران و تورکیای هاوپەیمانی هیتلەردا هاوکاری بکات، بۆیە دوورخراوەتەوە) ڕژێمی بەلشەویکەکان وەك لە زۆر بەڵگە و دیکومێنتدا هەیە، هەوڵیداوە کورد نەبێتە خاوەن قەوارەی خۆی، چونکە بە بۆچوونی ئەوان کوردستان کە بوو بە دەوڵەت، دەبێتە پێگەیەکی ئیمپریالیزم و مەترسی دەخاتە سەر سۆڤێت. خوێنەر ئەگەر کتێبی (کورد لە شەڕەکانی ڕووسیادا لەگەڵ ئێران و تورکیادا)ی خوێندبێتەوە یا بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ سیاسەتی ڕووسیا لەکاتی داگیرکردنی قەفقاسدا بەرامبەر بە کورد چی بووە؟ چ نامە و شاند و بەڵێنیان بە کورد داوە، تا وئامادە بن ببنە هاوڵاتی ڕووسیا؛ چونکە کوردی قەفقاس بەنیشتمان و دانیشتوانەکەیەوە، نە تەنیا قورساییەکی زۆریان بووە، بەڵکوو دەسەڵاتیشیان لە هەرێمەکەدا هەبوە. تەنانەت حاکمی ئیرەڤانیش کورد بووە. بەڵام ئەم هاووڵاتیە کوردانەی ڕووسیای قەیسەری و پاشان سۆڤێتی، بینیویانە چییان بەسەردا هێناون. کورد بەپێچەوانەی زۆربەی گەلانی قەفقاسەوە، ئەوانەی کە ئەمڕۆ قەوارەی نەتەوەییان هەیە، پاش داگیرکردنی قەفقاس لەلایەن ڕووسیاوە دژی ئەم دەوڵەتە ڕانەپەریوە داوای جیابوونەوە لە ڕووسیا، یا داوای گەڕانەوە بو باوەشی ئێران یا تورکیا بکات، یان ڕێکخراویکی دینی پێك بهێنێ، وەك حیزبی موساواتی ئازەربایجان یا داشناکی ئەرمەنی یا منیشەویکی جۆرجی، تا دژی سەقامگیربونی دەسەڵاتی سۆڤێتی بێ لە قەفقاس.

* بۆ سکرتێری گشتی کومیتەی ناوەندی پارتی کومونیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت و سەروکی باڵای شوورای یەکێتی‌ی سوڤێت (پەرلەمان)

هاوڕێ گەرباچوڤ. م. س.

لەلایەن نوینەرانی گەلی کوردەوە

داواکاری

بەڕێز میخائیل سیرگەیڤیچ

گەلی ئێمە گەلێکی بچووك نییە، لەدنیادا زیاتر لە چل ملیۆن کورد هەیە. بەپێ بەراوردو بە پشتبەستن بە سەرچاوەکانی ئیمپڕاتۆریی ڕووسیا تا شۆڕشی ئوکتوبر،

ژمارەی دانیشتوانی کورد لە یەکێتیی سۆڤێت دەبێ ئێستا لە پێنجسەد هەزار (نیو ملیۆن) کەس زیاتر بێ. بەڵام بەپێی سەرژمێری دوایی دانیشتوانی کوردی سۆڤێت نزیکەی سەدو پەنجاودوو هەزار کەسە. شۆڕشی ئوکتوبر بۆ ئەوە ڕووی دا کە شەرەف و نامووس و ماف و ئازادیی هەمووکەسێك مسۆگەر بکاتو بپارێزێ. دەبوو پارتی کومونیست ئاگای لە هەمووکەسێك و هەر گەلێك بێ و بزانێ چۆن دەژین و کەموکوڕیەکانیان چییە و چۆن و چ یارمەتییەك بدرێن. بەڵام سەردەمی دەسەڵاتپەرستیو زوڵم و زۆری ستالینی و پاشانیش سەردەمی کەساسی و وەستان (سەردەمی بریژنیڤ، هەورامی) زیانێکی قەرەبوونەکراویان لە کومەڵگەی ئێمە داو بناغەی داب و نەریت و ڕەگ و ڕیشەی ناسنامەی نەتەوەیی و کەلەپووری ئێمەیان هەڵتەکاند. ستالین بیرۆکەو ئامانجی ئوکتوبری ئاوەژوو کردەوەو، ستەمو زیان هەموو بوارەکانی ژیانی گرتەوە.

ئەم زوڵم و زۆرو زیانە، گەلی کوردی هەژار و بێدەرەتان و لێقەوماوی ئێمەشی گرتەوە. ستالین لەڕێی بەزۆر ڕاگواستنی گەلانی بچووك (کەمەنەتەوە)ەوە، گەلانی گەورەی ناچارکرد بێدەنگ بن.

دەڵێن یوهان گرۆزنی و پیتەری یەکەم، بێڕەحم بوون. ئەوانە بەرامبەر بە دوژمن بێڕەحم بوونو، گەلانیان بەیەکجاری لەناو نەبردووە. هیچ کاتێك ئەوانە گەلانی تریان ناچار نەرکردووە بەزۆر لەناو گەلانی تردا بتوێنرێنەوە. ئەوانە باوەڕیان بە خواو یاساکانی هەبوەو لێی ترساون و بەبێ تاوان سزا و زوڵم و زۆریان نەکردووە. مێژوو بەزۆر ڕاگواستنو تواندنەوەی ئەوتۆی گەلانی بچووك و بێدەرەتانی بەخۆوە نەبینیوە.

ئێمە دەزانین و لەبیرمانە کە نەوە گەورەکان چاوی بینینی ستالینیان نەبوە، هەمیشە گوتوویانە خوا هەروا ستالین ناهێڵێتەوە. کاتێك دێ خوای گەورە تەواوی بنەماڵەکەی لە ڕیزی ناوەکانی مرۆڤایەتی لا دەبات. هەروایش بوو، بەڵام بە دواکەوتنێکی زۆرەوە.

ئەم ئەرکە گەورەیە کەوتە سەرشانی خرۆشچۆڤی زاناو ئازا، بەڵام نەیانهێشت ئەم مرۆڤە تاسەر و بەتەواوی ستالین لەقاو بدات. دیارە ئێوەو هاوڕێیانتان لە

بیرۆی سیاسی حیزب ڕێبازێکی ڕاستتان گرتوەتە بەرو، شۆڕشێکی ئاشتیانەو بێخوێنڕشتننتان دەست پێکردووە کە تاقە شۆڕشێکی لەم شێوەیەی دنیایە؛ داواتان لێدەکەین پرۆسەی پیریستۆیکا خێراتر بکەن، ئەگەنا لەوانەیە دوژمن کەڵك وەربگرێ و نەهێڵێ بەڕێوە بچێ.

دەشێ لەوپەڕی دڵخۆشیو ڕەزامەندییەوە، باسی قووڵایی ئەو پرۆسە دیموکراتییەی وڵاتی ئێمە بکرێ. ئەم پرۆسەیە ڕەنگدانەوەیەکی باشی لە تەواوی بوارەکانی ژیانی ڕۆژانەی وڵاتدا هەیە، بەتایبەت ئەو لایەنەی کە پەیوەندیی بە گەل و نەتەوەکانەوە هەیە.

میخائیل سێرگەیێڤیچی بەڕێز، ئێوە لە ئۆکرانیا گوتتان: ((مسۆگەرکردنی مافی نەتەوەکان بە شێوەی جۆراوجۆرو، تا دروستکردنی ناوچەو هەرێم یا ئەنجومەنی نەتەوەیی دێتە دی)). ساڵی ١٩٥٦ کوردەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و کوردانی بەزۆر ڕاگوێزراوی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست، زۆر نامەو داواکارییان سەبارەت بە هەلس وکەوتی ناعادیلانەو چەوسانەوەی کورد نووسیوەو داویانە بە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کومونیستی یەکێتیی سۆڤیێت و دەڵەتیِ‌مسۆڤیێت و، داوای ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەیان کردووە؛ بەڵام تائێستا وەڵامی پێویستیان نەدراوەتەوە.

یەکێك لەو نامانە کە بۆ بریژنێڤ نووسراوە، شانزە ئیمزای نوێنەرانی کوردی حەوت کۆماری یەکێتیی سۆڤیێت و، دووەم نامەش شەشسەد ئیمزای ئێوەیەو، داوای گەڕانەوە یا دروستکردنەوەی سەرلەنوێی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردی لە چوارچێوەی ئەم وڵاتەدا دەکەن. میخائیل سێرگەیێڤیچی بە ڕێز، گەلی ئێمە، یەکێکە لە گەلە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (ڕۆژهەڵاتی عەرەبی). ئێوە باش شارەزای مێژووی گەلەکەمانن، لەبەر ئەوە هیچتان لەو بارەیەوە بۆ نانووسین. ئێمە زۆر چاوەڕوان بووین و ئێوەمان سەرقاڵ نەکردو کاتی گرانبەهای ئێوەمان بۆ کاروباری دەوڵەت نەگرت. بەڵام ئێستاو لەم قۆناغەدا کە ئێوە خەریکی پیریسترۆکای مەزنن، دەمانەوێ ئەوە ئێمەش بگرێتەوە. ئێمە داوامان ئەوەیە

خۆتان تەماشای داواکاریەکانمان بکەن و، داواکاریەکانی ئێمەی کوردی یەکێك لە گەلانی یەکێتیی سۆڤێت بەجێ بهێنن.

پیروسترۆیکا، دوای بریارە مێژووییەکانی کۆنگرەی ٢٧و کۆنفرانسی حیزبمان، سەرلەبەری بوارەکانی ژیانی ولاتەکەمانی گرتۆتەوە. وتەکانی لینین خەریکە جێبەجێ دەبن و، خەبات دەکرێ دژ بە بیرۆکراتی و بەرتیلخۆری و فریودان و درۆو دەلەسەو، نزیکە دیموکراسی ڕاستەقینەو پاکی‌و کراوەیی سەقامگیر بن. بەرهەمی کار ڕوو لە زیادبوونەو کەڵك لە دەسکەوتەکانی زانست و تەکنیك وەردەگرێ بۆ بەرهەمهێنانی زیاترو، ئابووری بەرەو بوژانەوەو کامڵبوون دەچێ. پیریسترۆیکا، لە زۆر ڕووەوە کاری کردوەتە سەر ژیانی گەلی ئێمەش'

جگە لەوە، لە ڕوانگەی بۆچوونەکانی لینینەوە بڕوانینە سیاسەتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی و تایبەتمەندی و کارەساتە مێژووییەکانی ژیانی گەلی کورد، بۆمان دەردەکەوێ کە کاری ناڕەواو زۆرداری بەرامبەر بە کورد کراون و، مافە ڕەواکانی کە لە یاسای بنچینەییدا سەلمێنراون، پێشێل کراون. لەکاتێکدا کورد هەر لە کۆنەوە نزیك بە ناوەندەکانی پێشکەوتن و شارستانێتی جێهان ژیاون، کەچی لەو دەسکەوتانە بێبەش کراوەو، دووخراوەتەوە. گەلی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لە ڕووی کولتووری و کۆمەلأیەتی و ئابووری و پێشکەوتنی سیاسییەوە، لە زۆربەی گەلانی تری ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست بەجێما.

کوردستان، لەناو دەوڵەتە گەورەو بەهێزەکانی ڕۆژئاوای ئاسیادا بووەو کەوتوەتە بەر چەوسانەوەی دەوڵەتانی تورکیاو ئێران و عیراق و سووریا. بۆیە کورد ئەمڕۆ دەست بەرداری خەباتی پیرۆزی خۆی نەبووە دژ بەو دەوڵەتە کۆنەپەرستانە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی و ئازادی یا لانی کەم کۆماری ئۆتۆنۆمی. کوردی عیراق، لە سەرەتای سەردەمی بیستەمەوە تا یەکەم جەنگی جیهانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دەستی دایە خەبات دژ بە چەوسێنەرانی عیراقی‌و ئینگلیز. ساڵی ١٩٢٠، شێخ مەحموود بە نامە داوای یارمەتیی لە "لینین"ی یەکەم ڕزگارکەری گەلانی چەوساوەی ڕووسیای لە دەست و زوڵم و زۆری قەیسەری کرد. ١٩١٤-١٩٢٥ شێخ سەعید ڕێبەرایەتی خەباتی گەلی

کوردی کرد بۆ سەربەخۆیی و ڕزگاری لە دەست تورکیا. خەباتی پیرۆزی گەلی کورد بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی بۆ ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی کۆماری عیراقد، سیانزە ساڵ درێژەی کێشا. کوردی ئێرانیش لە نێوان ١٩٤١-١٩٤٦ بە سەرکردایەتی قازی محەمەد، دژی ڕژێمی پاشایەتی‌ی ئێران هەستا بۆ سەربەخۆیی و سەرەتای ١٩٤٦ تا سەرەتای ١٩٤٧ دەولەتی سەربەخۆی خۆی هەبوو. خەباتی ئەم بەشەی کوردستان بەڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، تائێستاش بەردەوامەو پەرە دەسێنێ. بە وتەی مێژوونووسی کورد بەڕێز خالید، خەباتی پیرۆزی ئەم گەلە هێشتا بۆ گەیشتن بە قەوارەیەکی کوردی نزیکەی پێنج ملیۆن قوربانی هەبوە. خەباتی درێژخایەنی چەکدارانەی گەلەکەمان بۆ سەربەخۆیی هێشتا بە ئاکامی خۆی نەگەیشتووە.

ئاشکرایە دەوڵەتی ئێران شەڕێکی درێژی دژ بە گەلی زۆرلێکراوی کورد ڕاگەیاندو سەپاند. لێتان ئاشکرایە کە ئاڵۆزی ئابووری و هەژاری و نەخۆشی و گرانی کوردستانی گرتوەتەوەو، کوردستان سەرەتاترین مافی دیموکراسی و ئازادیی نییە. بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو گیروگرفت و دژواریانە، خەباتی قارەمانانەی گەلەکەمان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی، هەر بەردەوامە.

کوردی سۆفیەت و تەواوی مرۆڤایەتی لەلای ئاشکرایە کە پارتەکەمان پارتی کۆمونیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت و دەوڵەتی سۆڤێتی، لەگەڵ گەلانی ئەم وڵاتەدا، پەرۆشی بەجێهێنانی ئەرکی پیرۆزی ئینتەرناسیۆنالیزمی و، هەر لەیەکەم ڕۆژی شۆرشی ئۆکتۆبەرەوە هەموو یارمەتی و پشتیوانییەکی پێشکەش بە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی ئەم وڵاتە کردووە.

لە بارودۆخێکدا کە کێشەی کورد هێشتا چارەسەرێکی ئاشتیانەی لە ئاستی نێونەتەوەییدا بە خۆیەوە نەدیوە، ئێمەی کوردی سۆڤێت دەمانەوێ سەبارەت بە چارەسەری کێشەی نەتەوەیی کوردی دانیشتووی سۆڤێت هەڵوێستی خۆمان دەربڕین. تائێستا نزیکەی پێنجسەد هەزار کورد لە یەکێتی‌ی سۆڤێت دەژین و بەزمانی خۆیان دەدوێن و خاوەنی ژیان و کولتووری تایبەتی خۆیانن[١٦٢].

---

[١٦٢] بڕوانە: ١- کتێبی نیکیتین، ٢- دانتسیگ، تورکیا، لە بڵاوکراوەی سوپایی-سیاسی، مۆسکۆ، ٣-مەحموودۆڤ پ. خ، کوردەکان، (بە زمانی ئەرمەنی)، ئێریڤان، ١٩٥١.

سالأنی یەکەمی دەسەلأتداریتی یەکێتی‌ی سۆڤێت، ئەنجومەنی کۆمیسارەکانی گەل (ئەنجومەنی وەزیران)ی ئازەربایجان، بە فەرمانی لینین، گەلأڵەیەکی ئاراستەی کۆمیتەی ناوەندی جێبەجێکەر (تسیك)ی ئەم کۆمارە کرد، سەبارەت بە پێکهێنانی کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی کوردستان، کە ناوەندەکەی (لاچین)و لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا بێ. ساڵی ١٩٢٢ چەند جارێك لە کۆبوونەوەی تسیکی ئازەربایجاندا لەم گەلأڵەیە کۆڵرایەوە. ئەم مەسەلەیە لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ١٩٢٣/٧/٧دا بابەتی لێکۆڵینەوە بووەو، سەرەنجام بریاری دامەزراندنی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان، بە ناوەندی (لاچین)ەوە دراوەو، "گوسەی حاجییێڤ (گاجییێڤ)یش بە سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمیسارەکان (وەزیران)ی کۆمارەکە دەست نیشان کراوە.

ئەم کۆمارە ناوچەکانی لاچین و کەڵبەجارو قوباتلی گرتوەتەوە کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردە [١٦٣] . لینینی مەزن، بە تایبەت هەڵوێستێکی نیشتمانیی لەم بارەیەوە نیشان داوەو، هەر ئەویش ساڵی ١٩٢١ ئاگای لە برسێتی کوردستان بووەو برووسکەی بۆ سەرۆك وەزیرانی ئازەربایجان "نەریمانۆڤ ن. ن. ناردووە کە ئەمەی تێدا هاتووە: ((داوا لە بانکی دەوڵەتی ئازەربایجان دەکەم، کە دیسان کراوەتەوە، پاڵپشتێکی قایمی بەڕیوەبردنی سیاسەتی نوێی ئابووری بێ، وا کە کرێکاران و جووتیارانی کۆمارەکانی سۆفیەت بۆ نیشاندانی ئالأی سووری ئینتەرناسیۆنالیزمی زەحمەتکێشان، چل ملیون ڕۆبل بۆ برسیەکانی دەوروبەری ڤۆلگاو کوردستان تەرخان بکەن)).

کۆمیساریەکانی کۆماری فیدراڵی سۆشیالیستی ڕووسیا لینین

(نووسراوەکانی لینین و. ی. چ ٤، ب ٣، ل ١٠٠).

---

[١٦٣] بڕوانە: ئەرشیڤی دەوڵەتی ئازەربایجان سەر بە کۆمیتەی ناوەندی کۆمونیستی ئازەربایجان، دۆکۆمێنتەکانی بەڕێوەبەرێتی کاروباری زەوی سەر بە کۆمیسارپای زەویداری ئازەربایجانی سۆڤێت؛ دۆسیەی ژمارە ٧، ل٢٥، ١٩٢٣" بۆکشپان، کوردەکانی ئازەربایجان، باکۆ، ١٩٣٢.

چاوەڕوانی و پەرۆشیی ڕێبەری گەلانی ئازادکراو، کارێکی کرد لەکاتی پێویستدا یارمەتی کوردە برسیەکان دراو، قوتابخانە بۆ منالآنیان کرایەوەو، دەست بە لە چاپدانی کتێب کراو، ڕۆژنامەی "کوردستانی سۆڤێتی" بە زمانی کوردی لە شاری (لاچین) دەرچوو وبلآوکرایەوەو، پەیمانگەی پەروەردەیی تەکنیکی کوردی و ناوەندەکانی تری کولتووری لە شاری (شووشە)کرانەوەو، بەرنامەی ڕادیۆیی بەکوردی پەخش کراو، دامودەزگاکانی خۆجێیەتی و خوبەڕێوەبردنی کوردی لە ناوچە کوردنشینەکاندا چالاکانە کاریان کردو، بایەخێکی زۆر بە پێگەیاندنی کادیری کوردی درا.

دوای پێکهێنانی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ئازەربایجان، زۆری پێ نەچوو لە ناوچە کوردنشینەکانی ئەرمینیاو جۆرجیاو تورکمەنستانیش دەست درایە کردنەوەی قوتابخانەو ناوەندەکانی تری کولتووری و، قوتابی کورد نێردرایە زانکۆو پەیمانگە پەروەردەییەکانی شارەکانی وەك مۆسکۆ و لینیگراد، تا پسپۆڕ و شارەزای کورد بۆ ئەم کۆمارە ساوایە پێ بگەیەنرێ.

بەم چەشنە هەواڵی دروستکردنی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا بە فەرمانی لینین و پارمەتیدانی بەرپرسەکانی کوردستان، لە ناو هەموو کوردانی سۆڤێت و کوردی دەرەوەشدا دەنگیان دایەوەو، ئەم هەنگاوە بە خەمخۆری و چاودێرییەکی گەورەی پارتەکەی لینین و دەولەتی سۆڤێت بۆ گەلی زۆرلێکراوی کورد لە قەڵەم درا. دروستبوونی ئەو کۆمارە، هاندەرێکی بەرچاوی کوردانی تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا بوو بۆ خەباتی ڕزگاریی نیشتمانییان دژ بە داگیرکەرانی کوردستان. گەلی کورد لەو پارچەیەی ولآتەکەیدا، بە سیاسەتی ژیرانەی لینین بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی، بە بەختەوەری و ژیانێکی ئاسوودە شاد بوو.

ئەوی ڕاستی بێ، نێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٣٦ قۆناغێکی تایبەت و مەزنی پێشکەوتنی گەلی ئێمە بوو، کە هەستی تێدا بە ئازادی و یەکسانی و برایەتی و بەختیاری کرد. بەلآم لە ساڵی ١٩٣٧بەدواوە، لەبەر ئەو هۆیانە کە هێشتا ئاشکراو ڕوون نین، هەڵوێست و پەیوەندیی دەوڵەتی سۆڤێت بەرامبەر بەکوردی

موسڵمان گۆڕاو کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکەی لە ناوبراو، کوردی دانیشتووی قەفقاس گوێزرایەوە بۆ کۆمارەکانی پشت قەفقاس و کازاخستان.

لەبەر ئەوە کاتی خۆی هێزە عەسکەریەکانی شای ئێران کە زۆربەیان لە کورد پێك هاتبوون و سەرکردەکەیان کوردو، مێردی خوشکی شا عەباس بوو، جۆرجیا (گورجستان)ی داگیر کردو، چووە ناو شاری (تبلیس)، ستالین و بیریا لە تۆڵەی ئەوەدا ئەو کۆمارەیان نەهێشت و کوردیان دوورخستەوە. ئەمە هۆیەکی ئەو نەهامەتیە بوو.

لە تاراوگە، پاسەوانیان بەسەرەوە دانراو، لەبەر نەزانینی زمانی ئەو گەلانی کۆمارەکانی ئاسیا، منداڵەکانیان لە قوتابخانە بێبەش کران. تەنیا پاش مردنی ستالین لە ١٩٥٧دا، پاسەوانیان لەسەر هەڵگیراو منداڵەکانیان چوونە قوتابخانەو یارمەتی پێویست دراو، دووبارە بەختەوەری و مافی ژیانی یەکسانی پێڕەوا بینراو، ڕێگەی دا بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی خۆی. بەڵام لەبەر نەبوونی خانووبەرە، هەر نزیکەی ١٠%ی ئەو کوردە دوورخراوانە گەڕانەوە.

ئێستا کوردی خاوەن بڕوانامەی خوێندنی بەرز زۆر کەمەو، ئەوانەش کە هەن بە پێی خزمەت و زانستیان بواریان نادرێ کار بکەن و، تەنانەت بە شێوەیەکی بێمانا تەنگیان پێ هەڵئەچنرێ و ڕێیان لێ ئەگیرێ. هەر لەبەر ئەوەیە کە زاناو هونەرمەندو، ڕۆشنبیری گەورەو دادوەرو سکرتێری کۆمیتەکانی هەرێمی حزب و بەڕێوەبەرو سەرۆکی پۆلیس و ... یان نییە لەناو دەزگاکانی حکوومەت و حزبدا. ئایا ئەمە بەرابەری و یەکسانی و برایەتی گەلانە؟ دەمانەوێ بە زمانی خۆمان لە ژیانی ڕۆژانەماندا بدوێین و ئەدەبیاتی کوردی بخوێنین و گۆرانی بچڕین و بە زمانی کوردی بڵێین: دیموکراسی و گلاسنۆست و پیریسترۆیکا.

گەلی (لاك)ی دانیشتوانی داغستان، نموونەیەکی بچووکە؛ ئەو گەلە سەد دکتۆری زانستی زیاتری هەیەو، نوێنەرانیان لە هەموو شوێنێ و بگرە لە دەزگاکانی ئەنجومەنی وەزیرانیشدا کار دەکەن. بەڵام ئێمەی کورد، وەك بڵێی بە نەتەوەیەکی گومانلێکراو دانراوین، بۆچی؟ لامان روون نییە!

بەڕێز میخائیل سێرگەییڤیچ، بە ڕەچاوکردنی بارودۆخی کورد لە وڵاتەکەمان و پرنسیپەکانی سیاسەتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی، زۆر جار داوامان لە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونیستی یەکێتیی سۆڤێت و ئەنجومەنی وەزیران کردووە، سەرلەنوێ کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردیمان بۆ دروست بکرێتەوە. ئێمە بە جێبەجێکردنی ئەوە دەتوانین تەواوی شوێنەواری نابەرابەری گەلەکەمان لەگەڵ بنەماڵەی گەورەی گەلانی وڵاتدا، واتە یەکێتیی سۆڤیەت، نەهێڵین.

ئێمە هەموومان ئاگادارین کە لەدوای ١٩٣٧وە تائێستا گۆرانکارییەکی بەرچاو لە پێکهێاتەی گەلانی وڵاتەکەماندا رووی داوەو، چەندین کۆماری ئۆتۆنۆمی و هەرێمی و ناوچەیی لە کۆماری سۆڤیەتی فیدراڵی سۆشیالیستی رووسیاو کۆمارە یەکگرتووەکانی تری وڵاتدا هەن. ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمیانە لە شوێنی وا دروست کراون کە ژمارەی کەمەنەتەوەکانیان لە ٣٠-٤٠ هەزار کەس زیاترینە. بۆیە ئێمە هەست بە پێشێلکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی گەلەکەمان دەکەین. "محەمەد بابایێڤ"ی کوڕی گەلەکەمان ساڵی ١٩٥٦ داوای گەڕانەوەی گەلەکەمانی بۆ ئازەربایجانی سۆڤێت و دروستکردنەوەی کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکەیی لە چوارچێوەی ئەو وڵاتەدا کردووە. ئەوە بوو بانگ کرایە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمینیا و لەلایەن "نسیننیکۆڤ"ی فەرمانبەری کۆمیتەی ناوەندی پارتەوە وەڵامی درایەوەو، ناوبراو پێی گوتبوو: ڕێبەرایەتی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونیستی پارتی کۆمونستی یەکێتیی سۆفیەت و دەوڵەتی سۆڤێت و خودی هاوڕێ خرۆشچۆڤ ن. س. فەرمانیان داوە کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردی سەرلەنوێ لە ئازەربایجان دروست بکرێتەوە. ئەوکاتە محەمەد بابایێڤ و هاوڕێ سیننیکۆڤ لەلایەن هاوڕێ "موستاییڤ ی.د."ی سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونستی ئازەربایجانەوە، پێشوازییان لێ کرا. بەڵام سەرەنجام هیچ شتێکی لێ سەوز نەبوو.

ساڵی ١٩٦١ و مانگی یەکی ١٩٦٢ یەك یا دوو کەسی کورد لە هەموو کۆمارێکەوە لەگەڵ هاوڕێ بابایێڤدا بۆ چاوپێکەوتنی بەرپرسان چوونە کۆمیتەی

ناوەندی پارتی کۆمونیستی یەکێتیی سۆڤێت. ئەم دەستەی نوێنەرایەتیەی کورد بریتی بوو لە: عەلییێڤ تەیموورو سایخۆڤ ئوسەین، حوسەینی سادیقۆڤ"ی جووتە پاڵێورای زانست و ڕۆژنامەوان ئوسەین تەبییێڤ لە کۆماری کازاخستان و، مافناس میگەیۆڤ سانوی و ئەندازیار محەمەد عەبدوڵلاییێڤ لە کۆماری قرقیزستان و، مامۆستایان حەسەنۆڤ مەمەد و حەمۆسەینۆڤ تەیموور لە کۆماری ئازەربایجان و، مافناس کولوس لە کۆماری جۆرجیا. لە مۆسکۆوە پرۆفیسۆر باکاییێڤ چ. ح و لە لینینگرادەوە پرۆفیسۆر کوردۆییێڤ ك. خ. چووە پاڵیان. نۆ کەس لەوانە لە کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونیستی یەکێتیی سۆڤیەت وەرگیران و هاوڕێیان پانەماریۆڤ وبادیرو شومانیسکی پێشوازییان لێکردن. ئەوانە پێیان وتن: ئێستا لە عیراق شەڕە. ئێمە ناتوانین ئۆتۆنۆمیتان بۆ دابمەزرێنین، چونکە دەڵێن ئەمە دەستی یەکێتیی سۆڤێتی تێدایە. ئامۆژگارییان کردین کە جارێ بارودۆخ لە هەموو شوێنێ بخوڵقێنین بۆ دروستکردنی ئۆتۆنۆمی کولتووری و، بەڵێنیان دا دوای شەڕ بچینەوە سەر چارەسەری کێشەکە. بۆ جاری سێیەم، دەستەیەکی شەش کەسی لەگەڵ بابییێڤدا کە بریتی بوون لە: کاندیدی زانستی مێژوویی چەتۆییێڤ خ. م. بەرپرسی بەشی کوردناسی سەر بە کۆڕی زانیاری ئەرمەنستانی سۆڤێتی و، نووسەر مەمەدۆڤ ئا. ئا. کوردئۆغلی ك.و، ڕۆژنامەوان ئارامی چاچانیو ڕەحیمی قازی کوردی شۆڕشگێڕی ئێران و گێرام سانۆی مافناس لە قیرقیزستان. نوێنەرانی ئێمە لە چوار کۆمارەوە هاتن بۆ شاری باکۆ و، هاوڕێ

ئەخوندۆڤ لە بارەگای سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەوکاتەی ئازەربایجان پێشوازیی لێ کردن. هاوڕێ "ئەسکەندەرۆڤ"ی سەرۆکی دەستەی باڵای شوورا (پەرلەمان)ی ئازەربایجانی سۆڤێت پێشوازیی لێکردین و، ناوبراو حاشای لە بوونی کورد-بەگشتی- دەکرد؛ گوتی چیتر دوای ئەم کێشەیە مەکەون و باسی مەکەن. ئێمەش تێمانگەیاند کە ناتوانن دەنگی هەژدە ملیۆن کەسی گەلی کورد کپ بکەن. ئێمە هەر ناچار بووین چاوەڕوان بین. بەڵام بەداخەوە لێکۆڵینەوەو تاووتوێی کێشەکەمان دواخران و، بەبێ هیچ هۆو

بەهانەیەك فەرامۆش کرا. ئێستا زمانی نەتەوەییمان لە یەکێتیی سۆڤییەت لە مەترسی لەناوچووندایە. لە راستیدا پرۆسەی لەناوچوونی ئەم هەموو شتەی درێژایی هەزاران ساڵی مێژوومان کە کاری بۆ کراوە، بەڕێوەیە.

پارتی هەمیشە تەماشا دەکات و، هەڵەکانی راست دەکاتەوە. بە بۆچوونی ئێمە هەڵەی زۆر سەبارەت بە کێشەکەمان کراوە. تەواوی گەلانی بەختەوەری و سەربەخۆیی‌یان هەیە. ئێمەش دەمانەوێ وەك ئەوان بین و کۆمارێکی ئۆتۆنۆمیمان هەبێ. پێویستە ئەوەش بگوترێ، لەڕاستیشدا هەر وایە، جگە لە گەلی ئێمە، سەرجەمی گەلانی یەکێتیی سۆڤێت گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرزی کولتووری و خوێندەواری و ئابوورییەکی بەهێز. پێمان وایە هەر نەتەوەیەکی بچووکی یەکێتیی سۆڤێت، ئێستا لە هەر گەلێکی تری ولاّتانی سەرمایەداری ئەورووپا زیاتر پێشکەوتووترو خویندەوارترو دەوڵەمەندترو ئازادترو سەربەخۆترە.

میخائیل سێرگەییڤیچی ئازیز، ئێمە دوای کۆنگرەکانی ۲۰۰–۲۲۰ حیزبی کۆمونیستمان، بە ڕەچاوکردنی بریاری کۆنگرە ناوبراوەکان کە فەرمانی بەدامودەزگاکانی حیزب و دەوڵەت داوە. هەڵەکانی هەموو بارێك و تایبەت بە هەر کێشەیەك لە ماوەیەکی کورتدا ڕاست بکەنەوە. بۆیە ئێمە ساڵانی ۱۹٥٦، ۱۹٦۲، ۱۹٦٤، ۱۹۷۹، ۱۹۸۲ داواکاری و نامەو نوێنەرمان ناردوەتە لای کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونیستی یەکێتیی سۆفییەت و دەوڵەتی سۆڤێت، تا کۆماری ئۆتۆنۆمی بۆ ئێمەش دامەزرێننەوە.

میخائیل سێرگەییڤیچی ئازیز، هەموو گەلانی یەکێتیی سۆفیەت چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیان دەکرد کە کوڕێکی نەترس و ئازای گەلی ڕووس دەربکەوێ و کۆتایی بە زوڵم و زۆرو میتۆدە ناڕاست و پاکانە بۆ نەکراوەکانی بەڕێوەبردنی سۆشیالیزم لە ولاّتەکەماندا بهێنێ. ئێستا ئێوە ئەو قارەمانێتیەتان نیشان داو شۆڕشی بێخوێنتان ڕاگەیاند، پیریسترۆیکا و گلاسنۆست، کە شۆڕشی کۆمەڵگەکەمان لە بەرتیلخۆری و زۆرداری و دیموکراسیی دروزنانەو مفتەخۆری و بێیاسایی ... ڕزگار دەکات و ئابووری دەوڵەت بەهێز دەکاتەوەو پاکی و دیموکراسیی

ڕاستەقینەو خوشگوزەرانی بۆ گەلان بە دیاری دەهێنێ. ناوی ئێوە لە مێژووی ڕووسیادا، لەگەڵ ناوە گەورەکانی تری کوڕانی ئەم گەلەدا، بۆ هەتاهەتایە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەمێنێتەوە.

میخائیل سێرگەیێڤیچی ئازیز، ئاشکرایە پیریسترۆیکا سەرلەنوێ تەواوی ئەو کێشانەو هەڵەکان دەخاتەوە بەر لێکۆلینەوەو توێژینەوە. ئیمەش ئاواتمان ئەوەیە پیرویسترۆیکا کێشەی ئێمەی کوردیش چارەسەر بکات. کێشەی ئێمەی کوردیش چارەسەر بکات. کێشەی نەتەوایەتی لە یەکێتی‌ی سۆڤێت بۆ گەلە گەورەکانیش چارەسەر نەکراوە. بەلاّم بۆ گەلانی پچووکی وەك گەلی کورد جاریّ فەرامۆش کراوە. بگرە بارودۆخی کێشەی گەلی کورد زۆر خراپەو ئالۆزترە لە سەردەمی پێش شۆڕش. بەشێکی ئەو گەلە پچووکانە تواونەوەو، بەشێکی تریان بە مەبەست ناچار کراون خۆیان بە نەتەوەی تر لەقەڵەم بدەن تا پلەو پایەو کار وەربگرن یا خۆیان لە زوڵم و سەرکوتکردن بپارێزن. ئێمە پێمان وایە بە ناپاکی بەرامبەرمان جووڵاونەتەوە. ئێمە بەم نامەیە میخائیل سێرگەیێڤیچی ئازیز داواتان لێ دەکەین و دەپاڕێینەوە لێتان کە کێشەکەمان لەکۆڵ خۆتان بکەنەوە.

داواکاری گەورەمان لە ئێوە ئەوەیە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمیمان لە چوارچێوەی کۆماری ئازەربایجاندا بۆ پێك بێنن. ئیمە ڕێزمان بۆ ئازەریەکان هەیە. گەلەکانمان سەدان ساڵە بە برایەتی لەگەڵ یەکدا ژیاون. ئێمە خزمین و ئەم سەردەمە دژی دروستکردنی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەو هەرێمی گەرم و کۆمارەکانی تردا نین. ژمارەیەکی زۆری بنەماڵەی کورد هەمیشە لە کۆمارێکەوە بۆ کۆمارێکی تر کۆچیان کردووەو، هیچ قازانجێکیان نە بۆ خۆیان و نە بۆ دەوڵەتیش نەبوە. ئیمە دڵنیاتان دەکەینەوە کە هیچ کەسمان بێلایەن نەبین. ئیمە هەموومان وەك مرۆڤ ئامادەین بۆ بیناکردنی سۆشیالیزم و جێبەجێکردنی پرۆگرامی حیزب و بەدیهێنانی پێروسترویکا.

بەباوەڕی ئێمە، کۆماری ئۆتۆنۆمی لە ڕووی ئابوورییەوە بەرهەم و قازانجی بۆ دەوڵەت دەبێ. واتە ئیمە دەتوانین خەریکی کشتوکاڵ بین لەسەر زەوی و بەرهەمی

زیاتری کشتوکاڵ و ئاژاڵداری داپین بکەین. بەرهەم و دەسکەوتی گەلی کورد لەم بارەیەوە بۆ پتەوکردنی ژێرخانی کۆمۆنیزم، لە ڕووی ماددی و تەکنیکییەوە، زیاتر بەرچاو دەبیّ‌و، کۆماری ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان ئەم ڕاستیانە دەخەنە ڕوو. کۆماری ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی سۆڤێت دەبێتە پشتیوانێك بۆ کوردانی دەرەوەو زمان و کولتوور دەبووژێنێتەوەو ئاسەواری توانەوە ناهێڵێ.

میخائیل سێرگەییڤیچی ئازیز، ئێمە لەکاتی ئامادەکردنی بەرنامەی بەڕێوەبردنی ئاڵوگۆڕێکی گەورەدا سەبارەت بە یارمەتیدانی گەلانی بچووك و پێکهێنانی دەوڵەتێکی یاسایی، ئەم داواکاریەتان ئاڕاستە دەکەین. گەلانێك کە بوونەتە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان، واتە لە کۆماری سەربەخۆ یا ئۆتۆنۆمی باشتریان هەیە، بەلاّم ئێمە فەرامۆش کراین. ئێستاش داواکاری و پاڕانەوەی ئێمە لە ئێوە ئەوەیە کە دڵی خوش بکەن بەوەی کە بەڵێنی دروستکردنی کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی بدەنیّ. بەوچەشنە ناوی ئێوە لەگەڵ پیریسترۆیکا وگلاسنۆستدا دوو ئەوەندە زیاتر دەچێتە ناو مێژووی جیهان و گەلی کورد. گەلی کورد بەو پێیە سەدان ساڵ سوپاسی ئێوە دەکات و ڕێزتان لیّ دەنیّ، هەروەهایش لە حیزبەکەمان، واتە پارتی کۆمونیستی یەکێتیی سۆڤێت و گەلی مەزنی ڕووسیا.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە لە سەرەوە باس کرا، داوایەکی زۆر باوکانەتان لیّ دەکەین کە یارمەتی گەلە کڵۆڵ و زۆر زوڵم لیکراوو بەشخوراوو سووکایەتی پێکراوو تانەو تەشەر لێدراوەکەمان بدەن لەم لایەنانەی لای خوارەوە:

(١) ئێمە لە شوێنێك کۆبکەنەوەو کۆمارێکی ئۆتۆنۆمیمان بۆ دروست بکەن. ئێمە بەپیّ‌ی ئەو ئەزموونانە کە لەسەر کشتوکاڵ و زەویداری هەمانە، دەتوانین بە شێوەی هەروەزی لەسەر زەوی کار بکەین و سیّ تا پێنج قاتی کەڵخۆزو سەفخۆزەکان بەرهەممان هەبیّ. بۆیە ئێمە دەتوانین زەوی بە ئیجارە بگرین و، بۆ هەر هیکتارێك زەوی بەراو هەزار ڕۆبڵ بە ئیجارە بدەینە دەوڵەت و، بۆ هی بیّ‌ئاودێری پێنجسەد ڕۆبل و بۆ هی دێم دووسەد ڕۆبل. ئەویش بە قازانجی دەوڵەتە.

(٢) ئێوە بۆ خۆتان نوێنەرایەتی ئێمە وەربگرن و گوێیان بۆ ڕادێرن.

(٣) داوا دەکەین فەرمان بدەنە کۆمسیونی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کومونیستی یەکێتیی سۆڤێت و سەرۆکی شوورای و باڵا (پەرلەمان)ی یەکێتیی سۆڤێت کە لە کێشەکەمان بکۆڵنەوەو داوای نوێنەری ئێمە هاوڕێ باباییف مەمەد سولیمانۆڤیچ بکەن کە لەمێژە خەڵك وەك بەرپرس و سەرۆك بۆ ئەم مەبەستە هەڵی بژاردووە.

بابایێڤ م. س. کاندیداتی زانست و لە ساڵی ١٩٤٤ بەدواوە ئەندامی پارتی و بەشداری شەڕی نیشتمانی (جەنگی دووەمی جیهانی)یە.

ناونیشان بۆ وەڵامدانەوە:

شاری باکۆ -١٤٩، جادەی ژەنەراڵ مەمەد نازارۆڤا، ژمارە ٨، ماڵی ٣، بابایێف مەمەد سولیمانۆڤاییچ.

لەگەڵ ڕێزماندا

بابایێڤ م. س.

٩٠٠٥ نۆ هەزارو پێنج ناوتان بە ئیمزای دانیشتوانی کوردی سۆڤێتەوە ئاڕاستە دەکرێ.

١١س اپریلی ١٩٨٩

* بۆ سەرکۆماری یەکێتیی سۆڤێت. ١٩٩١/٧/١٢.

هاوڕێ گەرباچۆڤ م.س.

زۆر بەڕێز میخائیل سێرگەیێڤیچ.

لە سایەی ئەو دیموکراسی و کرانەوە (گلاسنۆست)و گەشەپێدانەی مافی مرۆڤدا لە یەکێتیی سۆڤێت کە ئێوە پیشکەشتان کردوون. ئێمەی کورد، بوارمان بۆ ڕەخسا لە یەکێتیی سۆڤێت بکەین بە نووسین لەبارەی ژیانی خۆمانەوە. گەلانی ئەم وڵاتە لەڕێگەی کۆبوونەوەو دیداری نوێنەرانمانەوە لە شاری مۆسکۆ ئاگادارکرانەوە کە گەلی کوردیش لێرە هەیە. دەکرا ئێمەش لە ڕیزی ئەندامانی سەرکردایەتی دەوڵەت و حکوومەتی یەکێتیی سۆڤێتدا بن.

ئێمە پێمان وایە گەلانی ئەم وڵاتە لە ڕێی دیموکراسییەوە دواڕۆژێکی بەختەوەر چاوەڕێیان دەکات. شۆڕشی ئۆکتۆبەر شتی زۆر بۆ گەلانی خاوەن ئۆتۆنۆمی و کۆمار کردووەو زۆر گەلی کردە نەتەوەو گەلی گەورە. ئەم شۆڕشە پێشکەوتن و پەروەردەو کولتوورێکی بەرزی پێشکەشی ئەم گەلانە کردووەو زمان و ناسنامەی نەتەوەییانی زیندوو کردوەتەوە.

زۆر جێی داخە کە کاتی دیاریکردنی سنوورەکانی نێوان یەکێتیی سۆڤێت و تورکیا، هەرێمەکانی فارس و وان و ئەرزەڕۆم کە تا پێش شۆڕش لەژێر دەستی ئیمپراتۆری ڕووسیادا بوون ، نەکەوتنە ناو چوارچێوەی یەکێتیی سۆڤێت. ئەگەر ئەم هەرێمانە کە چوار ملیۆن کورد زیاتریان تێدا دەژی، کەوتبانایە چوارچێوەی ئەم وڵاتەوە، بێگومان ئەوکاتە یەکێتیی سۆڤێت کۆمارێکی وەك کۆمارە یەکگرتوەکانی تری سۆڤێتی بۆ ئێمەش دروست دەکردو، ئەو دەمە ئەم وڵاتە بۆ ئێمەش دەبوە بەهەشت.

ئێوە دەزانن شۆڕشی ئۆکتۆبەر تەنیا خەم و چارەڕەشی و بەزۆر ڕاگواستنی ساڵانی ١٩٣٧-١٩٤٤ی بۆ کورد هێنا. ئەوکاتە ٢٣٢٠٠٠ دووسەدو سیودوو هەزار کورد کەوتنە ناو یەکێتیی سۆڤێت، کەچی ئێستا ١٢٣٠٠٠ سەدو بیستوسێ هەزار کەسمان ماوە. لەبەر مەترسی بەزۆر ڕاگواستن و هۆکارەکانی تری گوشارو تەنگ پێهەڵچنین ، ژمارەیەکی یەکجار زۆری کورد کە لە ٥٠٠٠٠٠ پێنجسەد هەزار کەس پترە، توێنرایەوە.

ئێمە دڵشاد بووین کە زانیمان دیموکراسی ڕێگەی بۆ گێڕانەوەی مافەکانمان کردوەتەوە. بەڵام بەداخەوە بارودۆخەکەمان لە سەردەمی گلاسنۆست و دیموکراسیدا گەلێ خراپتر بووە. زیاتر لە ٢٥٠٠٠ بیستوپێنج هەزار کوردی موسڵمان لە ئەرمەنستان و ٣٠٠٠ سێ هەزار کورد لەلایەن ئۆزبەکەکانەوەو زیاتر لە ١٠٠٠٠ دە هەزار کوردیش لەلایەن قرقیزەکانەوە، ئەگەرچی دانیشتووی ئەم کۆمارانە بوون، دەرکران. لەبەر ئەوەی ئەم کۆمارانە سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت، ئەوانە داوا دەکەن ئێمە یا لەناویاندا بتوێینەوە، یان خاکەکەیان بەجێبهێڵین.

بۆیە ئێمە ئەمڕۆ چل هەزار کوردی پەنابەرمان لە ٢٣ هەرێمی کۆماری ڕووسیای فیدراڵدا هەیە. ئێمە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەین کە ئۆتۆنۆمیەکەمان بۆ بگێڕنەوە. ئەو دەمە ئێمەش دەبینە خاوەنی مافێکی یەکسان و چیتر نابینە مرۆڤی پلەدووو، لەگەڵ گەلانی تری یەکێتی‌ی سۆڤێتدا دەبینە خاوەنی ماف یەکسان. ئێمە هیوامان بە پەیمانی یەکێتی‌ی سۆڤێت بوو. بەلام تەنانەت بە وشەیەکیش ناوی گەلەکەمان لە گەلاڵەی پەیماننامەی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا کە بەناوی (٩+١) (نۆ کۆماری پێشووی سۆڤێت و کۆماری ڕووسیا، وەرگێڕ)وە ئامادە کراوە، نەهێنراوە.

دەستەی نوێنەرایەتی ئێمە، بە فەرمانی ئێوە، لەلایەن هاوڕێ "ڕیڤینکا"ی ئەندامی شوورای سەر کۆمارییەوە، وەرگیراو بەڵێنی چارەسەری کێشەی کوردی دا وا کە پەلەی لێ بکات. لەم بارەیەوە کۆمسیۆنێك لە نوێنەرانی پەرلەمان بە سەرۆکایەتی هاوڕێ "سەبولییف ڤ. د"ی نوێنەری پەرلەمان پێك هاتووە. ئەم کۆمسیۆنە، لە ئۆکتۆبەری ساڵی پێشووەوە سەری لە تەواوی ئەو کۆمارانە داوە کە کوردی موسڵمانیان تێدا دەژی و کۆبوونەوەی لەگەڵدا کردوون و، زانیویەو بۆی دەرکەوتووە کە کوردەکان بە یەك دەنگ داوا دەکەن ئۆتۆنۆمییەکی کوردی لە هەر شوێنێکی یەکێتی‌ی سۆڤێتدا پێك بهێنرێ. ئەوانە دەچنە هەر شوێنێك کە کۆمسیۆن بۆیان دیاری بکات. بەلام ئەم کێشەیە کوردی ئێزدی نەگرتەوە کە بەزۆر دوورخراونەتەوەو نایانەوێ لەمەودوا خۆیان بە کورد لەقەڵەم بدەن.

دوو ساڵە شوورای بالا (پەرلەمانی سۆڤێت) یاسایەکی زۆری لەسەر دەوڵەتێکی یاسایی دیموکراتی پەسند کردووەو، بارودۆخی وڵات بەرە بەرە بەرەو ئاساییبوونەوە دەچێ. بەلام بارودۆخی ئێمە لە سایەی کۆمارە سەربەخۆکانەوە بەرەو خراپی دەڕوات. ئەگەر ئاوا بچێتە پێش، دوای دە ساڵی تر هیچ کوردێك لە یەکێتی سۆڤێت نامێنێ و، هەموویان لەناو ئەو گەلانەدا دەتوێنەوە کە تێیدا دەژین.

وەك دەزانن ژمارەی ئێمەی کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە بیست ملیۆن کەس زیاترەو بارودۆخیان تراژیدییە. بۆیە ئێمە ناتوانین داواتان لێ بکەین ڕێمان

بدەن بارکەین بۆ ئەو خاکە کە گەلەکەمانی تێدا دەژی و، لەوێش وەرمان ناگرن. کەواتە داوایەکی گەورەتان لێ دەکەین، ئەویش گێڕانەوەی ئەو ئۆتۆنۆمیەیە کە ساڵی ١٩٢٣ دروست کراو ١٩٣١ لەلایەن ستالینەوە لەناوبرا. ئەم داوایانەی خوارەوەتان لێ دەکەین:

١. ڕێمان بدەن ٣٠٠ کەسمان بڕۆنە ئەورووپاو ٣٠٠ کەسیشمان بۆ وڵاتانی ئاسیایی، تا کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی لە بارودۆخی دژواری گەلەکەمان ئاگادار بکەنەوەو جێگەیەك بۆ ئەو کوردانە بدۆزنەوە پێکەوە تێیدا بژین.

٢. لە ١ی ئابەوە بۆ ماوەی مانگێك مانگرتن لە خواردن لە مۆسکۆ بەڕێوە بچێ و ڕۆژانە ١٥ کەس بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ بەشداری بن. داوایەکی زۆرتان لێ دەکەم نوێنەرانی ئێمە قبووڵ بکەن.

لەگەڵ ڕێزماندا،

سەرۆکی ڕێکخراوی سەرتاسەری کوردانی سۆڤێت"یەکبوون" بابایێڤ م.س.

* بۆ سەروك کۆماری ڕووسیای سۆڤێتی فیدراڵ

هاوڕێ یلتسین. ب.ن

زۆر بەڕێز باریس نیکۆلایڤیچ

بەناوی هەموو گەلی کوردەوە، بەبۆنەی هەڵبژاردنتانەوە وەك سەرۆك کۆماری ڕووسیای سۆڤێتی فیدراڵ پیرۆزبایی سەرکەوتنتان لێ دەکەم. هیوای تەندروستییەکی پتەوو بەختەوەرییو بەئاکام گەیشتنی تەواوی هیواکانتان بۆ پێشکەوتنی کۆماری ڕووسیای سۆڤێتی فیدراڵ دەکەم. ئێوە مێژووی گەلی کورد بەباشی دەزانن. ئێمە دەمانەوی کورتە مێژوویەکی گەلی کوردی کلۆڵتان لە یەکێتیی سۆڤێت بۆ باس بکەین. کاتی دیاریکردنی سنوورەکانی نێوان تورکیاو ئێران و یەکێتیی سۆڤێت، ٢٣٢ هەزار کورد کەوتنە بەر خاکی یەکێتیی سۆڤێت. دوای زوڵموزۆر و تەنگ پێهەڵچنین و سووکایەتی پێکردن، ئەمڕۆ بەهەموویەوە ١٥٣ هەزار کوردمان لێ ماوەتەوە. یەکێتیی سۆڤێت کۆمارو کۆماری ئۆتۆنۆمیی بۆ گەلان بەرقەرار کردو، بەم چەشنە زۆر گەل و نەتەوەی بەپێی چەندایەتی پێك

هێنا. زۆر کەس هەستیان بەوە کرد کە سەر بە چ نەتەوەو گەلێکن. بۆیە ژمارەی دانیشتوانی ئەو گەلانەی کە خاوەنی کۆمار یا ئۆتۆنۆمی بوون، زیادبوو. گەلی ڕووس و تەواوی ئەو گەلانەی کە خاوەنی کۆمارو ئۆتۆنۆمی بوون، پەروەردەو ڕووناکبیریو کولتوورو هەروەها هۆشیاری و زانستییان چووە سەرێ و لەبواری وەستایی و پیشەسازیدا بەرەوپێش چوون.

بەلاّم یەکێتیی سۆڤێت بەم شیوەیە زۆر گەلی بچووکی لەناوبردو تواندیەوەو، زمان و ناسنامەی نەتەوەییو کولتووریو... لێ سەندنەوە. لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەدا زیاتر لە دووسەد گەل کە تا شۆڕشی ئۆکتۆبر لە ڕووسیا بوون، تەنیا ٣٥ تا ٥٠ یان مانەوەو، خەڵکی پلەدوویان لەم گەلە بچووکانە پێکهێناو، ئەوانە بەدرێژایی سەدەیەك لە باری کولتووری و پەروەردەوە، لە گەلانی گەورە بەجێ مان. ستالین بەم کارانەشەوە وازی نەهێنا، بەبێ هیچ شتێك ساڵی١٩٣٧ کوردە موسڵمانەکانی لە ئازەربایجان و ئەرمینیا دوورخستەوەو، ساڵی ١٩٤٤ لە کۆماری جۆرجیا وەك بەزۆر بەرەو کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان ڕاپێچ کران. لەو کۆمارانەیشدا ئێمەیان بەسەر چواردە هەرێم و سەدودە ناوچەدا پەرش و بلاّو کردەوە و دابەشیان کردین و نەیانهێشت لە هەر شوێنێك زیاتر لە دە بنەماڵە بژی.

لەڕێگەو کاتی گواستنەوەیاندا بۆ تاراوگە، ژمارەیەکی زۆر لەسەرما و برسێتیدا مردن. بەلاّم لەکاتی شەڕدا لەبەرئەوەی ستالین پێویستیی بە ئێمە هەبوو، گێڕاینیەوە بۆ قەفقاس و، وەك سیخوڕ کەڵکی لێ وەرگرتین بۆ سەر تورکیاو ئێران و، یەکێك لەوانە من بووم.

کۆتایی بە ستالین هات و خرۆشچۆڤ. ن.س ژمارەیەکی زۆری ئەو گەلانەی ناردەوە بۆجێ‌وڕێی پێشوویان و ئۆتۆنۆمیەکەی بۆ گەڕاندنەوە. هەر بۆیە ئەم گەلانە بۆ هەمیشە ئەمەکبارو قەرزداری خرۆشچۆڤن.

ساڵی ١٩٦١ دەستەیەکی نوێنەرایەتی کوردمان لەلایەن بە سەرۆکایەتی من لەلایەن سکرتێری ئەودەمەی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتەوە "باریس پونەماریوڤ" وەرگیراین. ئێمە داوای گەڕانەوە بۆ سەر زەوی و بەرقەرارکردنەوەی ئۆتۆنۆمیەکەی خۆمان کرد کە ٧ی حوزەیرانی ١٩٢٣ لە

چوارچێوەی کۆماری ئازەربایجاندا پێك هێنرابوو. داوامان کرد بمانگەڕێننەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆمان.

باریس بۆنەماریوڤ بەناوی خرۆشچۆڤەوە بەڵێنی پێداین و وتی ئێوە لێبوردنتان بۆ دەرچووە و مافەکانتان دەگێردرێنەوەو، بەم زووانە ئۆتۆنۆمیەکانتاندا دادەمەزرێتەوەو دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانەکەتان. بەڵام دەبێ کەمێك بوەستن، با بزانین چی بەسەر شەڕی ئێران وعیراقدا دێت. جگە لەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شەڕی کورد دژی عیراق بەدەستی مۆسکۆیەو دەستی مۆسکۆی تێدایە. ئەوەبوو پێویست بوو چاوەڕێ بکەین. لەناکاودا ساڵی١٩٦٤ خروشچوڤ.ن.س لەکار لابرا، بریژنێڤ دەسەڵاتی گرتەدەست کە تەنانەت نەیدەویست گوێشی لە ناوی کورد بێو بزووتنەوەی کوردی دەرەوەی سەرکوت کردو، هەڕەشەی گرتنیشی لێ کردم. بەڵام توانیم بەڕێگەی جۆراوجۆر لەم بارەوە خۆم لادەم.

ئێمەی کورد وەك گەلانی بچووکی تر کە سووکایەتییان پێ کراوە، چاوەڕێی کۆتایی هاتن بە زوڵم و زۆرو دیکتاتۆریمان دەکرد. ئەوە بوو ساڵی١٩٨٥هاتەپێش و دیموکراتی ڕاگەیەندراو بانگەوازی ئازادی بۆ هەموو خەڵك کرا، وا کە نابێ چیتر خەڵك پلەدوو بێو، تەواوی ئەو هەڵانەی کە کراون ڕاست دەکرێنەوە. ئێمەی کوردیش بەم ڕاگەیاندنانە خۆشحاڵ بووین. بەڵام بەپێچەوانەوە دەرچوو، گەلانی گەورە بوون بە دەوڵەتی سەربەخۆو، ئەوانە گەلانی بچووکیان ناچارکرد کە یا بە زووترین کات لەناویاندا بتوێنەوە، یا وڵاتەکەیان بەجێبهێڵن. وێنەیەکی زیندوو لەوانە ئێمەی کوردین: ئەرمەنەکان بەهۆی کێشەی ناگورناقەرەباغەوە ساڵانی١٩٨٩-١٩٩٠ بیستوپێنج هەزار کوردی موسڵمانیان لە ئەرمەنستان دەرکرد. لەباری لۆژیك (مەنتیق)ـەوە، دەبوایە ئازەربایجان ئێمەی وەرگرتبایە. بەڵام ئازەریاجان ئێمەی وەرنەگرت و، بیانووشیان بۆ ئەمە ئەوەبوو کە ئێمە بۆچی داوای پێکهێنانەوەی ئۆتۆنۆمیەکەمان دەکەین.

پاشانیش ٣هەزار کوردیان لە ئۆزبەکستان و، زیاتر لە دەهەزار کوردیان لە قرقزیستان دەرکرد. کۆمارەکانی تر ئێمە وەرناگرن و، دەیانگوت خاکی ئێوە

لەلایەن ڕووسەکانەوە داگیرکراوە، بڕۆن بۆ لای ئەوان.، بەم چەشنە نزیکەی چل هەزار کورد ئاوارەی کۆماری ڕووسیا بوون، لەوانە زیاتر لە دەهەزار کەسیان لە خانووبەرە کراوەکانی تاتاری کریم لە هەرێمی گراسنادار جێگیر کراون و قەزاقەکانی کراستاداریش کوردەکان دەردەکەن. نیوەی ئەو کوردانەش مافی نیشتەجێبوون‌و کاریان نییە. تائێستایش کوردەکان لەوێ دەکوژرێن و، هەتا ئەمڕۆ چوار کەسیان لێ کوشتوون. هەموو جارێ ئازاریان دەدەن و، داوایان لێ دەکەن خاکی کراستادار بەجێبهێڵن‌و بڕیاری شوورای گوندەکانیان ئاڕاستەدەکەن.

بارودخێکی ئەوتۆش لە هەرێمەکانی تردا هەیە. وەك لاتان ئاشکرایە کوردەکانی دەەرەوە لە خەبات بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردین. بۆیە ئێمەی کوردی سۆڤێتی پێشوویش جێگەیەکمان نییە، بۆ کوێ بڕۆین و لەکوێ بژین.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئێمەیان لە کۆمارەکان دەرکرد، ئێمەی کورد لە ١٩٨٩-١٩٩٠دا بۆ شارەزاکردنی کۆمەڵگەو ڕێبەرانی پارتەکان و دەوڵەت لە کێشەکەمان، لە شاری مۆسکۆ کۆڕو کۆبوونەوەیەکمان بەڕێوەبرد. دەستەی نوێنەرایەتی ئێمە، لەلایەن چیبریکۆڤ و گری ئینکاو ڕیڤینکاو تارا زایڤیچ و ...ەوە پێشوازییان لێ کرا. بڕیاری کۆنفرانسی حیزبی‌و شوورای باڵا (پەرلەمان)ش هەیە سەبارەت بە گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان و دامەزراندنەوەی ئۆتۆنۆمی کوردی، بەڵام ئازەربایجان هەر ناهێڵێ توخنی بکەوینەوە.

ئێمەرێگەیەکی تری دەربازبوونمان نییە. بۆیە بڕیارمان دا پەنا بۆ ئیوە، وەك سەرکردەی گەلی ڕووس، بەرین و داوای یارمەتیتان لێ بکەین. گەلی مەزنی ڕووسیا زۆر گەلی کردووەتە نەتەوەیەکی پێگەیشتوو و خوێندەوار، تەنیا ئێمەو تورکەکان ماوین. هیوای ئێمەبە ئێوەیە، بە گەلی مەزنی ڕووسیا.

ئێمە داوای زۆرتان لێ دەکەین لە ناوچەیەك کۆمان بکەنەوەو ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیمان بۆ دروست بکەن. بەم چەشنە زمانەکەمان و ناسنامەی نەتەوەیمان دەبووژێتەوەو خوێندن و پێشکەوتن و کولتوورمان پێ دەدات.

ئێمە وەرزێر (جووتیار) و ئاژەڵداری باشین، ئێمە ئەوە نابین ئەگەر بێتوو لە ناوچەیەکی زەوی ڕەش یا ناوچەی تردا جێگیرمان بکەن. ئێمە ئامادەین و دەتوانین لەسەر خاکی ئازادو نەکێڵراو ئیش‌وکار بکەین و، بەرهەمی کشتوکاڵیش بۆ خۆمان و بۆ هاوسێکانیشمان دابین بکەین.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە سێ ناوچەی هەرێمی کراستاداردا تا ٣٠ی ئەیلوول مۆڵەتیان پێ داوین کە خاکەکەیان بەجێبهێڵین، ئێمەش بڕیارمان دا لە ٢٧ی ئەیلوولدا دەستەی نوێنەرایەتی خۆمان بنێرینە مۆسکۆ بۆ لای ئێوە.

داواتان لێ دەکەین نوێنەرەکانمان وەربگرن و بەیەکجاری کێشەکەمان چارەسەر بکەن.

لەگەڵ ڕێزمدا سەرۆکی کۆمەڵەی سەتاسەری کوردەکانی سۆڤێت "یەکبوون"

بابایڤ. م ١٩٩١/٦/٢٦

* بۆ زۆر بەڕێزانی سەرۆك کۆمار و سەرۆك پەرلەمانەکانی کۆمارە سەربەخۆکانی سۆڤێتی پێشوو — ژمارە ٧٩ — ١٩٩١/٧/٢٠

ئێمە زۆرجار داوامان لە سەرۆکی یەکێتیی کۆمارەکانی سۆڤێت (یەکێتیی سۆڤێت) و دەوڵەت و پەرلەمانی یەکێتیی سۆڤێت کردووە، کێشەی کورد چارەسەربکەن. گەرچی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت سەربەخۆیی دا بەم کۆمارانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەربەخۆیی ئەو گەلانە فەراموش کرا کە خاوەن ئۆتۆنۆمی نەبوون. ئێمەی کوردی موسڵمان لە ١٩٣٧-١٩٤٤دا وەك گەلانی بچووکی تری موسڵمان کە کاتی خۆی لەژێر دەسەڵاتی تورکیاو ئێراندا بوون، ڕاگوێزراین بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان. تورکیا وئێران لەکاتی خۆیدا بەیارمەتی ئەم گەلانە جۆرجیا (گورجستان)یان داگیرکرد. ستالین بەهۆی جۆراوجۆرەوە ئەم گەلانەی سەرکوت کرد و، بەم چەشنە تۆڵەی خۆی سەندووەوە. ئێمەی کوردیش پێش هەموو گەلانی تر لە ١٩٣٧دا دوورخراینەوە.

دەبێ ئەوەیش بگوترێ کە لە تاراوگە بەباشی پێشوازییان کردین و، دەوڵەت ئاگاداری ئێمە بوو. بۆ وێنە، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی

کازاخستان هاوڕێ میرزۆریان.ل و سەرۆکی پەرلەمانی ئەم کۆمارە هاوڕێ عیسایێڤ، بۆ خۆیان سەردانی ئێمەیان کردو، هێوریان کردینەوەو بەڵێنی یارمەتییان پێ داین و لە وتەی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە. شەش مانگی تەواو ئێمەیان بە خۆڕایی بەخێو کردو جێو کاریان پێ داین. دوای ساڵێك پارەی ئەو بەرخانەیان پێ داین کە لێیان سەندبووین. ئەمەیش لە سەردەمی ستالیندا بوو.

ئێستایش کاتی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە وڵاتەکەماندا ڕوودەدەن، چل هەزار کوردی ئاوارەمان هەیە کە لە ٢٣ هەرێمی ڕووسیادا پەرش‌و بڵاون و یارمەتییان دەدرێ. ئەوانە کۆپۆن (بتیاقە)ی خواردەمەنی وەرناگرن‌و، ڕۆژانە منداڵ و بەساڵاچووەکانمان لەبەر برسێتی و سەرماو چاودێری‌نەکردن دەمرن. ئەگەر پیریسترۆیکا مرۆڤی بە گەورەترین سەرمایە داناوە، ئێستا ئەو بایەخەیان نەماوە. بە بۆچوونی ئێمە، هیچ سیستەمێك کە گەلان فێری خوێندەواری‌و پەروەردە دەکات، نەیتوانیوە ئەو چەشنە کولتوورو خوێندەوارییە بداتە گەلان کە سیستەمی سۆسیالیستی و پارتی کۆمۆنیستی داویانە. ئەگەر ستالین تۆڵەی لەو گەلە بچووکانە نەکردبایەوە، ئەوانیش خاوەنە کولتورێکی باڵاو پێشکەوتوو دەبوون. خرۆشچۆڤ. ن.س ئەم هەڵەیەی ستالینی ڕاست کردەوە و، گەلە بچووکەکانی گەڕاندەوە بۆ نیشتمانی خۆیان و ئۆتۆنۆمیی بۆ دروست کردنەوە. تەنیا چوار گەل نەبێ، کوردو تورك و ئەڵمانی و تاتارەکانی کریم. خرۆشچۆڤ فریای چارەسەرکردنی کێشەی ئەم گەلانە نەکەوت و، لایان برد. چارەنووسی ئەم چوار گەلە هەتا ئێستاش هەروا ماوەتەوە.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی سیستەمی سۆڤێتیدا، دەوڵەتێکی فرەنەتەوەی بێ‌وێنە پێك هات، کە بەرژەوەندی تەواوی گەلانی بەڕەسمی دەناسی‌و، بۆ نەتەوە گەورەکان کۆمارو، بۆ بچووکەکانیش کۆماری ئۆتۆنۆمی و هەرێمیی پێك هێنا . کۆنگرەی دەی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی‌ی سۆڤێت بە شێوەیەکی بێ‌وینە کێشەی نەتەوەیی چارەسەرکردو، پاشان ئۆتۆنۆمی بۆ ئێمەی کوردیش بەرقەرار

کرا. بەلام لە سەردەمی دیموکراتی ئێستادا، قەوارەو ناسنامەمان لەدەست چووە. دەکرێ چارەسەر بکرێ، یا بمانگێڕنەوە بۆ بارودۆخی جاران کە تێیدا ژیابووین.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە من تەمەنم حەفتا ساڵەو بە باشی لە سیاسەتی دەوڵەتیو کێشەی کورد تێدەگەم، پێموایە ئێمە سیاسەتێکی ڕاستمان نەگرتوەتە بەر، چونکە لەداهاتوودا نابێتە مایەی پێشکەوتنی گەلان. پێم وایە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سیستەمی پێشوو، ئەویش لەبەرئەوەی کە دەوڵەتەکەمان فرەنەتەوە بوو. ئەگەر ئێمە بودجەی لەشکریمان ٥٠-٧٠٪ ی کەم بکەینەوەو هاوسێکانمان بەخێو نەکەین ، لەماوەی ١٥ تا ٢٠ ساڵدا پێش ئەمەریکا دەکەوین. یەکێتیی سۆڤێت، دوای پەنجا ساڵ لە دامەزراندن، تەواوی کێشەی گەلاکەکانی چارەسەرکرد. خرۆشچۆڤ چارەسەری تەواوی کێشەی گەلانی یەکێتیی سۆڤێت (جگە لە کێشەی کورد، تورك و ئەڵمان و تاتارەکانی کریم)ی کرد. بەلام دەوڵەتە نوێیەکان یا کۆمارە سەربەخۆکانی سۆڤێت، کە ماوەی حەفتا ساڵە هەن، ناتوانن چارەسەری کێشەی ئەم سێ تا چوار گەلە بکەن. بەپێچەوانەوە، بەزۆر ڕاگوێزراوەکانیان ئاوارە کرد. ئێمە لە کۆمارەکانەوە ڕامان کردە هەرێمی کراسنادار بۆ لای گەلی ڕووسیا، ئەو گەلەی کە خاکەکەی ئێمەی داگیر کردو نیشتمانەکەی ئێمەی بەخشی بە گەلانی گەورەو بەرامبەر بە ئازەریو ئەرمەنیو جورجیو تورکمەن سووکایەتیی پێ کردین.

کوردەکان تا شۆڕشی ئۆکتۆبر هیچ کاتێك لەناو گەلانی تردا نەتوێنراونەتەوە. دوژمنایەتی ستالین بەرامبەر بە گەلەکەمان، بوو بەهۆی لەناوبردنی ئۆتۆنۆمیەکەمان و دوورخستنەوەو تواندنەوەمان لەناو ئازەریەکاندا کە ژمارەمان سێسەد هەزار کەس دەبوو. هەروەها لەگەڵ تورکمەنو زیاتر لە سەدهەزار ئەرمەنی و جۆرجیشدا. ئێمە بە دەستپێکردنی پێریسترۆیکا لە ١٩٨٥دا زۆر خۆشحاڵ بووین کە دیموکراتی و گلاسنۆستی ڕاگەیەندران. لەسایەی دیموکراتی و گلاسنۆست و پەرەسەندنی مافی مرۆڤدا لە یەکێتیی سۆڤێت، ئێمەی کورد کەوتینە نووسین لەسەر ژیانی خۆمان لەم وڵاتە. هەروەها لە ڕێگەی کۆڕو کۆبوونەوەوە لە شاری مۆسکۆ، گەلانی یەکێتیی سۆڤێت سۆڤێت ئاشناو

شارەزای گەلی کورد بوون و زانییان کورد هەیە. توانرا لەلایەن ئەندامانی سەرکردایەتی دەوڵەتیو حکوومەتی سۆڤێتەوە پێشوازی بکرێین [١٦٤].

... ئێمە لەگەڵ ئازەربایجانیەکاندا هاوسێی یەکترین. گەلی ئازەربایجان زۆر لە ئێمەوە نزیکن. زۆربەمان لە ئازەربایجانەوە ڕاگوێزراوینو، ئێستا خاكو ئاوی ئێمە لەلایەن دانیشتوانی ئەو کۆمارەوە داگیر کراون، گەرچی زەوی وا لە ئازەربایجاندا هەیە کە لەبەر نەبوونی خەڵك و جۆگەی ئاو چۆڵەوانییە. ئەم شوێنە کە ناوی جەیران-چیلیـیە هەر لە شاری باکۆوە تا شاری سالیان دەگرێتەوە. ئازەربایجان دەتوانێ ئێمە لەو شوێنانە نیشتەجێ بکات.

داواتان لێ دەکەین یارمەتی گەلەکەمان بدەن:

١- ئازەربایجان ڕازی بێ لەو شوێنە چۆڵانەی کەناومان بردن، ئۆتۆنۆمیمان بداتێ.

٢-کەرەسە (پارە) بۆ خەرجی کێشانی ئاوی خواردنەوەو ئاوداشتن بۆ ئەو شوێنە دیاری بکرێ و، قوتابخانە و... لە ئەستۆی خۆماندا بن.

٣-ئەگەر ئازەربایجان پەسندی ناکات، ئێمە ئامادەین ئۆتۆنۆمی لە هەر شوێنێکی تری یەکێتیی سۆڤێت بەرقەرار بکەین و بڕۆین بۆ ئەوێ.

٤-بۆ پێشگرتن لە بەردەوامی قوربانی (ئەم سێ ساڵەی دوایی، کوردەکان زیاتر لە سەد کەسیان لەدەست داوە)، داوا لە شووڕای فیدراڵی دەکەین ئەم کێشەیە لە کۆبوونەوەیەکی نزیکدا بە یەکجاری چارەسەر بکات.

لەگەڵ ڕێزمدا

سەرۆکی کۆمەڵەی سەرتاسەری کوردەکانی سۆڤێت "یەکبوون"

بابایف. م. س.

تێبینییەکی جیاواز لەسەر ئەم نامەیە:

کوردەکان پاش نائومێدبوونیان لە موسکو، ئەم نامەیەیان نارد بو سەرۆك کۆمارو پەرلەمانەکانی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت. دیارە نووسینەکەی خراپ نییە. گەرچی چاوەڕێی ئاڵوگۆڕێك ناکرێ لە سیاسەتی ئەو کۆمارانەدا بەرامبەر،

---

[١٦٤] هەندێ لەو بابەتانەی کە وشە بە وشە لە نامەکانی تردا هاتووە، بە پێویستم نەزانی وەری بگێڕم و دووپاتیان بکەمەوە.

نەك تەنیا کورد، بەڵکوو گەلانی بچووکی کۆمارەکانیشیان، نەدەکرا بڕیارێکی هاوبەش یا تەنیا لەم بارەیەوە بدرێ. تائێستاش دوورن لە دیموکراتیی و مافی مرۆڤ و ... زۆربەیشیان هەر پەروەردەی قوتابخانەی سۆڤێتی و ئەندامی سەرکردایەتی نێونەتەوەیی و حکوومیی و حیزبی یەکێتیی سۆڤێت و ئاگاداری ئەم کێشەیەی کورد بوون. نووسەر یا نووسەرانی نامەکە کە داوای گەڕانەوەی کورد بۆ شوێنێکی چۆڵ و بێئاوو نائاوەدانی ئازەربایجان یا شوێنێکی تر دەکەن، واتە لە هەر کۆمارێکی تری سۆڤێت بێ، نەك لە شوینی باووباپیرانیان و لەو شوێنەی کە کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستانی سووریان دامەزراند، هەڵەیەکە دواتر بەجیا باسی دەکەین.

نووسەر لەم نامەیەو نامەکانی تردا، هەر باسی کوردی موسڵمان دەکات، واتە کورد دابەش دەکات. ڕاستە کوردیان لەڕووی دینییەوە دابەش کردووەو، زیاتر کوردی موسڵمان کەوتوەتە بەر شالاوی هەمەچەشنەی زۆرداریو چەوسانەوە. ئەگەر دوژمن و ناحەزانی کورد یا هەندێ کوردی ئێزدی ئەم دووبەرەکیەیان دروست کردبێ، نووسەر یا نووسەرانی نامە نەدەبوو ئەم شتەیان کردبایە. ئەوانە لەسەرەتاوە کورد دابەش دەکەن و بەشێکیان دەکەن بەگژ ئەوی تریاندا و پارەیان دەدەنێ، تا بەشەکەی تریان لەکوڵ بێتەوەو، پاشان بێنە سەر بەشەکەی تریان. هەروایش کرا. نووسەر یا نووسەران بەم چەشنە بیانوو دەدەنە دەستی داگیرکەرو ناحەزو دوژمنی کوردو ژمارەیەك لەو ئێزدی و موسڵمانانە، تا کێشەکە ئاڵوزتر بکەن.

نووسەر یا نووسەرانی نامکە بەپێچەوانەی بەڵگەو دیکومینتەکان و گێڕانەوەی خەڵکەوە، کە دەڵێ پاش ڕاگواستنەوەیان بەپیریانەوەهاتوون و یارمەتییان داون، تەنانەت بە پێچەوانەی زانیاریەکانی خۆیانەوە کە لە نامەکانی تردا نووسیویانە، ئایا ئەم تاکتیکە، یا لەڕووی ناچاریو ترسەوە بەم چەشنە نووسیویە؟!

لەلایەکی ترەوە، لەم نامەیەدا بە خراپی باسی پیریسترۆیکاو گلاسنۆست و دیموکراتی سەردەمی گەرباچۆڤ دەکاتو، دەڵی ڕێگەیەکی ڕاست نییە. داوای گەڕانەوە بۆ دەوڵەتی فەرەنەتەوەی پێشووی سۆڤێت، یا چارەسەری کێشەی کورد

لەم وڵاتە یان یەکێك لە کۆمارەکان دەکات؛ ئەو سیستەمەی کە ئەو هەموو کارەساتەی بەسەر کورددا هێناو، پاش ستالین‌و هەتا ڕووخانیشی کێشەکەی چارەسەر نەکرد، کەچی داوای گەڕانەوەی بکرێ، لەبەر ئەوەی بارودۆخیان پاش ڕووخانی سۆڤێت بەرەو خراپتر چووە! من کوردێکی هەڵاتووی کوردستانی باشوورم بیرهاتەوە کە لە ڕووسیا گیرا، زیاتر لەبەر نەبوونی پاسپۆرت و ئیقامەو هاتنی نائاسایی. ناوبراو، ماوەیەکی زۆر لەبەر بێدەسەلاتی‌و نەبوونی کەسێك یا هەندێ پارە یا نەبوونی دەوڵەتی کوردی و گوێ نەدانی پارتە کوردیەکان و ....، خرایە زیندانەوە. پاشان کە بەربوو، ڕووسیاو UN وەك تاوانبارێك وەریان گرت و، هەروا بەبێ پاسپۆرت‌و ئیقامە مایەوەو نەیدەتوانی کار بکات‌و نوێنەر بۆ خۆی وەربگرێ. پۆلیسی ڕووسیش کە دەیانبینی، ڕایان دەگرت و پارەیان لێ دەسەندو ئازاریان دەداو زیندانییان دەکرد. لەبەر گەلیچك هۆش بواری گەڕانەوەی بۆ عیراق یا کوردستان نەبوو. دەیگوت خۆ زیندانەکەی جاران لەو ژیانەی ئێستام باشترەو، لەوێ جێگایەکم هەبوو زیندان بوو، خواردنێکم هەبوو. مەترسی پاسپۆرت و ئیقامەو کارو...م نەبوو.

کوردی سۆڤێتیش پاش ڕزگاربوونیان لەدەستی ئەو ڕژێمە، ئاواتەخوازی ژیانی ڕابردوویان‌و بە باشتری دەزانن. کەچی هیچ کامیان باش نین. ئەگەر جاران زیاتر داواو هەوڵیان بۆ گەڕانەوە بوو بۆ نیشتمانی خۆیان و هیواو خەونەکانیان دروست کردنەوەی کوردستانی سوور و بەڕەسمی ناسینی کورد لە کۆماری ئەرمینیاو جۆرجیاو تورکمەنیستان بوو، ئەمڕۆ لەبەر دەربەدەری و دۆزینەوەی ئیش و کار، جا لە هەرجێیەك بێ، ژیانیان لێ تاڵ بووە..

لەلایەکی ترەوە، نووسەران پێشنیاری کەمکردنەوەی خەرجی لەشکری (٥٠٪-٧٠٪) سۆڤێت و یارمەتی نەدانی وڵاتان و گەلانی تر دەکەن، تا ئەو وڵاتە پێش ئەمریکا بکەوێ. زۆر زەحمەتە ئەم وتەیە بنەمایەکی ڕاستی هەبێ، چونکە سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی ئابووری و سیاسی ئەم وڵاتە ،خراپ و ڕووخابوو و، زەحمەت بوو کە ئەو هەموو تاوانەی لە ڕابردوودا کردووەو ئاڵوگۆڕێکی لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەدا نەکردووە، بە کەمکردنەوەی خەرجی لەشکری یا

یارمەتی نەدانی هاوسیٚو دەوڵەتانیتر لە ڕووخانەکە ڕزگاری بێ. ئەوەیش کە ئێستا بارودۆخی کوردی سۆڤیێت پاش ڕووخانی سۆڤیێت خراپتر بووە، میراتی سیاسەتی ڕابردووی سۆڤیێتی پێشوو بووە.

کۆبوونەوەی شوورای خەڵکی دانیشتووی گوندی (ساروڤە)ی ناوچەی کراسناگڤاردیسکی سەر بە هەرێمی ئۆتۆنۆمی ئادیگە لە١٠/٦/١٩٩١ دا، بە دەربڕینی ویستی زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی گوندی ساروڤەی سۆڤیێتیو لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی نێوان خەڵکی کوردو دانیشتوانی ڕەسەنی گوندەکە کە خەریکی تەقینەوەیە، بڕیاری دا:

١- داوا دەکەن بە زووترین کات (لەماوەی هەفتەیەکدا تا ١٧/٦/١٩٩١) خەڵکی کورد دەربکرێن، ئەوانەی کە:

ئ: مافی نیشتەجێبوونیان نییەو بە نایاسایی ماونەتەوە،

ب: ئەوانەیش کە مافی نیشتەجیبێبوونیان هەیەو کار ناکەن، لەو ماوەیەدا کە کۆبوونەوەکە دیاریی کردووە، دەربکرێن. دەبێ خەڵکی کورد بەبێ هیچ چەشنە مەرجو پاڕانەوەیەك دەربکرێن.

بەڕێوەبەرایەتی کەڵخۆزی"دروژبا" بەپێی تواناو گونجان یارمەتی گواستنەوەی شتومەکیان بۆ ئیستگەکانی شەمەندەفەر بدات.

گرووپی دەستپێشخەر (چیسەبەیڤ، یو.پ وبابینکو، گ.ن و خاچەدوروڤ.پ.ف) هێمنیو کاروباری ئەوانەو پشتگیریکردن لە تێکهەڵچوونی نێوانیان لەسەر بناغەیەکی نەتەوەیی (ئەتنیکی) مسۆگەرو بەئەستۆ دەگرێ. ئەگەر هاتوو خەڵکی کورد داخوازیەکەیان جێبەجێنەکرد بە داواکاری بەشدارانی کۆبوونەوەکە بۆ دەرکردنیان، پەنا بۆ هێز ببرێ (بەزۆر دەربکرێن، هەورامی). لەم بارەیشەوە کۆبوونەوەکەمان هیچ بەرپرسییەکی ئاسەواری بڕیارەکەی ناکەوێتە ئەستۆ.

بەرپرسیی جێبەجێکردنی ئەم خاڵە دەخرێتە ئەستۆی سەرۆکی کومەڵەی کوردەکان عەلییێڤ.م.

٢- لە١١/٦/١٩٩١دا وتووێژو تاووتوێ لەم بارەوە بکرێ، ئەویش بە بەشداری گرووپی دەستپێشخەر (چیسەبەیڤ، یو.پ وبابینکو،گ.ن و خاچەدوروڤ،پ.ف) و،

"ئیچین،ن.ئا" له شوورای شار و"کاردیڤیسکی، ئا.د" له بەڕێوەبەرایەتی کەڵخۆزی (دروژبا)و، ئەو (٨-١٠) بنەماڵە بە نەتەوە کوردەی کە هێشتا هیچ خۆیان بەدناو نەکردووە، بەشێوەیەکی تایبەت بوارو مۆڵەتی مانەوەو ژیانیان پێ بدرێ، تا کێشەی ئۆتۆنۆمی کولتووری یا ڕێکخستنێکی تری نەتەوەیی کوردەکان چارەسەر دەکرێ. ئەویش بەو مەرجەی کە ئەم داخوازانەی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

ئـ- دەبێ تەواوی ئەوانەی کە ئیشیان پێ دەکرێ، بێ‌ئەملاوئەولا کاربکەن.

ب- بەجیددی ڕەچاوی تەواوی داب‌و نەریت‌و کەلەپوورو یاسای ناوچە و خەڵکەکە بکەن.

پ- دەستبەجێ لەماوەی ٥ ڕۆژدا ماڵ و حەوشەو بەر ماڵ و گەڕەك و دەوروپشتی خۆیان پاکوخاوێن بکەنەوە.

ت- دوورخستنەوەی ئاژەڵ (ئاشکرایە دەبێ لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا بێ)، دەبێ ئاژەڵەکە تەنیا لە (مێگەل یا گاگەل)ی گشتیدا بێ و تا ١٩٩١/٦/١ کاتیان بۆ دیاری بکرێ (مۆڵەتیان پێ بدرێ).

ج- دەبێ بەجیددی و بەتوندی چاودێری هەڵس‌وکەوتی کوردەکان بکرێ لە شوێنە قەرەباڵغەکان، یانە ڕۆشنبیریەکان (سینەماو شانۆو..) و فرۆشگاو گەرماوو شوێنە گشتیەکاندا.

ئەگەر کوردەکان هەر چەشنە لادان یا پێشێلکردنی یاساکان‌و داب‌و نەریت بکەن‌و، بە هەڵس‌وکەوت ڕێزی نەتەوەکانی تر نەگرن سووکایەتییان پێ‌بکەن) ،بەبێ لەبەرچاوگرتنی تەمەن و ڕەگەز، دەبێ دەستبەجێ (لەماوەی ٤٨ کاتژمێردا) دەربکرێن و، بەپێی بڕیاری هاوبەشی ئەندامانی دەستەی دەست‌پێشخەرو شوورای گوند، ئەگەر پێویست بکات پەنا ببرێتە بەر هێز بۆدەرکردنیان.

چ . فەرمانی بە دەستەی ئەندامانی دەست‌پێشخەر چیسەبەیڤ، یو. پ و سەرۆکی شوورای گوند ئیچن، ن.ئا بدرێ، سەبارەت بە پەسندکردنی بڕیارەکە، نوێنەرانی شووراکانی گەل لە هەرێم و ناوچە ئاگادار بکەنەوە.

ئیمزای سەرۆك ئیچین.ن.ئا

ئیمزای سکرتێر گورەنیکا. پ.گ

مۆری شوورا

سەبارەت بەم بڕیارە یا بەڵگەیە:

ئەمە یەکەم بڕیارو دواین بڕیاری دەسەلاّتدارانی سۆڤێتی و ڕووسی نییە، بگرە بڕیاری خراپترو توندترو دوور لە هەموو یاساو داب‌و نەریتێکی مرۆڤایەتی‌و نێودەوڵەتیش دراوە. کوردی هەزار لە گەلێك شوێن و ناوچەو هەرێم و گوندی ڕووسیا لەلایەن تاقمە ڕەگەزپەرست و فاشیەکانی ئەم ولاّتەوە کوژراو و بێسەروشوێن کراون‌و گیراون و تێیان هەڵداون و دۆسیەی درۆو تاوانیان بۆ هەڵبەستوون. بگرە لەلایەن پۆلیس و کاربەدەستانەوە دەرکراون بۆ شوێنی ترو، خەڵك لەدژیان هان دراوەو، گێرەو کێشەیان بۆ دروست کردوون و، ژیانیان لێ تاڵ کردوون و، ناچاربوون سەری خۆیان هەڵبگرن‌و، کارو ئیشیان پێنەداون، یا بە بیانووی نەبوونی ئیقامەوە نەیانهیشتووە خۆیان کاربکەن و پیسترین و بێڕەوشتترین و قورسترین و هەرزانترین کاریشیان کردووە، وەك فەڕاشی‌و حەماڵی و پاککردنەوەی ئاودەست. کوردەکان بازاڕێکن بۆ پۆلیسی ڕووسیاو، بە بیانووی نەبوونی ئیقامە و ژیانی نایاسایی و نەبوونی مۆڵەتی کارکردن یا کاری بێقانوونی و نەدانی باج و ...ەوە، ئەگەر ڕۆژانە جەریمە نەکرێن، بە قۆنتەرات حەفتانە یا مانگانەیان لێ دەستێنن بۆ پێکهاتنی هەردوولا تا دەرنەکرێن و پسووڵەی وەرگرتنی جەریمە یا پارەکەیشیان پێ نادەن کە بۆ دەوڵەتیش نابێ. بگرە زۆرجار کورد ڕۆژانە چەند جارێ لایەن پۆلیسەوە ڕادەگیرێن، چونکە پسووڵەی جەریمەیان پێ نییەو، دەبێ جەریمە بدەن. ئەگەر لەسەر جادەو ئیش دەستیان نەکەوت، بەناو مالاّندا دەگەڕێن و دەبێ جەریمە بدەن. ئەگینا دەیانبەن بۆ پۆلیسخانە و هەڕەشەی دەرکردن و زیندانیان لێ دەکەن.

زۆرجار کە لەسەر کوژران و لێدان و بەرتیل وەرگرتن پەنایان بردووەتە لای کاربەدەستان، یا بێ وەلاّم ماونەتەوە، یا پشتگوێ خراون، یان بەڵێنی هیچ‌وپووچیان پێ داون و هیچ هەنگاوێکیان نەناوە بۆ سزادان و دژ بەو تاوانانەی کە دەرحەقیان دەکرێ. زۆرجاریش بەبێ بڕیارو هۆو دادگاییکردن، سواری شەمەندەفەریان کردوون‌و وەدەریان ناون. تەنانەت ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنی ڕووسیاش لەم وێنەیەی هێناوەتەوە.

ئەم بڕیارو کۆبوونەوەیە لە سەردەمی سۆڤێتدا، بەناوی گەل و دانیشتوان و شووراو دەسەڵاتی دەوڵەتی و حیزبی و سیستەمی سوسیالیستییەوە بووە. ئەندامانی حیزبێکی ئینتەرناسیۆنال و پارێزەرو نوێنەری کرێکارو زەحمەتکێش و گەلانی چەوساوەو تەواوی دانیشتوانی ئەم وڵاتە، کە گوایا هەموو یەکسانن و یەك مافیان هەیە، فەرمانیان پێدراوە بۆ جێبەجێکردن. کۆمیتەو ڕێکخراوەکانی حیزبی ئاگادار کراوەتەوەو بەجێهێنانی ئەم بڕیارە خراوەتە ئەستۆیان، ئەویش بەشێوەیەکی ڕەسمیو نووسراو. کەچی هاوارو ڕەخنەیەك لەلایەن کۆمیتە یا ڕێکخراو یا ئەندامێکی ئەم حیزبەوە هەڵنەستاوە. ئەم بڕیارە سنووری ئاپارتایدو جیاوازی ڕەگەزیی بڕیوە. لەو ڕژێمە ناوبراوەدا، ئەگەر مرۆڤی ڕەش لە ئەفریقای باشوور داوای دەسەڵات، یا بەشداربوونی دەسەڵاتی لەگەڵ مرۆڤی سپیدا کردبێ، ئینجا کەوتوەتە بەر لێدان و تەنگ پێهەڵچنین. کەچی لێرە ئەوە بە کورد دەکەن کە داوای دەسەڵاتی نەکردووەو، گوایە هێشتا هەر هاووڵاتی ئەم دەوڵەتەیەو پاسپۆرتی هەر ئەم دەڵەتەی پێیە! من نامەوێ بە وردی و دوورودرێژی تاووتوێی ئەم بڕیارە بکەم، کە دەکرێ کتێبێکی لەسەر بنووسرێ. دەکرێ بکرێتە بەڵگەیەکی حاشاڵێنەکراوو دیکومێنتی و، بخرێتە بەردەم دادگای نێونەتەوەیی لاهای UN و ڕێکخراوو کۆڕو کۆمەڵەی نێوەنەتەوەیی و مافی مرۆڤ و... کە شتی ئەوتۆ ئەمڕۆ لە وڵاتێکدا دەکرێ و دنیاش بێدەنگە.

تەنانەت ئەنجامدەرانی ئەم بڕیارە، جگە لەوەی کە خۆیان دەستپێشخەر بوون و دەسەڵاتی پۆلیس و پاراستن (ئاسایش)یان هەبوە، خەڵکیشیان، یا بە واتایەکی تر دانیشتوانی ناوچەکەش، لەپاڵ ئەوەدا کە دژی کوردەکان هان دراون، کراونەتە چاودێرو سیخوڕ بەسەریانەوە. گەر شتێکی نائاسایی یا ناڕەسمییان کردو لەگەڵ داب و نەریتیاندا نەگونجا، کاربەدەستان ئاگادار بکەنەوە. لای خەڵکیش، کوردەکان داگیرکەری وڵاتەکەیانن و میوانی بانگ نەکراون، واتە دەسەڵاتداران خۆیان گەلان بەگژی یەکتردا دەکەن و، گێرەو کێشە لەنێوانیاندا دەنێنەوەو پەرەی پێدەدەن. بچووکترین بیانوو لەلایەن کوردێکەوە بەدەستەوە بدرێ، بەسە کە ببێتە

مایەی دەرکردنی. دەسەڵاتداران بە دانیشتوانی ناوچە یا گوندەکە نالێن: ئەوانە لێقەوماوو هاوولاتی ئێمەن و پێویستە یارمەتییان بدرێ و، ئێوەش ڕێز لە داب‌و نەریتی ئەوان بگرن. نابێ هەر کورد ڕێز لە داب‌و نەریتی ئەوان بگرێ، پێویستە ڕێزی هاوبەش و بەرامبەر بەیەك هەبێ.

لەلایەکی ترەوە، دەگوترێ ئەوانەی توانای ئیشکردنیان هەیە، یا گەیشتوونەتە تەمەنی ئیشکردن، دەبێ ئیش بکەن. بەڵام ئەی ئەگەر ئیقامەیان نەبێ و ئیشیان پێ نەدرێ، چۆن کاربکەن؟! دەگوترێ ئەوانەی ئیقامەیان هەیەو ئیش ناکەن، دەبێ دەربکرێن. دیارە کەس لە ئاوارەییدا ناتوانێ بەبێ کارکردن‌و تەنانەت بەبێ سواڵکردنیش بژیو، مەرج نییە بە ڕەسمی کاریان هەبێ، بەڵکوو ئیش‌وکاری ئازادی وەك کەسابەت‌و کرێکاری‌و وەرزێری‌و ... ئەمە لای ئەوان ئیش نییە. یا ئەگەر تۆ ئەو ئیش‌وکارانە بکەی، دەبێ بەوانە بڵێی یا ئاگاداریان بکەیتەوە. بەڵام هەر مەبەست دەرکردنیان بووە. تەنانەت زۆر کوردیش خانووبەرەی کڕیوە یا دروست کردووە یە بەکرێی گرتووە، کەچی هەر ناڕازین و دەبێ بیانوویەکی بۆ بدۆزنەوە. بۆ وێنە، ڕاگرتنی ئاژەڵ و ....، کەچی ئەوانیش کەم یا زۆر وەك خەڵکی ڕووس یا دانیشتوانی گوندو ناوچەکە ئاژەڵیان ڕاگرتووە. ژیانی کورد، وەك ڕابردوو، بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە بەستراوەتەوە. هەروەك هاوڕێیەکم گوتی، خەڵکی گوند، واتە دانیشتوانی ڕەسەن و ناڕەسەنی گوند، هەموو ئاژەڵ ڕادەگرن.

بەڵام بۆچی ئەم بڕیارە هەر بۆ کوردەکان دەرچووە؟ لەکاتێکدا ئاوارەو پەنابەری سەر بە گەلانی تریش لەوێ ژیاون، کەچی هەر ناوی کوردەکە هاتووە. ژمارەی پەنابەرە کوردەکان لەچاو زۆربەی پەنابەری سەر بە نەتەوەکانی تر کەمترە.

کوردە ئاوارەکان، وەك زۆربەی گەلانی تری ئاوارە، شوێن و ناوچەیەکیان بۆ پەنابەری هەڵبژاردووە کە بۆ ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵ لەبارو کەم دانیشتوو یا چۆڵ بووە. ئاشکرایە کار لە شوێنی وادا هەیە بۆ دانیشتوانی ترو، دەوڵەتی ڕووسیا بەرژەوەندی لەوەدایە کە بەرهەمی ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵی زیاتر بێ. لەلایەکی

ترەوە، زۆربەی دانیشتوانی ئەو جۆرە شوێنانە، بەتایبەت ڕووسەکان، کەمتر خۆیان لە ئیش‌وکاری ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵ یا کای تری هەرزان داوە. لە هەمووی گرنگتر، ڕووسیا وڵاتیکی مەزن و بەپیت و بەرەکەت و هێزی کاری تێدا کەمەو بوونی گەلی باڵادەست و خاوەن دەسەڵات یا براگەورە و پێشکەوتووترو ... هۆی پەنابردنی خەڵك بووە بۆ ئەم کۆمارە، بەتایبەت پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤێتی ئەم وڵاتە تەواوی بەرپرسیی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێتی گرتە ئەستۆ، یا وەك میراتگیری یاسایی دەوڵەتی سۆڤێت خۆی ڕاگەیاندووە.

خوێنەر ئەگەر تەماشای ڕۆژو مانگی بڕیارەکە بکات، وەرزی سەرماو زستانە. جگە لەوە، حەوت ڕۆژ ماوەیان پێداون کە دەبێ بڕۆن، بۆ کوێ و چۆن پرسیارێکە! ئەوی ماڵو ئاژەڵو شتومەکی هەیە بە حەوت ڕۆژ پێی نافرۆشرێ. ئەگەر بفرۆشرێ، دەبێ بە نیوە قیمەت بیفرۆشێ. ئەوەش نەبێ، چۆن پێویستیەکانی وەك قاپ و قاچاخ وپێخەف‌و جلوبەرگ و شڕەوپڕەی ناوماڵ و ... بە ئاوارەو دەربەدەروی بێدەرەتان و نەدار دەگوازرێتەوە؟ ئەوە خەرجیی دەوێ. پاشان بۆ کوێ بچن؟ لەوێش بە هەمان شێوە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ. ئینجا ناکرێ خۆیان بشارنەوە. ئەگەر نەڕۆن، وەك بڕیار دراوە، بەزۆر دەریان دەکەن. وەك لە بڕیارکەدا هاتووە، ئەگەر بێتوو ئەم دەرکردنە هەر پاشماوەیەکی تاڵ و ناخۆشی بەدواوە بێ تا ڕادەی کوشتن، جگە لە کوردەکان خۆیان کەس بەرپرس نابێ. ناکرێ نەڕۆن، پۆلیس و هێزی ئاسایش دەچن و سواریان دەکەن و دەیانبەن بۆ ئێستگەی قەتار یا گەڕاج. ناکرێ بمێننەوە و هەموو ڕۆژێ بەرۆکیان بگرن و خەڵك لەدژیان هان دەن‌و بیانکوژن.

لە جێگەیەکی تردا باسی کوشتنی کوردەکان لە چەند ناوچەو گوندو هەرێمی ڕووسیادا دەکەین، باسی نووسینی ڕۆژنامە و تەلەفزیونەکانیان‌و، هاندانی خەڵك و ڕێکخستنی خۆپێشاندان دژی کوردەکان و گێڕانەوەی کوردەکان خۆیان.

من لە هەندێك گوتاردا بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانی دەرەوەو ناوەوە، کە سی دانەیان لەگەڵ ئەم بەڵگەو دیکۆمینیتانەدا دەخرێنە بەرچاو، ئاماژەم کردووە

به سیاسەتی ستراتیژیکی دەسەڵاتدارانی ئەرمەنستان و ئازەربایجان و ڕووسیای کۆن و سۆڤێتی دوێنێ و ڕووسیای ئەمڕۆ بەرامبەر بە کێشەی کوردو، بەتایبەت کوردەکانی سۆڤێت. بۆچوونەکانیشم زیاتر بەهۆی ئەو شتانەوە بووە کە خۆم بە چاوی خۆم لە ڕووسیا بینیوومن. من کەوتوومەتە دووان لەگەڵ کوردەکانی سۆڤێتی پێشوودا، چ موسڵمان و چ ئێزدیو، ڕێکخراو کومەڵەو ڕۆژنامەو نووسراو و گێڕانەوەی هەندێ بەسەرهاتی تاڵیانم دیوەو بیستووەو، سەرئەنجام دەستم ڕاگەیشتووە بە هەندێ بەڵگەو نووسراوی ئارشیڤەکانی سۆڤێتی پێشوو. ئەم دەوڵەتانە، نەك تەنیا لە قەلاچۆکردنی بەناو هاوولاتی خۆیاندا لە قۆناغ و سەردەمی جیاجیادا دەستیان هەبووەو، تا بۆیان کرابێ پارێزیان لە سڕینەوەی قەوارەی کوردیو ناسنامەکەی نەکردووە، سەرەڕای ئەوە، دووبەرەکییان خستوەتە نە تەنیا ناو کوردەکانی لای خۆیان (موسڵمان و ئێزدی) و بەگژی یەکتریاندا کردوون، بەڵکوو لە ئاوارەیی و هەندەرانیش لەڕێگەی هەندێ بەکرێگیراوی کوردی ئێزدییەوە پەرەیان بەو دووبەرەکیەی ناو کوردەکانی خۆیان داوە. لێرە مەبەست ئەو کوردە ئێزدیانەی ئەرمینیایە کە ئێستا ئاوارەن لە ڕووسیا یا لە ئۆکراین و بیلە ڕووسیا بۆ پەیداکردنی پارووییەك نان و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان لە زیادبووندایەو لە دەرەوەیش پارەیان دەدەنێ ڕوژنامەو گۆڤار دەربکەنو کۆڕو کۆمەڵ ببەستنو ڕێکخراو پێك بهێنن و داوا لە کاربەدەستانی ڕووسی بکەن لە سەرژمێریەکاندا بە نەتەوەیەکی جیاواز بیاننووسن و ....

لێرەدا گوتاری دوو کورد (یەکێك وەك کورد و ئەوی تریان وەك نەتەوەی ئێزدی) کە لە کتێبی نەتەوەکانی کۆماری ئەرمەنستاندا نووسراوە، وەك بەڵگەیەك لە دەیان و سەدان بەڵگە، دەخەمە بەر چاوی خوێنەران. ئەمە ئەنجام و بەرهەمی سیاسەتی نەتەوەیی–لینینی ولاتێکی سسیالیستی بوو، ئەمە بەرهەمی هەموو ئەو ناوەندە کوردناسییەو ... بوو. گوتاری نوێنەری گەلی ئێزدی کە بێگومان بۆی نووسراوەو بێبناغەو دوور لەزانستە، بۆ فریودان و شێواندن و دژی گەلی کوردو کێشە ڕەواکەیەتیو بۆ مەبەستێکی تایبەت نووسراوە؛ لەوانەیە هەندێ کەسی

ساکاری پێ هەڵخەڵخەتینن یا بیانخاتە گومانەوە، چونکە خوێنەران لەوانەیە نەزانن گەلێك جار ئەو چەشنە پیلانانە لە شوێنەکانی تری کوردستان یا پارچەکانی تری کوردستان لەلایەن دەسەلأتدارانی عەرەب و تورك و فارسەوە بەڕێوەچووەو سەری نەگرتووە. ئەمە تەنیا لە سۆڤیێتی جاران یا ئەرمەنستان و ڕووسیای نوێ نەبوە. جێی سەرسوڕمانە کە نووسراوەکەی نوێنەری گەلی ئێزدیان، ئێزدیەکان و ئەرمەنیەکان بە یەك بنەماڵە، یا ئێزدیەکان بە بەشێکی ئەرمەنی یا خزمی ئەرمەنی دادەنێ. لەکاتێکدا نەك تەنیا هیچ شتێکی هاوبەشیان لەگەڵ کورددا نییە، بگرە زمان و جلوبەرگ وخواردن و کولتووریان و... جیاوازەو، بەڵکوو هەر لەکۆنەوە دوژمنی یەك بوون و ئێستاش هەر ئەو دوژمنایەتیە ماوە. ئەو نووسراوە دژی ئەوانە ڕادەوەستێ کە گوایە هەوڵ ئەدەن ئێزدیەکان بە نەتەوەیەکی ترەوە، واتە کورد، بنووسێنن. نوسەر دیارە نە چاوی بە سەرچاوە مێژووییەکان کەوتووەو، نە ویستوویە خۆی ماندوو بکات. نازانێ داگیرکەرانی تری کوردستان هەوڵی زۆریان داوە، نەك تەنیا کورد لە باری دینییەوە دابەش بکەن، بەڵکە بیکەنە ئێزدی و موسڵمان و قزڵباش و شیعەو سوننیو عەلی ئیلاهی و کاکەییو هەتا هەورامی و زازاو لوڕو بەختیاری و هەندێ هۆزو زاراوەی کوردی. بەگشتی، عەرەبو فارس و تورك هەوڵی زۆریان داوە نەتەوەی کورد بە بەشێك لە نەتەوەکەی خۆیان دابنێن.

نووسەر کە باسی کوشتاری بەکومەڵی ئەرمەنیەکانی لە ١٩١٥دا بەدەستی سەرکوتگەرانی تورك کردووە، نەك تەنیا کوردە ئێززدیەکان، بەڵکو کوردە موسڵمان و عەلەوی و ئاسوریەکانیشی تێوە گلاندووەو، باسی ڕاپەرینەکانی پێشترو پاشتری نەکردووە کە چۆن بزووتنەوەکانی کوردیان بێبەزەیی سەرکوت کردووەو سەرکوتکەرانی تورك نەیاندەپرسی کامەیان موسڵمان و ناموسڵمانە، باسی ئەوەیشی نەکردووە کە لە تەواوی ڕاپەرینەکانی کورددا تائێستاش تەواوی نوێنەرانی دینی (ئێزدی و موسڵمان)ی تێدا بەشدارییان کردووە و پێکەوە خوێنیان ڕشتووەو دەربەدەرو زیندانی کراون؛ یا لە باشووری کوردستان ڕژێمی بەعس چیی بەسەر کوردی ئێزدی و نائێزدی هێنا! نازانێ

خۆی لیٚ گێل کردووه که چەند کوردی ئێزدی له سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردو دامودەزگاکانی حکوومەتی باشووری کوردستاندا هەن.

نووسەر دیاره هەموو نووسراوەکانی زانای بەناوبانگی ئەرمەنی لەسەر کورد نەخوێندوەتەوه که ئێزدیەکان له کورد جیاناکاتەوه. نووسەرانی تریش باسی "ئاندەرانیك"ی ئەرمەنییان به باشی کردووه. نازانیٚ هەر ئەم پیاوه له سەردەمی شەڕی جیهانیی یەکەم و پاش جەنگدا بکوژی کوردەکان بووەو، ڕاپۆرتی فەرماندەکانی سوپای ڕووسیا له سەردەمی ناوبراودا باشترین بەڵگەی زیندووه که تەنانەت هێزەکانی ڕووسیش زۆر لەم کردەوه نامرۆڤانەیەی ئاندرانیکی ئەرمەنی ناڕازی بوون و ئاگاداریان کردوەتەوه. باسی بەشداری ئێزدیەکانی له شەڕی ئازەربایجان و ئەرمینیا کردووه که یارمەتیو شەهیدێکی زۆریان داوه بۆ پشتیوانیکردنی هێزەکانی ئەرمەنی. بەڵام باسی ئەوەی نەکردووه که لەکاتی شەڕەکەدا ئەرمەنیەکان گەلێك بەڵێنیان به کوردەکاندا دابوو، کەچی پاش داگیرکردنی ناگورناقەرەباخ که کوردستانی سووریش دەکەوێته ئەوناوه، بەڵێنی ئۆتۆنۆمییان به کورد دابوو. زۆر ناسەرکەوتوانه ویستوویه سلاڤیان و سیربیارو خارواتیەکان لەگەڵ کورددا بەراورد بکات، که جێی خۆی نییه.

بەڵام چەند ڕاستییەکی دەرخستووه، دان پێدانانی سیاسەتی کوردی کاربەدەستانی ئەرمەنییه له سەد ساڵی ڕابردوودا، که هەمیشه کوردو ئێزدییان بەجیا وەك دوو نەتەوەی جیاواز لەقەڵەم داوه. وەك له نووسراوەکەیدا دیاره، ماددەکانی ١٥و ٦٤ی یاسای بنچینەیی کۆماری ئەرمەنستان سەبارەت به مافی مرۆڤ و کەمەنەتەوەکان جێبەجیٚ نەکراوەو، ئەنجامەکەیشی ئەو دوو بەرەکیو جیاوازیەیه که خستوویانەته نێوان کوردی ئێزدیو موسڵمان و پەرەیان پیٚ داوه.

سەبارەت به گوتاری دووهەم که باسی کوردی ئەرمینیای کردووه، سەرەڕای دوورەپەرێزی یا ترس و نەبوونی بوار، نووسەر هەڵوێستێکی نیشتمانی و نەتەوەپەروەرانەی هەیه؛ باسی ئازارو مەینەتی ژیانی کوردەکانی ئەرمینیای کردووەو، له بێبەشیو دەوریان له دامودەزگای ئەرمەنستاندا دوواوه. باسی

چۆنیەتی دەرپەراندنی کوردە موسڵمانەکانی لە ئەرمینیا کردووە، بەڵام نەیوێراوە بەراشکاوی بڵێ دەسەڵاتدارانی ئەرمەنی بۆ گەیشتن بەم مەبەستە سوودیان لە کوردە ئێزدیەکانیش وەرگرتووە بۆ وەدەرنانی کوردە موسڵمانەکان. ئینجا نۆرەی کوردە ئێزدیەکان خۆیان هاتووە، کە زۆربەیان راستەوخۆ یا ناراستەوخو لەوێ هەڵکەندران یا لەناو ئەرمەنەکاندا توانەوە. هەردوو نووسەر وەك یەك باسی ئازارو کەموکوڕیو داخوازەکانیان کردوون، تەنانەت وەك یەك ناوی نیشتەجێی کوردەکانیان هێناوە کە زۆربەیان کوردین، گەرچی هەندێکیان گۆڕاون. واتە کوردی موسڵمان و ئێزدی پێکەوەو تێکەڵ ژیاون.

# ئێزدیەکان

(کتێبی: نەتەوەکانی دانیشتووی ئەرمینیا، چاپی ئیرەڤان، ١٩٩٨، ل٦٣-٧٠)

گوتاری سەرۆکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانی فۆندی نێونەتەوەیی ئێزدیەکان جەمال سەداخیان"

ئێزدیەکان لەبواری ئانترۆپۆلۆگییەوە بەشێکن لە بنەماڵەی ڕەگەزی بچووکی ئەرمەنیو یەکێکن لە ڕەگەزە گەورەکانی ئوروپایی. زمانی ئێزدیەکان (ئێزدی) یەکێکە لە زمانەکانی باکوور- ڕۆژاوای گرووپی زمانە ئێرانیەکان کە لە بنەماڵەی زمانە هیندۆ ئوروپاییەکانە.

ژمارەی گشتی ئێزدیەکان لە جیهاندا لە دوو ملیۆن زیاترەو زۆربەیان لە عیراق (لە ناوچەکانی شەنگال و شێخان) و لە تورکیا (لە موبین، دیاربکر، موش، ساسون، بتلیس و وان) و هەروەها لە ئێران و سووریا و جۆرجیاو ڕووسیاو ئەڵمان دەژین. لە ئەرمینیا، نزیکەی شەست هەزار ئێزدی دەژین و، زۆربەیان خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین و، لەناو شارەکانی ئەرمینیا چین و توێژێکی تر دەژین کە نوێنەرانی زانست و کولتوورو کۆمەڵایەتین. لە ئیرەڤان، ڕێکخراوی یەکێتی نەتەوەیی ئێزدیەکان ڕۆژنامەی ڕەسمی خۆیان بەناوی (دەنگی ئێزدیەکان) "گولەس یەزیدوڤ"ەوە دەردەکەن، ڕادیۆی میللی ئەرمینیا ڕۆژانە بۆ ماوەی سی خولەك بە زمانی ئێزدی بەرنامەی هەیە.

ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی سیاسی بەناوی "یەزدیخان" لە ١٩٩٦ەوە خەریکی چالاکیو مەبەستی پرۆگرامەکەی هاوکاری هەمەلایەنەی هاووڵاتیانی ئێزدیی کۆماری ئەرمینیایە بۆ ڕاکێشانیان لەپێناوی گەیشتن بە پرۆسەی دەسەڵاتێکی

گەلێریدا. ڕێکخراوی کومەڵایەتی"فوندی جیهانی ئێزدیەکان"(مالاتی ئێزدی) لە سەرەتای ١٩٩٨دا پێك هات، کە دەبوو بۆ پێکهێنانی ناوەندێکی زانیاریو کولتووری نەتەوەیی ئێزدی تێبکۆشێ.

دۆستایەتی گەلانی ئەرمەن–ئێزدی لە قووڵایی سەدەکانەوە دێت، با ئەو ڕۆژە خوێناویانەی ١٩١٥ کە بۆ گەلی ئێزدی تاڵ و بێبەزییانە بوون، بیربهێنینەوە کە هەردوو گەلی ئەرمەنیو ئێزدی کەوتنە بەر شالاّوی چەوسانەوەو کوشت و کوشتار. لەو بارودوخە دژوارو سەختەدا هەردوو گەل بوونە پاڵپشتی یەکتر. ڕاستییەکی مێژوویی و حاشانەکراوی ساڵی١٩١٥ ئەوەیە، کاتێك دەوڵەتی تورکیا بڕیاری کوشتارو ڕاونانی ئەرمەنیەکانی بۆ بیابانەکان دەرکرد، ئێزدیەکان نزیکەی شەش هەزار ئەرمەنییان لەدەست بکوژەکانی تورك ڕزگار کرد و پەنایان دان و لە ئامێزیان گرتن. هەر بۆیە لە ١٥ی شوباتی ١٩١٧دا دەوڵەتەکانی تورکیاو ئەڵمان ئێزدیەکانیان وەك دوژمنی خۆیان تاوانبارکرد. بەڵام سەرەڕای ئەوەیش، خۆیان ڕاگرت و درێژەیان بە یارمەتیدانی ئەرمەنەکان دا.

لێردا لەجێی خۆیدایە وتەی ڕووناکبیری مەزنی گەلی ئەرمەنی "خاچاتور ئەبوڤیان" بەبیربهێنینەوە: ((ئێزدیەکان و بیروباوەڕەکەیان، گەرچی لە هەموو شوێنێك کەوتوونەتە بەر شالاّو ڕاونانو نەفرەتکراوی هەموان بوون، بەڵام تا ئەمڕۆش لەبەر ئەو سروشتە ئازایەی کە هەیانە، ئەم گەلە بەرەنگاری لە خۆیو پاشەکشەی بە دوژمن کرد)).

لە ڕۆژە ڕەشەکانی ژینوسایددا، دۆستایەتی سەدان ساڵەی دوو گەل بە هاوکاری دوو سەرکردەی لەشکری "ئاندرانیك"ی ئەرمەنیو "جەهانگیر ئاغا"ی ئێزدی دژی تورکەکان خۆی نیشان دا. ئێزدیەکان چالاکییەکی بەرچاویان لە شەڕەکانی دەوروبەری بامش ئاپاران و سەردارئابادو.... نواند و لاپەڕەیەکی نوێیان لە مێژووی هەردوو گەلدا نەخشاند. هەموو ساڵێك ٧/١٥ ڕوژی قوربانیەکانی ئەم تراژدیایەیەو، نابێ تراژدیای ئێزدیەکانیش کە هەشتا ساڵ لەمەوبەر لە تورکیا ڕووی دا لەبیربکرێ.

دۆستایەتی دوو گەلی ئەرمەن و ئێزدی نەپچڕاوە. باشترین بەڵگەیش بۆ ئەمە ڕووداوەکانی ١٩٨٨ (شەڕی ئەمینیاو ئازەربایجان لەسەر ناگورناقەرەباخ، هەورامی)تە. کاتێك بزووتنەوەیکی گەلێری ئەرمینیا بۆ پاراستنی سەروەری خاکی ئەرمینیا دەستی پێکرد، ئێزدیەکانیش بەشدارییان تێدا کردو، بۆ ئازادکردنی "ئارشاخ" ژمارەیەکی زۆری ئێزدی زۆر خۆبەختکەرانە چوونە ڕیزی سوپای ئەرمینیاوە. زیاتر لە سی ئێزدی جەنگاوەر شەهید کران. بزووتنەوەی ئارشاخ بوو بە مەشق و تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ جەنگاوەرە لاوەکانی ئێزدی کە لە خۆپاراستنی گورس، ڤایك، ئیراسخەڤان، ئیجەڤاندا بەشدارییان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ژنە ئێزدیەکانیش شەڕیان کرد، ئێزدیەکان یارمەتییەکی زۆریان، لە بواری ماددیو داراییدا، پێشکەشی شەڕی ئارتساخدا کرد. ئێزدیەکان، جگە لە زمانی خۆیان زمانی ئەرمەنیش بەتەواوی دەزانن و بە ئازادی پێی دەدوێن. بۆچوونی وا هەیە کە دەڵێن ئێزدیەکانیش کوردن. ئەم بۆچوونە بێبناغەیەو، بەگوێرەی پێویست بەرپەرچ دراوەتەوەو مەحکوم کراوەو ڕەخنەی لێ گیراوە. ئێزدیەکان، بە زمانی نووسراوو دینو دابو نەریت و تایبەتمەندیەکانی تری ئەتنیکی، گەلێکی سەربەخۆن، یەکبوون یا لەیەکترچوونی ئێزدیەکان لەگەڵ هەر گەلێکی تردا، مانای ڕەتکردنەوەیەکی میکانیزمی سەربەخۆبوونی ئەو گەلەیە کە سەدانساڵە نیشانی داوەو ئیسپاتی کردووە.

لای هەموان ئاشکرایە کە سلاڤیانەکانی سیربیاو خارڤاتیا بە یەك زمان قسەدەکەن و سەر بە یەك گرووپی ئەتنیکیشن، بەڵام دینیان جیاوازە. واتە پراڤاسلاڤ و کاسولیك و موسڵمانن و، سێ دەوڵەتی جیاوازیان پێك هێناوە. ئێزدیەکان بەدرێژایی سەدان ساڵ دین و زمانی خۆیان و نەتەوەو ڕواڵەت یا دیمەنی ئەتنیکی خۆیان پاراستووە. لێرە دیسانەوە وتە بەنرخەکانی "خاچەتۆر ئەبوڤیان" بەبیردێنینەوە کە دەڵێ: ((گەل (نەتەوە) بە زمان و دینی خۆی دەپارێزرێ)). ئێزدیەکان هەر بەم چەشنە، بە درێژایی سەدەکان تا ئەمڕۆ خۆیان پاراستووە.

ماتریالەکان (کەرەستە نووسراوەکان) سەبارەت بە (دانیشتوانی ئەرمینیا لە سەد سالّی ڕابردوو ١٨٣١-١٩٣١)دا، نیشانی دەدەن کە ئێزدیەکان لە هەموو بەڵگەکاندا وەك نەتەوەیەکی جیاواز لە گەلانی ترو لەوانە لە کوردەکانیش لەقەڵەم دراون. بەپێی سەرژمێریەکان، ئێزدیەکان لە ئاپاران، باسارگیچار، نوربایەزید و ڤیدی دەژین. لە کۆماری ئەرمینیا نوێنەرانی گەل (نەتەوە) دەژین کە لەڕووی چەندایەتییەوە پلەی دووهەمیان هەیە. بەپێی سەرژمێری سالّی ١٩٨٩، لە ئەرمینیا ٥٣,٩٨٠ کەسن (پەنجاوسێ هەزارو نۆسەدوهەشتا). دوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کۆماری ئەرمەنستان، وەك دەزانن بارودۆخێکی دژواری کۆمەڵایەتی-ئابووری باڵی کێشا بەسەر ئەم وڵاتەدا، بە سەرماو سوڵەو وەستانی دووروودرێژی خەڵك بۆ نان و نەبوونی هۆیەکانی گواستنەوە، کاتێك خەڵك ناچار بوون ڕۆژانە دەیان کیلۆمەتر بەپێ برۆن، سەرەتاکانی سالآنی نەوەت بەبیر بهێنینەوە.

شتێکی شاراوەیش نییە کە لەم سالآنەدا خەڵکی ئەم کۆمارە کەوتنە کۆچکردن و پەنابەری بۆ ئێمە دیاردەیەکی پەسند نەکراوە. بەڵام ئەوە ڕاستییە کە ئاوارەبوون و کۆچ ئێزدیەکانی گرتوەتەوە. بەپێی سەرچاوە سەرژمێریەکان نزیکەی ١٠٪ی دانیشتوانی کۆماری ئەرمەنستان لەم سالآنەدا ئێرەیان بەجێهێشتووە. ئاوارەبوون لە ئەرمینیاوە، چ ئەرمەنی و چ نوێنەرانی گەلانی ترو لەوانە ئێزدیەکانیش، لە سالآنی نەوەتەوە بەپێی بنەمایەکی ئازادو سەربەستانە، بەداخەوە لەبەر هەندێ فاکتەری واقیعی لەزیادبووندایە.

بەپێی یاسای بنچینەیی کۆماری ئەرمینیا، دەسەڵات لەڕێگەی گەلەوە هەڵدەبژدرێ و یاسای بنچینەیی کۆماری ئەرمینیا یاسای نێونەتەوەیی ڕەچاو و مافی پاراستن و ئازادی مرۆڤ مسۆگەر ئەکات و بوار نادات هیچ چەشنە جیاوازییەك لە زمان و ناسیونال و ئایین و ... لەناو دانیشتوانی ئەرمینیادا هەبێ. ئەم مافە ڕەوایە بەڕوونی لە ماددەی پانزەی یاسای بنچینەیی کۆماری ئەرمینیادا جێ کراوەتەوە، سەبارەت بەوەی کە دانیشتوانی کۆماری ئەرمینیا، بەبێ لەبەرچاوگرتنی نەتەوەو ڕەگەزو زبان و ئایین و چۆنیەتی باری کومەڵایەتی و

نیشانەکانی تر، هەموو ماف و ئازادی و بەرپرسییەکیان هەیەو مسۆگەر کراوە. لە ماددەی شەست و چواری یاسای بنچینەیشدا هاتووە، بۆ نوێنەرایەتی پەرلەمانی کۆماری ئەرمینیا تەواوی دانیشتوانی کۆماری ئەرمینیا کە تەمەنیان گەیشتبێتە ٢٥ ساڵ و ٥ ساڵی دوایی هەمیشە لە ئەرمینیادا ژیابێ و ناسنامەی ئەرمەنی هەبێ، مافی هەڵبژاردنی هەیەو دەتوانێ خۆی بپاڵێوێ.

لەم دوو ماددەیەی یاسای بنچینەییدا دیارە کە لەم بوارە گرنگەدا جیاوازی نەتەوەیی بە هیچ شیوەیەك ناکرێ. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانەی کە باس کران، پیشنیار دەکەین کە:

١- ڕووناکبیرانی ئێزدی بۆ تاووتوێکردنی گەلاڵەی یاساکانی پەرلەمانی میللی ئەرمینیا ڕابکێشن.

٢. لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی میللی ئەرمینیادا بوار بە کۆمەڵەی ئێزدیەکان بدرێ نوێنەرانی خۆیان بۆ ئەم ئەنجومەنە کاندیدو هەڵبژێرن.

٣. لە بەڕێوەبەرایەتی و دامودەزگای دەوڵەتیدا، پسپۆڕی ئێزدی دابنرێ.

٤. بۆ ڕێکخستنی ناوەندێکی کولتووری بۆ کومەڵەی ئێزدیەکان شوێنی (بینایەك) لە شاری ئیرڤان دیاری بکرێ (دەتوانین شوێنێکی لەبار، بۆ وێنە، سینەما تیئاتری"ئیریبونی" پێشوو دیاری بکەین)، لەبەرئەوەی ئێزدیەکان لە ئیرەڤان نە تەنیا ناوەندێکیان نییە، بەڵکوو تائێستا لە هەموو ئەرمینیاش ناوەندێکی ئەوتۆیان نییە.

٥. لە پەیمانگەی میللی ڕۆژهەلاتناسی ئاکادیمیای زانیاری ئەرمەنستان، بەشی ئێزدیناسی (ئێزدالۆگیا) بکرێتەوە، تا بواری لێکوڵینەوەی مێژوویی ئێزدیەکانی هەبێ و بتوانێ بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و بابەتی مێژووی گەلی ئێزدی کە تائێستا ئاواژوو کراوەو هەوڵی زۆر دراوە بیسەلمێنن سەر بە نەتەوەیەکی ترن، ئاراستەی بیرورای گشتی بکەن.

٦. لە یەکێتی نووسەرانی ئەرمەنستان، بەشی نووسەرانی ئێزدیش بکرێتەوە.

٧. بۆ یادگاری هەمیشەیی و ڕێزنان لە جەنگاوەرانی ئێزدی کە لە ناوچە سەرسنوورییەکانی ئەرمەنستان و لە شەڕەکانی ئارستاخدا شەهید کران، ناوی یەکێك لە شەقامەکانی شاری ئێرەڤانیان لێ بنرێ و پەیکەرێکی بیرەوەری بۆ ئێزدیە تێکۆشەرەکانی ڕێگەی ئازادی دروست بکرێ.

٨. لە تەلەفزیۆنی میللی ئەرمینیاو لەژێر چاودێری و پشتیوانی دەوڵەتدا، لە حەفتەیەکدا کاتژمێرێك بەرنامە بە زمانی ئێزدی بلاوبکریتەوە.

٩. تا هەڵبژاردنی نوێ، نوێنەریکی گەلی ئێزدی بۆ پەرلەمانی ئەرمەنستان (مەجلیسی میللی)دیاری بکرێ.

**شوینی نیشتەجێی ئێزدیەکان لە کۆماری ئەرمینیا بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩**

| شارەکان | ژمارەی دانیشتوان |
|---|---|
| ئێرەڤان | ٧٠٨٦ |
| ئەبوڤیان | ٤٦٥ |
| ئەڵلاوێردی | ٩ |
| ئاشتاراك | ٨٣ |
| ئارارات | ٥٤ |
| ئارتیك | ٦٤ |
| ئارتاشات | ٣٦٣ |
| گوریس | – |
| دیلیجان | ١٨٦ |
| ئەچمیادزین | ١٠٠٧ |
| ئەجوان | ١ |
| گومری (لینینەکان) | ٣٢٥ |
| کامو | ١ |
| ڤانادزور (کیروڤەکان) | ٣٣ |
| ئارماویر (ئوکتیمبریان) | ٩٣٨ |
| رازدان | ١٣٣ |

| | |
|---|---|
| کاپان | - |
| چارنیتساوان | ١٥١ |
| چەرموك | ١ |
| سیوان | ١٥٥ |
| سپیتاك | ٣٣ |
| ستیپانەوان | ١٦٨ |
| سەرجەم | ١١١٣٣ |

| ناوچەکان | ژمارەی دانیشتوان |
|---|---|
| ئەبوڤیان | ١٨٤٠ |
| ئارزنی | ١٤٣ |
| بیروخەوان | ٥٥ |
| عەزیزبەیکوڤ (ڤایك) | ٣ |
| ئاخوریان | ٢٣٧ |
| ئاماسیا | - |
| ئانی | ٢٨٥ |
| ئاشتاراك | ٢١٦٩ |
| ئاپاران | ٧٣ |
| ئاراگاتس | ٤٠٣٤ |
| ئارارات | ٢١٤٢ |
| ئارتیك | ٩٩ |
| ئارتاشات | ٢٦٥١ |
| گوتارك | ٣٨ |
| ئیخیگنادزور | ١٧ |
| ئەچمیادزین | ٧٣٠٣ |
| تالین | ٤١٩٣ |
| تومانیان | ٨٣ |

| | |
|---|---|
| ئەجوان | ٣٧ |
| کالینین (تاشیر) | ٥٦ |
| کامو | ٤١ |
| کراسناسیلسك | ١٤٠ |
| ئارماویر | ٩٩٥٢ |
| رازدان | ٤١٤ |
| کاپان | ٤ |
| ئاشوتسك (گوکاسیان) | ٣ |
| ماسیسی | ٣٢٣١ |
| مارتونی | ١٨ |
| میگری | ٢ |
| نایری | ٢٣٨٨ |
| نوئیمبەریان | ١١ |
| شەمشەدین (تائوش) | ١٠ |
| سیوان | ٢٤٩ |
| سیسیان | ١٢ |
| سپتیاك | ٤ |
| ستیپانەوان | ٤٣ |
| ڤاردیسی | ٣٣٩ |
| (سەرجەم) | ٤٢٣٣٧ |

# کورد لە ئەرمینیا

(سەرچاوەی پێشوو)

(نوسینی ئاماریکی سەردار- سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی شووڕای ڕووناکبیرانی کوردی کۆماری ئەرمینیا سەرنوسەری ڕۆژنامەی"ڕێیا تازە"، ڕۆژنامەنووسی خزمەتگوزاری ئەرمینیا)

ئێمە کە لەسەر "کوردەکان" دەدوێین، بە شێوەیەکی گشتی باسیان دەکەین. واتە کە دەڵێین کوردەکان، مەبەستمان هەم کوردە موسڵمانەکان و هەم ئەو بەشەی ئێزدیەکانە کە خۆیان بە کوردی ئێزدی دادەنێن. جگە لەوە، هەروەك ئاشکرایە بەشەکەی تری ئێزدیەکان تا ئەمڕۆش ئایینی کۆنی خۆیان، واتە ڕۆژپەرستی خۆیان، پاراستووەو خۆیان بە گەلێکی جیاواز دادەنێن. بۆیە بۆچوونی جیاواز لەسەر ئەم کێشەیە هەیەو، گفتوگۆی زۆریشی لەسەر دەکرێ. بەڵام دوان و لێدوان و ڕوونکردنەوە لەم بارەوە ئەرکی ئێستای ئێمە نییە.

فاکتە مێژووییەکان ئەوەمان بۆ دەردەخەن، کە هێشتا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە هەندێ هۆزو خێڵی کورد لە ئەرمەنستانی ڕۆژهەڵاتدا ژیاون و، لەبەر سیاسەتی چەوساندنەوەی تورکیاو، هەروەها لەبەر ڕووبەڕووبوونەوەی کوردی موسڵمان و ئێزدی کە دەسەڵاتدارانی تورکیا بە هەموو توانای خۆیانەوە دەستیان لە هەڵگیرساندن و پەرەپێدانیدا هەبوو، کوردە ئێزدیەکان کاتی شەڕی ڕووسیا- تورکیا لە١٨٧٨-١٨٧٧دا لە (عەین تەپە)وە کۆچباری ئەرمەنستانی ڕۆژهەڵات بوون و لە ناوچەی تیکور (گوبیرنی کاخ)، سورمالو، ئاپاران، ئەچمیادزین، ئارماویرو ئاشتاراك جێگیربوون. کاتی شەڕی جیهانیی یەکەمیش، زۆربەی کوردە

ئێزدیەکان لە ناوچەکانی (گوبرنی) قارس و سورمالین و وان هەڵکەنراون و، لە ناوچەکانی ئاپاران و تالین و ئارماویر، ئەچمیادزین، ماسیس، ئارارات، ئاشتاراک، ئارتاشات و، لە جۆرجیاش زۆربەیان لە شارەکانی تیبلیس و باتوم و تیلاو جێگیر بوون. لە ئەرمینیا کوردە ئێزدیەکان لە گوندەکانی ناوچەکانی ئاراگاتسون، ئارماویر، ئارارات دەژین. کوردێکی ئێزدی زۆریش لە گوندەکانی دوڵی ئارارات (لەگەڵ دانیشتوانی تر (تێکەڵوپێکەڵ) دەژین. لە شارەکانی ئیرەڤان و گومری، ڤانادزور، ئەبوڤیان، دلیجان، ستیپاتووان و تاشیریش دەژین.

ئیش‌وکاری سەرەکی کوردەکان ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵە. زۆربەی گوندە کوردنشینەکان لە ناوچە کوێستانیەکاندا لەگەڵ ئاژەڵداریدا، کشتوکاڵی جۆو گەنم و پەتاتە دەکەن. ئەو کوردانەی کە لە دوڵی ئارارات دەژین، باخداریش (باخەوانی) دەکەن.

لەناو کوردەکانی شارنشیندا، کرێکارو فەرمانبەرو ئەندازیار و ڕووناکبیر هەیە. پێویستە بگوترێ لەماوەی حەفتا ساڵی ڕابردوودا، کوردەکانی ئەرمینیا، نەك تەنیا گەیشتوونەتە ئاستێکی پێشکەوتن، بەڵکوو ژمارەی دانیشتوانیشیان زیادی کردووە. بۆ وێنە، ئەگەر لە ١٩٣٣دا (٨٦٥٠) (هەشت هەزارو شەشسەدو پەنجا) کوردی موسڵمان و ئێزدی ژیابن، ئێستا بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ زیاتر لە شەست هەزار کەس لە ئەرمینیا دەژین.

زۆربەی کوردە موسڵمانەکانی ئەرمینیا لەنێوان ١٩٨٩–١٩٩٠دا لەگەڵ ئازەریە موسڵمانەکانی ئێرەدا ئەرمینیایان بەجێهێشت. هۆی سەرەکی ئەم بەجێهێشتن و ئاوارەبوونە، ئەوە بوو کە ئەوانە لە گوندە ئازەری‌نشینەکانی ئەرمینیا دەژیان و، پەیوەندی بنەماڵەیان بەیەکەوە هەبوە و، منداڵانی کورد لە قوتابخانەکانی ئازەری دەیانخوێند. ژمارەی ئاوارەکانی کوردی موسڵمان نزیکەی دەهەزار کەسە، ژمارەیەکیش لە کوردە ئێزدیەکانی ئەرمینیا (نزیکەی دوانزەهەزار کەس) هەروا ئاوارەی دەرەوەی ئەرمینیا بوون. بۆ وێنە، ئێستا تەنیا لە هەرێمی یاروسلاڤی (ڕووسیا) هەشتسەد بنەماڵەی ئێزدی دەژین‌و، زۆربەی هەرەزۆریان لە ئەرمینیاوە هاتوون. سەرەڕای ئەمەیش، ئەوانە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ کۆماری ئەرمینیا

نەپچڕاندووە، ئەوانە منداڵەکانی خۆیان نەفرۆشتووەو، تەنانەت ئەوانەیش کە لەوێ کۆچی دواییان کردووە، بۆ ناشتن هێنراونەتەوە بۆ ئەرمینیا. ئێستا ژمارەی دانیشتوانی کوردی موسڵمان و ئێزدی لە ئەرمینیا نزیکەی چل هەزار کەسە.

هۆی سەرەکی ئاوارەبوونی کوردە ئێزدیەکان، ئاڵوزیو سەختی بارودخی ئابوریيە کە تەواوی دانیشتوانی کۆماری ئەرمینیای گرتوەتەوە. ئێمە هیچ کاتێك هەستمان بە جیاوازی نەتەوەییو چەوسانەوەو ئازاردان لە ئەرمینیا نەکردووەو، هەست بەوە دەکەین کە هەموو مافێکی هاووڵاتیمان هەیە، واتە ئەو مافانەی کە لە یاسای بنچینەییدا تۆمارکراون.

ئەرمەنستان ئەو وڵاتەیە کە کۆمەڵگەی ئێمەی کوردەکانی لێ جێگیر کراو بە هاوکاری ڕاستەوخۆی ڕووناکبیرانی ئەرمەنی پەرەی بە کولتووری نەتەوەیی خۆی داوە. ئێستا ڕ بەرنامەی ڕادیۆیی ڕۆژانە کاتژمێرێك و پازدە خولەك بە زمانی کوردی بڵاودەبێتەوە. لە(١٩٣٠)ەوە تائەمڕۆ ڕۆژنامەی ڕێیا تازە بە یارمەتی دەوڵەت دەردەچێ، کە لەکاتی خۆیدا یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بوو لە یەکێتیی سۆڤێت. لە پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتناسی کۆڕی زانیاری (ئاکادیمیای زانست)ی میللی ئەرمەنستان، گرووپی کوردناسی و لە زانکۆی "داویت ئاناخت" بەشی کوردناسی هەیە.

یەکەم فیلمی هونەری و بەڵگەنامەیی کە باسی ژیانی کولتووری کوردەکان دەکات، لە ئەرمینا بەرهەم هێنراوە (بۆ وێنە، فیلمەکانی"زاری"، "کوردە ئێزدیەکان"، "کوردەکانی ئەرمینیا"، "کوردەکانی ئەرمینیا"... هتد). زیاتر لە شەست ساڵەو بەشی نوسەرانی کورد لە یەکێتی نووسەرانی ئەرمینیادا کاردەکات. لە قوتابخانەی گوندە کوردنشینەکاندا لە پۆلی دووهەمەوە تا هەشتەم دوو سەعات لە حەفتەدا بە زمانی کوردی وانە دەگوترێتەوە.

ئەم دە ساڵەی دوایی، لە ئەرمینیا ئەوەندە کتێب (لەبواری هونەری، وەرگێڕانی زانستیو سیاسی) بە زمانی کوردی دەرچووە کە لە هیچ وڵاتێکی تر، یا بە واتایەکی تر، لە یەك وڵاتی تردا ئەوەندە دەرنەچوە. کوردەکانی ئەرمینیا

سوپایەکی ڕووناکبیری زۆریان هەیە وەك زانا و نووسەرو دکتۆرو ئەندازیارو .... بەلاّم بەداخەوە بەشێکی زۆریان، لەبەر سەختی باری ئابووری، ئەرمەنستانیان بەجیّهێشتووە. لە ئەرمینیا چەند کۆمەڵەو ڕێکخراوی کۆمەلاّیەتی کوردی کاردەکەن.

بەم چەشنە، تا ئەو جێگەیەی کە بوار ڕەخسابیّ، کوردەکانی ئەرمینیا کەڵکیان وەرگرتووە بۆ پەرەدان بە کولتووری خۆیانو ئەزمونێکی دەوڵەمەندیشیان لەم بارەوە هەیە. ئەوی ئەمڕۆ پێویستە بۆ کێشەی کوردەکانی ئەرمینیا بکریّ، مۆڵەتی میکانیزمی کاری ڕێکخراوو کۆمەڵە کوردیەکان بدریّ بۆ چارەسەری ئەو کێشە نوێیانەی کە هاتوونەتە پێش و، ئەو کەموکوڕیانەی کە هەبوون، لابرێن و چارەسەر بکرێن و، ئەو شتانەش کە نەکراوە بکرێن.

لەم سالاّنەی دواییدا، لە ئەنجامی قۆناغی گواستنەوەو ئاڵوگۆڕەکاندا، هەندیّ کێشە هاتوونەتە بەردەم کۆمەلاّنی کوردی ئەرمینیا. بەداخەوە گەورەترین ژمارەی کەمەنەتەوەکانی ئەرمەنستان، واتە کوردەکان، هێشتا نوێنەرێکیان لە پەرلەمانی ئەرمینیادا نییە. پێویست بە بیرهێنانەوەیە کە سالّی ١٩١٨ تا ١٩٩٠ ئێمە یەك یا زیاتر لە یەك کەسمان لە پەرلەمانی ئەرمینیا هەبوە. نەبوونی کوردەکان لە پەرلەمانی ئەرمینیادا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەموکوریەی کە لە یاسای هەڵبژاردندا هەیەو بەتەواوی کاری لەسەر نەکراوە. پێم وایە پێویستە لەم بارەوە ئەزموونی ئێران و لوبنان لەپێش چاوبگرین. لەم دوو ولاّتەدا نوێنەرانی کەمەنەتەوەکان لەلایەن کۆمەڵگەی خۆیانەوە هەڵدەبژێردرێن و، نوێنەرانی ئەرمەنی بەم چەشنە بۆ پەرلەمانی ئەم دوو ولاّتە (ئێران و لوبنان) هەڵدەبژێردران. ئێمە هەروەها نوێنەرمان لە دامودەزگای جێبەجێکەری (دەوڵەتی) کۆماری ئەرمەنستانیشدا نییە، گەرچی ئێمە لێوەشاوەییەکی ئەوتۆمان هەیە. زۆر حەز دەکەین و باشتریش بوو مرۆڤێکی ئەوتۆ لە نووسینگەی سەرۆك کۆماری یا دەوڵەتی (شووڕای وەزیران)دا هەبیّ کە ئاگاداری کێشەکەی ئێمە بیّ و بیزانیّ.

زۆریش پێویستە لە کۆمارەکەماندا کادێری نەتەوەیی ئامادەبکریّ و، ئێمە لەم باریشەوە ئەزموونێکی تەواومان هەیە. لەکاتی خۆیدا ئێمە خاوەنی پەیمانگەی

پەروەردەی کوردی بووین و بەشی کوردناسی لە فاکولتەی ڕۆژهەڵاتناسی زانکۆی ئێرەڤان هەبوو کە پسپۆڕیان بۆ ئامادە دەکردین و وەڵامدەری پێویستیەکان بوون. کەواتە ئەگەر ئێمە هەبوونی گرووپی کوردناسی، ڕۆژنامەی کوردی، هەبوونی بەرنامەی ڕادیۆیی بە زمانی کوردی، گوتنەوەی زمانی کوردی و ئەدەبیاتی کوردی لە قوتابخانەکاندا لەبەرچاو بگرین، نەبوونی کادیر و ئامادەنەکردنیان بۆ ئەم ناوەندە کوردییانە مەنتیقی نییە.

کردنەوەی بەشی کوردناسی لە پەیمانگەی پەروەردەیی ئەرمینیاو زانکۆی ئێرەڤان یا لە فاکولتەی زمانناسی، بە وەرگرتنی ٤ تا ٥ قوتابی کورد (بەبێ ململانێ بە ڕاسپاردەی دەوڵەت) لەم ناوەندانە پێویستیەکانی کادیری کوردی کە لەمێژە هەستیان پێ دەکرێ، جێبەجێ دەبوو. جگە لەوە، ئەگەر ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە هیچ پسپۆڕێکی پێداگوك (پەردوەردە)مان بۆ زمانی کوردی نییە. هەروەها کەموکوڕییەکی زۆر لە دەستخستن و ئامادەکردنی کتێبی قوتابخانەدا هەیە بۆ قوتابیانی کورد (بە زمان و ئەدەبیاتی کوردی). ئێستا زیاتر لە ١٥ ساڵە ئەم کتێبانە لەچاپ نادرێن و، ئەوەیش کە هەیە، وەڵامدەرەوەی ئەم سەردەمە نییە. تەلەفزیۆن تایبەتمەندی و کاریگەریکی ڕاستەوخۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتیو نەتەوەییو کولتووریدا هەیە. لانی کەم بڵاوکردنەوەی بەرنامە لەسەر کوردەکان (بابەتە کوردیەکان)، ئەویش جاروبارو نەك بەردەوام، نیشانەی بایەخدانە و بە هەنگاوێکی گەورە دادەنرێ. بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی دەتوانێ دانیشتوانی ئەرمەنی زیاتر لە ژیان و دین و نەتەوە و کەلەپوور و... ی کوردەکانی ئێرە ئاگادار بکاتەوە.

ئەرمینیا، وەك ناوەندێکی کوردناسیو چاوگی بووژاندنەوەی کولتووری کوردی، جێگەیەکی تایبەتی هەیەو، داموودەزگای دەوڵەتیو پەیوەندی ئەرمەن لەم بارەوە زۆر باشە. بەهەڵکەوتیش نییە کە لێرە باس یا داوای ئۆتۆنۆمی کولتووری بۆ کوردەکان دەکرێ بۆ بووژانەوەو پەرەپێدانی زمان و کەلەپووری ئەم گەلە.

هەشت گوندی ناوچەی ئاراگاتسوتن، واتە گوندەکانی ئالاگیز، ئاڤ شین، دەریك جا موشلو، ڕێیا تازە، سەنگار، ئەمری تازە، بەشێکن لەو ناوچەیەی کە بە

ناوچەی لێقەوماو و زیان لێکەوتوو ڕاگەیەندراوە، کە لە ئەنجامی بوومەلەرزەوە زیانێکی زۆریان لێ کەوتووەو دانیشتوانیان تووشی قوربانییەکی گیانی زۆر بوون. زۆربەی خانوەکانی ئەم گوندانە وێران یا ڕوو لە ڕووخانن. هەروەها ناوەندە کولتوورییەکانی ئەم شوێنانە (کلووبەکانو کتێبخانەکان و ماڵە کولتوورییەکان و قوتابخانەکان)یش زیانیان لێ کەوتووە. ئەم گوندانە لە دە ساڵی ڕابردوودا هیچ کاروبارێکی دروستکردنی بینا یا چاککردنەوەو ئەو کاروبارانەی کە ڕاگیراون، بۆ نەکراوە. قوتابخانەی ناوەندی ئالاگیز، ئەو قوتابخانەیەیە کە لەناو قوتابییە دەرچووەکانیدا زاناو نووسەرو ڕۆژنامەنووس و دکتۆرو مافناس و... ی بەناوبانگی لێ هەڵکەوتووە، لە بارودوخێکی دڵتەزێندایە. وانەکان لە جێگەوڕێگەی کاتیدا دەگوترێنەوەو هیچ پێویستییەکی گەرمکردنەوەیان نییە. هەروەها قوتابخانەکانی ناوەندی گوندەکانی سیپان و دەریك و ڕێیا تازەیش لەو بارودوخەدان.

لە ١١ (یازدە) گوندی ناوچەی ئاراگاتس، تەنیا لە گوندی ئالاگیز بنکەیەکی تەندروستی هەیەو، لە هەشت گوندی ناوچەی تالین، تەنانەت شوێنێکی دەرمانکردنیشی لێ نییە.

چەند ساڵە ژمارەیەك لە گوندەکان، تەنانەت ئاوی خواردنیشیان نییەو، ئوتوبوس بەوێدا هاتوچۆ ناکات. تەنانەت لە هەندێ گوند یەك دەزگای تەلەفونیش نییە. ڕۆژنامە هەر ناگاتە لایان و، بگرە بواری بینینی تەلەفزیۆنیشیان نییە. لە گوندەکاندا تەنانەت ناوەندێکی کولتووری نییەو چۆڵ کراون و، تەنیا بەساڵاچوان و ژن و منداڵیان لێ دەژین. گەنجەکان بۆ بەدەستهێنانی بژێوی کەسوکاریان ئەوێیان بەجێهێشتووە. زۆربەی کێشەکانی ئێمە پێویستییان بە چارەسەر هەیە.

– نوێنەرێکی کورد لە پەرلەمانی ئەرمینیادا هەبێ.

– دەکرێ داموودەزگاکانی دەوڵەتی کەڵك لە هێزو توانای ڕووناکبیرو زاناو پسپۆری ئێمەوەربگرن.

– ئامادەکردنی کادیری کوردی.

- چاپکردنی کتێبی قوتابخانە لە بواری زمان و ئەدەبیاتی کوردیدا.
- دیاریکردنی لانی کەم سەعاتێك لە مانگێکدا بۆبەرنامەی تەلەفزیۆنی کوردی.
- بایەخی پێوست بە کردنەوەو چاککردنەوەی ناوەندە کولتووریەکان، بەتایبەت قوتابخانەکانی گوندە کوردنشینەکان بدرێ، بەتایبەت ئەوانەی کە ئێستا بە ناوچەی زیان لێکەوتوو دانراون. دروستکردنی دەرمانگە، خزمەتگوزاری گواستنەوە، ئاوی خواردنەوەو دابەشکردنی دادپەروەرانەی ئەو یارمەتیە مرۆڤانەیەی کە دەگات.
- ڕەخساندنی گەیاندنی ڕۆژنامە بۆ ئەو گوندانە.

لەو باوەڕەدام بە چاکتربوونی باری ئابووری، ئەو کێشانەی سەرەوەیش کە تووشی کۆمەڵانی گەلەکەمان بوون، چارەسەر دەکرێن. لەبەر ئەوە کەمەنەتەوەکانی کۆماری ئەرمینیا هیچ کاتێك تووشی جیاوازی نەتەوەیی نەبوون.

# ڕووخانی ئیمپراتۆریی سۆڤێت و
## قووڵبوونەوەی تراژیدیای کەمەنەتەوەو گەلانی دەربەدەرکراو

تا ڕژێمی سۆڤێتی مابوو، بەتایبەت لە سەردەمی هاتنە سەرکاری گەرباچۆڤدا، هیوای گەڕانەوەی ئەو گەلە بەزۆر دەرکراوانە بۆ نیشتمانی باووباپیران، نەك تەنیا مابوو، بەڵکە لەچاو جاران بەهێزتریش بوو. وێڕای بڕیارەکانی حیزب و دەوڵەت و پەرلەمانی ئەم دەوڵەتە، گەلێك بڕیاری نوێ لە سەردەمی گەرباچۆڤدا سەبارەت بە گەڕانەوەو قەرەبووکردنەوەی زیان و زەرەرێك کە لێیان کەوتووە دەرچوو و، لەسایەی سێبەری پیریسترۆیکاو ئازادی دەربڕیندا، گەلێك چالاکی لەم بارەیەوە کراو، بە شێوەیەکی بەربڵاو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەم وڵاتەدا پەردە لەسەر تاوانەکانی ڕژێمی ستالین و ئێش و ئازارو خواستی ئەو گەلانە هەڵدرایەوەو خرایە بەر چاوی دەوڵەت و حیزبی کۆمۆنیستی دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە بەتایبەتیو جیهان بەگشتی.

ڕێکخراو و بزووتنەوەی سیاسیو کۆمەڵایەتیو کولتووری، کەوتنە خۆسازدان بۆ وەرگرتنەوەی مافە ڕەواکانیان و گێڕانەوەیان بۆ نیشتمانی خۆیانو، کێشەکەیان بە ئاشکرا لە پەرلەمان و شووڕای وەزیران و، بەتایبەت لای گەرباچۆڤی سەرۆکی ئەم وڵاتە خرایە بەرباس و توێژینەوە. گەلێك هەنگاوو گەلاڵەو یاساو کۆمیسیۆن و کۆمیتە بۆ چارەسەری کێشەکانیان ڕێك خرا و، ئەو گەلە دەرکراوانە ڕوویان لە مۆسکۆ بوو و، چارەسەری کێشەکانیشیان هەر بەدەست مۆسکۆ و پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتەکەی بوو و، لەوبڕوایەشدا بوون ئەگەر مۆسکۆ بیەوێ کێشەکەیان چارەسەر بکات، کۆمارەکانی تری سۆڤێت

دەتوانن لەژێر دەستی مۆسکۆ دەربچن؛ پێیان وابوو سەردەمی گەرباچۆڤ لەچاو رابردوودا باشترین هەل بۆ گەڕانەوەو چارەسەری کێشەکانیان ڕەخساوەو، چاوەڕێش دەکرا هەر وابێ و، گفتو بەڵێنیش لەم بارەیەوە هەبوو. ساڵی ۱۹۹۱ کاتێك بۆ یەکەمجار، بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتی بڕوانامەکەم سەبارەت بە کۆماری مەهاباد، نامەو ڕاسپاردەکەی پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتناسی (معهد الاستشراق)م بۆ ئارشیڤەکانی سۆڤێت پێ بوو، لەگەڵ سەرۆکی ئارشیڤی حیزبیدا لەسەر کێشەی کوردو بابەتی لێکۆڵینەوەکە دوام و کێشەی کوردی سۆڤێتیشم باس کرد. گوتی: دەستوورێکی تایبەتمان لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی سەرۆك کۆمار گەرباچۆڤەوە بۆ هاتووە، وا کە ڕاپۆرتێك لەسەر کوردەکانی سۆڤێت بەپێی بەڵگەو دیکومێنتی ئارشیڤەکەمان ئامادە بکەین. گوتی: ئامادەمان کردو ناردمان. دیارە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی من لەسەر کۆماری مەهاباد بوو و، نەدەکرا لە یەکەم چاوپێکەوتنا داوای کۆپی یا خوێندنەوەی بکەم. پاشان هەوڵی زۆرم دا ئەم ڕاپۆرتەم دەست کەوێ و، بەڵێنیان پێدام و ئەملاو ئەولای زۆریشم کرد، بەڵام بەداخەوە هەر دەستم نەکەوت. مەبەستم ئەوەیە جموجوڵ و ئاوڕدانەوەیەك بۆ کێشەی کوردی سۆڤێت، لەلایەن چ سەرکردایەتی سۆڤێت و چ کوردەکان خۆیانەوە، هەبوو.

بەڵام بەهۆی هەڵوەشانەوەی سۆڤێت و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کۆمارەکانی پێشووەوە کە لە ۹ کۆماریاندا کورد هەبوون و، دەرچوونیان لەژێر دەسەڵاتی مۆسکۆ، کێشەی کوردی سۆڤێت و گەلانی تری بەزۆر دەرکراوی وەك کورد تراژیدیایەکی خەمبارتری بەخۆوە بینی. ئیتر ناوەندێك نەما ئەو گەلانە پەنای بۆ بەرن و، کۆمارە نوێکانیش سەرکردەکانیان هەر ئەندامی سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤێت و دەوڵەتەکەی بوون، یا لە کۆمارەکانی خۆیان خاوەن دەسەڵات بوون (گۆش کردە و پەروەردەی قوتابخانەی حیزب و کۆمەڵگەی سۆسیالیستی و ئینتەرناسیۆنالیزم بوون). ئەوانە بەپێچەوانەی ئەوەی کە خوێندبوویان و بانگەوازیان بۆ دەکرد، شۆڤێنی و ناسیۆنالیست و دینی و ڕەگەزپەرست بوون و، بە ناوی سەربەخۆبوونەوە گەلانی چوارچێوەی کۆمارەکانی خۆیان خستە بەر ئەوپەڕی تەنگ

پێهەڵچنین و لێدان و کوشتارو دەرکردن و سنووردار کردنی مافەکانیان. هەر ئەو میراتە شوومەی سەردەمی ستالینیان بۆ مایەوە. ئازەری و ئەرمەنی، جگە لە شەڕە خوێناویەکانیان لەسەر ناگورنا قەرەباغ، دانیشتوانی یەکتریان لە شارەکانی خۆیان بەزۆر لە مالان دەردەکردو، منداڵیان لە پەنجەرەی ماڵەکانەوە فڕێدەدایە خوارەوەو، بە تەورو چەقۆو چەکوش گەڕەك بە گەڕەك و ماڵ بە ماڵ بەدوای یەکتردا دەگەڕان و دەیانکوشتن. یا دەسەڵاتدارانی جۆرجی چییان بە ئابخازو ئەسەتینو و تورکی میسخیتی نەکردو، ئۆزبەکی هاوڕەگەزو هاوزمانی تورکی میسخیتی چ خوێنێکیان لە تورکی میسخیتی ڕشت و دەریان کردن ! تەنانەت دایکێك کاتی ڕاکردن منداڵە کوژراوەکەی خۆی لەناو جامەدانیدا لەگەڵ خۆی بردووە. ئیتر باسی سوپای ڕووسیا ناکرێ کە چیی لە چیچنیەکان کرد. کوردی کلۆڵ و داماویش کە فریای گەڕانەوەو پێکهێنانەوەی قەوارەکەی خۆی نەکەوت، بواری گەڕانەوە یا داواکردنی مافەکانیشی پێ نەدرا؛ جاران سکالای خۆی بۆ مۆسکۆ دەبرد، بەلام ئێستا پەنا بۆ کوێ بەرێ و، داوای چی بکات و، چی وەلام ئەدەنەوە و چی لێ دەکەن ؟!

لە بێبەختی و چارەڕەشی کوردی سۆڤێت و ئەو گەلانەی کە نەیانتوانی مافی خۆیان وەربگرنەوەو بگەڕێنەوە جێ و شوێنی خۆیان، تا ڕووخانی ڕژێمی سۆڤێتی فریای گەڕانەوە نەکەوتن یا نەیانهێشت بگەڕێنەوە. ئەو سیستەمەش کە پرۆسەی دیموکراتیزەکردن و ڕیفرۆم (چاکسازی)ی گرتبوە بەر، لەناکاودا هەڵوەشایەوەو، کارەساتی ئەو گەلە زۆرلێکراوانە زیاتر بوو. جێی داخ و کەسەر بوو کە گەلی کورد بە هەموو پارچەکانیەوەو، بەتایبەت کوردی سۆڤێت، جگە لە زیان و تاوان شتێکی باشی لەو سیستەمە نەدیتبوو و، ئەو ڕژێمە نەك تەنیا دەسکەوتێکی نەبوو بۆ کوردەکانی ولاتەکەی خۆیو پارێزگاریی لێ نەکردن، بەڵکوو نیشتمانەکەشیان لێ سەندنەوە.

ئەگەر ئەم ڕژێمە بمایە، سەدام و ڕژێمە داگیرکەرەکانی تری کوردستان کە پاڵیان پێوە دابوو، ئەمڕۆ لەو کەساسیو لاوازیەدا نەدەبوون (ئەمە بابەتێکی تایبەتە، لێرەدا شیی ناکەینەوە بە ناوی دژی ئیمپریالیزم بوونی ئەو ولاتانەو

کرینی چەك و تەقەمەنیی ڕووسییەوە چییان بەسەر کورددا هێناوەو چاو لە هەموو تاوان و کۆنەپەرستی ئەم وڵاتانە پۆشراوە).

جگە لەوە، پاش مردنی ستالین تا ڕووخانی سۆڤێت، ٣٨ ساڵ ماوەو کات بۆ ڕاستکردنەوە یا قەرەبووکردنەوەی تاوانەکانی ئەم ڕژێمە هەبوو. ماوەیەکی یەکجار زۆر بوو، مافی کورد و چەند نەتەوەی تریشیان نەگەڕاندەوە. هیچ گەرانتیەکیش نەبوو کە ئەگەر ئەم ڕژێمە هەر بمایەو درێژەی بە تەمەنی بدایە، کوردەکانی دەگەڕاندەوەو قەوارەکەی بۆ دادەمەزراندنەوە. ئەگەر ڕاگواستنی زۆرملێی ساڵی ١٩٣٧، یا هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور لە ساڵی ١٩٣٠دا، تا ڕووخانی سۆڤێت لە ساڵی١٩٩١دا، کە دەیان ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، لەبەرچاو بگرین و چاوێك بە کێشەی کوردی سۆڤێتدا بگێڕین، دەبینین لەکاتێکدا بڕیارەکانی ستالین بە برووسکە لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا جێبەجێ دەکران، کوردی سۆڤێت بە پێچەوانەی زۆر گەلی وەك یۆنانیو جوو و ئەڵمانیو کۆریو... ، دەوڵەتی نەبوو تا لەکاتی تەنگانەدا پەنای بۆ بەرێ یا کۆچی بۆ بکات، یاخود ئەو دەوڵەتە کوردییە وەك کۆریا و یۆنان داواو گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی سۆڤێتو، پاش ڕووخانی، زۆر بۆ کۆمارەکانی تری سۆڤێتی پێشوو بهێنن. ئەو دەوڵەتانە لەڕێگەی بالیۆزخانەو کۆنسوڵەکانیانەوە پاسپۆرتیان دایە هاووڵاتیانی خۆیان (بۆ ئەوانەی دەیانویست بگەڕێنەوە)و، فڕۆکەیان بەدوادا ناردن یا بلیتیان بۆ کڕین؛ بۆ ئەوانەش کە مانەوە قوتابخانەو ڕۆژنامەو پەیمانگەو.....یان بۆ دامەزراندن. کورد وەك نوێنەرانی ئەو گەلانە سەرمایەیەکیان لە سۆڤێتی جاراندا نەبوو، کە بتوانێ یارمەتی گەلەکەی پێ بدات و بیخاتە سەر ئیشوکارو لە کارخانەو کۆمپانیاو هتد.... دابمەزرێنرێن، یا وەك ئەوان پیاویان لە دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا هەبێ.

هەروەها پاش ڕووخانی سۆڤێت و سیاسەتی خاوەندارێتی و پەیدابوونی کەرتی تایبەت، ئەوی پارەدارو دەستڕۆشتوو بوو، سەر بە نەتەوەی دەسەڵاتدار بوو. زۆر کارگەو کارخانەو دوکان و هۆتێل و ڕیستۆران و کەڵخۆز و سەڤخوز و

زەوی‌و هتد... یان کڕی. کورد لەمەش بێبەش بوو ! خوێندن و خزمەتگوزاریەکانی تەندروستی‌و بوارەکانی تر هەمووی بوون بە پارە.

ئەمڕۆ کورد بەهۆی سەربەخۆبوونی کۆمارەکانی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە کەوتووەتە ناو چەند وڵاتی سەربەخۆو، بۆ هاتوچۆی لای یەکتر یا ئیشکردن لە هەندێ لەو کۆمارانەداو، تەنانەت بۆ بەشداری لە شایی‌و شیوەنی یەکترو دەیان کێشە و گیروگرفتی تردا، پێویستی بە مۆڵەتی مانەوە هەیە. ئەمەش لە باری ماددییەوە بارێکی گران و قورسە.

ڕژێمی خاوەنداریێتی (کەرتی تایبەت و فرۆشتنی کەرتی گشتی یا دەوڵەتی)، لە کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوودا گەورەترین زیانی لەو گەلە دەرکراوانە دا. هەر بۆیە یەکێك لەو کێشانەی کە کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراو بایەخی پێداوەو شیکردنەوەی لەسەر کردووەو کاربەدەستانی دەوڵەتی کۆمارە سەربەخۆکانی سۆڤێتی پێشووی لەم بارەیەوە لێ ئاگادار کردوەتەوە، کێشەی خاوەنداریێتی سامانی ئەو گەلانەو، لەوانە فرۆشتن و کڕینی زەوییە. واتە جگە لەوەی زەوی ئەو گەلانە پاش بەزۆر ڕاگوێزرانیان لە ساڵی١٩٣٧ و پاش ساڵی١٩٤٤ دەستیان بەسەردا گیراو، چیتر نەیانهێشت بگەڕێنەوە وڵاتەکەی خۆیان و، بەخشرا بە خەڵکی تر، پاش ڕووخانی سۆڤێت فرۆشراو وەك شیری حەڵاڵی دایك‌و میرات مایەوەو، کرا بە موڵکی هەتاهەتایی خەڵك و کەسانی تر. ڕاپۆرتی ئیسماعیل عەلییف سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراو، بەناوی کێشەی گەلانی سەرکوتکراوەوە، بۆ ڕێگەی چارەسەریان لەم بارەیەوە گوتوویە:

((بۆ گەلانی سەرکوتکراوو نەتەوە کەم ژمارەکان، زەوی نەك تەنیا شوێنی ئیشکردن و ژیانە، بەڵکوو نیشتمانی گەل و نەتەوەکەیەو وڵاتی پیرۆزی باووباپیران و پێشینانە و نابێ بازرگانیی پێوە بکرێ. بۆ ئەو گەلانە فرۆشتنی زەویەکانیان، مانای فرۆشتنی نیشتمانە. ئەمڕۆ گەلانی سەرکوتکراو زۆرباش دەزانن و پێیان وایە دەکرێ بگوترێ گەورەترین هۆو و تاقە هۆی بەزۆر دوورخستنەوەو دابڕینیان لە نیشتمانەکەیان، جوانی‌و دەوڵەمەندی‌ی وڵاتەکەیان

بووه، بەڵام ئەمجارە لەسەر زەمینەیەکی ئابووری زوڵمیان لێ دەکرێ. زەحمەتە ئەم گەلانە بەرگەی خاوەندارێتی بگرن یا پەسندی بکەن (١٦٥).

لە خاڵی دوانزەی بڕیارنامەی کۆنگرەی تایبەتی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراودا ١٥-١٩٩٢/٢/١٦ لە شاری ناڵچیك بۆ تەواوی کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو، لەم بارەیەوە هاتووە:

١٢-داوا لە پەرلەمانی کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو دەکرێ، بڕیاری ڕاگرتنی خاوەندارێتی زەوی و سەر و سامانی گەلانی سەرکوتکراو لە نیشتمانەکەیان بدرێ، تا بەتەواوی مافە ڕەواکانیان پێ دەدرێتەوە... (١٦٦).

وەك باس کرا، هەندێك لەو بەزۆر ڕاگوێزراوانە (لە هەموو نەتەوەکان) پاسپۆرتیان لێ وەرگرتوون و، هەندێکیش پاسپۆرتیان هەبوە، بەڵام بە مۆری "مافی سەفەرکردنی نییە"وە. ئەویش ئەگەر یەکێك ویستبێتی بەو پاسپۆرتە بڕوات بۆ شوێنێك، دەبوو پاش لێکۆڵینەوە لە داواکاریەکەی مۆڵەت وەربگرێ. ئەوانەی کە پاسپۆرتیان نەبوە، جێی مەترسی بوون و نەیانتوانیوە سەفەر بکەن و، کۆنترۆڵ و چاودێریی زیاتریان لەسەر بووە.

هەروەها بەزۆر ڕاگوێزراوەکان بۆ چەند دەستەو تاقمێك دابەش کراون. لێرەدا تەنیا ئاماژەیان پێ دەکەین: ڕاگوێزراو، بەزۆر ڕاگوێزراو، بەزۆر ڕاگوێزراوی تایبەت، ڕاگوێزراوێك کە بۆ هەمیشە دوورخراوەتەوە، ڕاگوێزراوێك کە بۆ شوێنە تایبەتەکان دوورخراوەتەوەو مافی هاتوچۆی نەبوە. دەستەو تاقمی ئەوتۆش هەبوە کە دەبوو ڕۆژانە خۆی بە پاسەوانی یا بەڕێوەبەرایەتی و دامودەزگاکانی پارێزگاری بناسێنێ و ئیمزا بکات.

پاش مردنی ستالین، بارودۆخی قورس لەسەر هەندێکیان هەڵگیرا، ((بەڵام تەنیا بە بڕیاری ١٩٥٥/٣/١٠ (پاش ١١ ساڵ یا ١٨ ساڵ) پاسپۆرت بە ڕاگوێزراوە تایبەتەکان درا)) (١٦٧).

---

(١٦٥) سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

(١٦٦) هـ. س، ل١٤٩.

له کۆنگرەی کۆنفیدراسیۆنی گەلانی سەرکوتکراودا، کورد لەچاو گەلانی تردا باسی ئازارەکانی نەکرا، چونکە نوێنەر یا ڕێکخراوێکی کوردیی تێدا بەشدار نەبوو. بەڵام هەر لە کۆنگرەکاندا کەم یا زۆر باسی کردا. ((لە ناوچە سەرسنووریەکانی جۆرجیادا، تەنیا لە مانگی ١١ی ١٩٤٤دا هەشت هەزارو شەشسەد کورد ڕاگوێزراون. ئەمەو جگە لەوەی کە ساڵی ١٩٣٧ هەزارو سێسەد کەس لە نەخچەوان و ئەرمەنستان بەزۆر ڕاگوێزراون))[١٦٨].

بەداخەوە، ژمارەیەك لە دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی کۆمارەکانی سۆڤیێتی پێشوو و هەندێ لایەنگری ڕژێمی سۆڤیێتی پێشوو و ستالینیستەکان و میراتگرانی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیێت و ناسیۆنال شۆڤێنیەکانی ئەو کۆمارانە، جاروبار وەك ڕابردوو نەشتەری ژەهراوی خۆیان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئاڕاستەی ئەو گەلانەو مافە ڕەواکانیان دەکەن و بوختان و درۆیان بۆ هەڵدەبەستن و سووکایەتییان پێ دەکەن و، هەندێك لەوانە بۆ بەرگرتن بە مافە ڕەواکانی بزووتنەوەی پێشکەوتنخواز پێشنیاری گۆڕینی سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی ئەمڕۆ (بەتایبەت سیستەمی فیدراتیڤی ڕووسیا) و کۆمارەکانی تری خاوەن ئۆتۆنۆمی یا کێشەی نەتەوەیی دەکەن، وا کە ئەو سیستەمە هەڵوەشێندرێتەوەو وەك سەردەمی قەیسەری لێ بکرێتەوەو بەپێی گوبرنیەکان (پارێزگا یا ئوستان) بێ. واتە قەوارەی (ئۆتۆنۆمی) ئەو گەلانە لە چوارچێوەی کۆمارێکی فیدراتیڤی وەك ڕووسیادا، هەڵوەشێندرێتەوەو... لەباتی ئەوەی هەوڵی دروستکردن و زیندووکردنەوەی قەوارە زەوتکراوی ئەو گەلانە بدرێ، داوای دروستکردنەوەی یەکێتیی سۆڤیێت و هاتنە سەرکاری دەسەڵاتێکی لە چەشنی ستالینین بکرێ و، سیاسەتێکی توندوتۆڵ و ناوەندی بەرامبەر بەو گەلانە پێڕەو بکرێ ! بەم چەشنە پاکانە بۆ ڕژێمی ستالین و سۆڤیێت دەکەن و مەترسیی جیابوونەوەی گەلان و کۆمارەکان یا ئۆتۆنۆمیەکانی وڵاتەکەیان دەهێننەکایەوە.

---

[١٦٧] هـ. س، ل٧١.

[١٦٨] هـ. س، ل٥٥.

زۆر کاربەدەست و بەرپرسی گەورەو بچووکی دەوڵەتی، لە ئاستی سەرەوە و خوارەوەی دەسەلأتدا، لایەنگری لەم بیرو بۆچوونانە دەکەن و کۆسپ و تەگەرە و ئاژاوەو دژایەتی لەنێوان گەلاندا قوت دەکەنەوە. کێشەو شەڕە خوێناویەکانی پاش تێکچوونی سۆڤێت لە کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوودا، کە زۆربە و بگرە هەموویان ئەنجامی ئەو سیاسەتە دژی مرۆڤ و نالەبارەی ستالین و حیزبەکەی بوون، هەتا ئەمڕۆش زۆریان بەبێ چارەسەر ماونەتەوە. ئەو هەل‌ومەرجە دەیان هەزار کەس و خەڵکی بێتاوانی کردووەتە قوربانیو، ملیۆنەها کەسی ئاوارە و دەربەدەر کردووە، یا کەوتووەتە نێوان بەرەکانی شەڕ. گەرچی ئەم بۆچوون و پڕوپاگەندەیە تا ڕادەیەك کاری کردووەتە سەر هەندێ کۆڕو کۆمەڵ، بەلأم دەرکەوتن‌و ئاشکرابوونی ئەو هەموو بەڵگەو دیکومێنتانەو بیرەوەری و گوتاری زیندووی قوربانیەکانی ڕژێمی ستالینی، پەردەیان لە ڕووی ئەو تەنگەتاوکردنانە هەڵماڵیوە و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاترو ڕوونتر دەکرێنەوە.

# بڕیارێکی بێسەروبەر لە ڕووسیا سەبارەت بە کوردە ئێزدیەکان

لە ڕووسیا بڕیارە مانگی ئوکتوبری ساڵی ٢٠٠٢ سەرژمێری دانیشتوانی ئەم وڵاتە بکرێ. گرنگی سەرژمێری لە هەر وڵاتێکدا دیارەو، ئەوانەی کە لەم بارەوە بەتایبەت لە بواری ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ...دا پسپۆڕو شارەزا بن، دەزانن ناگونجێ لەم وتارەدا باسی بکەی.

وەك لەم بەڵگەیەدا هاتووە، کابرایەك بە ناوی کۆمەڵەیەکی ئێزدییەوە، لە یەکێك لە شارەکانی ڕووسیادا، داوای کردووە ئێزدیەکان لە سەرژمێری نوێی دانیشتوانی ڕووسیادا بە نەتەوەیەکی جیاوازو سەربەخۆ بنووسرێن. ویستوویە داواکاریەکەی لەلایەن ئەو دوو ئەنیستیتووتەوە پەسند بکرێ و، ئەوانیش پەسندیان کردووەو داویانەتە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی سەرژمێری دەوڵەتی ڕووسیا. ئەم کۆمیتەیەش، بە پشتبەستن بەم بڕیارەو بەم بەڵگەیە، ناوی ئێزدیەکانی لە ڕیزی نەتەوەکانی تردا بەجیا داناوە. واتە نەتەوەیەکی نوێ زیاد دەکرێ بۆ نەتەوەکانی دانیشتووی ڕووسیا.

با لەوە بگەین کە پارت و ڕێکخراوە کوردیەکانو نوێنەریانو ڕووناکبیری کورد، بەتایبەت هی دینی ئێزدی، لە ڕووسیاو کۆمارەکانی تری پێشووی سۆڤێتدا هەڵوێستێکیان لەم بارەوە نەبوە، کە دەیانتوانی بە نووسینی نامەو شاندو گوتارو ڕوونکردنەوە لە چاپەمەنیەکانی ئەم وڵاتەدا، پێش بەم تەنگەتیلکەکردنە بگرن. با لەوە بگەڕێین کە کوردناسەکانی سۆڤێتی پێشوو،

بەتایبەت کوردناسەکانی ڕووسیا، کە گەلێك ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەی کێشەو مێژووی کورد بوون و، بەرهەمیان لەم بارەوە هەیە و، کەم یا زۆریش لە نووسینەکانیاندا ئاماژەیان بە دینی ئێزدیو ئێزدیەکان داوە و، هەموو لەم بارەیەوە یەکدەنگن کە ئێزدیەکان کوردن و ئێزدی نەتەوە نییەو ئاینێکی کۆنی کوردانە، ئەوانیش بێدەنگ بوون. با لەوەش بگەڕێین ئەوەی کە ئەم نامەیەی نووسیوە و داوای لە ئەنیستیووت و کۆمیتەی سەرژمێری ڕووسیا کردووە داخوازەکەی جێبەجێ بکەن، ئایا ئەم کابرایە بە قەناعەت و بیروباوەڕەوە نووسیویە، یا دەستێکی لەپشتە، یا لەڕووی نەزانینەوە ئەم کارەی کردووە؟! بەڵگەو ڕاستی لەم بارەوە چی بێو ئەم کابرایە ڕابردووی چی بێو، ئەو کۆمەڵەیەی کە لە شارێکی وا بچووك، ئەویش لە هەندەران و ناو ئاوارەکانی ئێزدی ئەم شارەدا دەستەیەکی پێك هێنابێو، ئەم داوایەی کردبێ، ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارانە پێویست نییە. لێرەدا مەبەست ئەو ئەنیستیووت و پرۆفیسۆر و دکتۆر و شوورای زانیاری ڕووسیایە، کە بە ڕەچاوکردن و لێکوڵینەوە بڕیارێکی ئەوتۆی دوور لە زانست و زانیارییان داوە، کە نەك تەنیا شانوشکۆی ئەنیستیووت و کۆڕی زانیاری ڕووسیا و خۆیان هێناوەتە خوار، بەڵکوو سووکایەتییەکی گەورەشیان بەرامبەر بەو زاناو لێکوڵەرەوەو مێژوونووسانەی وڵاتەکەی خۆیان کردووە کە لەم بارەوە نووسینیان هەبوەو پرسیان پێ نەکردون (ئەوانەی کە ئەمڕۆ زیندوون) و نەیانڕوانیوەتە نووسینەکانی ئەوانەی کە کۆچی دواییان کردووە یا نەکردووە یا ئینسۆکلۆپیدیەکانی خۆیان و ئەوروپایی یا ئیسلامی، یا لانی کەم پرسیارێکیان لەم ڕووەوە لە چەند ئێزدییەكو کوردێك کردبایەو، ئینجا بڕیاریان دابایە. ئایا ئەم ئەنیستیووت و پرۆفیسۆر و دکتۆر یا کۆمیتەیەی سەرژمێری دانیشتوانی ڕووسیا یا دەوڵەتەکەیان، بوار دەدەن گەلی ڕووس لە باری دینییەوە دابەش بکەن بەسەر مەسیحی (خاچپەرست) و لایەنگرانی ئایینی تر کە زۆرن، بەتایبەت ئەو دین و مەزهەبانەی کە هیچ پەیوەندییەکانی بە ئایینی مەسیحییەوە نییە.

پاش ڕووخانی سۆڤێت، گەلێك کۆمەڵ و ڕێکخراوی ئەم دین‌و مەزهەبانە لە ڕووسیا پێك هاتوون. ئایا دەکرێ ئەگەر کەسێك یا کۆمەڵەو دەستەیەك هەوڵێکی ئەوتۆ بدات، هەڵوێستی ئەوانەو دەوڵەتەکەیان چی دەبێ؟ نەك تەنیا بوار نادەن، بەڵکوو سزاشیان دەدەن. هەروەها هیچ نەتەوەیەك بوار نادات گەلەکەی لە باری ئایینییەوە دابەش بکرێ و ژمارەیەکیان دژی ژمارەیەکی تریان هان بدرێ و، دووبەرەکی یا چەندبەرەکی بخەنە ناو خەڵکەکەیان. زۆر گەل و نەتەوەی ئەم دنیایە پەیڕەوی دوو یا چەند ئایینن‌و، نموونەیش زۆرن. لە ڕووسیا گەلی وا هەن هەم پەیڕەوی ئاینی ئیسلام‌و هەم مەسیحیش دەکەن، یا بەشێکیان بودا و بەشێکیشیان مەسیحی و بەشێك پەیڕەوی ئایینە کۆنەکان دەکەن. بەڵام ناوی نەتەوەکەیان لە پاسپۆرتیاندا نووسراوە، نەك ئایینەکەیان. کە لە ڕووسێك دەپرسن سەر بە چ نەتەوەیەکی؟ ناڵێ سەر بە دینی مەسیحی یا کاسۆلیك یا پراڤاسلاوۆ یا بودسیت یا موسڵمانم یا بێ‌دینم. ئەو پرۆفیسۆرو دکتۆرانە دەزانن کە نیشانەکانی نەتەوە چین و، لێرەوە پێویست بە ئامارژەکردنیان ناکات. بەڵام ئایا دەزانن کورد زۆربەی موسڵمانە، بە شیعە وسونی و لق وپۆپەکانی سونی وەك شافعی، حەنەفی، حەنبەلی و مالیکی، یا ڕێبازی شێخ و سەیدەکانی وەك قادری، نەقشبەندی‌و، هەقە یا عەلی ئەلاهی، کاکەیی، شەبەك، عەلەوی، دوانزە ئیمامی، جگە لە ئێزدی.

ئەوانە ئەگەر بیانزانیایە بەر لە ئیسلام ئایینی کوردان چی بووەو ئیسلام چۆن هێنراوەتە کوردستان و، لایەنگرانی دینی کۆنی کورد ماون یا کێن و لەکوێ دەژین و بەسەرهاتیان چی بووەو کتێبەکەیان ناوی چییەو بە چ زمانێك نووسراوەو، خۆیان بە چ زمانێك دەدوێن‌و، کولتوورو جلوبەرگیان چییەو، نیشتمانیان لەکوێیە، دەیانزانی ئێزدیەکان چەند چالاکانە بەشداری بزووتنەوەی کوردیان کردووەو لە سەرکردایەتی پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکانی بزووتنەوەی کورددا، چ لە ڕابردوو چ ئەمڕۆ، چ دەورێك دەبینین و بینیویانەو، چەند ناوەندی چاندو لێکوڵینەوەو چاپەمەنییان لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان هەیە.

ئەوانە کەس باسی کوردبوون یا نەبوونیان ناکات، بەڵکوو بەشێکی جیانەکراوەی نەتەوەی کوردو نیشتمانەکەیانن و شانازی بەکوردبوونی خۆیانەوە دەکەن و، شێخ و پیرەکانیان لەگەڵ مەلاو شێخ و سەیدە موسڵمانەکانی کورد بۆ ڕزگاربوون و سەربەستی وڵاتەکەیان شان بەشانی یەك هەوڵ دەدەن و بەرپەرچی ناحەزان و داگیرکەرانی کوردستانیان داوەتەوە. گەلێك جار ویستوویانە بەهۆی جیاوازی دینی یا زاراوەیی گەلی کورد پارچە پارچەو دژی یەکتر هان بدەن و، زۆر جار بە پارە یا لەژێر گوشاری داگیرکەرانی کوردستاندا ویستوویانە ئاژاوە دروست بکەن، بەلاّم بۆیان نەچوەتە سەر. داگیرکەران و نەیارانی کورد، نەك تەنیا کەڵکیان لە جیاوازی دینی گەلی کورد وەرگرتووە، بەڵکوو هەتا ئەمڕۆیش هەوڵی زۆریان داوە زاراوەو دیالێکتەکانی کورد بکەنە ئامرازی دابەشکردنی گەلی کوردو، گەلێك نووسراوو کتێبی بێناوەڕۆکیان لەم بارەوە نووسیوە. بۆ وێنە، دەڵێن زازاییەکان یا هوورامیەکان یا لوڕو بەختیاریەکان کورد نین، یا کوردی شیعەو سونییان کردووە بەگژ یەکدا. هەر بەوەشەوە نەوەستاون، ناوی گوندو شارو کێوو چیاکانی کوردستانیان گۆڕیوە و، بگرە ناهێڵن ناوی کوردی بە منداڵەکانیانەوە بنرێ، یا بەهۆی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بەعەرەبکردن یا بەتورك کردن یا بەفارسکردنەوە، خەڵکی هەندێ ناوچەی کوردستانیان دوور خستوەتەوەو دەربەدەر و دوچاری تواندنەوەیان کردوون لەناو گەلانی خۆیاندا. بگرە ئەو کوردانەیش کە زمانی زگماکی خۆیان نازانن، هەر خۆیان بە کورد دادەنێن. ئەوانە نەیانتوانیٚ پێش بە پەرەسەندنی کێشەی کورد بگرن و لە خەباتی ڕێگەی سەرخۆیی گەل و نیشتمانەکەی لای بدەن. پێکهێنان یا دروستکردنی کۆمەڵە یا ڕێکخراو یا ناوەندێکی کوردی ئێزدی، چ لە دەرەوەو چ لەناوەوەی کوردستان، بۆ ئەوە نییە یا ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم بەشەی کورد لەوانی جیابکرێنەوە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە کە توێژینەوەی تایبەتیان لەسەر بکرێ و کێشەکانیان چارەسەر بکرێن، وەك چۆن زۆر ناوەندو کۆمەڵە یا ڕێکخراوی جیاجیا بۆ لوڕەکان (فەیلیەکان)، ئەنفالکراوەکان، کێشەی کەرکووك و بەعەرەبکردنی ئاوارەکان، هەروەها کاکەییەکان، هەورامیەکان و ... هەیە و دروست کراوە.

وەك چۆن لە ڕووسیا و دەرەوەی ڕووسیا، گەلێك ڕێکخراوو ناوەندی ڕووسەکانی دەرەوەی ڕووسیا، بەتایبەت هی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، یا ناوەند یا کڵێسەی کاسولیکەکانی ڕووسیا، یا ئاوارەکانی ڕووس، یا قەزاقە ڕووسەکان هەیە.

پرۆفیسۆر تیشکوۆ و هاوکارەکانی کە پسپۆری مێژوو و ئیتنۆلۆگیاو ئانترۆپۆلوگیان، کەم یازۆر شارەزای مێژووی کوردو تراژیدیاو نەبەزیو ئازادیخوازی ئەم گەلەن و دەزانن بەدرێژایی مێژوو هەتا ئەمڕۆ چ ناڕەواییەك بەرامبەری کراوە. ناشیٚ ئاگایان لە تراژیدیای کوردەکانی سۆڤێت نەبیٚ کە ستالین لە وڵاتەکەی خۆی وەدەری نان و قەوارەکەی پیٚهەڵوەشاندنەوە. ئەمڕۆش لە هەندەران‌و ئاوارەیی‌و کراسنادار چییان پیٚ دەکریٚ. ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانیش بەپارە ئەوەی کە تائێستا بۆیان کراوە لە چاپەمەنیەکانی ڕووسیادا کوردیان بەدناو کردووەو ئەمەیش (کوردە ئێزدیەکان بە نەتەوەی جیاواز دابنرێن) بەشێکە لەو پیلانانەی کە دژی کورد بەڕێوە دەبرێن. ئەگەر ئەم جۆرە کردەوە ناشایستانە لە بەشێکی کوردستان لەلایەن داگیرکەرێکی کوردستانەوە ئەنجام درابایە، مرۆۆ بایەخێکی ئەوتۆی پیٚ نەدەدا. بەڵام لە ڕووسیا، وڵاتێك کە بەرەو دیموکراتی‌و شارستانی دەڕوات، کە ئەم تەنگەتیلکەکردنە لەلایەن زاناو پسپۆڕانەوە بەڕێوە دەبریٚ، جێی داخە. ئێمە هیوادارین ئەم جۆرە کردەوانە سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەتی ڕووسیا نەبن. دەزگاکانی بەرپرسن فەرمان بە هەڵوەشانەوەی ئەم بڕیارە بدەن. هەروەها هیوادارین ئەو کەسانەو ئەو دامودەزگایانەی کە لەم بارەوە بڕیارێکی ئەوتۆیان داوە، لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر کوردو کێشەکەی بکەن و، بڕیارەکەی خۆیان وەربگرنەوەو پێشنیاری خوێندنەوەی ڕۆژهەڵاتناس و کوردناس و گەڕیدەو زاناکانی ڕووسیاو سۆڤێت بکەن، کە زۆربەیان بەناوبانگ و جێی ڕێزو شانازی گەل و دەوڵەتی ڕووسیان. ئەوانەی کە لە کوردستان بوون و لەنزیکەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە، بەتایبەت لەسەر کوردە ئێزدیەکان یا دینی ئێزدی، بۆ وێنە دەتوانین ناوی هەندێکیان بڵێن:

نووسراوکانی ئاکادیمیك "مار" که دەڵێ: ئێزدیزم دین یا دینی ڕەسمی کوردان بووە تا هاتنی ئیسلام" بیلیایڤ، مینتیشاشفیلی که دەڵێ: بێگومان ئێزدیزم یەکێکە لە ئاینەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، نەك گەلێکی جیاواز؛ یا ئاریستوڤاو ویلچیڤسکی کە لەسەر کوردە ئێزدیەکانی سۆڤێتی پێشوو لێکۆڵینەوەیان هەیە. سەرچاوەکانی ئیسلامی سەدەکانی ناوەڕاست، وەك ئیبنو ئەثیر و گەلێك مێژوونووسی ئیسلام و عەرەبیش، ئاماژە بە کوردە ناموسڵمان و ئێزدیەکان دەکەن.

کۆمەڵە یا ڕێکخراو یا ناوەندکانی ئێزدی، چ لەدەرەوەو چ ناوەوەی کوردستان، بەتایبەت ئەو ڕێکخراوە ئێزدیانەی شاری یاروسلاڤ کە ئەرکیان لێکۆڵینەوەو پەرەدان بە کولتوورو چاندو هاوکارکردنی هاووڵاتیانە، ئەمڕۆ کوردەکانی ڕووسیا چ ئێزدی و چ موسڵمانەکانیان کە تووشی کێشەیەکی زۆر بوون و ئیقامەیان نییە، یا بەئازادی ناتوانن بگەڕێن و ئیش‌وکار بکەن و، لەبواری پەروەردەو تەندورستیدا مافیان پێشێل دەکرێ، پێویستە ڕۆژنامەو گۆڤار دەربکەن و، لەڕێگەی دەزگەکانی دەوڵەتی ڕووسیاوە بە هاوکاری پارت‌و ڕێکخراوە کوردیەکان و ناوەندو ڕێکخراوە ئێزدیەکانی ترەوە، بەتایبەت لە باشووری کوردستان و ئەوروپا، کێشەی هاووڵاتیانیان چارەسەر بکەن، واتە ئەو کێشانەی کە ڕۆژانە بەرەوڕوویان دەبنەوە. بەجیادانانی ئێزدیەکان وەك نەتەوە نە کێشەکانیان چارەسەر دەکات و نە دەسکەوتێکیان بۆ بەدەست دەهێنێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر لە بەرژەوەندی کوردی ئێزدی و موسڵماندا نییەو نابێ و، تەنیا بە یەکێتی و یەکگرتوویی دەکرێ کێشەکانیان چارەسەر بکرێ، ئەویش لە هەندەران و لە بارودۆخێکی دژوارو ناخۆشدا. جگە لەوە ئەم جۆرە کردەوانە شان‌وشکۆی کوردە پەنابەرەکان و کێشەی کورد بەگشتی لەلای کۆمەڵانی تر خەوشدار دەکات.

ئەمڕۆ وەك ڕابردوو نییە کە داگیرکەرانی کوردستان لەدژی کورد پیلان بگێڕن و بەرپەرچ نەدرێنەوە. ئەمڕۆ کورد خاوەنی دام‌ودەزگای ڕاگەیاندنە و، نە گەلی

کوردو نه کۆمەڵگەی جیهانیش وەك جاران و وەك سەردەمی سۆڤێتە بەرامبەر بە کێشەکەی. ژمارەیەك لە کوردەکانیان بە نەتەوەیەکی جیاوازی وەك ئێزدی نووسی و، کەس نەیوێرا دژیان ڕاوەستێ و لەقاویان بدات. ئایا ئەوەی کە ئەمڕۆ دەکرێ، هەر ئەودەستانەی دوێنێ نین کە کوردی ئێزدییان بە نەتەوەی جیاواز لە پاسپۆرت و سەرژمێریەکاندا نووسیوەو لە ئاوارەیی و پەنابەریشدا دەستبەرداریان نین؟! چوار مانگ زیاتر ماوە تا دەست پێکردنی سەرژمێری دانیشتوانی ڕووسیا، ئایا لەو ماوەیەدا دەکرێ ئەم بڕیارە هیچوپووچە هەڵوەشێندرێتەوە؟ گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر هەڵنەوەشێندرێتەوە، کوردەکانی دانیشتوی ڕووسیا لەکاتی سەرژمێریەکاندا، واتە کاتی نووسینی بەڵگەی سەرژمێریەکان، وەڵامی ئەم تەنگەتیلکەکردنە دەدەنەوە.

نەیارو ناحەزانی کورد ئەمڕۆ لە ڕووسیا دەیانەوێ بەم چەشنە ژمارەی دانیشتوانی کورد دیاری نەکرێ و، سبەینێش لە کۆمارەکانی تری پێشووی سۆڤێتدا کە کوردیان تێدا دەژی، لە سەرژمێریەکانیاندا وێنەی ئەرمەنستان و ڕووسیا دووپات بکەنەوە. گەرچی سەردەمی سۆڤێت و پاش هەڵوەشانەوەیشی، هیچ کاتێك سەرژمێریی کوردەکان لە کۆمارەکانی تر بەڕاستی نەکراوە. سەرژمێری تەواوی کوردەکانی سۆڤێت هەمیشەو هەتا ئەمڕۆش لە ژمارەی کوردەکانی تەنیا یەك کۆماری وەك کازاخستان کەمتر نووسراوە[١٦٩].

وەرگێردراوی بەڵگەنامەکە:

* ئاکادیمیای زانیاری ڕووسیا

ئەنیستیووتی ئیتنۆلۆگیا ئانترۆپۆلۆگیا (بەناوی میکلوخە- مەکلایا. ن.ن)

کۆپی

لە پرۆتۆکولی ژمارە ٣

---

[١٦٩] ئەم گوتارە لەگەڵ بەڵگەی ناوبراودا، ئازاری ساڵی دووهەزارو دوو نێردرا بۆ سلێمانی، گوایە بڵاوکراوەتەوە. هەتا ئێستاش نازانم لە چ گوڤار یا ڕۆژنامەیەکدا بڵاوکراوەتەوە.

کۆبوونەوەی شوورای زانستی ئەنیستیووت (پەیمانگە)

١٤ی مارتی ساڵی ٢٠٠٢

گوێمان گرت: بۆ کێشەی سەرژمێری ئێزدیەکان، بە پێشنیاری سەرۆکی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی "ئێزدیەکان" لە هەرێمی یاروسلاڤ بەڕێز پولاتوڤ. ف.پ، وا کە ئێزدیەکان لە سەرژمێریە ڕەسمیەکاندا بە نەتەوەیکی سەربەخۆ بنووسرێن.

سەرۆکی شوورای زانستی

پرۆفسیۆر تیشکوڤ. ف، ئا

سکرتێری شوورای زانستی

دوکتۆر پییانیڤا. ڤ.ئا

# تراژیدیای کوردەکانی سۆڤیێت و بێدەنگییەکی گشتی

کاتێك کردەوەیەکی ناڕەوا بەرامبەر بە مرۆڤ یا کۆمەڵە و نەتەوەیەك لە هەر کون و قوژبنێکی ئەم دنیایە دەکرێ، کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی یا دەوڵەتێك یا ڕێکخراوە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و مرۆڤایەتیەکان ئەم کارە ناڕەوایە لەقاو دەدەن، یا ناڕەزایی لەدژی دەردەبڕدرێ و، بەگشتی بەرگریی لێ دەکرێ، بۆ ئەوەی ئەم ناڕەوایەتیە نەك تەنیا لەو شوێنە، بەڵکوو لە شوێنی تر دووپات نەکرێتەوە. بەتایبەت کاتێك بەرامبەر بە گەل یا نەتەوەیەکی وەك گەلی کورد کە دابەش کراوە و قەوارەیەکی نییەو، ناتوانێ دەنگی گەلەکەی لەڕێگەی ڕێکخراوە نیونەتەوەیەکانی وەك (un)ـەوە بە دنیادا ڕابگەیەنێ و، وڵاتەکەی چ لە دەرەوە و چ لە ناوەوە پارێزگاری لە گەلەکەی خۆی بکات.

بەداخەوە ئێمە نەك تەنیا مافی دامەزراندنی قەوارەی نەتەوەیی و سروشتی خۆمان پێ ڕەوا نەبینراوە، بەڵکوو وەك زۆر گەلی بندەستی تر و بێقەوارە یا گەلی بچووکی تر نوێنەری چاودێریشمان لە(un)دا نییە. بەڵام خۆ ڕێکخراوو پارتی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریی و کەسایەتی ڕووناکبیرمان لە دەرەوە و لە ناوەوە یەکجار زۆرە. دەتوانین کۆمەڵگەی جیهانی کەم یا زۆر بە نامەو خۆپیشاندان و مانگرتن یا لەڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە سەرنجی خەڵك ڕاکێشین و لەسەر ئەو تاوان و کارە ناڕەوایانەی کە بەرامبەر بە هاونیشتمانەکانمان دەکرێن ئاگاداریان بکەینەوە. مەبەست لە نووسینی ئەم وتارە ئاگاداکردنەوە یا ئاگادارییەکە بۆ هەموان، ئەویش تراژدیای کوردەکانی سۆڤێت (کوردستانی سوور یا قەفقاس یا ڕووسیای پێشووە) کە کوتایی پێ نایەت.

ئەگەر پشتگیریی لێ نەکرێ، چاوەڕێی دیمەنێکی خەمناکتر یا گەوەرتر دەکرێ. بۆیە ئەرکی نیشتمانی یا نەتەوەیی یا مرۆڤایەتی هەموو کوردێکە، بە ڕێکخراوو پارتە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانەوە، کە هەموو هەنگاوێکی پێویست بۆ پشتیوانی هاووڵاتیانی خۆیان هەڵبگرن. با وەك سەردەمی سۆڤێت بەرامبەر بەو هەموو تاوانەی کە ڕژێمی سۆڤێت بەرامبەر بە کوردەکانی خۆی کردی و لە نیشتمانی خۆی دەربەدەری کردن، بێدەنگ نەبین. با ئەمڕۆیش وەك دوێنی فریوی تاقم و کەسانێك نەخۆین کە بە درۆو بەپێچەوانەوە لەسەریان دەدوێن یا خۆ لە باسکردنیان دەپارێزن و.... سەرەتای مانگی ٥ی ساڵی دووهەزارو دوو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕووسیا، بەتایبەت چەند کاناڵێکی ناوەندی تەلەفزیۆنی، هەواڵو بڕیاری پارێزگار (محافظ یا ئوستاندار)ی شاری کراسناداری ناوەندی هەرێمی (کوبان)ی سەبارەت بە دەرکردنی ئەو پەنابەر یا هەڵاتوانە بڵاو کردەوە کە مافی نیشتەجێبوونیان نییەو بە شێوەیەکی ناڕەسمیو نایاسایی لە هەرێمەکەدا دەژین. گوایە لەبەر زوربوونیان هەڕەشەو مەترسییان خستوەتە سەر قەوارەی نەتەوەیی ناوچەکەو، ئەگەر وا بڕوات لەوانەیە لە داهاتوودا ژمارەی پەنابەران لە دانیشتوانی ناوچەکە زیاتر بێ. فەرمان دراوە بە داموەزگاکانی پۆلیس و پاراستن کە ئەو کەسانەی فایلەکانیان بە"یان" واتە (فامیلی ئەرمەنی) یا ئوغلی (فامیلی ئازەری) یا "دزە" (فامیلی گورجی) کۆتایی پێ دێ (فامیلی کوردەکانیش زۆربەیان ئەرمەنی و ئازەرین، لەبەرئەوەی ناسنامەو پاسپۆرتەکانیان لەو کۆمارانە وەرگرتووە)، دەبێ دەربکرێن و، تەنانەت بە چاودێری و کۆنترۆڵی هێزی پۆلیس و قەزاق یا لەشکری بەڕێ بکرێن. بگرە پارەی بلیتی فڕۆکەو شەمەندفەرو ماشینیشیان پێ دەدرێ. ئەگەر هاتوو بەرەنگارییان کرد، لە ئۆردووگاکاندا کۆبکرێنەوەو بەرەبەرە بەڕێیان بکەنەوە بۆ وڵاتی خۆیان یا ئەو جێگەیەی کە لێوەی هاتوون.

بۆ ئەم مەبەستەیش، ڕێکخراوە چەکدارەکانی قەزاق و پۆلیس و ژمارەیەك لە دەستەو ڕێکخراوە ناسیونالیستەکانی ناوچەکە پێکەوە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی ئەلیك ندر تکاچوۆ کەوتنە گرتن و لێدانی، وەك لێرە خەڵکی قەفقاس

پێیان دەڵێن، سەرڕەشەکان. تەنانەت کەوتنە پشکنینی ماڵەکانیان و چوونە چەند گوند و ناوچەیەك و هەڕەشەیان لە قەفقاسیەکان کرد کە خۆیان بۆ ناردنەوە ئامادەبکەن و پاسپۆرتەکانیان تەسلیم بکەنەوەز

لەسەر جادەو کۆڵان و ناوبازاڕەکانیش دەست بەلێدان و سووکایەتی و گرتنیان کراو، جەریمە کران و دەست بەسەر سامانیاندا گیرا یا تێکوپێك درا، یا لەلایەن هەندێ باندەوە سووتێنرا. هەواڵدەرکانی تەلەفزیۆن کومەڵە دیمەنێکیان لەم بارەوە هەڵگرتبوو و پیشانیان دا. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ناوچەکەیش وەك ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و ڕادیۆکان، خەڵکی ناوچەکەیان بۆ دەرکردنی قەفقاسیەکان هان دەدا و، پروپاگەندە و هەراوهوریایەکی زۆریان دەست پێکرد، بە نووسینی دروشمیش لەسەر دیواری کولاَن و جادەکان داوای گەڕانەوەیان دەکردن یا سووکایەتییان پێ دەکردن. تەلەفزیۆنەکانی ناوەندی ڕووسیا لە موسکۆ چەند ڕۆژێك لەسەریەك وێنەی هەندێ لە ڕەفتاری پۆلیس و قازاقەکانی کراستاداریان پیشان دا، کە چۆن ڕەفتار لەگەڵ سەرڕەشەکانی قەفقاسدا دەکەن. مرۆڤ بە دیتنی ماڵو گوزەران و جلوبەرگی ئەو خەڵکەو، ئەو ترس و بێدەرەتانیەی کە پێیانەوە دیار بوو، ئاگری تێبەردەبوو. جگە لەوانە، دیمەنێکی قەبرستانی ئەرمەنی پیشان دا کە تێکوپێك درابوو و کێلەکانیان شکاندبوو.

فەرمانی کاربەدەستانی هەرێمی کوبان، بەتایبەت پارێزگار ئا. تکاچوڤ، کە بەپێچەوانە و دژی یاسای ناوەند بوو، لەبەر گوشار و ڕەخنە و پرۆتێستی کومەڵەو ڕێکخراوو کەسایەتیەکانی پاریزەری مرۆڤ و کاربەدەستانی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، ڕاگیرا. گەرچی دەبوو تکاچوڤیان، نە تەنیا لەسەر کار لابردرایە، بەڵکوو سزاش درابایە لەناو ئەو گەلانەی کە داوای دەرکردنیان دەکرد. جگە لە ئەرمەنی و ئازەری و تورکی میسخەتینی، ناوی کوردیش دەهات و، هەندێ جار کورد و ئێزدییان بە دوو نەتەوەی جیاواز دادەنا. بەپێی بڕیاری (دادستان، مدعی عام)، لەو هەموو هەراوهوریایەدا تەنیا سێ ماڵ لە ناوچەکە دەرکران کە هەرسێ بنەماڵە کورد بوون و بەڕەسمیش لە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان

ڕاگەیەندرا. ئیتر لەناو چەند سەدهەزار ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجی و گەلانی تردا کە لە ناوچەکەدا دەژین، تەنیا۳۰-۲۵ هەزار کورد لەوێن، کە لەچاو زۆری گەلانی تردا، هەر نەدەبوو باسی کورد کرابایە. کەچی تەنیا بڕیار لەسەر دەرکردنی سێ بنەماڵەی کورد درا، چونکە کورد بێپشتیوانە، بێکەسە و وەك ئەرمەنی و ئازەری یا گەلانی تر قەوارە و دەوڵەتی تییە، تا لەسەریان بەجواب بێ‌و ناڕەزایی و ڕەخنەو پەرۆشی خۆی دژ بەو سیاسەتە ئاراستەی دەوڵەتی ڕووسیا و داوای ڕاگرتن و کۆتایی هێنان بەم تاوانە بکات. کوردی بێدەرەتان باڵیۆزخانە و کونسولێ یا ناوەندێکی لە ڕووسیا نییە، یا بەپێچەوانەی ئەرمەنی و ئازەری و جۆرجییەوە کەسی لەناو دامودەزگاکانی دەوڵەتی و نادەوڵەتی ڕووسیا نییە، یا کەسایەتی زاناو خا وەن دەوری وەك نووسەر و ڕۆژنامەوان و هونەرمەندو...ی لە ڕووسیا نییە دەنگی خۆی بەرزبکاتەوە و بیروڕای دەوڵەت و کۆمەڵگەی ڕووسیا بۆ ئەو کارە ناڕەوایەڕابکێشێ. کوردناسەکانیش، بە ڕووس و کوردو پارت و ڕێکخراوە کوردیەکانەوە، بەرامبەر بەم تاوانە بێدەنگن و، تەنانەت بە نووسینی وتارێك یا کۆڕو کۆبوونەوە یا کۆنفراسێك تاووتوێی ئەم ڕووداوەیان نەکردو، دەرهەق بەو ناڕەوایی‌یە هاوارێکیان لێوە بەرز نەبوەوە.

گەرچی پێش ئەو ڕووداوانەی کراسنادار، هەر لەوێ و لە شارەکانی تری ڕووسیا، بەتایبەت لە موسکۆ، گەلێك ڕووداوی وەك هێرشی ناسیونالیستەکان و ئازارو ڕاونانی سەرڕەشەکان لەلایەن ئەوان و پۆلیسەوە هەبوو و گرتن و کوشتنێکی زۆریان بەدواوە بوو و چاپەمەنیەکانی ڕووسیا و دنیاش لەسەریان نووسی‌و دەنووسن. گەلێك جاریش ئەم هێرش و کوشتن و تەنگ پێهەڵچنینە، جگە لە سەرڕەشەکانی قەفقاس، خەڵکی وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ئورووپا و ئەفریقا و ئاسیاشی گرتوەتەوە، کە زۆربەیان خوێندکارو گەڕیدە یا سەیرانکەر یا فەرمانبەر بوون و، کەوتوونەتە بەر شاڵاوی ئەم هێرشانەو، ئەوە بووە بەهۆی ڕەخنەو ناڕەزایی دەوڵەتەکان و باڵوێزەکانیان لە موسکۆ. سەرئەنجام لە۲۰۰۳/۵/۳۰دا کۆبوونەوەیەکی گشتی تەواوی سەفیرانی وڵاتانی دەرەوەی لە

مۆسکۆ لێ کەوتەوە، کە بەشێوەیەکی ڕەسمی و هاوبەش لەڕێگەی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیاوە پەرۆشی و ناڕەزایی خۆیان دەربڕی سەبارەت بەو مەترسییەی کە لە هاوولاَتیەکانیان لە ڕووسیا دەکرێ و، داوایان لە دەوڵەتی ڕووسیا کرد بۆ بەرگرتن لەو کردەوانە هەنگاو هەڵبگرێ و دەوڵەتی ڕووسیایان بە بەرپرسی ئەو ڕووداوانە دانا. زۆری پێ نەچوو دوای ئەوەی هاوولاَتیەکانیان لە شەڕی جیهانی دووهەمدا بوونە قوربانی هێرشی نازیەکان، لە ساڵڕۆژی لەدایکبوونی هیتلەردا، بەتایبەت لە مۆسکۆ، بە هێرشبردنە سەر سەرڕەشەکان و دروشم نووسینی وەك"ڕووسیا بۆ ڕووس"، "ڕووسیا بۆ پیستەسپیەکان"و.... کۆمەڵگەی ڕووسیای هاژاندو، لەلایەن ڕێکخراو و کەسایەتی پارێزەری مافی مرۆڤی ڕووسیا و جیهانەوە لەقاودرا و دەوڵەتی ڕووسیا ناچارکرا بۆ بەرگری لەو کردەوانە هەنگاو هەڵبگرێ.

هێنانەوەی ئەم وێنانە و دەیان وێنەی تر کە زۆر زەحمەتە مرۆڤی کورد لە دەرەوەی ڕووسیا هەست بە قووڵی تراژدیای هاوولاَتیان خۆی بکات، لە وتارێکدا جێی نابێتەوە. گومان لەوەدانییە ئەگەر ئێمەی کورد قەوارە و دەوڵەتێکمان هەبوایە، ستالین یا ڕژێمی سۆڤێتی نەیدەوێرا کوردی سۆڤێت لە خاکی باووباپیرانی، واتە ئەو نیشتمانەکەی کە بەلشەویکەکان دانیان پێدا ناو (کوردستانسکی ئویزد) یا (کوردستانی سوور)یان لێ دروست کرد، دەربکات و، قەوارەکەی هەڵوەشێندرێتەوە و، زۆربەی دانیشتوانی بگوازرێتەوە بۆ کومارەکانی سۆڤێتی پێشوو. کورد، تەنانەت وەك ئەو گەلانەی کە لەگەڵیدا یا پاشتر دوورخرابوونەوە و قەوارەیان لێ سەندرابوەوە، وەك کالمیکەکانو چیچنیەکاو، کاباردنیەکان و... کە پاشان بەلشەویکەکان ناچار بوون لەژێر گوشاری ناوخۆو دەرکیدا بۆیان بگەڕێننەوە، نەگەڕاێنرایەوە پێی ڕەوا نەبینرا کوردستانی سووری بۆ دروست بکرێتەوە.

یاخود کورد، بەپێچەوانەی گەلانێکی وەك کۆریەکان و یۆنانیەکان و ئەڵمانیەکان و بگرە یەهودیەکانی سۆڤێتەوە، کە کاری ناڕەوایان بەرامبەر کرابوو،

دەوڵەتەکانیان بە هەموو ڕێگەو توانایی خۆیانەوە فریایان کەوتن و، ئەوانەی کە دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ کۆمارەکانی کۆریا و یۆنان و ئەڵمان و ئیسرائیل، هەموو پێویستییەکی گەڕانەوەیان بۆ دابین کردن و چوونەوە. هەتا ئەمڕۆش یارمەتی ئەوانە دەدەن کە ماونەتەوە و قوتابخانەو ناوەندی کولتووری و ڕۆژنامەو شتی زۆریان بۆ مسۆگەر کردوون و، لە هەمو بارێکەوە لەلایەن دەوڵەتەکانیانەوە پشتیوانییان لێ دەکرێ. بگرە هەرجارێك دەستەیەکی نوێنەرایەتییان دێتە ڕووسیا یا کومارەکانی تری سۆڤێتی پێشوو، سەردان و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکەن و هەست بە چەوسانەوە وکەم زانین ناکەن و سەربڵندن و کەس ناوێرێ سووکایەتییان پێ بکات و مافیان ژێر پێ بنێ، لەکاتێکدا ئەو گەلانەی وەك کۆری و یۆنانی، بەپێچەوانەوە وەك کورد، خاوەنی خاك یاخود قەوارەیەك نەبوون.

دەبێ ئەو ڕاستییەش بگوترێ، تەنگ پێهەڵچنین و لێدان و سووکایەتیکردن و بگرە دەرکردنی نەتەوەکانی تر لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، شێوەی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆی هەیە و ڕۆژبەڕۆژ زیاترە. بۆ وێنە، ئەو کارە ناڕەوایانە بەرامبەر بە ڕووس و ڕووس‌زمانەکان، جگە لە کۆمارەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست، لە سێ کۆماری پری بالتیك، واتە ئەستۆنیا و لیتڤی و لاتڤیا، دەکرێن. ئەوە زۆر جار بووەتە هۆی ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکانیان. سەرپەڕەی ئەو خۆشنەویستن و ڕق لەیەك هەڵگرتنەی ڕووسیا شەڕی چیچنیا بوو، کە بوو بەهۆی ئەوەی هەر سەرڕەشێك لە ڕووسیا بەگومان و شکەوە چاوی لێ بکرێ و ڕابگیرێ و، ئەگەر ئیقامە یا ڤیزەی نەبوو، سزا بدرێ. بەهۆی ئەو تەقینەوە و خراپکاریانەوە کە لە ڕووسیا کراون و، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕووسیاش کاریگەرییەکی خراپیان لەم بارەوە لەسەر دانیشتوانی ڕووسیا داناوە، خەڵك بە چاوێکی گوماناوی‌و نابەدڵ تەماشای ئاوارە و پەنابەرەکان دەکەن. ڕاستە بەشێك لەو تاوانانەی وەك دزی و کوشتن و بڵاوکردنەوەی مادەی بێهۆشکەر کە لە ڕووسیا دەکرێن، پەنابەرەکان دەیکەن. ڕاستە کێشەی تریان بۆ کۆمەڵگەی ڕووسیا دروست کردووە. بەڵام زۆربەیان بۆ خزمەتی کومەڵگەی ڕووسیا و

بەرژەوەندی ئابووری کۆماری ڕووسیای فیدراڵ کاردەکەن و خەڵکی زەحمەتکێش و خەریکی کشتوکاڵ و بیناکردنی ڕێگەوبان و خانووبەرەن. دانیشتوانی ڕووسیا، سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆریان بێکارن، بەڵام ئەوکارانە ناکەن، یاخود بەو هەرزانییە نایکەن. بەکورتی، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ڕووسیا لە هاتنی خەڵکی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، نەك تەنیا هی کۆمارەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست، بەڵکوو هی ئوکراینیا و بیلەڕووسیا کە هاوزمان و هاوڕەگەزو هاوئایینی یەکترن، ناڕازین.

لە کۆمارکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست، ڕووس و ڕووسزمانەکان زۆرجار لەلایەن شۆڤێنی و تاقمە ڕەگەزپەرستەکان و، بگرە خەڵکی ئاساییشەوە، بە داگیرکەری وڵاتەکەو بێگانەیان دەزانن و، بەئاشکرا لەسەر کار لادەبرێن یا پێیان دەڵێن بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، یا نامەیان بە پۆستدا بۆ دەنووسن یا بۆیان لەناو ماڵ دەهاوێن کە بگەڕێنەوە بۆ ڕووسیا و، بەر بە پێشکەوتنی کولتووری و دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییان دەگرن و، قوتابخانەکانیان بە زمانی ڕووسی دادەخرێن. بۆیە شەپۆلی گەڕانەوەی ڕووسەکان بۆ ڕووسیا، لەبەر ئەو هۆیانە و ئاڵۆزی باری ئابووری بەردەوامە.

ڕووسیاش، لەبەر ئابووری دژوار، ئامادە نییە ملیۆنەها وەربگریو توانای یارمەتیدانی نییە، چونکە هەر وەرگرتنی ئەوانە مەرج نییە، بەڵکوو دەبێ شوێنی حەوانەوەو کارو خوێندن و...یان بۆ ئامادەبکات. مرۆڤ کە دەیانبینێ لە بارودۆخێکی نالەبارو بێیارمەتیدان، دڵی بۆیان دەسووتێ. تەنانەت ئەوانیش کە خانووبەرەو سامانی خۆیان فرۆشتووە، بەو پارەیە لە ڕووسیا نە دەتوانن خانووبەرەی دروست بکەن و، نە پێی دەژین. بەڵام ئەوە هەیە کە گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان و دەرناکرێن و بەرەوڕووی مەترسی وەك کورد نابنەوە. واتە بەتێکچوونی یەکێتی سۆڤێت، لەبەر ئەو کێشانەی کە باس کران، ملیۆنەها خەڵك ماڵوێران و دەربەدەرکران، بەتایبەت گەلانی بچووك و بێقەوارە وبێدەرەتان کە کەس پارێزگارییان لێ ناکات و لەسەریان وەجواب نایەت و وەریان ناگرێ و مافیان

لەهەمووڵایەکەوە پێشیل کراوە. یەکێك لەو گەلانە کوردە، کە دەتوانم بڵێم لە هەموان زیاتر زوڵمی لیّ کراوەو دەکریّ، چونکە هەر لە سەردەمی سۆڤێتەوە پەرِاگەندە کرابوو و، پاش ڕووخانی سۆڤێتیش پەرِاگەندە کران و ژمارەیەکی زۆریان هاتنە ڕووسیا و لە کراسنادار و تامبو و یاروسلاوڤ و ساراتوڤ و... جێگیر بوون.

ڕووسەکان یا ڕووس‌زمانەکان کە لە کومارەکانی پێشووی سۆڤێت دەژین و نایانەویّ خۆیان لەناو کولتوورو داب و نەریتی ئەو کومارانەدا بتوێننەوە یا زمانیان فێر بن، دەگەڕێنەوە بۆ ڕووسیا. گوایە لە ٣٥ ملیۆن تا ئەمرِۆ هەشت ملیۆنی گەڕاوەتەوە. کەچی کورد و نەتەوەکانی تر کە لە ڕووسیا دەژین یا پەنابەرو ڕاکردوون، نایانەویّ زمان و کولتوور و داب و نەریتی خۆیان بەسەر گەلی ڕووسدا بسەپێنن و، بێپێچەوانەوە فێری زمانەکەیان دەبن و خۆیان لەگەڵ ژیانی ڕووسدا ڕادێنن. واتە لەڕووی ناچارییەوە بێ یا لەبەر خواست و پێشکەتنی کولتووری ڕووس، زەمینەی توانەوەی ئەوانە لەناو ڕووسدا زیاترە. ئەو پلەوپایەیەی کە ڕووس لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێتدا هەیانبوو، غەیرە ڕووسەکانی ڕووسیا لە ڕووسیادا نیانە، یا داوای ناکەن، یا بۆیان ناچێتە سەر داوای بکەن. واتە پەنابەرەکان زیاتر لە بەشی خزمەتگوزاری و کاری هەرزان و ڕەشدا خەریکن و کشتوکاڵ و حەماڵی و دەستفرۆشی دەکەن.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان کوردە کڵۆڵەکەیە کە لە سەردەمی سۆڤێتەوە تا ئەمرِۆ لەبارکردن و دەرکردن لەم کۆمارەوە بۆ ئەو کۆمار و لەم شارەوە بۆ ئەو شاردایەو، لەژیانی کۆچەریشدا حەوانەوەی بۆ نییەو، مەترسی دەرکردنی هەمیشەیی لیّ دەکریّ. جگە لەوە، دەکەوێتە بەر شاڵاوی سووکایەتی پێکردن و لێدان و بارکردنی نویّ. ژمارەیەك لەو کوردانە، کە لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ناگورناقەرەباخی نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە، واتە دووسیّ ساڵ پێش ڕووخانی یەکێتیی سۆڤێت، هاتوونەتە ڕووسیا و خانووبەرەیان کریوە یا پاسپۆرتیان وەرگرتووە یا ئیقامەیان هەیە، کەچی ئەوانیش کەوتوونە بەر هێرش و تەنگ پیّ‌هەڵچنین. ڕووسیا بە ڕەسمی ڕایگەیاندووە میراتگیری یەکێتیی سۆڤێت و پارێزەری مافە، بەرپرسە بەرامبەر بە

زۆر شت، لەوانە هاووڵاتیانی پێشووی یەکێتیی سۆڤێت کە دەتوانێ ببێتە هاوڵاتی ڕووسیا. جگە لەوە، ڕووسیا کە ئەو پەیمانە نێونەتەوەییانەی سەبارەت بە مافی مرۆڤ و پەنابەر وەرگرتن (کە لە یاسای بنچینەیی ڕووسیاشدا هاتوون) و خەبات بۆ نەهێشتنی جیاوازی ڕەگەزی، نەتەوەیی، ئایینی و...ی ئیمزا کردووە، دەبێ ڕەچاویان بکات و، لە چوارچێوەی ئەو یاسا و پەیمانانەدا ڕێز لە مافی کوردەکان بگرێ کە خزمەتێکی زۆری ئەم وڵاتەو گیانیان لەپێناویدا بەخت کردووە.

دەسەڵاتدارانی ڕووس زۆر بە باشی ئاگاداری کێشەی کوردن، بەتایبەت ئەو کوردانەی کە سەردەمێك هاووڵاتییان بوون و بەشدارییان لە شەڕی جیهانیی یەکەم و دووهەم و دەوریان لە ئابووری و بینای کۆمەڵگەی سۆڤێتیدا هەبوەو، باسی بەشدارییان ناکەم لە شەڕەکانی نێوان ڕووسیا و عوسمانی و شاکانی ئێرانداو بەتایبەت شەڕی کریم کە هەزاران کورد لە ڕیزی لەشکری ڕووسیادا گیانیان لەدەست دا، ئەوانە باش دەزانن کێشەکانیان کامانەن و چین و، سەردەمی سۆڤێت بەتایبەت، سەردەمی دەسەڵاتداریەتی ستالین، تووشی چ کارەساتێك بوون. با هەوڵ بدات قەوارەکەیان کە زەوت و داگیر کراوە، بۆ بگەڕێنێتەوە، ئینجا هەوڵی ناردنەوەو دەرکردنیان بدات.

ڕووسیا هەمیشە وڵاتێکی فرەنەتەوە بووەو، پەیوەندی کۆن و نوێی کوردو ڕووس شتێکی شاراوە نییە. پێم وایە کاربەدەستی ناوچەی کراسناداری وەك تکاچوڤ، ئەگەر ئاگاداری کێشەی کوردو بەسەرهاتی خەمباری کوردەکانی سۆڤێت و بەشەکانی تری کوردستان بێ، بەو جۆرە ڕەفتار ناکات. ئەگەر نەزانێ، پێویستە دەسەڵاتدارانی ناوەند ئاگاداری بکەنەوە. دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئەوانە چارەنووس وای لێ کردوون ئەمڕۆ لە ڕووسیا بگیرسێنەوەو تووشی ئەو هەموو ناڕەواییە ببن. ئەوانە بە دڵی خۆیان نەهاتوون، بەڵکوو لەبەر ناچاری ڕوویان لە ڕووسیا کردووە و، هیچ ڕێگە و دەرەتانێکی تریان نەبوە؛ کە لە ڕووسیاش دەربکرێن، بۆ کوێ بڕۆن، بۆ نیشتمانە پارچەکراوەکەیان کە هیچ

مافێکیان لەوێ پێ ڕەوا نەبینراوە! خۆ دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانیش وەریان ناگرن.

دەبێ ڕووسیاو وڵاتانی ئەورووپاو ... کە لەمێژە هەوڵی نێوبژێکەری و یەکلاییکردنەوەی کێشەی نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستان دەدەن لەسەر ناگورنا قەرەباغ (کوردستانی سووریش دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو ناوچەیە کە دوو وڵاتی ناوبراو شەڕی لەسەر دەکەن) و دەیانەوێ چارەسەری بکەن و، ئاوارەکان کە ژمارەیان یەك ملیۆن و دووسەد هەزارە و زۆر بیابانی لە بیابانی (ئاجبەدینسکی) و نزیکەی دووسەد هەزاریان تائێستا لەناو خاکی ئێران دەژین. دەبێ لە چارەسەرکردنی کێشەی ناگورناقەرەباغدا، هەم لایەنی ئازەریو هەم ئەرمەنیو هەم دەوڵەتانی ناوبژێکەریش کێشەی کوردەکانیش ڕەچاو بکەن، چونکە بەپێی بەڵگەی مێژوویی کۆن و نوێ ئەو ناوچە کوردنشینانە پاشتر کوردستانی سوور یا (کوردستانسکی ئویزد)یان لێ دامەزراند. بەپێی هەندێ سەرچاوەی ڕەسمی، لەو یەك ملیۆن و دووسەد هەزار ئاوارەیەی ناوچەی ناگورنا قەرەباغ، نزیکەی سەدوهەشتا تا دووسەد هەزاریان کوردنو پاشماوەی کوردەکانی کوردستانی سوورن کە دانیشتوانی شەش ناوچە و شار پێك دێنن (شووشە و لاچین، قوبادلی، زەنگیلان، کەڵباجاڕ، جەبرەئیل). ناکرێ چاو لەو هەموو ڕاستییە بپۆشرێ و بێدەنگ بن. کێشەی ناگورنا قەرەباغ، تەنیا کێشەی نێوان ئازەربایجان و ئەرمینیا نییە، کێشەی کوردیشەو، دەسەڵاتدارانی هەردوولا ئەم ڕاستییە بە باشی دەزانن.

کوردو ئازەریو ئەرمەن، بەهۆی هەڵکەوتنی جوگرافیاوە، هاوسێی یەکن و، ڕابردوویەکی هاوبەشیان هەیەو، تووشی چەوسانەوەی هاوبەش بوون و، ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەرمەن و ئازەری لە بەشەکانی تری کوردستاندا دەژین. پێشێلکردن یا ڕێزنەگرتن لە مافی یەکتر، خزمەتی هیچ لایەنێك ناکات و، ڕووسیاش وەك میراتگری یەکێتیی سۆڤێت دەتوانێ دەورێکی باش ببینێ. کوردەکانی سۆڤێت بە پەیوەندیگرتن بە هەردوولای ئازەری و ئەرمەنیو ناردنی نامەو یادداشت و نوێنەرانی خۆیان، دەتوان کێشەکەیان باس بکەن. لەلایەکی

ترەوە، وەك لایەنێکی خاوەنی کێشەکە، دەبێ بەشداری لە چارەسەرکردنی کێشەی ناگورناقەرەباغی نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستاندا بکەن.

پێویست بە بیرهێنانەوەیە کە تەواوی سەرچاوە مێژووییەکانی بەتایبەت سەدەو نیوێك و سەدەیەکی رابردوو، لەوە دەدوێن کە کورد لە هەرێمی قەفقاس ژیاوە، واتە پێش ئەوەی هەرێمەکە لەلایەن ڕووسەکانەوە داگیر بکرێ و، سنوورەکانی سێ ئیمپراتۆریی عوسمانیو ڕووسیاو پاشایەتی ئێران دیاری بکرێن. بە داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن ڕووسیاوە، کە تێشکانی پاشایەتی ئێران و پاشان عوسمانیی لە ئەنجامی زۆر شەڕی خوێناویدا لە سەردەم و قۆناغی جیاجیادا لێ کەوتەوە، بەشێکی کوردستان خرایە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا (ڕووسیا، بەدرێژایی سەدەی نۆزدە، دوو شەڕی گەورەی لەگەڵ پاشایەتی ئێراندا، واتە ١٨٠٥-١٨١٣ و، چوار شەڕی لەگەڵ تورکیا ١٨٠٥-١٨١٢، ١٨٣٨-١٨٣٩، ١٨٥٣-١٨٥٦، ١٨٧٧-١٨٧٨ کردووە). لە ئەنجامی ئەو شەڕانەدا کە زۆرجار پارچەیەکی کوردستان دەبوە گۆڕەپانی شەڕە دڕندانە و کاولکەرەکانیان، گەلی کوردیش تووشی زیانێکی هەمەلایەنەی بەتایبەت گیانی و ئابووری بووەو، ناوچە کوردنشینەکان لە ئاکامی شەڕەکانیاندا و بەپێی پەیمانەکانیان، چەندجار دەست بە دەست کراون، واتە سنوورەکانیان گۆڕاوە. دوایین جار، بەپێی پەیمانی (بریست لیتوفسك)، فارس و ئەردەهان لەلایەن بەلشەویکەکانەوە، بەبێ ڕەزامەندی و پرسکردن بە زۆربەی دانیشتوانیان کە کورد بوون، درانەوە بە کەمالیەکان.

سەرچاوەکانی ڕووسی تا کۆتایی یەکەم شەڕی جیهانی، باسی دابەشبوونی کوردستان بەسەر سێ ئیمپراتۆریەتی ڕووس و فارس و تورکدا دەکەن و، بگرە مێژوونووس و گەڕیدەو سیخوڕو پیاوانی لەشکری و ڕۆژهەڵاتناس و ... تا ١٩٣٠، واتە ساڵی هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور لەلایەن ڕژێمی ستالینەوە، هەموویان دان بەوەدا دەنێن کە بەشێکی کوردستان دەکەوێتە چوارچێوەی ڕووسیا (سۆڤێت)ەوە. ئەوە بوو لە ناوچەیەکی ئەم بەشەی کوردستاندا، ساڵی

١٩٢٣ كوردستانی سووریان دامەزراندو، ساڵی ١٩٣٠ هەڵوەشێندرایەوە. دامەزراندنی ئەم قەوارەیە بۆ کورد دەستکرد و کتوپڕ نەبوو، لەبەرئەوە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە کورد بوون و، بەپێی بڕیارەکانی دەوڵەتی و حیزبی ئەو سەردەمەی سۆڤێت دامەزرا. جگە لەو بەڵگەو دیکومێنتانەی کە تا ئەمڕۆش ماون، ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە کوردستانی سوور، واتە ئەو ناوچەیەیان، بە نیشتمانی کوردان و بەناوی کوردستانەوە ناو بردووە. بۆ وێنە، سەردێڕی هەواڵەکانیان بەم چەشنە دەستی پێ کردووە:

"لە کوردستانەوە"، "بە کوردستاندا"، "کوردستانسکی ئویزد (ناوچە)"، گوند یا فلان شاری سەر بە کوردستان، یا هەواڵەکانی کوردستان، یا کۆبوونەوەی حیزبیی ژنان، یا ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیستی (بەلشەویك) لە فلان شار یا ناوەندی کوردی لە کوردستان، یا دەستکەوتی ئاژەڵدارانی کوردستان و، لەو بابەتە سەردێڕانە. پاش هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور، هەر ناوچەو شارێکی کوردستانیان بەناوی "دابەشکردنی سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی نوێی ئازەربایجان"ەوە، خستە سەر ناوچە یا هەرێم و شارەکانی تری ئازەربایجان. بەم چەشنە ناوی کورد و کوردستان، یا بە واتایەکی تر قەوارەکەیان لە فەرهەنگی سۆڤێتی و ئازەربایجانی سۆڤێتیدا سڕییەوەو، قوتابخانەو ڕۆژنامەو بەڕێوەبەرایەتیو، بەگشتی دەسکەوتەکانی ئەم گەلەیان نەهێشت و، دانیشتوانی کوردی کەوتنە بەر شاڵاوی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی جیاوازی ڕەگەزیو تواندنەوەو، ژمارەیەکی زۆریان لە ترساندا ناوو ناسناو و نەتەوەی خۆیان گۆڕی، بۆ ئەوەی دەرنەکرێن، یا لە ناونەچن، یا کارو ئیشی خۆیان لەدەست نەدەن، یا بتوانن بخوێنن و کاربکەن و لە نیشتمانەکەی خۆیاندا بمێننەوە. کوردێکی یەکجار زۆر بەم چەشنە هەتا ئەمڕۆیش، لەبەر نەبوونی قەوارەو بواری خوێندن، توێندراونەتەوە. بەڵام ئەمەش واتە بێدەنگ بوون و تواندنەوەیان. کوردەکانی سۆڤێت لە کارەساتی تریش نەپارێزران. پێش و لەکاتی شەڕی جیهانیی دووهەمدا، بەتایبەت لە ١٩٣٧ و ١٩٤٣و ١٩٤٤دا بە کۆمەڵ گوێزرانەوە بۆ

کۆمارەکانی تری سۆڤێت. بیانووشیان بۆ ئەم تاوانە گەورەیە زۆربوو" گوایە بەرەی قەفقاس، لەبەر "کۆمەڵانی گومانلێکراو" یا "بڕواپێنەکراو" کە کوردیش خرابوە ئەو خانەیەوە(بە بەهانەی ئاریبوون و هاوهەستییان لەگەڵ ئەڵماندا یا هاوئایینییان لەگەڵ تورکیادا)و، لەبەر نزیکبوونەوەی هێزەکانی ئەڵمان و تورکیا، دەبوو پاك بکرێنەوەو دوور بخرێنەوە، نەوەك بە دەستپێکردنی شەڕ یارمەتی ئەڵمانیەکان و تورکەکان بدەن (ئەویش پاش ئەو هەموو کارەسات و جینۆسایدەی کە تورك بەسەر کورددا هێنا!). کەواتە دەبوو ئەو مەترسییە نەمێنێ، ئەویش لەڕێگەی دوورخستنەوەی ئەو گەلانەوە کە کوردەکانیشی دەگرتەوە. ئەوەبوو کوردەکانیان لە ئازەربایجان و ئەرمینیا گواستەوە، زۆربەیان بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و ئۆزبەکستان و سیبریا. گواستنەوەکەیشیان بە شێوەیەکی نامرۆڤانە و بێئاگاداری پێشوەخت و بە شەو بوو، بە گەمارۆدانی گوندو شارە کوردنشینەکان و هێنانیان بە ماشێنی لەشکری بۆ ئیستگەکانی شەمەندەفەرو گواستنەوەیان بە شەمەنەفەری تایبەت بە ئاژەڵو بارهەڵگر، بەبێ ئەوەی بهێڵن شتومەك و پێویستی ناوماڵ و سامانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن.

کاتی کۆکردنەوەو ناردنو لە ڕێگە، ژمارەیەکی زۆریان لەبەر ڕەخنە و ناڕەزاییدەربڕین لەلایەن سەربازەکانی سوورەوە گوللەباران کراون، یا خۆیان لە شەمەندەفەرەکان فڕێ داوەتە خوارەوە. ژمارەیەکی زۆریشیان لە ڕێگەو لەبەر سەرما و برسێتی و نەبوونی خواردنو... ژیانیان لەدەست داوە، بەتایبەت بەساڵاچوانو منداڵ.

کارەساتی ئەو گەلانە، بەتایبەت کورد، لە شوێنی نوێی ژیاندا، بەهۆی بارودۆخی نامرۆڤانەو ڕانەهاتنەوە لەگەڵ کەشوهەوای بەتایبەت (سیبریا)دا، درێژەی تراژیدیاکەیەو باسێکی ترو تایبەتی دەوێ. لە تاراوگە و ئۆردووگا زۆرەملێکاندا، دەستبەسەرو لەژێر کۆنترۆڵی دەزگاکانی پاراستنی سۆڤێتدا بوون. سەفەرکردنیان بۆ ئەملاو ئەولا یاساغ بووەو، پاسپۆرت و ناسنامەیان لێ سەندراوەتەوە.

دووەم شەڕی جیهانی، ژمارەیەکی زۆری ڕۆڵەکانی گەلی کورد لەناو سوپای سووردا بەشداری شەڕی دژی ئەڵمانیای فاشی و دەرپەڕاندنی سوپای ئەڵمان لە خاکی سۆڤێت و ئازادکردنی ئەورووپا تا گرتنی بەرلین بوون(١٧٠) . جگە لەوەی کە کورد قوربانییەکی زۆری لە شەڕدا داوەو، ژمارەیەکی زۆریشی نیشانەو میدالیاو پلەوپایەی سوپایی پێ دراوە، کاربەدەستانی سۆڤێت بەم چەشنە سوپاس و پێزانینی خۆیان بۆ لێبوردوویی و ئازایی و مێرخاسی ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە شەڕی جیهانیی دووهەمدا نیشان داوە! بەڵام کە ژمارەیەکی زۆر لەم قارەمان و سەربازانەی شەڕ گەڕانەوە بۆ ماڵ و شوێنی خۆیان، بنەماڵەو کەس‌وکاریان لەوێ نەمابوون و خەڵکی تر لە جێگەی ئەوان نیشتەجێ کرابوون. دۆزینەوەی کەس‌وکارو ڕۆیشتن بۆ لایان و زانینی هۆی گواستنەوەیان، ئاسان نەبوو، ئازایی و نەترسی دەویست، ئەویش لە سایەی ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرەی ستالیندا. کوردە دوورخراوەکانی ئەوێش، بە بیستنی کۆتایی هاتنی شەڕ، هیواو گیانێکی تازەیان بەبەردا کرا، چونکە دەگەڕانەوە بۆ وڵات و شوێنی خۆیان. لەبەر ئەوەی فاشیزم تێك شکابوو و مەترسی لەسەر وڵاتەکەیان (سۆڤێت) نەمابوو و، پێیان ڕاگەیەندرابوو کە هێنان یا گواستنەوەیان کاتییەو بە کۆتایی هاتنی شەڕ هەموویان دەگەڕێنەوە سەر جێ‌وڕێی خۆیان. زۆربەی ئەو گەلانەی کە لەگەڵ کورددا لە وڵاتی خۆیان دوورخرابوونەوە، بواریان پێدرا بگەڕێنەوەو سەرلەنوێ قەوارەکەی خۆیان دابمەزرێننەوەو گەشە بە زمان و کولتوور و ژیانی خۆیان بدەن؛ بەتایبەت پاش هاتنە سەرکاری خرۆشچۆڤ، دەوڵەتی سۆڤێت یارمەتی زیاتری ئەو گەلانەی دا کە بگەڕێنەوەو، تاڕادەیەك قەرەبووی ماڵوێرانییانی کردەوە. دەوڵەت و پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، کردەوەکانی ستالینیان لەم بارەوە بە تاوان لەقەڵەم دا و شەرمەزاریان کرد و، داوای لێبوردنیان لەو گەلانە کرد کە بوونە قوربانی ئەم سیاسەتەو، ناوی کوردیش لە ڕیزی ئەو گەلانەدا

---

(١٧٠) کتێبێکی تایبەت لەسەر بەشداری کورد، بە ناوو بە وێنەوە، لە دووەم شەڕی جیهانیدا لەلایەن نووسەرێکی کوردی سۆڤێتی "چەتویڤ.خ.م"ـەوە نووسراوە (مۆسکۆ، ١٩٧٠).

هاتووه. بەڵام مخابن بواری کوردەکان نەدرا بگەڕێنەوە، سەرەڕای ئەوەی کە بڕیارەکە بۆ هەموان بوو، بۆ تەواوی ئەو گەلانەی کە لەگەڵ کورداو پاش کورد لە وڵاتی خۆیان دوورخرابوونەوەو قەوارەکەیان هەڵوەشێندرابووەوە. بگرە پاش ئەوەش قەوارەیەکی وەك ئۆتۆنۆمی یا بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت بۆ زۆر گەلی بچووك دامەزرێنرا.

هۆیەکانی نەگەڕاندنەوەی کوردەکان و دروستنەکردنەوەی کوردستانی سوور زۆرن. وەنەبێ کوردەکان بۆ خۆیان نەیانویستبێ بگەڕێنەوە، یا بۆیان نەکرابێ، یا سەدان نامە و داواکارییان بۆ کاربەدەستانی خوار و ژووری سۆڤێتی نەنووسیبێ، بگرە چەند جاریش دەستەی نوێنەرانی کورد چوونە بارەگاکانی پارتی کۆمۆنیست، بەتایبەت داوایان لە خرۆشچۆڤ کرد بوار و یارمەتی گەڕانەوەیان پێ بدەن، بەڵام پشتگوێ خرا، نە مۆسکۆ و نە باکۆ و نە ئیرەوان لەم بارەیەوە بڕیارێکیان نەدا.

مۆسکۆ بڕیاری نەداو، باکۆ و ئیرەوانیش دژی گەڕانەوەی کوردانن. ئەگەر مۆسکۆ بڕیاری دابایە، باکۆ و ئیرەوان جێبەجێیان دەکرد. بڕیارەکە لەدەستی مۆسکۆدایە، باکۆ و ئیرەوان ناتوانن بەرفەرمانی نەبن. لە تاراوگە یا شوێنی دوورخستنەوەیاندا، یاسای سەردەمی ستالین بۆ کورد هەر لەجێی خۆیدایەو، بڕیاری گەڕانەوەیان و هەروەها بارکردنیان بۆ شوێنێکی تر نییە. باکۆ و ئیرەوانیش لەم بارەوە، بە بیانووی ئەوەی کە لەسەرەوە –واتە لە مۆسکۆ– بڕیارێك نەدراوە، ئامادەی وەرگرتنیان نین؛ خۆشیان نە داوا لە مۆسکۆ دەکەن و، نە پێیان خۆشە بگەڕێنەوە، چونکە جێ‌وڕێکەیان بەخشراوە بە خەڵکی ترو داگیر کراوە. بیانووی تریش هەبوە، وەك ئەوەی جارێ کەرەستەو ئیمکانی گەڕانەوەیان نییە. بیانووی ئەوەش هەڵبەستراوە کە ئەگەر ئەوانە بگەڕێنەوە، لەگەڵ نیشتەجێکراوانی نوێدا کە دەستیان بەسەر ماڵ و شوێنی کوردەکاندا گرتووە، دەبێتە شەڕ و کێشەیان.

بەم چەشنە تا ڕووخانی ڕژێمی تۆتالیتاری سۆڤێتی، مۆسکۆ لە سەردەمی چ خرۆشچۆڤ و چ بریژنیف و چ گەرباچۆڤ و هەتا هەڵوەشانەوەی سۆڤێت، بڕیارێکی

بۆ کوردی سۆڤێت نەداوە، لانی کەم بۆ گەڕانەوەی بەبێ قەوارەو هیچ مافێکی نەتەوەیی و کولتووری و تریتۆریالی.

سەردەمی دەسەڵاتدارێتی گەرباچۆڤ، گەلێك هەوڵ درا ئەو ناڕەوایی و پێشێلکردنەی مافی کورد لە قۆناغی پیریسترۆیکا و گلاسنۆستدا، واتە لەسایەی ئەو ئازادی و ئاواڵەییەدا کە دانیان پێدا نرابوو، ڕاست بکرێنەوەو هەنگاویان بۆ بنرێ. بەڵام بە دەستپێکردنی شەڕی ناگورناقەرەباغ، کوردەکانی ئەوێ تووشی گەورەترین زیانی گیانی و ماددی بوون و دەربەدەر و ئاوارە کران. تائێستایش لەو بارودۆخە ناهەموارو خەمبارەدا دەژین. مرۆڤ بە دیتنی دیمەنی ئۆردووگاکانیان قرچە لە جەرگی دێ!نە ئەوەیە شوێن و ماڵی نوێیان بدەنێ و بگوازرێنەوە بۆ ناوچەی تر و، نە ڕێگەی گەڕانەوەیان هەیە. لەژێر دەسەڵاتی ئەرمەنیەکاندان و، ڕێی ڕۆیشتن و پەنابەرییان بۆ وڵاتێکی تر نەدراوەو، لەو بارودۆخەدا هێشتویاننەوە، بۆ ئەوەی وەك بەڵگەیەکی زیندوو لەپێش چاوی کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا بن‌و چارەسەرێك بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە. کەچی پاش تێپەڕبوونی ١٦ ساڵ، نە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و، نە ئازەربایجان و ئەرمەنستان چارەسەری ئەم کێشەیان نەکردووە. ئازەربایجان نەیتوانیوە بە شەڕ ئاوارەکان بگەڕێنێتەوە بۆ جێ‌ڕێی خۆیان. ژمارەی ئاوارەکانی کورد ڕوون نییە، بەڵام هەموو وەك ئازەربایجانی لەقەڵەم دراون. کاربەدەستانی ئەرمەنی دەسەڵاتداری ناگورناقەرەباغیش چاوەڕێی گەڕانەوەی کوردەکان ناکەن کە بوونەتە قوربانی شەڕی ئەرمینیا و ئازەربایجان و وەریشیان ناگرن. تائێستا هیچ تەگبیر یا بانگەوازێکیان لەم بارەوە بۆ کوردەکان نەکردووە.

کاتی شەڕە خوێناویەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان، هەردوولا بەڵێنیان بە کوردەکان دا ئەگەر بێتو هاوکارییان بکەن، مافیان لە ناگورناقەرەباخ بەدی دەهێنرێ‌و، بگرە کوردستانی سووریان بۆ دروست دەکرێتەوەو کوردە دوورخراوەکانی سەردەمی ستالینی بۆ دەگێڕدرێنەوە. بەم چەشنە کوردەکانیان (کوردی موسڵمان لە بەرەی ئازەربایجان و کوردی ئێزدی لە بەرەی ئەرمینیا)

گلاندە ئەو شەڕە. کوردیش لە ڕیزی سوپای هەردوولادا بوو. هێزی تایبەت و جیاوازیان لە کوردەکان پێك هێنا. کوردی موسڵمان، واتە کوردەکانی کوردستانی سووری پێشوو، پشتی ئازەربایجانیەکان و، کوردە ئێزدیەکانیش هی هێزی ئەرمەنییان گرت. بەم چەشنە کوردەکان کەوتنە دوو بەرەی دژ بەیەك و سەدان کورد لە هەردوولا کوژران و بریندار بوون و بەدیل گیران.

کاتی داگیرکردنی ناگورناقەرەباغ و شکستی سوپای ئازەربایجان، کوردەکانی ئەرمینیا چوونە پایتەخت، یا ناوەندی کوردستانی سوور، واتە لاچین و، ئاڵای کوردستانیان هەڵکردو، بە چەپڵەڕێزان و شادی و ڕێوڕەسمێکی تایبەت دامەزراندنەوەی کوردستانی سووریان ڕاگەیاند (١٧١).

لکاتی شەڕی ئازەری و ئەرمەنی، چاپەمەنی و ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی هەردوولا بەشداری کوردەکانیان لەم شەڕانەدا ڕادەگەیاندو، بانگەوازی بەشداری کوردەکانی نیشتەجێی خۆیان (ئەرمینیا و ئازەربایجان) دەکرد، بگرە نێردراوی کوردیان بۆ لای کوردە دوورخراوەکانی ئۆزبەکستان و قازاخستانیش دەنارد، وا کە بگەڕێنەوە تا بەشداری شەڕ بن و، بەڵێنی گەڕانەوەی بەم زووانەو هەروەها دامەزراندنەوەی کوردستانی سووریان دەدانێ. هەتا کوردێکی زۆریشیان هێنایە سەر ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانیان، یا چاپەمەنیەکانیان، تا بۆ مەبەستی خۆیان وتووێژیان لەگەڵدا بکەن بۆ هاندانی زیاتری کوردەکان. هەندێ بەکرێگیراوی کوردو مرۆڤی ساکاری کوردیان دەناردە گوندە کوردنشینەکان و، پڕوپاگەندەی بەشداری کوردیان لە ئازادکردنی کوردستانی سووردا لەناودا بڵاو دەکردنەوە. کوردە ساکارەکانیش بەپیر ئەم پڕوپاگەندەو بانگهێشتنانەوە دەچوون. داخ و

---

(١٧١) ئەم ڕێوڕەسمە بە ڤیدیۆ تۆمار کراوە. لەم فیلمەدا، دیارە چۆن ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان لەلایەن بەشدارانەوە هەڵکراوەو ماچیان کردووەو سوێندیان پێ خواردووە کە پارێزگاریی بکەن و، لەناو شایی و زەماوەندا سروودی ئەی ڕەقیبیان گوتوەتەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەی یەکێك لە بەشدارانی ئەم ڕێوڕەسمە، دوو سەعات بەسەر کۆتاییهاتنی ڕێوڕەسمەکەدا تێپەڕ نەبوە، کاتی گەڕانەوەی بەشداران، یەکێکیان ئاوڕی داوەتەوە، هەواڵی ئاگرتێبەردانی ئاڵای کوردستان لەو شوێنەدا کە بەرزکرابوەوە، بە هاوڕێکانی ڕادەگەیەنێ. دەبینن ڕاستە و ئاڵاکە نەماوەو، لەلایەن ئەرمەنەکانەوە سووتێنراوە.

کەسەر لەوەدایە کە گەلێك لەو پڕوپاگەندەکەر و ئاژاوەگێڕانە ڕووناکبیرو خوێندەواری کورد بوون، ئەوانەی کە کوردەکانیان بۆ ئەم شەڕە ناڕەوایە ڕاکێشاو، بەبێ ئەوەی هیچ گەرانتی و بەڵگەیەك یا بڕیارێکی ڕەسمی لەلایەن دەوڵەتانی ناوبراو یا پەرلەمانەکانیانەوە هەبێ، کوردەکانیان هان دا. هەر ئەو تاقمە، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت گاڵتەیان پێ کردوون و فریودراون و درۆیان لەگەڵدا کراوە، خۆیان پێ ڕانەگیراو بەرەو ڕووسیا یا هەندەران باریان کرد، بەبێ ئەوەی ڕەخنەیەك ئاڕاستەی دەسەڵاتدارانی ئازەری‌و ئەرمەنی بکەن، بەتایبەت ئەرمەنیەکان کە دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت و پشتیان لە هەموو بەڵێن و گوتەکانی خۆیان کرد.

ژمارەیەك لەوانە ئێستا خۆیان بە پارچەکانی تر یا پارتەکانی تری کوردستانەوە خەریك کردووەو تێکەڵیان بوون و، نوزەیان لەسەر کێشەی کوردی سۆڤێت لێوە نایەت و، هەر دەڵێی کورد لە سۆڤێتی جاراندا نەماوە یا کێشەیان نییە.

پاش تێکچوونی یەکێتی‌ی سۆڤێت، چەند شەڕێکی خوێناوی کە لەسەر خاك (تریتۆریا) و کێشەی نەتەوەیی‌و ناکۆکی کۆن و دەسەڵات ڕوویان دا، تا ئەمڕۆیش چارەسەر نەکراون و، هەردەم مەترسی هەڵگیرسانەوەو پێکداچوونی نوێ‌و شەڕێکی خوێناوی نێوان ئەو گەلانە یا ئەو کۆمارانە لەئارادایە، چونکە هێزەکانیان تائێستایش بەرامبەر بەیەك ڕاوەستاون. ئەو لایەنە دژانە تەواوی پەیوەندیەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا بڕیوەو، هەمیشە پڕوپاگەندە دەکەن دژی یەکتر. بۆ وێنە، ناکۆکیەکانی نێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستان، ئابخازیا و جۆرجیا، کۆمارە ئۆتۆنۆمیەکانی ئینگووشی‌و ئەستین لە ڕووسیای فیدراڵی‌و گەلێك وێنەی تر، بەپێچەوانەی بانگەشەی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی‌و پارتی یەکێتی‌ی سۆڤێتەوە کە گوایە کێشەی نەتەوایەتی گەلان لە یەکێتی‌ی سۆڤێت چارەسەر کراوە، یا تەواوی گەلانی سۆڤێت مافی یەکسانیان هەیە، ئەنجام یا میراتی ئەو سیاسەتە بوون کە بەجۆرێکی تر کەوتەوە. گەلێك کۆمار یا نەتەوەی پێشووی چوارچێوەی یەکێتی‌ی سۆڤێت، لەسەر حیسابی گەلان و نیشتمانی

گەلانی بچووکتر پێك هێنرا یا گەورە کرا کە هیچ قەوارە یا بەڕێوەبەرایەتی یا مافێکی کولتوورییان پێنەدراو پەڕاگەندە کران، یا لەناو گەلانی تردا توانەوەو ناویان نەماو سڕانەوە. ئێمە لێرەدا تا لە مەبەستی گوتارەکە دوورنەکەوینەوە، باسەکەمان لەسەر کوردە بێقەوارە و بێماف و دەربەدەرەکانی سۆڤێتە کە دوای هەڵوەشانەوەی ئەو ئیمپراتۆریە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زووترو زیاتر لەچاو گەلانی تر هەستیان بە مەترسی کردووە، بەهۆی مانەوەیانەوە لە چوارچێوەی ئەو کۆمارانەی سۆڤێتی پێشوودا، بەتایبەت کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان، لەبەر چەوسانەوەو بێمافی و پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم و بگرە ڕەگەزپەرستی دەسەڵاتداران و تاقم و گرووپی تر لەو کۆمارانەدا بەرامبەر بە نەتەوەکانی تری دانیشتووی وڵاتەکەیان.

ئەو شەڕە خوێناویەی کە لەنێوانیاندا لەسەر ناگورناقەرەباغ ڕووی داو، سەرئەنجام ئاڵۆزی باری ژیان و قەیرانی ئابووری پاشماوەی کوردەکانی ئەوێی ناچارکرد بۆ بژێوی خۆیان ڕوو بکەنە ڕووسیا. زۆربەیان ماڵ و سامانی خۆیان فرۆشت، تا لە تاراوگە پەنایەك بۆ خاوخێزانیان پێك بێنن و، پاسپۆرتی خۆیان گۆڕی و بوون بە هاووڵاتی ڕووسیاو، دەستیان دایە کارکردن. ئەوانەی توانای کڕینی خانووبەرە یا گۆڕینی پاسپۆرتیان نەبوو، کە زۆربەی ئاوارەکانیان پێك دەهێنا، خەریکی کاری ڕەش و هەرزان بوون، کە زۆر جار بەهۆی باری نائاسایی و نەبوونی ئیقامەوە لەلایەن پۆلیسەوە جەریمە دەکران یا تووشی وەدەرنان و ڕاگرتن لە ناوەندەکانی پۆلیس و سووکایەتی دەبوون. ژمارەیەك لەوانە ناچار گوند بە گوند یا شار بە شار جێگەی خۆیان دەگۆڕی. جگە لە ڕووسیا، شوێنێکی تر نەبوو بتوانن کاری لێ بکەن و خۆیانی تێدا بژێنن. لەبەر ئاڵۆزبوونی باری ئابووری، بەتایبەت لە ئەرمەنستان و ئازەربایجان، ئەمجارە نەك تەنیا ژمارەی ئاوارەکانی کورد بۆ ڕووسیا زیاتر بوو، بەڵکو ئەرمەنی و ئازەری و نەتەوەکانی تریشی گرتەوە، بە چەشنێك کە وای لێهات لە سێ ئەرمەنی دوانیان لە دەرەوەی ئەرمەنستان بژی. ئەوانەش زۆربەیان لە ڕووسیا دەژین و، بەپێی

سەرچاوەکان هەر لە ڕووسیا دوو ملیۆن ئازەری دەژی. جگە لە ئازەریو ئەرمەنی، چەند ملیۆن خەڵکی کۆمارەکانی تری سۆڤێتی پێشوو کە زۆربەیان بەشێوەیەکی ئاسایی هاتوون، لە ڕووسیا دەژینو، ئەوانیش لەبەر ناخۆشی ژیان و هەژاری ڕوویان کردوەتەئەویّ. ڕووسیا سەرەڕای ئەو قەیران و گرانییە، لەچاو کۆمارەکانی تردا، باشترە، بۆیە خەڵك ڕووی تیّدەکەن.

ئەوەشمان لەبیر نەچیّ کە پاش هەڵوەشانەوەی سۆڤێت بیست‌وشەش ملیۆن ڕووس و ڕووسی‌زمان کە زۆربەیان ڕووسن، لە دەرەوەی ڕووسیا، واتە لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێت، مانەوەو ژیان. بەپێی هەندیّ سەرچاوە، تائێستا هەشت ملیۆنیان گەڕاوەتەوە. واتە ژمارەی ئەوان، لە هی ئاوارەو پەنابەرە ئاسایی و نائاساییەکانی ناو ڕووسیا، زیاترە. بە جیابوونەوەی کۆمارەکانی سۆڤێت و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی‌یان، .هەر کۆمۆنیستەکان دەسەلاّتیان بەدەستەوە گرت‌و، بەرگی خۆیان گۆڕی و، بەناوی دیموکراسی و سەربەخۆیی‌یەوە، ئینتەرناسیۆنالیزم و برایەتی گەلان و...یان وەلانا. هەر ئەوانیش بوون شەڕەکانیان هەڵگیرساند و تەنگیان بە گەلانی بچووك یا بیّهێز هەڵچنیو سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەیان گرتەبەر. ئەنجامەکەی ئەو شەڕە قورس و خوێناویانە بوو کە دنیا ئاگاداریان بوو. هەندێکیان ناوی پارتی کۆمۆنیستیان گۆڕی، یا پارتێکی تریان دامەزراندو، ٣٦٠ پلە بایان دایەوە؛ هەندێکیان چوونە حەج و، هەندێك لە کلّێسەکان گوناحەکانی ڕابردووی خۆیان شوشتەوەو، بگرە کەوتنە لیّدانی ڕێکخراوو پارتە پێشکەوتوو و ئازادیخوازو نەیارەکان. زۆربەیان ئەوە دووسیّ خولە بەزۆر خۆیان دەکەنەوە بە سەرۆك کۆمار و، یەك دوانیشیان خۆیان بۆ هەمیشە بۆ سەرۆکایەتی کۆمارەکەیان هێشتوەتەوەو، بگرە مرخی میراتگری دەسەلاّتیشیان هەیە، وا کە پاش مردن کوڕو نەوەکانیان جێیان بگرنەوە، وەك تورکمان باشی "هاوڕیّ نیازوڤ"ی سەرۆك کۆماری تورکمانستان کە ناوەکەشی گۆڕیوەو، خۆی کردوەتە باوك و سەرۆکی هەموو تورکمانەکان و، دەیان پەیکەرو جادەو گۆڕەپان و شوێنی تری بەناوی خۆیەوە ناو لیّناوەو، پارەکەشیان وێنەی هاوڕیّ تورکمان باشی پێوەیە. ئیتر

باسی دەوڵەمەندی و سامانیان ناکرێ کە خۆیان و بنەماڵە و کەس‌وکاریان بە دەوڵەمەندترین کەسی وڵاتەکەیان دادەنرێن، یا وەك دەوڵەمەندەکانی دنیا دەژین.

هەموو ئەوەش بەرهەمی تاڵانکردنی خەڵك و سامانی نیشتمان و گەلەکەی خۆیانە، کە لە هەژاری و برسێتیدا ماوەتەوە و، ڕۆژ نییە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهان پەردە لەسەر ئەوانە لانەدات. جگە لە سەرۆکەکانیان، کابینەی وەزیران و ئەندامانی پەرلەمانەکانیان و، بەگشتی هەموو دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی یاسایی و لەشکری و... دەوڵەتەکەیان پەروەردە و گۆشکراوی سەردەمی دەسەڵاتداریێتی سۆڤێتن؛ ئەوانەی فێری برایەتی و یەکسانی و... کرابوون و ئەمڕۆ بەدەسەڵاتەوە پشتیان لە هەموو پرنسیپێکی مرۆڤانە کردووە، ئەوانەی کە بۆ خۆیان یا بە چاوپۆشی ئەوان ئەو هەموو تاوانانە بەرامبەر بە گەلانی تر دەکەن، بۆ خۆیان جیابوونەوە و سەربەخۆیی‌یان ڕاگەیاند، کەچی ئەو مافە نە تەنیا بە گەلانی تر ڕەوا نابینن، بەڵکوو ئەو گەلانەیش کە مافی ئۆتۆنۆمی یا کولتووری یا بەڕێوەبەرایەتییان لە چوارچێوەی کۆمارەکەیاندا هەبوو، کەوتنە تەسککردنەوە و سنووردارکردنیان و بیانوویان پێ دەگرن و دەیانەوێ گاڵەیان پێ بکەن یا بیانتوێننەوە. ئیتر کورد، کە لەوەتی ڕاگوێزراوە و بەسەر ۹ کۆمار و دەیان شار و ناوچەی سۆڤێتی پێشوودا دابەش کراوە و لەیەك پچڕاوە، ناتوانێ پێکەوە دەنگ بەرز بکاتەوە و داوای خواستەکانی بکات کە لانی کەم دابینکردنی ناسنامەی هاووڵاتی‌بوون و کار و ژیان و مافی کولتوورییە. پێشان دەوڵەتێکی یەکگرتوو، واتە سۆڤێت، هەبوو هەندێ کێشەی وەك ناسنامەو ئیقامە و بێکاری‌و ڕاونانی قڕەش و ڕاگرتنی خەڵك لەسەر کۆڵان و جادە و لەناو ماڵاندا نەبوو، سووکایەتی و جەریمەی خەڵك نەدەکرا، هاتوچۆ بە ڤیزە نەبوو، خەمی ئەوە نەبوو منداڵ بێ خوێندن و نەخۆش بێ دکتۆر... بمێنێتەوە.

کوردە دەرکراو و ئاوارەکانی سەردەمی سۆڤێت لە تاراوگە زۆرەملێکان، لەناو ڕووسی سیبریا یا کازاخی کازاخستان یا ئۆزبەکدا کە میوانی بانگنەکراو و هاووڵاتی سەپێندراو بوون، یا وەك بێگانەیش چاویان لێ کرابێ، کەس نەیدەوێرا

سووکایەتییان پێبکات یا وەدەریان بنێ. پێشان دەوڵەتی سۆڤێتی ئەوانەی دوورخستبوەوە و نەیدەهێشت سووکایەتییان پێ بکرێ، چونکە بۆ خۆی تاوانبار و بەرپرسی چارەنووسیان بوو، دەبوو پارێزگاری مانەوەیان بکات؛ گیروگرفتێکیشیان هەبوایە هەم دەوڵەت و هەم پارتی کۆمۆنیست هەبوو پەنای بۆ بەرن. ئەمڕۆ هیچ کامیان نەماون. ئەمڕۆ لە چەند کۆماری سەربەخۆ و چەند ناوچەی ئۆتۆنۆمی و شار و ناوچە و گونددا دەژین، لەناو یا لەژێر دەستی نەتەوەی خاوەن قەوارە یا باڵادەست یا دەسەڵاتداری ئەوێدان و، بیانوو بۆ تەنگ پێهەڵچنین و دەرکردنیان زۆرە. پێیان دەڵێن بگەڕێنەوە جێوڕێی خۆتان، ڕوونکردنەوەی ئەم جێوڕێیەیان بەلاوە زۆر زەحمەتە. یا دەڵێن ئێمە نەمانهێناون، میوانداری بەسەو بڕۆن.

واتە کەشوهەوایەکی وا بۆ هەردوولا دروست بووە کە کوردەکە خۆی بە بیانی و میوان دەزانێ. ئەگەر وای دابنێین خاوەنماڵ سووکایەتییان پێ ناکات و وەدەریان نانێ، ئەوا بە چاوێکی باش تەماشایان ناکات. کوردە دوورخراوەکان ناسنامەی ئەو کۆمارانەیان هەیە کە ماوەیەکی درێژ، واتە ٦٠ تا ٧٠ساڵ، بەسەر گواستنەوەیاندا بۆ ئەو شوێنانە تێپەڕیوە و لەوێ لەدایك بوون و هاوولاتی ئەوێن، بەتایبەت وەچەی نوێ کە شەست حەفتا ساڵ بەسەر دوورخستنەوەی باووباپیرانیاندا تێپەڕ بووە و نیشتمانی خۆیان نەدیوەو تەنیا بۆیان باس کردوون، نازانن چۆن و لەکوێیەو، کەمیان ئاگایان لە قووڵایی کارەساتی گواستنەوەی باووباپیرانیان هەیە.

نەتەوەکانی خاوەن قەوارە و دەوڵەت کە لە هەندەران تەنگیان پێ هەڵدەچنن، دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتانی خۆیان؛ خزم و کەسوکار و گوند و شار و خانووبەرەیەکیان هەیە تێیدا بحەوێنەوەو، دەوڵەتەکەیان حاشایان لێ ناکات. بەڵام کوردەکە، کێ هەیە پشتگیریی بکاتو، کێ چاوەڕوانە، وڵاتی نییە" هەیبووە لێی زەوت کراوەو داگیر کراوە. با پاسپۆرتی کازاخی، ئازەری، ئەرمەنی، یا بەگشتی سۆڤێتی هەبێ و هاوولاتی یا لەدایکبووی ئەوێ بێ، وەك ئەرمەنی یا کازاخی یا

